# سەردەم

گۆڤارێکی تایبەتە بەوەرگێڕان و کەلتووری بیانی
دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم دەریدەکات
**ژمارە (٣) حوزەیرانی ١٩٩٩ — ساڵی یەکەم**





**ناونیشان:**

**سلێمانی – فولکەی یەکگرتن**

**دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم**

**تەلەفۆن : ٢٩٨٣٩**

**بۆ پەیوەندی کردن لەدەرەوەی وڵاتەوە**

**سەنتەری سەرچنار**

**Tel: 00873 761 477 268 – 00873 682 040 391**

**Fax: 00873 682 040 392 – 00873 761 477 269**



بەرگ: ئۆفسێتی دلێر    چاپ : چاپخانەی بابان    کۆمپیوتەر : جەلیل حسەین

ژماره (٣) حوزەیرانی ١٩٩٩ سالی یەکەم

# پاش مۆدێرنیتی

■ بابەك ئەحمەدی

• و: ڕێبین هەردی

( لەگۆشەیەكی دووری دنیادا كە لە سیستەمی كەهكەشانە بێ ئەژمارەكان دەدرەوشایەوە، ڕۆژێك ئەستێرەیەك هەبوو كەگیاندارانێكی هوشیار تیایدا دەژیان و ئەم گیاندارانە لەكاتێكدا زانینیان داهێناو ئەو ساتەوەختەش لەمێژووی دنیادا غرور ئامێزترین و لەهەمانكاتدا درۆزنترین ساتەوەختەكان بوو. بەڵام تەنها ساتەوەختێك بوو. چونكە سروشت چەند بایەكی هەڵساند و ئەستێرەكە بەستی و گیاندارە هوشیارەكانیش مردن)

فردریك نیتچە

مێژوونووسی ڕۆحی تیتۆس لیڤیوس بەم شێوەیە ئەو مەتەڵەی كە ببووە ئافەتی سەردەمەكەی، دەربڕی: (لەم ڕۆژگارەی ئێمەدا نەدەتوانین تەحەمولی هەڵەكانمان بكەین و نەدەتوانین تەحەمولی ڕێگاچارەسەری ئەو هەڵانە) . ئەو نووسەرەی ئەم رستەیەی هێناوەتەوە [1] باسی (هیگڵ) یشی كردووە كە رمانی جیهانی یۆنانی دەگەڕانەوە بۆئەوەی توانای تەحەمول كردنی ئەنگێزە خود هوشیارییەكانی خۆی نەماوە. ئایا ئەتوانین بڵێین كە سەردەمی ئێمە واتە ئەو ڕۆژگارەی كە كەسانێك بە (مۆدێرنیتی دوایی) و زۆریش بە ڕۆژانی پاش مۆدێرنیتی دەزانن، سەردەمێكە كە تیایدا نەدەتوانین بزوێنەرە مۆدێرنەكان لە ڕێكخستنی دنیاماندا ڕاست بكەینەوەو نەدەتوانین تەحەمولی دەرئەنجامەكانی [ئەو بزوێنەرە



مۆدێرنانه] بکەین؟ بۆ تیتۆس لیڤیۆس جیهانێك کۆتایی پێهاتبوو، هیگڵیش باسی کۆتایی مێژووی دەکرد. ترس لە (یان پێشبینی) کۆتایی، شتێکی تازەنییە. پێدەچێت بەردەوام بیرۆکەی کۆتایی وەك سەرەتاترین ئاماژەکانی عەقڵانیەتی مرۆڤ (وەك ئیدراکی غەریزی لە بوونی سەرەتا) هاتبێتە ئاراوە.

هەموو رەخنەگرانی مۆدێرنیتی باسی کۆتایی مێژوو و ئاخر زەمان، ناکەن. تەنانەت هەندێکیان هیوایان بەکردنەوەی ئاسۆی تازە هەیە، بەڵام هەموویان باسی (کۆتایی مۆدێرنیتی) دەکەن. مۆدێرنیتی رەخنەی لە نەریتەکانی کۆمەڵگا کۆنەکان دەگرتو دەیگوت ئەو کۆمەڵگایانە عەقڵانی نینو بێئاگان لە ئازادیو رۆحی داهێنەرانەی مرۆڤ و بەهایەك بۆ تاکانەیی عەقڵی زانستی – رخنەیی دانانێن ... و بەڵام رەخنەگرانی مۆدێرنیتی کۆمەڵگای مۆدێرنیش هەر بەم خەسڵەتانەوە دەناسن. ئەوان رێگای رۆژگاری پاش مۆدێرنیتی بەیەکێك لەم دوو رێگەیە دەزانن: یان نهیلزم یان گەیشتن بەئاسۆیەکی تازە.. ئاسۆیەك کە هەڵاتنی بەگومانخوازی پۆست مۆدێرن و بەبڕوا نەبوون بە مانای کۆتایی شتەکان، رووداوەکان، گوتارەکان، دەقەکان و بە نکوڵیکردن لە میتافیزیکی ئامادەبوونی مانا، دەستی پێکردووە.

## کۆتایی مۆدێرنیتی

یەکێك لە سەرەتاترین بەکارهێنانەکانی پێشگری پۆست Post بەمانای (دوایی) یان (پاش) لە فەلسەفەی ئەمرۆدا زاراوەی (پاش مێژوو) ە کە ئەرنۆڵدگلن لە کتێبی (دنیاییبوونی گەشەسەندن) لە ساڵی ١٩٦٧ دا هێنایە ئاراوە. ئەو لەم کتێبەدا باسی کۆمەڵگای مۆدێرنی کردو پرسی بۆچی ئێستا جووڵەی نوێبوونەوەی بەردەوام کە یاسای مۆدێرنیتی بوو، لە لقەکانی ژیانی کلتوری، فکری و فەلسەفیدا خاو بۆتەوە؟ چۆن ئەمرۆیی بوون واتە (هاوچەرخ بوون لەگەڵ سەردەم دا) کە بنەمای مۆدێرنیتی بوو، لەکاری فکریدا بەرچاو ناکەوێت؟ گلن باسی بێتوانای عەقڵی فەلسەفی کرد و نووسی چیدی ناکرێ لەپاش مارکس، نیتچە و فرۆیدەوە، قسەیەکی تازە لە فەلەسەفەدا بکرێت.. ئەو لەکۆتاییدا پرسی ئەم قەیرانی فکری فەلسەفییە چ کاریگەرییەك دەکاتە سەر بناغەی ئەندێشەی زانستی؟ لێرەدا باسەکە بەو وەڵامەی گلن بەم پرسیارەی داوەتەوە، درێژ ناکەمەوە. بەڵام تەنها ئاماژە بۆ نزیکی ناچارانەی باسەکەی لەگەڵ کتێبی (قەیرانی..) هۆسرل دا دەکەم. لە ساڵی ١٩٦٩ دا (ئالان تورین) یش پێشگری Post ی بەکارهێنا بەڵام لە بوارێکی جیاوازو لەقاڵبی گوتارێکی کۆمەڵناسانەدا. ئەو لە کتێبی

(کۆمەڵگای دوای پیشەسازی) دا دەریخست کە (قۆناغی دوای پیشەسازی لە پەرەسەندنی کۆمەڵگای مۆدێرنا) یەکێ لە ساتەوەختە مێژووییەکانی پرۆسەی پیشەسازی بوونە. واتە پێشگری (پۆست) بەمانای گۆڕانکارییەکی رادیکاڵو چۆنایەتی نیە، بەڵکو قۆناغێکی پەرەسەندن ئاشکرا ئەکات کە (لەچەند لقێکدا) لە قۆناغەکانی پێشوو جیاوازە، زاراوەی (دوای پیشەسازی) تاڕادەیەك لەگەڵ زاراوەی (کۆمەڵگای دوای سەرمایەداری) دا دروست کراوە کە لەناو ژمارەیەك لە خەباتگێڕانی باڵەکانی چەپی سۆسیال دیموکراتیدا، لە دەیەکانی ۱۹۲۰ و ۱۹۳۰ دا بەکار دەبراو مەبەستیش لەبەکارهێنانی روونکردنەوەی هەڵو مەرجی چینایەتی رژێمو کۆمەڵگای یەکێتی شورەوی بوو، کە بەبڕوای ئەوان بەقۆناغێکی گواستنەوەدا تێدەپەڕی: واتە نەسەرمایەداری بوو نە سوشیالستی.

ئەم زاراوەی (دوای سەرمایەداری) یە لەپاش جەنگەوە لە بەرهەمەکانی بیریارانی راستڕەویشدا بەکار براو مەبەستیشیان [لەم زاراوەیە] (سەرمایەداری نوێ) بوو. ئەم بیریارانە هەڵو مەرجی ئەمڕۆی سەرمایەدارییان بە (دوای سەرمایەداری) ناو دەناو تەنانەت لە هەندێ کتێبی وانەی ئابووریشدا، سوودیان لەم زاراوەیە وەرگرت. کۆمەڵێ لە نووسەرانی چەپڕەویش لە دەیەکانی ۱۹۶۰ و ۱۹۷۰ دا سوودیان لەم زاراوەیە بۆ رەت کردنەوەی جێگەی یەکێتی شورەوی و دژایەتی لەگەڵ سۆشالیزم دا وەرگرت. هەندێ جار لەبواری لێکۆڵینەوەی کلتوریشدا باسی (خەسڵەتی پاش بورژوازی) دەکرا، بۆنمونە (ژرار رولە) لە وتارێکدا باسی [خەسڵەتی پاش بورژوازی بەرهەم و ئەندێشەکانی (فالتر بنیامینی)][٣] کردووە. واتە بنیامین تێڕوانینێکی بۆ کلتوور هەیە کە لە (قەیرانی عەقڵباوەڕی


موسرل

هاوچەرخ) دوور دەکەوێتەوەو تاڕادەیەك لە (هەڵو مەرجی پۆست مۆدێرنی ئەمڕۆی ئێمە) دەچێت.

بەڵام شێوە جیاوازەکانی بەکارهێنانی زاراوەی پاش مۆدێرن، کامانەن؟ Postmodernismo زاراوەیەکە کە لەدەیەی ۱۹۳۰ داو لە باسکردنی ئەدەبیاتی ئیسپانی پێش جەنگی جیهانی یەکەمدا بەکار دەهێنرا. لە هەندێ جاریشدا ئەم زاراوەیەیان بۆ باسکردنی ئەدەبیاتی ئەمریکای لاتین لەماوەی نێوان دوو جەنگی جیهانیدا، بەکارهێناوە. هەندێك لە مێژوونووسانی ئەدەب، ئەدەبیاتی دەیەی ۱۹۵۰ وڵاتە یەککرتووەکانیان بە (پاش مۆدێرن) ناوناوە،[٢] بەڵام بەکارهێنانی تازەی ئەم زاراوەیە لە هونەری معمارییەوە هاتووەو دەگەڕێتەوە بۆ بیرۆکەی دابڕان لە (شکڵی پێکەوە بەستراو و ئۆرگانیك)، واتە جیابوونەوە لە (یەکێتی گریمانەیی ئۆرگانیکی نەخشەیەك یان واقیعێکی فەزایی). لەڕاستیدا ئەو تێڕوانینەی کە [پێی وایە] ئەکرێ بەشەکانی (أجزاء) بینا هەم دوور لەبەکارهێنانەکانی و هەم دوور لەو یەکێتییە گریمانەییە دروست بکرێ، ئاڕاستەیەکە بۆ خۆقوتارکردن لە (وانە زانکۆییەکانی مۆدێرنیزم)[٤]. لێرەدا ئاشگرایە بەکارهێنانی پاش مۆدێرن بەمانای قبوڵ نەکردنی بەردەوامی مۆدێرنیزمە. واتە لێرەدا رووبەڕووی دابڕان دەبینەوە، لەکاتێکدا کۆمەڵگای پاش پیشەسازی، شکڵێکی پیشەسازیبوونی کۆمەڵگابوو.




یەکێکی تر لەو بەکارهێنانانەی (پۆست مۆدێرنیزم) کە کەمتر ناسراوە دەقێکی نوسراوی ئارنۆڵد تۆینبی فەیلەسوف و مێژوونووسە کە لە نۆهەمین بەرگی کتێبی (توێژینەوەی مێژوو) لە ساڵی ١٩٥٤ دا باسی ئاوابوونی ژیاری رۆژئاوای بۆ ناو دەهلیزی (ناعەقڵانیەتو رێژەگەری) دەکردو پەیدابوونی [ئەم حاڵەتەشی ]دەگەڕانەوە بۆ سەدەی نۆزدەو بەتایبەتی بۆ دەیەی ١٨٧٠، و لەم بوارەشدا سوودی لە زاراوەی (پۆست مۆدێرنیزم) (وەك مەجازی سووکایەتیەك) وەرگرت.[٥] بەڵام بەکارهێنانی فەلسەفیانەی پاش مۆدێرن کە فرانسوا لیوتار نمونەی کامڵی بە زاراوەی (مەرج یان هەلومەرجی پاش مۆدێرن) دەست نیشان کردووە، خەسڵەتێکی ئاڵۆز بە پێشگری (پۆست) دەبەخشێ. لەلایەکی دیەوە وشەی مەرج یان هەلومەرج (Condition) کە لە ناونیشانی کتێبە گرنگەکەی لیوتار دا هاتووە، ئەوەندەی دی ئاڵۆزییەکان زیاد ئەکات.[٦] لەڕاستیدا لیوتار باسی دوو شتی جیاواز ئەکات. مەرجی پۆست مۆدێرن واتە هەلومەرجێك کە تیایدا بێتوانایی مۆدێرنیتی دوایی، بە قەیرانە گشتگیرەکانیەوە ئاشکرا بووە، بەڵام هێشتا هەلومەرجێکی تازە لەدایك نەبووە. لەلایەکی ترەوە هەلومەرجی پاش مۆدێرن واتە دەست پێکردنی رۆژگارێك کە تیایدا مۆدێرنیتی کۆتایی پێهاتووە، رۆژگارێك کە هێشتا ناوێکی بۆخۆی نەدۆزیوەتەوە، مەرجی پۆست مۆدێرن یان رۆژگاری ئێمە (پاش مۆدێرن) نیە، بەڵام بەردەوامی مۆدێرنیش لە هەموو ئەو لایەنانەدا نیە کە مۆدێرنیتی دروست کردووە. [بەڵکو] زۆرتر ئاشکراکەری قەیرانی مۆدێرنیتی و مۆدێرنیزمە، هەلومەرجێکە کە هەم پێویستی بەردەوامی دەهێنێتە پێشێ و هەم لایەنە دژەکەی واتە پێویستی دابڕان.. هەم ناتوانێ بمێنێتەوەو هەم جێگرێکی نیە.

بگەڕێینەوە بۆ حوکمەکەی (بۆدلێر) کە لە فەسڵی شەشدا باسم کرد: هەموو شتێکی مۆدێرن، ململانێ نەك لەگەڵ رابردوو، بەڵکو لەگەڵ ئەمڕۆدا دەکات. ئەم خاڵە تەنها لە گوتاری پۆست مۆدێرندا ئەوەندە بە کامڵی و دروستیو وردی زانرا. خەباتی نوێگەری، ئەمڕۆیی بوون و تازەگەری دژی نەریتەکان، خەباتە دژی بەردەوامی نەریتو ژیانی نەریت لە ئەمڕۆدا. کەوابوو دابڕان لە مۆدێرن، خۆی بزووتنەوەیەکی مۆدێرنە. لەکاتێکدا لەبونیادی خۆیدا دژی ئەم دووبارەبوونەوەیەیە. مۆدێرنیتی پیرۆزکردنی گۆڕانکاری، نوێبوونەوەو ئەمڕۆیی بوونە، جا چ ئەو شتانە بەدەست هاتبن یان نەء، [ئەوا] مۆدێرنیتی بانگەشەی ئەنجامدانیان ئەکات. کەوابوو گۆڕانی بابەتی مۆدێرنو گۆڕینی بە شتێك کە ئێستا بە پۆست مۆدێرن یان بە مەرجی پۆست مۆدێرن ناوی دەبەین، لە بانگەشەو ئەفسوونو جادووی مۆدێرنیزم، جیانابێتەوە.

ئەم خاڵەی دوایی زۆر گرنگە. هەندێ لە بیریارانی پۆست مۆدێرن پێیان لەسەر ئەو خاڵە داگرتووە کە مەزنترین دەسکەوتەکانی مۆدێرنیزم لە هونەردا (دەگۆڕێت بۆ گوتاری پۆست مۆدێرن) ئەو نموونەیەی کە یەکسەر بە خەیاڵماندا دێت، دوا رۆمانی جیمس جویسە (Finnegans Wake) ١٩٣٩. رۆمانێك کە نوسراوی یەکێك لە گەورەترین نوسەرانی مۆدێرنیزمە، دەکرێت لەهەوڵدانی جویس دا بۆ راکردن لە زمان، بۆ بەکارهێنانی وشەکان‌و تەنانەت رێزمانی نەحوی زمانە جیاوازەکان و لە راکردنی (رۆمان)ەکەدا لە نەخشەی رۆمانی [روائی]، ئەو قۆناغی (تێپەڕین بۆ بێ‌مانایی) یەی (لیوتار) بدۆزینەوە،[٧] بە وتەی دێریدا مەسەلەکە لێرەدایە کە تێگەیشتنی جویس بۆ گوتار (پۆست مۆدێرن)[٨] ە.

نموونەیەکی دی کە بەهۆی نووسینەکانی جیل دۆلۆزەوە یەکسەر بەبیرماندا دێت، کافکایە، هەلومەرجی زمان‌و (جۆرەکانی زمان) کە دۆلۆز لە کتێبی (کافکا، لەبەرگریکردن لە ئەدەبیاتی کەمایەتی) دا (١٩٧٥) ئاماژەی بۆکردووە،[٩] خۆی لەخۆیدا تێپەڕین لە زمانی مۆدێرنیزم پیشان ئەدات. ئەوەی کە چۆن زمانێکی تر لەناو دڵی زمانەوە دروست دەبێت (وەسوەسەی بەرهەمەکانی دوادەیەی دۆلۆز) خۆی بەیانێکی ئەو گۆڕانەیە:

(رەنگە خەڵکی حەرامزادە، ژێردەست، چەوساوە، بەردەوام لە حاڵەتی دروست بوون، بەردەوام ناکامڵدا تەنها لە ناوەڕۆکەکانی نووسەردا بدۆزێتەوە، حەرامزادە چیدی هەلومەرجێکی خێزانی نیە، بەڵکو هەلومەرجێکی نەژادیە.. کافکا بۆ ئەورووپای ناوەندی‌و (ملۆیل) بۆ ئەمریکا، ئەدەبیاتیان وەك کرداری پەیوەندی گشتی خەڵکی کەمایەتی‌و چەوساوە، ناساند... بۆ هەموو کەمایەتیەکان کە دەربرینی خۆیان جگە لە ناو و لەڕێی نوسەرەوە نەبێت، نادۆزنەوە).[١٠]

ئێستا با جیهانی ئەو نووسەرانە بەجێ بهێڵین کە هەندێ جار لە مۆدێرن دەچن‌و هەندێ جار لە پۆست مۆدێرن و بگەڕێینەوە بۆ نمونەی (پاش پیشەسازی). کۆمەڵناسان بە هێنانە ئارای ئەم چەمکە بەدوای ناسینی (قۆناغی پاش پیشەسازی) دا نەدەگەڕان، بەڵکو دەیانویست بەردەوامی پیشەسازی بوون و دەرئەنجامەکانی گشتیبوونی ئەم جووڵەیەی (ژیانی پیشەسازی) بخەنە ژێر لێکۆڵینەوەوە. لە گوتاری زانستیش دا چەمکی (پاش ئەزموونی) بە مانای ئەو کۆمەڵە دەرئەنجامە ئەزموونیە دێت کە (سەقامگیر) بوون. لە گوتاری هونەردا (پاش ئەوانگارد) واتە قبوولکردنی هونەری پێشڕەو. بەڵام بەپێچەوانەی هەموو ئەمانەوە کاتێ باسی (پاش بونیادگەری) دەکەین، ئیدی ئاماژە بۆ بەردەوامی ناکەین بەڵکو بەراشکاوی ئاماژە بۆ جۆرێك لە دابڕان دەکەین: لەکۆتایی دەیەی ١٩٦٠ وە هەوڵێکی هەمەلایەنە درا بۆئەوەی بەس نەبوونی شیکاری بونیاد گەرانە بخرێتە ژێر لێکۆڵینەوەوە. جاك دێریدا نەك هەر ئەو شیکردنەوەیەی بەهۆی رەخنەگرتن لە زمانەوانی (سوسیر) رەت کردەوە، بەڵکو لەهەمان کاتدا گەڕانەوە بۆ (هەلومەرجی پێش بونیادگەری) شی رەت کردەوە. جیل دۆلۆز هەوڵیدا بۆ ئەوەی دەسەڵاتی مانا لە (گوتاری بونیادگەری) دا ئاشکرابکات و تەنانەت هەندێ لە بونیادگەرانیش هێواش هێواش هەندێ لە تێزە سەرەکیەکانی خۆیان وەلاوە نا، لێرەوە لیوتار نووسیویەتی کە لەسەر بناغەی نمونەی (پاش بونیادگەری)، دوو رێگا لەبەردەم پاش مۆدێرنیزمدا هەیە: یان (پەردە دڕان) یان (نهیلیزم).[١١]

رێگای یەکەم چیە؟ دووری پەردەی دڕان لەبێ‌شەرمیەوە Cynicism چەندە؟ لیوتار دەنووسێ کە مەبەستی گەڕانەوەی بەردەوامە بۆ بانگەشەکانی مۆدێرنیتی (و مۆدێرنیزم) بۆئەوەی لەناویدا ناتەواوی بانگەشەی دابڕان لە نەریت

ئاشکرا بکرێ. [و] هەڵهێنجانی ئەو دەرئەنجامە نەك هەر تەنها لەیەك یا چەند ڕوویەکەوە، بەڵکو لەسەرجەم ژیانی هاوچەرخەوە کە (قەیران بەردەوامە) و لە قەیرانی تەکنەلۆژی، زانستی، پەروەردەیی، ئابووریو ... وە، گەیشتن بەو دەرئەنجامەی کە (تەنها یەك ناو کۆتایی هاتنی ئامانجی مۆدێرن، ئاشکرا دەکات: (ئاشڤێتز). ڕەنگە بتوانین بڵێین گوتاری پۆست مودێرن شێوەیەکی (ڕەخنەی کلتووری) یە بە فراوانترین ئەو مانایانەی تا ئێستا بۆ ڕەخنەمان زانیوە.

نابێ پەیدابوونی گوتاری پۆست مۆدێرن بۆ بەرگریکەرانی مۆدێرنیتی ئەوەندە جێی سەرسوڕمان بێت. [چونکە] مۆدێرنیتی خۆی هەمیشە سەرقاڵی ڕەخنەلەخۆگرتن بووە. سەیرکردنی هەمووشتێك لە دیدێکی ڕەخنەگرانەوە (هەموو شتێك، تەنانەت خودی ڕۆژگاری مۆدێرنیش)، وانەی دێرینو تەنانەت دەکرێ بڵێین دروشمی ڕۆشنگەرانو لایەنگرانی نوێخوازیو گۆڕانکاریەکان، بووە. هەنووکە پێدەچێ هیچ ڕێگایەکمان بۆ ناسینی مۆدێرنیتی لەبەردەمدا نەبێت جگە لە وردبوونەوە لە ڕەخنە برینداركەرەکانی پۆست مۆدێرنەکان، لەڕاستیدا لێکۆڵینەوەی خودی مۆدێرنیتی هیچ ئەگەرێك ناخاتە بەردەستمان جگە لە وردبوونەوە لەم ڕەخنە توندە لە بنەماکانی، تەنانەت ئەگەر لەگەڵ گوتاری پۆست مۆدێرنیشدا هاوبیر نەبین. نووسەرێکی ئەمەریکی لەکاتی نووسینی ئەم ڕستانەدا کە دەیهێنمەوە، هیچ بەینێکی لەگەڵ پۆست مۆدێرنیزم دا نەبوو، کاتێك باسی مۆدێرنیتی ئەکا، قسەکانی ئاشنا دێنە بەرگوێ:

(ئەمڕۆ جۆرێکی زیندوو لە ئەزموون هەیە، ئەزموونی شوێنو کات، خودو ئەوی دی، تواناکانو مەترسیەکانی ژیان کە لەنێوان ژنانو پیاوانی دنیادا هاوبەشە. من ئەم جۆرە ئەزموونە ناودەنێم: مۆدێرنیتی. مۆدێرن – بوون واتە


جیمس جۆیس

خۆمان لە فەزایەکدا بدۆزینەوە کە بەڵێنی مەترسیەکان، دەسەڵات، شادی، پەرەسەندن و گۆڕانکاری ئێمەو دنیا، دەدات. و لەهەمان کاتدا یانی ئێمە سەرقاڵی وێرانکردنی هەموو ئەو شتانەین کە بۆمان دابین کراوەو لەبارەیانەوە [شتێك] دەزانین، یان بە خۆگونجاندن لەگەڵیاندا، دەژین. دەورووبەرو ئەزموونی مۆدێرن سەرجەم سنووره جوگرافیاییی... و چینایەتیو نەتەوایەتی، دینیو ئایدیۆلۆجیەکان، تێك دەشکێنێ. بەم مانایەش دەتوانین بڵێین مۆدێرنیتی سەرقاڵی یەکگرتووکردنی سەرجەم مرۆڤەکانە، بەڵام ئەمە یەکێتیەکە لە بونیادی خۆیدا ناکۆکی تێدایە. یەکێتیەکی یەکنەگرتووە، ئێمە بەرەو گێژەڵووکەی لێکهەڵوەشاندنەوەو دیسان فۆرمەلەبوونی بەردەوام، خەبات و دژایەتی، ئاڵۆزی و دڵەڕاوکێ پاڵ پێوەدەنێ. مۆدێرن.. بوون یانی بەشێك لە دنیاییبوون کە

بەوتەی مارکس تیایدا هەرشتێکی قورس لەناو فەزادا مەلەدەکات).[١٢]

- پێدەچێ گرنگترین کارایی (پۆست مۆدێرن) لە سەرنجی یەکەم دا ئەوەبێت کە ئەو هەلەمان بۆ دەڕەخسێنێ [تابتوانین] (لایەنی کەم لە هەندێ بابەت و هەندێ جاردا) کۆمەڵێ شتی جیاواز پێکەوە کۆبکەینەوە.. ئەو شتانەی کە بەرهەمی مۆدێرنیتین، بەڵام پێکەوە لەجێگەیەك دا کۆنابنەوەو ناپێورێن و ناناسرێن. بەم مانایەش پێدەچێ پۆست مۆدێرن توانای ئەنجامدانی کارێکی هەبێت کە بیریارانی مۆدێرن ناتوانن ئەنجامی بدەن، ئەمە لایەنی پۆزەتیفی بەکارهێنانی پۆست مۆدێرنە. بەڵام لەڕاستیدا خودی نووسەران و بیریارانی پۆست مۆدێرن بەردەوام لە کۆشەی بەکارهێنانی سلبی یان نیگاتیڤەوە پۆست مۆدێرن بینائەکەن. ئەمەش تاڕادەیەك دەرئەنجامی [illegible]گاری (مەرجەکانی پۆست مۆدێرنە). واتە سەردەمی قەیرانی مۆدێرنیتی [کە تیایدا] بێ توانای (نموونەیەکی سەرەکی و یەکتا) ئاشکرابووە، بەڵام هێشتا بیریارانی پۆست مۆدێرن ناتوانن کارێکی دی لەجێی ئەوە ئەنجام بدەن، یان تەنانەت ئەڵتەرناتیڤێك دابهێنن. پورتوگزی [ئەندازیار]ی میعماری پۆست مۆدێرنیستی ئیتالی، شیعری شاعیرێکی هاوڵاتی خۆی هێناوەتەوە کە ناوی (مونتاله) یە: (کلیلێك / لە ئێمە داوا مەکەن/ کە هیچ دەرگایەك ناکاتەوە/ ئێمە تەنها دەتوانین بڵێین کە چی نین/ و چ شتێکمان ناوێت..).[١٣]

دەکرێ لە هونەری میعماری (و دیارە شارسازی) دا کە بەر لە هەرهونەرێکی دی کاردانەوەی ئیجابی بەرامبەر بە پۆست مۆدێرنیتی پیشان داو دەوری هەبوو لە دروست بوونیدا، ئەو لایەنە دروستکەرو کاراییەی پۆست مۆدێرنی بەسادەتر ببینین. میعماری (تا ئەو جێگەیەی لە روانگەیەکی ستاتیکیەوە سەیری دەکەین و بەهونەرێکی دەزانین) زۆر بەرامبەر بەگۆڕانکاریەکانی مۆدێرنیزم، هەستیار بوو. یەکێك لە گرنگترین لایەنەکانی ژیانی مۆدێرن [بریتیبوو لە] ژیان لەناو شارە گەورەکان دا. پێشتر لە فەسڵی یەکەم دا بینیمان کە کۆمەڵناسێکی وەك (سیمیل) [چۆن] لەم بارەیەوە لێکۆڵینەوەی گرنگی ئەنجام داوەو دەست پێشخەری باسێکی گرنگ بووە لەکۆمەڵناسیدا، خاڵێکی گرنگ کە دەبێت لێرەدا ئاماژەی بۆ بکەین ئەوەیە کە لایەنی بەکارهێنان و عەمەلی میعماری لە هەموو هونەرەکانی دی زیاترە (و هەر لەبەرئەمەش کە ژمارەیەك لە جوان - ناسەکان بەتوندی نکوڵی لەوە دەکەن کە میعماری هونەرێك بێت). میعماری بەو مانایەی کە لە وشەی یۆنانی تخنە دا هەبوو، خوڵقاندن و داهێنانە، هەم بۆ تێرکردنی نیازەکان (تەنانەت دەکرێ بڵێین نیازە سەرەتاییەکان) فۆرمەلە بووەو بەبەکارهێنانی ئامێر، سەودای گەیشتن بە ئامانجێکی کەم تا زۆر دیاریکراوی هەیەو هەم پشت ئەستوورە بە نەخشەیەکی هونەری، واتە پەیوەستە بە رێسا ستاتیکیەکانەوە. میعماری لەبەر ئەم لایەنە تەکنیکیەی خۆی (لێرەدا تەکنیکم بەهەمان ئەو مانایە بەکارهێناوە کە هابرماز مەبەستێتی) هونەرێکی عەمەلیە، هەرچەند دەکرێت لە مێژوودا چەند ساتەوەختێکیش بدۆزینەوە کە کەمتر سەرنج لەم حاڵە دراوە. هەر لەبەرئەم خەسڵەتە عەمەلی یان فونکسیونلی میعماریە، ئەم هونەرە کە پەیوەستە بەژیانی رۆژانەو پێداویستیەکانیەوە، زیاد لەهەر هونەرێکی دی ئاستی لێکۆڵینەوەی لەبارەی بێتواناییەکانی مۆدێرنیزمەوە، کردەوە، میعماران یەکەم هونەرمەند بوون کە تێگەیشتن چیدی تازەگەری و نوێکردنەوە لەخۆیان دا بە بەهایەك نازمێرن. لەمەش گرنگتر سەرەتا میعمارەکانی پۆست مۆدێرنیست بوو بوون کە [illegible]

لەسەر ئەوە داگرت کە ئێمە هەنووکە ڕووبەڕووی (نەریتی مۆدێرنیزم) ڕاوەستاوین کە چیدی خاوەنی ئەو زیندوویی‌و کارایییەی میعماری مۆدێرنی سەرەتای سەدەی بیست نیەو لە ئاستی تیوری‌و پراکتیك دا باوەڕی بەو دوگمایانە هێناوە کە لەگەڵ ژیانی ڕاستەقینەو ڕۆژانەی خەڵك دا، ناگونجێ.

چ شتێك لەنێوان میعمارانی مۆدێرنیزمدا، تەنانەت لە ڕۆژەکانی کارایی‌و دەسەڵاتی مۆدێرنیزمدا، هاوبەش بووە، چ شتێك (ڤالتر گروپیوس)، (لوکوز بوزید)، (لودڤیك میس وان درروە) ی بەدەر لە جیاوازیی تیۆری‌و پراکتیکیەکانیان - لەیەك نزیك دەکردەوە؟ ئەو ئایدیا هاوبەشەی کە ئەوانی پێکەوە گرێ دەدا هەرئەوە بوو کە ناویان نا (ئایدۆلۆژیای میعماری مۆدێرن). بیرۆکەی مۆدێرنیزم کە خۆی گۆڕانێکی بنەڕەتی بەسەر میعماری کلاسیکی ئەوروپایی - ئەمەریکیدا هێنا، ئەمەبوو: بیناکە بۆ سادەترین ڕەگەزەکانی کورت بکەینەوە، هەبوویەتی [موجودیت] فەزای بیناکە چڕبکەینەوە لەسەر ناوکی سەرەکی [نەخشەی بیناکە].

بناغەی یەکپارچەی سەرجەم بەشەکانی بیناکە بەهۆی سادەترین شکڵەکانەوە، دابنێین، خۆمان لە جوانکاری‌و تەنانەت یەك فۆرمی زیاد (کە بەکەڵك نایەت) دووربخەینەوە، شتە زیادە دیداری‌و نمایشیەکان وەلاوە بنێین. بەکورتی هەوڵ بدەین بەو شتانە بگەین کەکاری سەرەکی بیناکە زامن و نمایش دەکات. ئەو حوکمە سەرەکیەی کە هەندێ جار بەشێوەی جیاواز دەردەبڕرا، بریتیبوو لە: جوانی هەمان کردارە. جوانی شتێکی زیادە نیە، واتە شتێکی زیادە بۆکردار نیە. هەمیشە ڕووکردنە سادەکردنەوە خۆی لەخۆیدا (فۆنکسیونالیسم) ە.[*] دەبێت هەموو شێوەیەکی جوانکاری بەبیانووی ئەوەی کە (بەکەڵك نایەت) واتە دەورێکی تایبەتی نیە، وەلاوەبنرێ. بنەمای کورت کردنەوە، گەیشتنە بە کەمترین مادەی دەربڕین بۆ تێگەیاندنی باشتری پەیام.

دەکرێ ئەم ئاڕاستەیە بەرەو سادەیی و فۆنکسیونالیسم لەبەرهەمە هونەریەکانی (میس ڤان درروە) دا، بدۆزینەوە. کەسێك کە بەڕاشکاوی وتبووی لەهەرجێیەك شکڵێك بەکارهات، دەبێ بەکەڵکی شتێك بێت. بناغەی ئەم فۆنکسیونالیزم و زیادەڕەوییە لە سادەییدا، شێوەیەکی دەربڕینی عەقڵ باوەڕی، ئامێری، مۆدێرنیتە، شێوەیەك کە لەسەر بناغەی [بڕوانەبوون بە] کردارە گۆڕانکارەکانی خود، ڕاوەستاوە. ئەم عەقڵباوەڕیە نەیدەتوانی جیا لەو دەسەڵاتە بێت کە هاوڕێ‌و پەیوەستە بەزانینەوە. لێرەوە قسەی نەوتراوی میعماری مۆدێرن بریتیبوو لە: دەبێ بەو شکڵانە بگەین کە ئەو کردارانە دەردەخەن کە بەسود [یان زامنی] هاتووچۆی سەرمایەن. لەڕاستیدا کاتێ لوکور بۆزی دەینووسی (ئەخلاقی پیشەسازی گۆڕاوە: ئەمڕۆ کارخانە مایە گەورەکان گۆڕراون بۆ ڕێکخراوی تەندروست‌و ئەخلاقی)[14]، [هەمان] ئایدیۆلۆژیای مۆدێرنیتی دووبارە دەکردەوە، ئەو شتانەی لەگوتاری میعماری مۆدێرن دا بەیەکێتی، ناوکی سەرەکی، یەکپارچەی ڕەگەزەکان ناو دەبرا، دەربڕینێکی تری ڕێسا سەرەکیەکانی عەقڵ باوەڕی مۆدێرنیتی بوون کە بە پەیوەندییان لەگەڵ دەسەڵاتدا، بەپێچەوانەی خەیاڵی مۆدێرنیزمەکانەوە، ئیمکانی درێژەدان بە ژیانیان بە سیستمێکی (نامرۆڤانە) دەدا. بەدەربڕینێکی

---

(*) فۆنکسیونالیزم = الوظیفیة: قوتابخانەیەکی کۆمەڵناسی ئەمریکیە کە (تالکوت پارسونز) و (ڕوبرت میرتون) بەنوێنەری سەرەکی لەسەردەمی هاوچەرخ دا دادەنرێن. یەکێ لە تێزە سەرەکیەکانی ئەم قوتابخانەیە ئەوەیە کە هەر سیستمێك لە پەیوەندی نێوان بەشەکانی پێك دێت‌و هەموو ئەو پەیوەندییانەش وە بایەخیان وەك یەکە بۆ پەرەسەندن‌و کارکردنی سیستەمەکە. هەروەها لەم قوتابخانەیەدا مانەوەو بەردەوامی سیستمێك بەهۆی دەرئەنجام و وەزیفەکانیەوە تەفسیر دەکرێ.. (وەك)

فەلسەفییانە ئەم عەقڵباوەڕیە پشت ئەستوور بوو بە خەیاڵی ئامادەبوونی مانایەکی یەکتاو ناعاقڵانە. میعمارێك کە گەورەترین میعمارەکانی مۆدێرن بوو واتە (فرانك للوید رایت) (کە لە سادەکردنەوەدا پێش هەموان دەکەوت) گوتبووی کە (یەکێتی بینا) لەسەرچاوەیەکی عاقڵانەوە دێت. لوکور بوزیە، دەساڵ دوای ئەوە کە ستایشی (کاپیتۆڵ) مایکل ئانژی لەڕۆما دەکرد، نووسی کە (لێرەدا یەکێتی دەروونی) مانای بە سیمای دەرەکی بەخشیوە، ئەو نمونەی گەردیلەی هەوای هێنایەوە کە بەهۆی پەستانی هەواو پەیوەندیە دەروونیەکانەوە، شێوەیەکی دەرەکی هەیە.[١٥] لەڕاستیدا کاتێ میس ڤان دروە دەیگوت کە شکڵ دەبێت لەگەڵ (ڕۆحی زەمانە) دا بگونجێ (ئەو خۆی وشەی هیگڵی بەکارهێناوە Zeitgeist) قبووڵدیدەکرد کە ڕۆژێکیش دێت میعماری مۆدێرن لەگەڵ سەردەمەکەیدا نەگونجێ. ڕۆژێك کە بەپێی وتەی لیوتار ئەوەندەش دوورنەبووە.

چارلز جنکس لەسەرەتای دەیەی ١٩٧٠ دا لەنەخشەی میعماریەکانیو لەکتێبەکەشیدا: (واتە) (زمانی پۆست مۆدێرن لە میعماریدا) رەخنەی لەم بنەما عەقڵانیەی شکڵی سادە گرتووە. ئەو رەخنەی لەو شکڵە یەکتایە گرت کە لەسەر بناغەی (ناوەڕۆکێکی باڵادەست) دروست دەکرێتو دەسەڵاتی خۆی لەسنوردارکردنی دەلالەتەکانەوە بەدەست دێنێو نووسی لەڕاستیدا لەم شەشە پاڵووە لاکێشەییە شووشەییە مۆدێرنانەدا کەگوایە یەکێتیەکی ئۆرگانیکیان هەیە، ئەوەی بوونی نیە جیاوازیە. جنکس بەرگری لە هەمەڕەنگی کردو گوتی هیچ پێویست نیە کە بەردەوام هەمان مانای دووپارەبووەوە، لە شکڵە یەکسانەکان دا پێشکەش بکرێ، ئەم خاڵە لە هەموو شتێ زیتر لەگەڵ ژیانی ئەمڕۆدا ناگونجێ. لەڕاستیدا هەمەکیەك (کلي) کە خاوەنی هاوڕێکی [انسجام] و یەکێتی ئۆرگانیکی بەشە جیاوازەکانی نەبێت، هەمەکی نیە، ئەو بەشێوەی فەیلەسووفانی پۆست مۆدێرنیزم پرسی چ گرفتێك لەوەدا هەیە کاتێك یەکێك بەرەورووی بینایەك، یان کۆمەڵێ بینا (نەخشەی گەڕەکێك، کۆمەڵگایەکی نیشتەجێ، کۆمەڵگایەکی کلتوری) دەبێتەوە، هیچ وێنایەکی لە کەماڵو کۆتایی هاتنی مانای لە خەیاڵ دا نەبێت یان بەدەرئەنجامێکی وا نەگات؟ ئەو نووسی کە میعماری مۆدێرن لەترسی ئەم بێ کۆتاییە مانا، وێنایەکی (تصورێکی) هەڵەی بۆ کۆتایی و کەماڵ دروست کردو هەر لەبەرئەوەش بچوکترین رەگەزی جوانکاری وەلاوە نا کە رتوشێك لەم بیرۆکەیەدا دروست دەکات. جنکس پێی لەسەر ئەوە داگرت کەهەرگیز ناکرێت بەو دەلالەتە پەتیە بگەین کە ئارەزووی مۆدێرنیزم بوو.[١٦] لەبەرئەو هۆیە سادەیەی کە هیچ کاتێ ناتوانین بڵێین گەیشتووینەتە هەلومەرجێك کە هیچ دەلالەتێکی شاراوەو ناواخنی، بوونی نیەو ئەوەی کە هەیە [تەنها] یەك مانای روونو دیاریکراوە. لەڕاستیدا ئەو گرفتەی لەم سادەکردنەوەیە لە میعماریدا دروست دەبێت، ناگەڕێتەوە بۆ هەوڵ دان بۆ دەست گەیشتن بە بەیانێکی تەجریدی، بەڵکو دەگەڕێتەوە بۆ تێنەگەیشتن لە شکڵی واقعیو هەبووی پەیوەندیکردن. دەبێ ئەمڕۆ باس لەشێوەیەکی تازەی پەیوەندی مرۆیی بکەین (بەبەراورد لەگەڵ شێوەی سەرەتایی پەیوەندیەکان لەسەرەتای شۆڕشی پیشەسازیدا). شکڵی سادەی مۆدێرنیزمی زادەی تێگەیشتنی سادە خوازە کە سەرچاوەکەی دەگەڕێتەوە بۆ سەردەمی شۆڕشی پیشەسازی. دەکرێ ئەوە ببینین کە پەیوەندیەکی راستەوخۆ لەنێوان دەسەڵاتو عەقڵباوەڕیدا هەبوو کە لەم تێگەیشتنە سادە خوازو لە میعماری مۆدێرندا، دەرکەوت. رابرت

ڤنتوری کەمێك پێش بڵاوبوونەوەی کتێبەکەی (جنکس) لە کتێبێك دا کە مۆزەخانەی هونەرە مۆدێرنەکانی نیویورك چاپی کرد، و ناونیشانی بریتیبوو لە (ئاڵۆزی و دژایەتی لە میعماریدا) [١٩٦٦] ئاماژەی بۆئەم خاڵە کرد.[١٧] ئەو نووسی بنەمای میعماری مۆدێرن بیرۆکەیەکی کۆنە (و کە چیدی نەماوە) لەپەیوەندی مرۆیە، رەگەزی سەرەکی لەو شتەی کە ڤنتوری بە (دەربڕینی مۆدێرن) و جنکس بە (زمانی میعماری مۆدێرن) لە قەڵەمیان داوە (بەپێچەوانەی خەیاڵی خودی میعمارانی مۆدێرنیزمەوە) (نمونەکان یان شکڵە پەتیو تەجریدیەکان) نیە.

رەگەزە بونیادیەکان ناتوانن وەك رەمزی سەربەخۆ و رێك، رێکەوتننامەی کاریکەن. (ئەو سادەیی شکڵانە) زادەی دەست گەیشتن بەبەیانێکی تەجریدی نیە کە گروپیوس بڕوای پێبوو، ناشتوانێ ببێ. جنکس لەسەرشێوەی سیستمی زمانەوانی سۆسێر، باسی زمانی میعماری کردووە کە تیایدا رەگەزەکانی ئاماژە لەو پەیوەندیەوە مانا وەردەگرن کە پێکەوەیان دەبەستێ. (واتە لەسەر بنەمای رووبەڕووبوونەوەکان، لێکچوونەکان)، لە بینایەکدا کە هەموو شتێك تیایدا ئەندازەی زیادڕەوی سادە کراونەتەوەو تەنها ئاشکراکەری کردارەکانە، بەرامبەرەکان [متقابل] لەناو ناچن، بەڵکو تەنها نمایش ناکرێن. کاری میعماری دروست کردنی پەیوەندیە لەنێوان (شوێن ژیانو مرۆڤ) و (مرۆڤ و مرۆڤ) دا. رەگەزەکانی میعماری پۆست مۆدێرن لە خەسڵەتی پەیوەندی میعماریو لەڕاستیدا لەشێوەی تازەی پەیوەندی تاکەکەسەکان، سەرچاوە وەردەگرن. [واتە] هەمان ئەو خەسڵەتەی کە لە میعماری مۆدێرن دا نکوڵی لێدەکرێ. خاڵی گرنگتر ئەوەیە رەگەزەکانی بیناو ئەنجامی کارەکە دەکەونە بەردەم تەفسیرە جیاوازەکانو بەردەوام بەپێی تێگەیشتنێکی تازە بۆ ئەو (یاری زمان) ەی کە خۆیان لەناویدا فۆرمەلەبوون، راڤەدەکرێنو دەهێنرێنە ئاراوە.

میعماری پۆست مۆدێرن لەسەر بنەمای هەمەڕەنگی، گۆڕانکاری و جیاوازی، دروست دەبێت. بناغەکەی جیابوونەوەی شکڵە لە کردار. (سوود وەرگرتن لە جوانکاری) کە لەم میعماریەدا باوە، لە میعماری مۆدێرن دا بەگوناهێکی نەبەخشراو، دەژمێررا. لە میعماری پۆست مۆدێرن دا زهنێکی خولقێنەر یان ئەوەی لوکوربوز بە (داهێنانی پەتی زیهنی) ناو دەنا، جێی خۆی دەدا بەپەیوەندیەکی هاوتای لەنێوان میعمارو ئەوەی سوود لە بیناکە وەردەگرێ. لە میعماری مۆدێرندا یەك میعمار کاردەکات کە بەتەواوی پسپۆڕ، وردو تەکنیکیە، بەڵام لە میعماری پۆست مۆدێرندا، میعمار ناتوانێ بێ پەیوەندیەکی هەمیشەیی لەگەڵ ئەوانەی سوود لە بیناکە وەردەگرن، کاربکات. ئەو کرداری بیناکە (پێشبینی ناکات) بەڵکو بەردەوام لەکاردا بەرەو روویەتی. ئەو ناونیشانی کردار بەشکڵێکی تەجریدی نابەخشێ، بەڵکو لەسەر بنەمای پێداویستیە مرۆییەکان (و یەکێك لەو پێداویستیانە، پێویستی ستاتیکیانە بە (شتێکی بێ کەڵك)ە نەخشەکەی دەگۆڕێو لێرەوە بیناکەی ئەو لە قۆناغی کۆتاییدا تەنها وەڵامدەرەوەی پێداویستیەکان نیە، بەڵکو خولقێنەری پێداویستی تازەو دەربڕی پێویستی پەیوەندیمرۆیی تازەیە. نموونەی بەشداری (خەڵکی ناوچەیی) لە دروست کردنی پرۆژەکانی خانوودا (و لەنوێ کردنەوەی گەڕەكو خانووە کۆنەکان دا) لە میعماری پۆست مۆدێرندا، کەم نیە.

خاڵێکی گرنگی دی ماوەی نێوان میعماری مۆدێرنو پۆست مۆدێرن، زیاد دەکات. میعماری مۆدێرین هەوڵ ئەدات بەشێوەیەکی رەها

لەرابردوو و بەشێوەیەکی کاملّو بنەڕەتی لە نەریتەکان دابڕێ. ئەو بەپێی حوکمی دێرینی مۆدێرنیتی جگە لە بێزاربوون لە نەریتو (دابڕانی ئەبستمۆلۆجیانەی کاملّو رەها) لەبەردەم خۆیدا نابینێ، ئەو هەوا ئەدات رێسا میعماریەکانی پێش مۆدێرن فەرامۆش بکاو ئەوپەڕی تەنها نرخێکی مێژوویی سنووردراوین بۆ دادەنێ. بەڵام میعماری پۆست مۆدێرن تامەزرۆی شکڵە کۆنەکانو ئەزموونە مێژوویيە جیاوازەکانەو هەندێکیان بێ هیچ ترسێك لە نەگونجان، لەبیناکەدا بەکاردێنێ. ئەم تێکەڵ کردنی شێوازانە یان ئەوەی جنکس ناوی دەنێ (وەرگرتنی رادیکالانە)[١٨] لەسە بناغەی ئەو حوکمە گرنگەی پۆست مۆدێرنە کە ناکرێ مانا ئامادەبکرێ. ناکرێ داوا لەهەموو رەگەزەکان بکرێ مل بۆیەك مانای یەکتا، بنەڕەتیو کۆتایی بدەن. بەڵام ئەمە خۆی رێسایەك نیە: بڕیار نیە کە هەر بینایەك کە لەسەر (بنەماکانی) میعماری پۆست مۆدێرن دروست دەکرێت، بەردەوام لەتێکەڵ کردنی شێوازەکان پێك بێت. بەڵام کاری میعماری پۆست مۆدێرن ئەوەیە دەری بخات هەمیشە تێکەڵ کردنی شێوازەکان ئەستەم نیە. بەهەرحاڵ نکوڵی کردنی مۆدێرنیزمەکان لەم خاڵە، کارێکی هەڵەیە. بە وتەی (پیتر ئاینزمان) لە گوتاری پۆست مۆدێرندا گوتاری بالادەست بوونی نیە. میعماری پۆست مۆدێرن هیچ رێسایەك دانانێت کە پەیرەوکردنی هەمیشەیی کارێکی ناچارانەبێت. هەمەڕەنگی نەك هەر لە بینایەکدا بەڵکو لەسەرجەم کاری میعماری پۆست مۆدێرندا، بالادەستە.

**(میتافیزیك و نهیلیزم)**

یۆئاخیم دوفلورە، بیریارو لاهوتیەك کە لەماوەی ١١٣٠ تا ١١٤٥ دا هاتە دنیاوەو لەساڵی ١٢٠٢ دا کۆچی دوایی کرد، سێ قۆناغی مێژوویی بە لەیەك جیا دەزانێ: قۆناغی باوك، قۆناغی کوڕ و قۆناغی (روح القدس)، یەکەمینی بەرۆژانی کوفرو هەروەها بەرۆژانی یەهودیەت دەزانێ، دووەمی بەرۆژگاری مەسیحیەتو سێهەمیشی بە قۆناغێك دادەنا کە تیایدا خەڵکی باوەڕ (ایمان) لە دەست ئەدەن. بالاترین پلە لە قۆناغیەکەم دا کاتێ بوو کە باوك بە (عهدی عتیق) حوکمی کرد. لەقۆناغی دووەم دا کوڕ بەهۆی کرینی گوناهی مرۆڤەکانەوە لەسەر خاچ، چارەنووسی هەموانی دەست نیشان کرد. بەڵام لەجواقۆناغ دا – کە درێژی زەمەنەکەی ئاشکرانیە – (روح القدس) لەگەڵ کفردا دەجەنگێ بەڵام شکست دێنێ، ئاخری زەمان دێتو کوڕ جارێکی دی دێتەوە. ئەم تێڕوانینە ئاخر زەمانیو مسیانیکیە بەشێوەیەکی دی لە سەدەکانی دوایدا لەبەرهەمی عارفە مەسیحیەکانو لە نووسینی عارفە یەهودیەکانیشدا، دووبارە کرایەوە. ئەمە تێڕوانینێکە هەم پەیوەستە بە قۆناغبەندی مێژووییەوە هەم ئەنجام و دوامێژوو، دەیهێنێتە پێشێ. ئەگەر چاو لەلایەنی مسیانیکی (بڕوابوون بەدەرکەوتنی رزگارکەری کۆتایی) تێڕوانینەکانی دوفلورە، بپۆشین، [ئەوا] بنەمای کارەکەی نزیکە لە ژمارەیەك وتو وێژی مێژوویی سەدەی رۆشنگەریو هەروەها نزیکە لە قۆناغبەندی مێژوویی ڤیکۆ وە، ڤیکۆش باسی سێ قۆناغی خودایی، قارەمانیو مرۆیی دەکرد کە دەبێتە هۆی لەناوچوونو میحنەتی مرۆڤەکان. بێگومان کاتێ جیمس جویس دوا رۆمانەکەی خۆی لەسەر بنەمای تێڕوانینەکانی ڤیکۆ، پێك دەهێنا چاوێکیشی لەسەر نووسینەکانی عارفی سەدەی دوازدەیەمیش بوو. بەتایبەتی ئەمرۆکە کە ئیدی ئەوە روون بووەتەوە کە سەدەکانی ناوەڕاست رێ – نمای زهنی ئەوبوون.

نیتچە لەرێگەیەکی دییەوە – جیا لە رێی ڤیکۆ، تاڕادەیەك نزیك لەجویسەوە – گەڕایەوە بۆ قۆناغبەندی دوفلوورە. ئەو وێنایەی ئەو بۆ

نەهیلیزم هەبوو، بیرخەرەوەی (سەردەمی لەناوچوونی دەسەڵاتی (روح القدس)ە. جیل دۆلۆز بە ئاماژەکردن بۆ ئەم پەیوەندیە دەنوسێت کە دەبێ سەرچاوەی ناوەڕۆکی سەرەکی فەلسەفەی نیتچە، واتە (گەڕانەوەی هەمیشەیی)یش هەر لەم باوەڕبوونە بەسووڕانی قۆناغە مێژوویییەکان، بەتایبەتی لەڕۆژگاری لەناوچووندا، بدۆزینەوە، ئەوەی دەگەڕێتەوەو زەردەشتی نیتچە هەواڵەکەی دێنێ، بابەتێکی دوویارەبووەوە نیە. بەڵکو (جیاوازیەکە کە دوویارە دێتەوە).[١٩] دۆلۆز پێشنیاری ئەوە دەکات بۆیەکجاریش بووە دەربڕینی بریندارکەرانەی زەردەشت بە جدی وەربگرین:

بڕیار نیە کە هەموو شتێك رێك وەك چۆن بوون و یەکجار روویدا، دووبارە بێتەوە. شتێکی جیاواز دێتەوە بەڵام بەپێی رێسای دووبارەبوونەوە. لێرەوە دەبینین لە پەرەگرافی دووەمی پارچەی سیانزەیەم لە کتێبی سێیەمی (زەردەشت وای گوت) دا کە ناونیشانەکەی بریتیە لە (چاك بۆوە)، زەردەشت دەمرێت و دیسان زیندوودەبێتەوە، بەڵام چیدی ئەو هەمان ئەو کەسە نیە کە پێشتر بوو. کەسێك نیە کە بۆژیانێکی دی بگەڕێتەوە، یان کەسێکی دی نیە کە بۆ هەمان ژیان بگەڕێتەوە، هەمان زەردەشتە کە بۆ هەمان ژیان دەگەڕێتەوە. زەردەشت بە جانەوەرەکانی دەڵێت:

(من دیسان دێمەوە، بەم خۆرەوە، بەم زەویەوە، بەم داڵەوە، بەم مارەوە، بەڵام نەك بۆ ژیانێکی نوێ، یان ژیانێکی باشتر، یان ژیانێکی لێکچوو، من نەمرانە هەر بۆ ئەم و ئەم ژیانە یان بۆ گەورەترین و بچوکترین شتەکانی، دەگەڕێمەوە، بۆئەوەی جارێکی دی گەڕانەوەی نەمرانەی هەموو شتێك، فێر بکەم).[٢٠]

دۆلۆز ئاماژە بۆ حوکمەکەی دانسی ئوسکوتلەندی دەکات (هەموو شتێك لەنێوان دوو جیاوازیدا روونەدات).[٢١]

خوازە شکلێکی جیاوازیە. جیاوازی نێوان مانای زمانی و مانای خوازەیی. شیعروتن شکلێکە لەجیاوازی دانان: لەنێوان جیهانی عاقڵانەو جیهانی شاعیرانەدا. لەنێوان دنیایەك دا کە عەقڵ سنوورەکانی دەست نیشان کردووەو دنیایەکیش کە شیعر (یان دامێنان) بێ سنووری کردووە. بەڵام شیعر دەری دەخا کەلەناو خودی زمان دا جیاوازیەك هەیە کە لە (زمان و جیهانی عاقڵانە) شدا بەهەمان دەسەڵاتەوە کاردەکات کە لە شیعردا هەیەتی. ئێمە لە دنیادایین بەڵام بەپاراستنی دوورییەکەوە لێی، بەجیاوازیەکەوە کە خۆمان هۆشیارین پێی. بە وتەی دۆلۆز کەسێکی دی لە دەروونی ئێمەدایە، کەسێکی دی کەماوەی لەگەڵماندا هەیەو هەمیشە لەدەروونی ئێمەدا بیردەکاتەوە. کەوابوو گەڕانەوە بۆ (هەر ئەم و هەر ئەم جیهانە) هیچ نیە جگە لە گەڕانەوە بۆ شتێك کە لەگەڵ جیهان دا ماوەی هەیە، هەمان (شت) نیە، (بەڵکو) جیاوازە.

مارتین هایدگەر دەپرسێت (زەردەشتی نیتچە کێیە)[٢٢] زەردەشت بەو شێوەیەی لەهەرپارچەیەکی کتێبەکەوە دەیزانین پەیام هێنەرو مژدەهێنەرو، هەواڵ هێنەرێکە. ئەو هەواڵ لە شتێکەوە دێنێ، پێغەمبەرێك نیە کە بلێت هەواڵ لەحەقیقەتەوە دێنم، (بەڵکو) سواڵکەرێکە، بەرگریکەرێکە، بۆ بەرگریکردن لە شتێك (بۆ شتێك) هەواڵ دێنێ و لەڕاستیدا بۆ رەوایەتی بەخشین بە شتێکە کەکاردەکات... واتە هەواڵ دێنێ. زەردەشت بەیانگەرە (Fur Sprecher)، بەرگری کەرە (Fursprech). قسەکەرێکە کە راڤەدەکات، روونی دەکاتەوە، هەم پەیام هێنەرە هەم شیکارکار، هەم تەفسیرکارەو هەم پەیامدەر. بۆ بەرگریکردن لە شتێ قسەدەکا. لە چ شتێك؟ هەواڵی گەڕانەوەی نەمرانەو سوپرمان دێنێ و بەرگرییان لێدەکات.

زەردەشت – بەدەربڕینی هایدگەر – فێرکاری ئەخلاق نیە، بەڵکو فێرکاری میتافیزیکە، ئەو

هەواڵی (رزگاری) ئێمە دێنێ. واتە [هەواڵی] ماوەی ئێمە لەگەڵ ئەوەدا کە هەیە. هەواڵی دژێتی (ضدیت) ی ئێمە دێنێ.. لەگەڵ ئەوەی کە بە (Widerwill) یا (دژە ئیرادە) ناو دەنرێ. رزگاری ئێمە، رزگاری لە ئیرادە نیە: زەردەشت ئیرادە بە (بنەمای بوونی ئێمە) دەزانێت و واش پێناسی دەکات. ئیرادەی هێز بە ئازادی دەناسێ‌و دەیناسێنێ بەڵام:

بەڵام زەردەشت وەك پێغەمبەرە کۆنەکان واناکات. ئەو پەیام دێنێ بەڵام نەك لە هێزێکی باڵاترەوە یان لەخواوەندەوە، ئەو خۆی بەبەرزتر، بەتواناتر، داناتر لەو وانانەی کە دەیڵێتەوە، پیشان نادات. ئەو تەنها داوامان لێ‌دەکات (لەو کەسانەی کە فێریان دەکات) بۆئەوەی زیاتر بڕۆین. بەزمانی هایدگەر زیاتر بڕۆین، [واتە] Uber بڕۆین. هایدگەر دەڵێت: زیاتر لەو پردەبڕۆین کە هەنووکە لەسەری راوەستاوین. هایدگەر باسی پرد زیاتر دەکات: پرد (زەمەنە)و ئێمە خەڵکەکانین (Menchen). خەڵکین کە تێدەپەڕین، دەبێ لەپردەکە تێپەڕین‌و زیاتر لەوە بڕۆین و ببین بەخەڵکانی تێپەڕیو Ubermenchen .[٢٣] واتە ببین بە سوپرمان. ئەم مرۆڤە تێپەڕیوە لەپردی زەمەن، ئەم سوپرمانە، بەمانای رەگەزێکی باڵاتر لە مرۆڤ نیە، [بەڵکو] تەنیا کەسێکە کە لەپرد پەڕیوەتەوە. کەسێکە کە لە کۆت‌و بەندی زەمەن رزگاری بووە. لەپرد پەڕیوەتەوەو بەڵام ئاسمانی سەری هەر هەمانەکە بوو ئاسمانێك کە هاوبەشە لەنێوان پردو پاش پردا (زیاتر لەپردا).

ئاشکرایە کە نیتچە زەردەشت نیە. نیتچە پرسیارکەرە، کەسێکە کەبوونی ناچارە بۆئەوەی لە شوناسی زەردەشت بپرسێ. پرسیارکردن کاری ئەوە. هایدگەر ئەڵێ: نیتچە هیچ هەوڵی نەدا گوتاری خۆی لە داوی میتافیزیك رزگار بکا. لێرەوەیە کە هەمیشە بەراوردی زەردەشت لەگەڵ پێغەمبەرانی (عەهدی عەتیق) دا (و بۆچی لەگەڵ پێغەمبەرانی (عەهدی جەدید)یش دا؟ نا) دێتە پێشەوە نیتچە دەپرسێ شوناسی زەردەشت چیە:

تەنانەت ئێوەش رەنگە لەخۆتان پرسی بێت (زەردەشت بۆئێمە کێیە؟ دەبێ چی ناو بنێین؟) و (ئێوەش وەك من بەپرسیارەکان وەڵامی خۆتان داوەتەوە: ئایا مژدە بەخشێکە؟ یا بەئەنجام گەیەنەرێ؟ سەرکەوتوویەك؟ یا میراتگرێك؟ چارەسەرکراوێك یان پزیشکێك؟ ئایا شاعیرێکە یا گەڕیدەیەکی حەقیقەت؟ رزگارکەرێکە یا کۆیلەکەرێك؟ پیاوچاکێکە یان خراپکارێك؟).[٢٤]

زەردەشت پێشتر، ساتەوەختی پێشتر، خۆی گوتوویەتی:

(بینەرێك، خوازیارێك، داهێنەرێك، خۆی هەم ئاییندەیەك و هەم پردێ بۆ ئاییندە و هەروەها داخەکەم وەك دەستەوسانێك لەسەر ئەم پردە ماوەتەوە: زەردەشت هەموو ئەمانەیە)[٢٤]

گوتاری پۆست مۆدێرنیش لەمە زیاتر ناڵێت: مۆدێرنیتی هەمان پرد (زەمەن) ە پردێك بۆ ئاییندە، یان دەڵێن کەوایە. ئێمە کێین؟ دەمانەوێ لەپردەکە تێپەڕین، ببین بە سوپرمان، (واتە) کەسێك کە زیاتر دەڕوات. دەمانەوێت وەك بینەرێك بین بەڵام خۆمان بەپردێك بۆ ئاییندە دەزانین. هەرچیەك دەڵێین لەولاوە بوەستێ، ئێمە جگە لە کەسێکی دەستەوسان کە لەسەر پردەکە ماوەتەوە، زیاتر نین. رێگایەکمان بۆئەولا، بۆ زیاتر نیە.

گوتاری پۆست مۆدێرن بانگەشەی ئەوە ناکات کە ئەولایە، خۆی لەگەڵ ئەوشتەدا کە مۆدێرنیتی دەبێت پێ‌ی بگات (یان بانگەشەی ئەوە دەکات کە دەبێ – یان دەتوانێ – پێ‌ی بگات) بەیەك شت نازانێ. گوتاری پۆست مۆدێرن زیاتر لەدەوری (خوازیارو بینەرێك) دا دەردەکەوێت، واتە خۆشی دەستەوسانێکە، ماوەتەوە لەناوەڕاستی پردەکەدا. ئەوەی پۆست

مۆدێرن دەڵێت لەمە زیاتر نیە: لە پردیش کە تێپەڕیت، چی لەسەر پەناهەکەت دەکەیت؟ خۆ ئاسمانی هەردوولای پردەکە هەریەکێکە. زیاتر دەڕۆی لەپردی (زەمەن) دەپەڕیتەوە، بەلام خۆ لە ئاسمان بەرزتر ناڕۆی. لەسەر رووبەر دەچیتە پێشێ بەلام خۆ لەقەبارەدا سەرناکەوی، خۆ نابیت بەسوپرمان. بانگەشەی مۆدێرنیتی پڕوپووچە. تەنانەت ئێستاش کە وەك دەستەوسان لەناوەڕاستی پردا راوەستاوە، هەر واز لە بانگەشە ناهێنێ. قسەکردن لەبارەی قەیرانەوە (قەیران گرنگترین وشەیە لە فەرهەنگی زمانی پۆست مۆدێرنیتیدا)، [بریتیە] لەهەوڵدانێك لەبارەی مانەوە لەسەر پردەکە، زەردەشت دەڵێت: (ئاە، هەر زیندانیەك شێت دەبێت... تووڕەیی ئەو لەبەر ئەوەیە زەمەن ناگەڕێتەوە بۆدواوە. (ئەوەی بوو) ئەمەیە ناوی ئەو بەردەی کە ئیرادەی ناتوانێ بیجولێنێ).(٢٥)

ناگەڕێینەوە. ناتوانین بگەڕێینەوە، ئەو تۆمەتەی هابرماز بۆ فکرو گوتاری پۆست مۆدێرنی دروست ئەکات، نەك ئەوەی بەزمانی بیریارانی پۆست مۆدێرن رەت بکرێتەوە، بەلکو خۆی لەخۆیدا دەڕمێ: کەس ناتوانێ (و لەم بارەیەشەوە نایەوێت) بگەڕێتەوە. بەلام کەسێك هەیە کە دەڵێت: لەبەرەوپێش چووندا چ مەترسیەك هەیەو لە بانگەشەی پێشرەوانیشدا چ مەترسیەك شاراوەتەوە. ئیرادەی ئازادی بەخش، ئیرادەی پێشکەوتن، لەبەرئەوەی ناتوانێ ئەو بەردە بجوڵێنێ، دەبێت بە ئازاردەر. ئیرادە لەگەڵ زەمەن دا دوژمنی دەکات، ئیمڕۆی ئێمە لەدوێنێمان دەچێت، بڕیاربوو بەیانی دوێنێی ئێمە بگۆڕێت، شتێکی دی بێت، بەلام نەبووە بە شتێك جگە لە ئەمڕۆ. کەوابوو بەلگە چیە سبەینێی ئێمە، سبەینێی ئەمڕۆمان، باشتربێت لەمڕۆ؟ هایدگەر دەڵێت: بەم شێوەیە زەردەشت (لەبڕوای خۆیدا بەسوپرمان و بەئەم بڕوایە، وانەی گەڕانەوەی ئەمرانەی شوناس دەڵێتەوە).(٢٦) لیوتار چەندان جار بەدڵنیاییەوە گوتوویەتی‌و نووسیویەتی کە نابێت گوتاری پۆست مۆدێرن و نهیلیزم بەیەك شت بزانین، تا ئێرەش بینیمان کە باسی ناوەڕۆکێکی تری ئەندێشەی نیتچەیە: گەڕانەوەی ئەمرانە. ئێستا بەهۆی هایدگەرەوە دەبینین کە چۆن باسی نهیلیزم، ئێمە بەرەو (ناوەڕۆکێکی دی) رادەکێشێ.

نووسینی (تێپەڕین لە هێڵ) ی ئەرنست یونگەر بۆ خوێنەری فارسی زمان ئاشنایە، زیاد لە سی ساڵە بۆ فارسی وەرگێڕاوە(٢٧) و لەم ماوەیەدا چەندان جار چاپ کراوەتەوە، یونگەر لەم نووسینەدا باسی (نهیلیزمی کاملی) کردو پرسی ئایا ئێمە بەجێمان هێشتووە یان نەء؟ هایدگەر لە وتاری (مەسەلەی بوون) ١٩٥٦(٢٨) دا کەبەبۆنەی یادی شەست ساڵەی لەدایکبوونی یونگەرەوە نووسیبووی: گەڕایەوە بۆ پرسیارەکەی یونگەر:

(راپۆرتەکەی ئێوە لەبارەی هەلومەرجەوە لەدوای ئەو ئاماژانەوە دێت کە دەری دەخەن ئایا ئێمە لە هێڵەکە تێپەڕیوین یان تا چ رادەیەك جێمان هێشتووەو پێمان ناوەتە دەرەوەی ناوچەی نهیلیزمی کامڵەوە. لەناونیشانی نووسینەکەتان دا Uber die Linie وشەی Uber بەمانای جێهێشتن‌و تێپەڕینە. لەگەڵ هەموو ئەمانەش دا Uber لەوئاماژەیەدا کە دێت بەمانای (لە) بەکاردەهێنرێ. باسکردن لەهێڵو لەناوچەی نهیلیزمی کامڵ. ئەگەر ئێمە لەوێنەی هێڵ وردبینەوە، دەبینین کە هێڵ فەزایەك رەسم دەکات کە بە فەزایەکی دی دیاری دەکرێ. فەزا لەیەك کۆدەبێتەوە. لەیەك کۆبوونەوە سەرپەناهێکە بۆهەرچیەك کە پێکەوە کۆدەبنەوە. سەرچاوەی جەوهەری نهیلیزم و بە کەماڵ گەیشتنی، لەدەرەوەی شوێنی هێڵ، دەست پێ دەکات).(٢٩)

یونگەر باسی تێپەڕین لە هێڵ دەکاتو هایدگەریش باسی خودی هێڵ [دەکات]. لای هایدگەر فەزایەك بوونی نیە لەدەرەوەی فەزای نهیلیزمێك کە خۆی کامڵ دەکات. دەکرێت پێش کێشانی هێڵ باس لە پەیوەندی مرۆڤ بە نهیلیزمەوە بکەین. خاڵی گرنگ هەنگاونان نیە بەرەو ئەویەری هێڵ، [چونکە] ئەمە یانی ڕۆیشتن لە شکڵێکی نهیلیزمەوە بەرەو باڵاتر لێی، [واتە] ڕۆیشتن بەرەو شکڵێکی تری نهیلیزم. فەزا مولکی هێڵە، هەر لەبەرئەوەش باڵاتر لێی یان ئەویەری هێڵ، شتێکی تر نیە. وشەی Peri لەیۆنانیدا جگە لە مانای (لە) مانایەکی تری هەبوو: ئامانج یان مەبەست. ئەوەی بەئەڵمانی پێی دەڵێن Endzweck: پانتایی کۆتایی. ئەو شوێنەی ئیدی ناکرێ لێوەی بۆ جێیەك بڕۆین. ناکرێ چیدی لێوەی بۆ جێیەکی دی بڕۆین. قسەکردن لەبارەی هێڵەوە واتە تا دوا ئەندازە چاو بڕینە (خودی کاملی نهیلیزم)، وێنەی هێڵ بیرهێنەرەوەی سەرپەناهێکە (دوولایەن) کۆدەکاتەوە. [واتە] بەسەر هەردوولادا، یەك مانا باڵادەستە. نیتچە کاتێ باسی ئیرادەی دەکرد، ئیرادەی سەرپەناهێکی دی، ڕوانگەیەکی دیو فەزایەکی جیاوازی دەهێنایە پێشێ. هایدگەر لە وتاری (میتافیزیکی نیتچە)[30] دا دەریخستووە کە هەرلەبەر ئەمەش بوو لای نیتچە ئیرادە نەیدەتوانی جگە لە (ئیرادەی هێز) شتێکی تر بێت.[31] ئەم ئیرادەی هێزەش – بەپێچەوانەی مەبەستی نیتچەوە – سەرچاوەی ئەخلاقێکی تازەبوو. چەمکی چاکی (agathon)– کە نیتچەش وەك هایدگەر – پەیدابوونی بەیەکێك لە گوناهەکانی ئەفلاتوونو گرێدراو بەچەمکی ئایدیاوە دەزانی، بە شکڵی تازە (لە قاڵبی ئایدیایەکی تازەدا) سەر دەردێنێتەوە. واتە گوتاری نیتچە لە قاڵبێکی میتافیزیکیدا دەردەبڕێو هیچ چارەیەکیش لەمە زیاتر نیە.

تێپەڕین لەهێڵ ئاشکراکەری ئەم میتافیزیکیەیە، وتن لەبارەی هێڵەوە، دەیەوێ ئەو ئایدیا، ئەو بونیادە ئەخلاقی – میتافیزیکە وەلاوە بنێت.

وێناکردنی هێڵ وەك ئەوەی دەکرێت لێی تێپەڕین، واتە ئەوەی هێشتا نەمانزانیوە کە جەوهەری نهیلیزم [بریتیە لە] کەماڵ بەخشین بەخۆی.[32] و لەم حاڵەتەدا نەمانزانیوە کە ئەوبونەی کە بەگریمانەی ئێمە دەبێت لە هێڵ بپەڕێتەوە (شێوەی جیاجیایی بوونی بوونە)[33] و بەخودێك (سوژەیەك) مان زانیوە کە بەهەرهۆیەك بێت لەجێیەك دا لەهێڵ دەپەڕێتەوە. واتە بواری تازە بابەت دەناسێتو مەبەستی کونترۆڵ کردنێتی (ئیرادەی هێز). بەڵام بوون نە خودەو نە مەبەستی جێگایەکە، نەشتێکەو نە پەیوەندی نێوان شتەکانە. بوون لەناو زەمەن دا نیە. واتە زەمەنێکی پێشتر لەو بوونی نیە. پێش بوون بواری (لەدەرەوەی ..) بوونی نیە. زەمەنو بوون یەك شتنو بوون ناتوانێ لەهێڵێك بپەڕێتەوە، چونکە ئەمە تێپەڕین لەخودی خۆیەتی. هایدگەر بە ئاماژەکردن بۆ دەقێکی کۆنتری یۆنگەر (کرێکاران) پێی دەڵێت کە لەم نووسینەدا ئەو باسی نهیلیزمی جیهانی (لە ئاستی سەیارەدا) کردووە. چۆن ئێستا هێڵێك وێنە دەکات کە دەتوانین تێی بپەڕێنین؟ کەواتە ئەو ئیرادەی (خۆ سازدانە [بسیج] کامڵە کە لەو نووسینەدا هاتووە، چی لێهاتووە؟ (بەکەماڵ گەیشتنی نهیلیزم دەست پێئەکا).[34] ڕێك هەر لەبەرئەمەش ئێمە ناتوانین باسی تێپەڕین لەمۆدێرنیتی، واتە تێپەڕین لە هێڵو گەیشتن بە فەزا یان ڕۆژگارێك، یان ئەگەرێك، یا شوێنێکی تازە بکەین، و بە (هەلومەرجی پاش مۆدێرنە) یان بە زاراوە بەناوبانگەکەی لیوتار بە (هەلومەرجی پۆست مۆدێرن) ی بزانین. پۆست مۆدێرنە لە باشترین حاڵەتدا، بە کەماڵ گەیشتنی نهیلیزم یان مۆدێرنیتی دوایە. نەك وەك

باسەکەی نیتچە کە پاش مۆدێرن بە نەهیلیزم دەگەین، بەڵکو وەك تێگەیشتنێك لە (سەرپەنامێك کە دوو فەزا [ی دوویەری پرد] پێکەوە کۆدەکاتەوە). ئەمە قەدەر یان بەو وشەیەی کە هایدگەر بەکاری دێنێ (موئیرای) مۆدێرنیتیە.

## پۆست مۆدێرنیزم و قەیران

گوتاری پاش بونیادگەری و پۆست مۆدێرن بە (پەیڕەوکردنی) نەریتی رەخنەکاری لە مۆدێرنیتی، دوو چەمکی قەیران و عەقڵ، هەمیشە پێکەوە بەکاردێنێ. عەقڵباوەڕی رۆژئاوایی یەکێك لەشێوەکانی بڕوامێنان بوو بەهێزی عەقڵانی مرۆڤ کە هەرگیز نەیتوانی نهێنی قەیران روون بکاتەوە. لایەنی دەسەڵاتگەری عەقڵ باوەڕیش هەر بۆئەم نەتوانینە دەگەڕێتەوە: لەبەرامبەر قەیرانەکانداو لەکاتێك دا توانای روونکردنەوەیانی نیە، پێ لەسەر کارایی خۆی دادەگرێ و بەم شێوەیە رێگای رەخنەکاری دادەخات کە سەردەمێك خۆی هێنابوویە ئاراوەو هانی دەداو تەنانەت لەهەندێ ساتەوەختدا پشتی پێ بەستبوو. لیوتار دەنووسێت کە عەقڵ (راوی مەزن) یان (راوی سەرەکی) بووە. سیفەتی مەزنیش بیرهێنەرەوەی (پشکنەری گەورەی داستاڤیسکیە). هەنووکە مەنەلۆجی ئەم گێڕەوەیە کۆتایی پێهاتووە. پۆست مۆدێرنیزم واتە رزگاربوون لەم گێڕەوەو گێڕانەوەیە، یان لەم مەنەلۆجە. ئێستا دەتوانین تێبگەین کە نەك هەر عەقڵباوەڕی سەدەکانی رابردوو، بەڵکو عەقڵ تەنیا یەکێك لەگێڕەوەکان بووە، و ئەوەندەش گێڕەرەوەیەکی باش نەبووە. رەنگە لەچەند ساتەوەختێکداو بۆهەندێ کەس چەند شتێکی باشی گێڕابێتەوە، بەڵام بەهەرحاڵ یەکێك بووە لەناو ئەوانی دیدا. ئەگەرچی بەهێزتربووە (واتە باشتر رەوایەتی بە دەسەڵات بەخشیوە). واتە ئەویان تەنها بە گێڕەرەوەیەك ناساندووە.

میشیل فۆکۆ باسی گێڕەرەوەی تری کردووە، تەنانەت ئەگەر رەخنەی دێریداش لە فۆکۆ قبوڵ بکەین، ئەوا ئەو خاڵە دەمێنێتەوە کە فۆکۆ ئەگەرچی بۆ یەکەم جار نا، بەڵام بەکامڵترین شێوەی مومکینی دەربڕینی دەنگی گێڕەرەوەیەکی دی: واتە شێتی، هێناوەتە پێشێ. فۆکۆ جارێك وتی: (ناکرێ هیچ کام لەشێوەکانی عەقڵباوەڕی لەگەڵ خودی عەقڵدا بەیەك شت دابنێین). بناغەی قسەکەشی ئەوەیە کە (عەقڵ یەکێك لەشێوەکانی ئیرادەی دانایی بووە).[٣٥] کەوابوو عەقڵباوەڕی بە زمانی دێریدا (پاشکۆی پاشکۆیە). بە عەقڵەوە بەستراوە (و بەهۆی ئەوەوە رەوایەتی پێ دەبەخشرێ) کە خۆی بەستراوە بە ئیرادەوە.

هەنووکە بابگەڕێینەوە بۆ بەڵگەنەویستی سەرەکی (تێگەیشتنی پۆست مۆدێرن): قەیران. رەنگە ئەم قەیرانە وەك هوسریل گوتوویەتی قەیرانێکی مەعنەوی بێت، رەنگیشە ئەو حاڵەتی ئاخرزەمانیە پیشان بداتەوە کە جێی سەرنجی ئادرنۆ بوو. رەنگە بەهەمان ئەو سادەییەی کە هابرماز گوتوویەتی: لەرێکەوتنەکانەوە بێت و کورت بکرێتەوە بۆ قەیرانی رەوایەتی، بەڵام لەهەر رێگایەکەوە برۆین (ئەگەر رێگاکە ببڕین) تێدەگەین کە قەیرانێکە لەبێ توانایی دەربڕیندا، لەبەدەربڕین – نەهاتنی مانادا، لە ونبونی مانا. کاتێ دەپرسن: دواجار جیاوازی مۆدێرنیزم و پۆست مۆدێرنیزم چیە؟ گرانترین پرسیاریان هێناوەتە ئاراوە، چونکە جیاوازی [راکان] لەبارەی هەمان چەمکی جیاوازیەوەیە. وەڵام دەدەینەوە: پەیوەندی بەوەوە هەیە مەبەستی ئێوە لە جیاوازی چیە؟. مەبەستی پۆست مۆدێرنیزم لە جیاوازی ماوەی بەیەك نەگەیشتووی نێوان ماناو دەربڕینە، واتە نەتوانین لەپێشکەشکردنی مەبەستدا. دەتوانین بە زمانی کلاسیکی بڵێین جیاوازی نێوان جەوهەرو مانایە.

دەزانین کە فۆکۆ، بارت، لاکان و زۆربەی بونیادگەران بەپێی نەریتی فۆرمالیستە رووسەکان، جیاوازیەکیان دەکرد لەنێوان مانای دەق و مەبەستی نووسەردا. قبوولیان نەدەکرد کە مانای دەق هەمان ئەو شتەبێت کە نووسەر ویستوویەتی (یان لەدەق دا دایناوە). لقێکی گرنگی هێرمۆنتیکی مۆدێرنیش لەسەر ئەم بڕوایەن. ئەم دوو گرووپە لەدوو رووی جیاوازەوە بەهەمان دەرئەنجام گەیشتوون: دەبێت لەشیکردنەوەدا بۆ دۆزینەوەی ماناکانی دەق، سوود لەمیتۆدەکانی زمانەوانی وەربگرین، بۆ ئەوەی لە مانای شاراوەی دەق بگەین (باوەڕی بونیادگەر لەقۆناغی یەکەمیدا) و یان بەهۆی راڤەکانی وەرگرانی دەقەوە، مانای تازە دابهێنرێت (باوەڕی قوتابخانەی هێرمۆنتیکی مۆدێرن). پێویست ناکا لێرەدا ئەوهۆیانە بهێنمەوە کە هەریەکێکیان بۆسەلماندنی بۆچوونەکەی هێناویەتیەوە. ئەمە کارێکە کە لە چەند نووسینێکی دیدا کردوومە. بەلام خالێکی گرنگ لەپێداچوونەوەی پۆست مۆدێرنیزمەکان دا بەم ئەنجامە دەگات کە ناتوانین تێی بپەڕێنین:

ئەوان رەخنە لە بونیادگەران دەگرن [و دەلێن] کە میتۆدی کارەکەیان خولقاندنی مانایە نەک دۆزینەوەی، لەپەیڕەوانی هیرمۆنتیکیش ئەو رەخنەیە دەگرن کە داهێنانەکەی خۆیان بەجدی زانیوەو نازانن کە (دەق لە مانا رادەکات). راستە دەق ئاسۆیەکی کراوەیە بۆ مانای بێ ئەژمار، بەلام رێک لەبەرئەم هۆیە هەمیشە دەکرێت لەرێگەی تازەوە بەمانایەکی خوازیار بگەین. ئەم گومانکاریە رەهایەی پۆست مۆدێرنیزم دەگەڕێتەوە بۆ بەلگەنەویستە سەرەکیەکەیان واتە (قەیرانی مانا). لەراستیدا بەپەیڕەوی لە (فینگشتاین) دەلێین دەق پانتایی یارییە زمانییە بێ ئەژمارەکانە. مانا لەم یاریانەدا دەورێکی دروستکەری نیە، بەلکو رێسایەکە کە هەر یاریەک پێشکەشی ئەکات، یان ئەنجامێکە. یاریەکی دەق ئەوەیە کە نووسەر ویستوویەتی و هێناویەتە پێشێ، یاریەکی دی ئەوەیە کە وەرگرێك دەیهێنێتەوە پێشێ. یاری سێیەمیش ئەوەیە کە وەرگری سێیەم دەیهێنێتە پێشێ کە مەبەستێکی گریمانەیی دەگەڕێنێتەوە بۆ نووسەرو... نە یاری نوسەر بەمانا دەگات (و لێرەش دا بونیادگەران و پەیڕەوانی هێرمۆنتیك راست دەکەن) و نە یاری دەق بەمانا دەگات (و لێرە شدا هەردوو قوتابخانەکە هەلەن). نەیاری وەرگرو نە هیچ یاریەکی دی [بەمانا ناگات]. هەر یاریەك رێسایەکی هەیەو مانایەك، بەلام نابێت ئەو مانایە بەجدی وەربگرین و نابێت بەوەندە وازبهێنین. نابێت بەراستی ئەوە بە مانا دابنێین. ئەو چەمکانەی بەکاری دێنین لە قالبی ئاماژە زمانەوانیەکان دا دەردەبڕێن، بەلام لەبەرئەوەی زمانمان تەنك نیەو لەبەرئەوەی سنووری دنیاکەمان زمان دەست نیشانی کردووە، [کەوابوو] نازانرێت. نە ئەو سنوورەی دنیای ئێمە دەناسرێت و نە پانتایی دنیای چەمکی ناسینی و زمانی ئێمە. ئێمە تەنها دەتوانین بە زمان و چەمکەکان یاری بکەین و ماناکان دروست بکەین، بەلام نابێت ئەوەندە بەجدی وەریان بگرین کە بانگەشەی ناسین بکەین.

جارێکی دی ئاماژە بۆ دەوری نەشاز دەکەم. ئەم دەورە بەکەم تەماشا مەکەن. ئەوەی دەلێت (هیچ یەقینێك بوونی نیە) ئایا خۆی یەقینی بەم رستەیە هەیەیان نەء؟ ئەوکەسەی کە دەلێت (تەنیا ئەو گوزارانەی کە لەرووی ئەزموونیەوە تاقی کردنەوە هەلدەگرن، شایانی سەلماندنن یان نەفی کردنن) ئایا دەتوانێت ئەم گوزارەیە لەرووی ئەزموونیەوە تاقیبکاتەوە بۆئەوەی تێبگات کە راستە یان هەلە؟ ئەو کەسەی کە دەلێت (مانایەکی کۆتایی بوونی نیە) ئەم قسەیە خۆی مانایەکی هەیە یان نەء؟ دەکرێت هەریەك لەم

گۆڕانانە بەحوکمێکی بنەڕەتی یان کۆتایی دابنێنین، دەتوانین وانەکەین. بابەتە یەقینەکانی ئێمە لە سیستەمی ئاماژەکان دا (و لە هەنگاوی یەکەم دا لە سیستەمی ئاماژەکانی زمان دا) پێشکەش دەکرێن، بەڵام ئاماژەکان خۆ (بێ لایەن) نین. ئەو ماوەیەی نێوان ئاماژەو مانا (ماوەی دالو مەدلوول ماوەی مەدلوولەکان وەك وێنای زیهنی تاکەکان) چی لێ بکەین؟ گوتاری پۆست مۆدێرن لەبەرئەوەی بەم نەشازە هوشیار بووە، زۆر بەئاسانی دەڵێت پلەیەك هەبووە کە تیایدا خود، هوشیار دەبوو بە بابەت. بەمانای ئەوەی باسی زانستی خۆی لەبارەی جیهانی دەرەوە دەکرد. پلەیەکی دووەم هەبوو کە تیایدا خودی هوشیار لەهوشیار خۆی هوشیار دەبوو. بەزمانی هیگڵ خود هوشیار دەبوو، یان بە زمانی فەیلەسووفان (خود ئەندێش) دەبوو. پلەی سێیەم هەبوو کە تیایدا خود، هوشیار دەبوو بەناهوشیاری خۆی. تێدەگەی کە بۆچی تێناگات، یان چۆن تێناگات، یان ئەوەی تێی ناگات چ دەورێکی هەیە لەوەی کەوا دەزانێ تێی دەگاتو چ دەورێکی هەیە لەکردارەکانیدا. ئەکرێ ئەم سێ پلەیە بەم شێوەیە کورت بکەینەوە:

١. هوشیار بوون بە بابەت – کە بانگەشەی فەلسەفەی ئەزموونگەری، شیکاری و ئامبریکیە.
٢. هوشیار بوون بە هوشیاری – کە بانگەشەی ئایدیالیزمو عەقڵباوەڕی ڕەخنەگرانەیە.
٣. هوشیاربوون بە ناهوشیاری – کە لە کانتەوە تا فرۆید جێگەی مشتو مڕ بوون.

گوتاری پۆست مۆدێرن (پلەی چوارەمە) ناهوشیاریە بە...؟ واتە جارێکی دی وەك گومانخوازەکانی یۆنانی کۆن (چیدی نازانین). تەنانەت لە پلەی سێیەمیش کە دەمانزانی کە نازانین، تێپەڕیوینو ئێستا نازانین. پلەی سێیەم لەناوخۆیدا سنوورێکی بۆ دانایی بەگریمانەوە وەردەگرت... لە [بوونی] شتێك – بوونی ناهوشیاری – ئاگادارین، بەڵام پلەی دوایی نکوڵی کردنە لە داناییو چونکە ناشزانین، هەم ئەو پلەیەی چوارەم بێمانا دەبێت و هەم پلەی یەکەم تا سێیەمیش.. کەواتە دەگەڕێینەوە بۆ خاڵی سەرەتا: بۆئەو شوێنەی کەوامان دەزانی لەبەرئەوەی دەزانین کە بیردەکەینەوە،[کەوابوو] هەین. بۆئەو جێیەی کە (خود) مان دروست کرد. دەگەڕێینەوە بۆ سەرەتای قەیران، قەیرانێك کە بوونی لەداناییەوە وەردەگرتو هەر لەبەر ئەم هۆیەش بە وتەی فۆکۆ (دروست کردنی خود هیچ دەردێکی چارەسەر نەکرد).

نیتچە، هایدگەرو دێریدا هەریەکەیان بەشێوەیەك لایەنی تێك – شکێنەری وێرانکەری خود هوشیارییان پیشان داوە، هەریەکەیان بەشێوەی تایبەتی خۆی دەریان خستووە کە هەڵە کۆنەکان لەخود هوشیاریدا پشت ئەستور بە عەقڵباوەڕی ماونەتەوە. نیتچە باس لە مەسیحیەت دەکات، هایدگەر لە میتافیزیکو دێریداش لە سەنتەریزمی ئاخاوتن، هەرسێکیان لایەنێکی ڕەهاگەریان هەیە کە لێیان جیا نابێتەوە. نیتچە لەنێوان نهیلیزمو ئیرادەدا، هایدگەر لەنێوان دوولایەنی قەدەری مۆدێرنیتیدا ڕێگایەکیان دەدی جیاواز لەیەکدی. بەڵام دێریدا دەری دەخات کە ئاینده تەنیا بەو شێوەیەی کە دەتوانێ ببێ، دەبێ: وەك مەترسیەکی مەزن. نیتچە دەینووسی (زەمان لەسەر بنەمای ئەورۆژە بەدیارانە دەژمێرێن کە ئەم قەدەرە دروستی کردووە،[واتە] لەیەکەم ڕۆژی مەسیحیەتەوە، بۆچی لەدوارۆژیەوە نایژمێرین... واتە لە ئەمڕۆوە.[٣٦] دێریدا وەك هایدگەر دەری دەخات ناکرێت ژماردن لەسەر بنەمای ئامادەبوونی مانا، بونیاد بنێین. هەر ڕۆژێك کە دەست پێدەکات ڕۆژێکی بەدیار دەبێ.

پۆل ریکۆر (و تاڕادەیەکیش ڕۆلان بارت) مێژوویان کرد بەڕاپۆرت یان گێڕانەوەیەك. لیوتار مێژووی لەڕێی جیاواز لە سیستمی هیگڵی (و لەڕاستیش دا لەڕووبەڕوی تەواوی هیگڵیدا) کرد بە عەقڵ. عەقڵی ڕووداوەکان یان (سەروو دەق) بەمانای دەقێك لەبارەی دەقێکەوە. فەلسەفە لەم نێوەدا (ڕەوایەتی ئەم سەروو دەقەیە) یا (هەوڵدان بۆ دروست کردنی ڕەوایەتیە). ڕاپۆرت یان چیرۆکی ڕۆشنگەری بە مۆدێرن ناو دەبەن.،[و] ڕاپۆرتێك لەبارەی ئەم ڕاپۆرتەوە، وەك دەقێك لەبارەی دەقێکەوە یا (سەروو دەقێکەوە) بە پۆست مۆدێرن ناودەبەن.[٣٧]

پەیدابوون (و بواری دەسەلاتی) ئەم سەرو دەقە ناگەڕێتەوە بۆ سەردەمێك کە دەق کامڵ بووە، بەڵکو دەگەڕێتەوە بۆ ئەو سەردەمە نزیکەی کە ڕێساکانی یاری لە گوتار، یان بە وتەی لیوتار لە زانست، ئەدەبیات و هونەرەکاندا، گۆڕا و ئەم گۆڕانەش پتر (قەیرانێك بوو لە ڕاپۆرتدا، قەیرانێك کە هەر لە سەرەتای مۆدێرنیزمەوە (وەك خود هوشیاری مۆدێرنیتی) بوونی هەبوو، بەڵام درەنگ بەشێوەیەکی کامڵ ئاشکرابوو. لێرەدا مەبەست لە مۆدێرنیزم بە وردی ئەو کۆمەڵە قوتابخانە هونەرییە کە لەماوەی ساڵەکانی ١٨٩٠ و ١٩٣٩ دا پەیدابوون، و ساڵی سیو نۆ، ساڵی گەیشتنە کۆتایی Fnnegnas ە.

لەڕاستیدا ئەو سەردەمەی کە ئێمە لە گوتاری ستاتیکیدا بە مۆدێرنیزمی لەقەڵەم دەدەینو زۆر کەسیش وەك (سەرکەوتنی مۆدێرنیتی) باسی دەکەن، ڕۆژگاری پەیدابوونی گوتارێکی ڕەخنەگرانەیە لەبارەی مۆدێرنیتیەوە، دەکرێ بە (مۆدێرنیتی دوایی) یان (سەرەتای پۆست مۆدێرن) ی بزانین. ئەم ناوکە سەرەرتاییانە کە لە نووسینەکانی نیتچەدا ئاشکرابوون، تا ناوەڕاستی دەیەی ١٩٥٠ دەرئەنجامەکانی خۆی جگە لە ناو بەرهەمەکانی هایدگەردا (لە هیچ شوێنێکی دیدا) ئاشکرانەکرد. و ئەم دەیەیەش هەمان ئەوکاتەیە کە بە وتەی لیوتار (تیایدا دانایی، شکڵی گۆڕی) و کۆمەڵگای پیشەسازی بەرەو کۆمەڵگای پاش پیشەسازی هەنگاوی نا و میعماران باسی پۆست مۆدێرنیزمیان کرد.

ئاڵۆزی پۆست مۆدێرن – کە بە هیچ شێوەیەك نکوڵی لێ ناکرێ – زادەی ئەم مێژووەو ئەم ئاشکرابوونی دەرئەنجامانەیە. مۆدێرنیتی بیر لە ئەنجام [یان کۆتایی] دەکاتەوە، هەرچەندە ڕۆشنگەران باسی ئەمڕۆیان دەکردو کانتیش ئەم خاڵەی بە ستایشێکی ئاشکراوە دووبارە کردووەتەوە، بەڵام ئەم ئەمڕۆیە بە ئایندەو (بە هەلومەرجێکی ،ئومێداوی) یەوە، بەستراببووەوە. ئەندێشەی ڕەخنەگرانە بێئەم ئەنجامە ـ لانی کەم بەومانایەی ڕەخنە کە ئایدیالیزمی ئەڵمانی دەیهێنایە ئاراوە – بوونی نەبوو. پۆست مۆدێرنیزم لە بەرامبەر ئەم ئایندە بینی مۆدێرنیتیەدا، لایەنێکی پراگماتیکی هەیە، لە ئەنجامەوە دوورەو توانای یاسا ڕێژی کاری فیکری نیە. دڵبەستنی (پۆست مۆدێرن) بە یاری زمانی کە فینگشتاین لە لێکۆڵینەوە فەلسەفیەکان دا هێنایە پێشێ، دەگەڕێتەوە بۆ ئەم بێ توانابیە. هەر یاریەك خۆی (ئاڕاستە دەکات) بێ پێداویستی بەڕەوایەتی عەقڵ – باوەڕانە. لیوتار دەڵێت ئێمە بە (ڕێکخستنێکی دروستی زمان) واتە بە (ڕێساکانی گواستنەوەی مانا) ناگەین، لەبەرئەوەی کە مانایەك نیە بگوێزرێتەوە. لێرەدا لیوتار سوودی لە خوازەی (هەور) وەرگرتووە. سروشت، زانست، کۆمەڵگاو زمان لەم خوازەیەدا چونیەك [دەبن]و یەك ڕەنگ وەردەگرن. وەك چۆن هەر گێڕانەوەیەك لەناو هەورێك (پێکهاتەیەکی گۆڕاوو دەست نیشان نەکراو) لەرەگەزە ریوائیەکاندا.. دروست دەبن، هەورێك کە وەك خۆی نامێنێتەوەو بەردەوام شێوەی دەگۆڕێ، هەروا سیستمی مانایش قابیلی

گۆڕانه.[٣٨] هەور نموونەی سیستمێكی ناسەقامگیره.. سیستمێك كه ڕەگەزەكانی (ناسینی وردترین یەكەكانی یان بە زمانی لیوتار micrologie كەی) دەمێنێیەوە بەڵام لە شكڵی جیاجیادا.

باسەكەی لیوتار لەبارەی زمانەوە كە نە لە دیدی قوتابخانەیی زمانەوانیەوە و نە لە گۆشەی گوتاری فەلسەفیەوە پێشكەش كراوە، ڕەخنەیەكە لە ئاماژە لەو دیدگایەوەكە (گوتاری ئاماژە ناسی، هەمیشە خۆی وەك گوتار ئامادە دەكات).[٣٩] گوتاری مۆدێرن لەنێوان زمان‌و داناییدا پەیوەندی دەدۆزێتەوە. بەتایبەتی لەنیوەی دووەمی ئەم سەدەیەدا (تەكنیك و زانست ئەم پەیوەندیەیان قبووڵ كردووە) بەڵام ئەمڕۆ ئێمە نەك لەبارەی زمانەوە بەڵكو لەبارەی (زمانەكان)ەوە قسە دەكەین، واتە تیۆرەی پەیوەندی ڕۆڵێكی گرنگتر لە تیۆرەی زمانەوانی پەیداكردووە، چونكە پەیوەندی مرۆیی گرانتر بووە. تیوەری پەیوەندی شێوەیەكی (سەرو زمان) ە، بەواتای گوتارێك بەڕێسای زمانیەوە لەبارەی زمانەكانەوە. ئەم گۆڕانكاریە دەرئەنجامی سلبی لێ كەوتۆتەوە. ئەمڕۆ زۆربەی خەڵك لە گیرفانی خۆیان دا وەرگێڕێكیان هەیە بە هەزارو پێنج سەد وشە لە یادەوەریدا.[٤٠] ئەمەش یەك مانای هەیە: پەیوەندی بەهۆی زیاتر لە هەزارو پێنج سەد وشەوە مومكینە. زمان كارەكتەری ستاتیكییانەی خۆی لەدەست داوە. كارەكتەرێك كە بەسترابوو بە تیورەی ئەدەبیەوە Poetigue، شاراوە بەڵام بەتەواوی گرنگ بوو، لیوتار باسی (تیورەی بێدەنگی) دەكات. وەك ئەوەی گەڕابینەوە بۆ ڕۆژگاری پێش سۆسێر (گەڕانەوە وشەی بێزراوی پۆست مۆدێرنیزمە). ئایا دەكرێ لەم جیهانەدا كە ئەوەندە لەڕووی گەنجینەی وشەكانەوە فەقیرەو لەدیدی تیوریشەوە هیچ شتێكی نیە پێشكەشی بكات، باسی پەیوەندی زمان‌و زانین بكرێ؟ لەكۆمەڵگایەكی ئینفۆرماتیك دا زانین (ئینفۆرمیزە) دەبێ. زانینی زمان‌و تەنانەت پێویستی پێی لەبیردەچێتەوە.[٤١] لیوتار بە بێزاریەوە دەنووسێت (ئیدی دەكرێت بە ئاسانی ڕۆژێك بهێنینە بەرچاومان كە زانین دەسووڕێتەوە، ڕێك وەك پارە).[٤٢] زانین (بێ تایبەتمەندی) (فۆنكسیونل) دەبێ. ئەوەندە بەسە كە ڕەنگی جیاوازی ئسكناسەكان بناسی.

گرفت بەهۆی بێبایەخی زانین و زمانەوە لە ئاستی سیاسی یان كۆمەڵایەتیەوە، بە ئاستی ئەخلاقی دەگات. پێدەچێ پۆست مۆدێرنیزمیش نەتوانێت پەیوەندی بە گرفتێكی ئەخلاقی بزانێ. بەڵام دەبێت لێرەدا وردبینەوە. نەتوانین لە دروستكردنی پەیوەندیدا دەرئەنجامی هەمان ئەو هەلومەرجەیە كە پەیوەندی كردن وەك (خەبات كردن) دەردەخات.[٤٣] لەدۆخی گومانخوازی‌و نەزانین جەوهەرێكی شاراوەدا، واتە لەدۆخی (نەزانمكاری) (اللاادریە) دا جێگەیەك بۆ ئەخلاق نامێنێتەوە. لیوتار ئەم (گرفتە ئەخلاقیە)ی خستۆتە ژێر باسەوە. لایەنە جیاكانی (ئەم گرفتەی) لە دواكتێبێك دا كە تا ئەمڕ بڵاوی كردووەتەوە، واتە لە (ئەخلاقی پۆست مۆدێرنیزم) دا خستووەتە ژێر باس.[٤٤] با ئەم گرفتە بەراورد بكەین بەو باسەی هابرماز كە لە بواری (ئەخلاقی پەیوەندی) دا كردوویەتی: لە ئەخلاقی پەیوەندی كردن دا، پەیوەندی دەگۆڕێت بۆ كردارێكی ئاخاوتنی‌و دواجار بۆ ئاخاوتن. (بەڵام) لە باسەكەی لیوتاردا خاڵی ناوەندی سەرو زمانە، واتە ئەو زمانەی كە لەبارەی زمانەوەیە. لە بارەی ئەو زمانانەوە كە پەیوەندی ناومكین دەكەن. لە زمان دا ئەو پەیوەندیە دادەهێنین كە (ئەگەری گوتارێكی ستاتیكانەی لەناو خۆیدا حەشارداوە). نەك لەناو ئاخاوتن واتە: لەناو (ئەگەری ئامادەبوونی مانادا)

بەو شێوەیەی کە مۆدێرنیتی دەیویست دەری بخات.[٤٥]

داهێنان بەدەر لەخودی زمانەوانییانە بەستراوە بە گوتارەوە. کەوابوو گوزارەکان گرنگن نەك (کرداری ئاخاوتن)، کۆمەڵێ لە گوزارەکان نەك پەیوەندی ئاخاوتنی، توانا نەك کردار. (ئەخلاقی پەیوەندی) هابرماز ملکەچی لەناوچوونی توانای دەروونیو ستاتیکی زمان بووە. ئەوەی لەنێوان خەڵك داو لە ئاخاوتنی رۆژانەدا روودەدا پەیوەندیەکی ناکامڵە. هابرماز ئەم [ئاخاوتنی رۆژانەیە] (ئومێد بەخش) دەکات. خەڵکی بەماناناگەن، [بەڵکو] سەرجەمی درۆزن لەجێی مانا، دادەهێنن. هابرماز تەسلیمی ئەم (نوسخە بەدەڵەی ماناو واقعیەت) دەبێت.

هابرماز (لوجیکی بێمانایی) دەرك نەکردووە. هەمان بێتوانایی لە گەیشتن بە مانادا کە بە زاراوەی نەگونجاوی ئەنگوستیسیزم ناوم هێنا، دەبێتە هۆی بێتوانایی لە (ریوایەت کردندا) لیوتار دەنووسێ کە گوزارشتی ریوایی، گوزارشتێکە بۆ فەرامۆشکردن، وەك چۆن ئێمە لەکاتی بیستن (یان خوێندنەوەی) رۆمانێك دا (زۆر شت) فەرامۆش دەکەین.

بگەڕێینەوە بۆ چەمکی پۆست مۆدێرن، لیوتار لە کتێبی (روونکردنەوەی پۆست مۆدێرن بۆ منداڵان)دا دەنووسێت کە بە سەرنجدان لە بەردەوامی داهێنانی هونەری، تێدەگەین کە هەر دەستکەوتێکی تازەو مۆدێرن، لە پەیوەندیدا بەوەی پێش خۆیەوە بە (پۆست مۆدێرن) دەژمێررێت. واتە بەرلەوەی مۆدێرن بێت، لە پەیوەندیدا بە (بابەتی مۆدێرنی پێش خۆیەوە) پۆست مۆدێرنە:

(سیزان کام فەزایەی بۆ جەنگ بانگ ئەکرد، فەزای ئینتیباعیەکان. بیکاسۆو براك هێرشیان دەکردە سەر چ شتێك؟ فەزای سیزان. دوشان لە ساڵی ١٩١٢ دا لە چ بەڵگەنەویستێك دابڕا؟ لەوەی کە دەڵێت پەردەی وێنەکێشان تەنانەت ئەگەر کوبیستی بێت دەبێ بخولقێنرێ. بۆرن بەڵگەنەویستێکی تر دەخاتە ژێر پرسیارەوە کە بە بڕوای ئەو لەکاری دوشان دا بەدەست لێنەدراوی مابووەوە: جێگەی بەیانگەری بەرهەم. [بەم شێوەیە] بەخێراییەکی سەرسوڕهێنەر (نەوەکان) پێش یەکدی دەکەون. بەرهەمێ تەنیا کاتێك بە مۆدێرن دەژمێررێ کە سەرەتا پۆست مۆدێرن بووبێ. بەم شێوەیە پۆست مۆدێرنیزم نەك لەکۆتایی مۆدێرنیزمدا بەڵکو لە پلەی لەدایك بوونیدا راوەستاوە).[٤٦]

جیانی ڤاتیمۆ کە قوتابی هایدگەر و گادامێرەو زۆرتر لەبواری هێرمۆنتیك دا بیر دەکاتەوە تالەبواری پۆست مۆدێرنیزمدا، هەوڵ ئەدات جەوهەری مۆدێرنیتی بدۆزێتەوە و باسەکەی لەگەڵ باسەکەی لیوتاردا چەند لێکچوونێکیان هەیە (مۆدێرنیتی سەردەمێکە کە تیایدا مۆدێرن بوون، بەهایەکە. دەکرێ بڵێین بەهایەکی بونیادیە کە سەرجەم بەهاکانی دی بۆئەو دەگەڕێنەوە).[٤٧] ئەم پێناسەیە بیرهێنەرەوەی پێناسە کۆنەکانە کە مۆدێرنیتی لەگەڵ دونیای بوونو ئەفسانە دامالین دا، بەیەکەوە دەبینی. دەربڕینێك کە پاش ماکس فیبەر (باوەڕ بە پێشکەوتن و ئەمڕۆییو تازەیی) تیایدا، دەورێکی گرنگی بینیوە. مۆدێرنیزم بەخواستی (ستاتیکایی کردنی ژیان) دەستی پێکرد. تەنانەت بە وتەی بودلێر (هەوڵێك بوو بۆ دەست بەسەراگرتنی هونەر بەسەر بوارەکانی تری ژیاندا). هەر لەبەرئەمەش لەگەڵ (شەوقو ئارەزووی ئایندە) دا هاوڕێ دەبوو.

سەیرکردنی ئایندە، خواستی گەیشتن بەکۆتایی، بناغەی داهێنانی هونەری مۆدێرنبوو. فۆتۆریسم لە سەرەتای سەدەی بیستدا ناوێکی بەخۆی بەخشی کە ئاشکراکەری مەیلی سەرەکیو قووڵی سەرجەم قوتابخانە

ستاتیکیەکانی مۆدێرن بوو. ڤاتیمۆ دەنووسێت (سەیرکردنی ئاینده) ئەمڕۆیی مۆدێرنیتی دروست دەکرد.[48] بەڵام دەکرێ لەم ئایندەبینییەدا بەشێوەیەکی تایبەت لە فۆتۆریسم دا، دەرکەوتنێکی (ستراتیژی پۆست مۆدێرن) بدۆزینەوە: ئارەزووی تەواوبوونی ئەم سەردەمە، واتە ئارەزووی کۆتایی پێهاتنی رۆژگارێك کە بە (ئەبستمۆلۆجیا) دەستی پێکردو لە بنەمای خۆیدا جوانی بە [شتێك دادەنا کە دەتوانرێ] بناسرێ. بەبڕوای ڤاتیمۆ کۆتایی مۆدێرنیتی واتە کۆتایی ئەبستمۆلۆجیا.[49] ئەم کۆتاییەش (زمانی یەکتای فەلسەفە)شە. (دەقە کلاسیکیە گەورەکانی کلتوری ئەورووپایی ئێمە) یەك یەك بایەخی خۆیان لەدەست دەدەن. ئێستا تەنیا دەکرێ لەگەڵیاندا گفتوگۆ بکەین (وتووێژ لەگەڵ رۆژگاری دێرین دا).[50] بەڵام دەبێت بۆ بەردەوامی گفتوگۆ هەردوولا بەرابەر بن. قبووڵ کردنی بەرابەری واتە نکوڵیکردن لەسەرتر و لەپایەو پلەکان. هیوم یان سپینوزا سەرووتر لە وەرگرە پەروەردەکراوەکانی سەردەمەکەیان بوون. هەمیشە بەرهەمەکانیان بەم گریمانەیەوە دەخوێنینەوە. نیتچە و هایدگەر بەمانایەك فەلسەفەیان (ناپیرۆزکرد). ئەوان بە هێنانە ئارای مێژووی میتافیزیك رێگای وتووێژێکی بەرابەریان لەگەڵ (کەسانێکدا کە تادوێنێ بەمامۆستا دەناسران) کردەوە. هەر لەبەرئەمەش ڤاتیمۆ ئەوان بە (فەیلەسووفانی پۆست مۆدێرن) لەقەڵەم ئەدات.[51] ئەوان فەیلەسووفێکی وان، نەك لەبەرئەوەی باسی لەناوچوونی مۆدێرنیتیان کردووە، بەڵکو لەبەرئەوەی قسەیەکیان هەبوو لەبارەی قسەی مۆدێرنەوە.. قسەیەك کە نەزیندانی مۆدێرنیتیەو نەزیندانی (ئەمری پیرۆز). قسەیەك کە ئەمڕۆیی بوون و نوێکردنەوە بەبەهایەك نازانێ، چونکە ئامادەبوونی نەریتەکانی (عەهدی عەتیق) لەناویاندا دەناسێتەوە. نیتچە و هایدگەر هێرمۆنتیکێکی سەرو گوتاریان لەبارەی گوتاری کۆتایی مۆدێرنیتەوە، خولقاندووە. هەرلەبەرئەمەش چەمکی (تێپەڕین) ی هایدگەر، ئەوەندە گرنگە. واتە ئەو شتەی دێریدا بە Depassement ی ناوناوە: وەلاوەنان، نکوڵیکردن، تێپەڕین لە ... نیتچە بۆ لەناوبردنی مۆدێرنیتی) پێشنیاری ئەوەی دەکرد (مەیلە دەروونیەکەی رادیکاڵیزەبکەین).[52] بەڵام رادیکاڵیزەکردن بەناچاری بەمانای قبووڵ کردن نیە، بەناچاریش بەمانای نەفی و نکوڵی لێکردن نیە. لەڕاستیدا ئێمە، نەك بەکرداری نکوڵیکردن و نەفی کردن، بەڵکو بەکرداری کوشتن هاتووینەتە ناو رۆژگاری پۆست مۆدێرنیتیەوە. لەجێی [جێ‌بەجێ‌کردنی] پێشنیارەکەی نیتچە لەگەڵ مۆدێرنیتیدا هەمان ئەو شتەمان کرد کە ئەو لەگەڵ نەریت و رابردوودا دەیکرد. کوشتن بە وتەی دۆستۆڤیسکی (کردارێکی ئەمڕۆییە). مۆدێرنیتی کە بە کوشتنێك دەستی پێ‌کرد کە شێتی (زانینی شاد) [ی نیتچە] بەهاوارەوە باسی دەکرد. هێزی باڵایان کوشت و مرۆڤیان بەهێزی باڵا ناونا. لەڕاستیدا بیرۆکەی بڵندبوون و بەرزبوونەوە لەناوچوو، فەلسەفەش لە (نمونەی بەرزی هوسریل) دا دەری خست کە بۆ یادهێنانەوەی خودی (تراسندنتالی) زمانێکی نوستالوژیانەی هەیە.

## سنووری گوتاری مۆدێرن

نیتچە بۆ تێکشکاندنی زمان سوود لە زمان وەردەگرێ. ئەو سوودی لە رێساکانی دەربڕین، شێوازەکان، نەشازەکان، خود ئەندێشەییەکانی زمانی مرۆیی وەردەگرت، بۆئەوەی ئەم (بینا گەورەیە) تێك بشکێنێ. بەکارهێنانی وشەکانی بیناو بناغەو ئەو وشانەی بەدوایان دا دێن: وەك: پێکهاتە، وێرانە، بونیاد، سەرپەناه و... وەك ئەو مەجازانەی بۆ چەمکەکان و (دیاردە

فەلسەفیەکان) بەگشتی و گوتاری فەلسەفی لەبارەی زمانەوە بەشێوەیەکی تایبەتی بەکاردەهێنرێ، بووە بە شتێکی باو لە فەلسەفەی [ئەم] سەدەیەی دواییدا. (نیتچە) و (دێلتای) و (سیمیل) هێمای وێرانەیان بەکار دەهێنا. ئەم دەربڕینە مەجازیە لە هایدگەرەوە (کە نهێنی هۆنەری وەك نهێنی پەرستگای کلاسیکی دەبینی) تا فۆکۆ (کە ئەرکۆلۆژیای، نەك بەدۆزینەوەی بەڵگەکان، بەڵکو بە وردبوونەوە لە (بینا دێرینەکان) دەزانی)، بیری پەیوەندی نێوان میعماری و فەیلەسوفمان دەخاتەوە. دێریدا لە یەکێك لەو وتارە سەرەتاییانەی بڵاوی کردەوە، نووسی:

(ئەوکاتە، بەرجەستەیی و نەخشەی بونیادەکان روونتر دەردەکەوێت کە ناوەڕۆك (کە وزەی چالاك و زیندووی مانایە) بێلایەن و بەتاڵ بکرێتەوە. رێك وەك شارێکی چۆڵ و جێماو کە بەهۆی کارەساتێکی سروشتیەوە یان هونەریەوە، کورت بووبێتەوە بۆ جومگە پێکهێنەرەکانی خۆی. شارێك کە چیدی کەس تیایدا ناژی بەڵام بە ئاسانیش فەرامۆش نەکراوە، بەڵکو (هێشتا) بەماناو کلتور داگیرکراوە).[٥٣]

لەم لێکچواندنەی (دێریدا) دا چەند خاڵێکی گرنگ هەیە:

١. مانا نەبەستراوە بە ژیان [و] بە بوونی چالاکی بابەتەکانەوە، لە شارێکی وێراندا جومگە پێکهێنەرەکان ئاماژە بۆ ژیانێکی رابردوو (یان ئامادە نەبوونی - بوونێکی چالاك-) دەکەن بەڵام هاوکات وێنایەکی ماناش لەناو خۆیدا هەڵدەگرێ.

٢. دۆزینەوەی جومگە پێکهێنەرەکانی بابەت (واتە تێگەیشتن لە پێکهاتەی بونیادی بابەتەکە) بێ تێك شکاندنی مومکین نیە. دەبێ هەلومەرجی بەکارهێنانی لەناو بچێت، بۆئەوەی توانای بەکارهێنانەکانی تری، ئاشکرابێت.

٣. تێکشکاندنی پێکهاتەی بابەت لە کارەساتێکی سروشتی یان نا سروشتی دەچێت. لە (بوومەلەرزە) یان (بومبابارا ن) دەچێت.

[دەبێ] دەق یان بابەت لە (خەڵکی) واتە لە ماناگریمانەکانی، لە بەرکارهێنانە سیمۆنتیکیەکانی رەگەزەکانی، چۆڵ بکەین. ئەوکات دەتوانین کاتێ لایەنی کاراو پراکتیکی دەق کاڵ بووەتەوە یان تەنانەت سڕاوەتەوە، لەو هەلومەرجە نادیارانە وردبینەوە کە دروستکەری پێکهاتەو بونیادی دەقن. واتە چیدی شێوازەکانی دەربڕین، مەجازەکان، خوازەکان، تەکنیکیەکانی شیعرو.. بەکەڵك نایەن و زمانی پەتی لە دەرەوەی مانا داسەپاوەکان یان ئەوکۆمەڵە مانایانەی بۆ دەق دەگێڕرێنەوە، دەردەکەوێت. تێزی دێریدا وەك فورمالیستە رووسەکان (وردبوونەوەیە لە خودی (دەق)، بەڵام ئەو لەم ئاراستەیەدا پێ لەسەر وردبوونەوە دادەگرێ، نەك لەسەر دەق و دەڵێت کە شتێك لەدەرەوەی دەق بوونی نیە. چونکە ناکرێت لەدەرەوەی دەق لە شتێك وردبینەوە، کەوابوو سەرجەم مانا داسەپاوەکان دەسڕینەوە. [لەمەشدا] تەنیا مەبەستی نووسەر و هەلومەرجی مێژوویی و سایکۆلۆجی و کۆمەڵناسیەکان، ناسڕینەوە، بەڵکو هەموو شتێکی (گێڕانەوە) (نسبت دادن) دەسڕێتەوە. دەکرێت بەئاسانی ئەوە ببینین کە ئەم شێوە نەخشەیەی پێویستی (پێکهاتە شکانی) دەق، هیچ نیە جگە لە بەردەوامی لوژیکی کورت کردنەوەی دیاردەناسیانە کە هوسریل داوای دەکرد. واتە گەیشتن بە ئەپوخە یان (پێش داوەری داماڵین) و هەموو بابەتە زیادەکان لە (خودی بابەت) جیاکردنەوە.

(پیتر ئاینزمان) ی میعماریش پێشنیارێکی (لەم شێوەیەی) هەیە. ئەویش وەك دێریدا ئەڵێت دوالیزمە بەرامبەرەکان وەلاوەنێن (بەرامبەری نێوان بونیادو جوانکاری - دکوراسیون -، نێوان ئەزموونگەری‌و فۆرمەلەکردن، نێوان شکڵ‌و کردار..). ئەم وەلاوەنانەی دوالیزمە بەرامبەرەکان بەمانای لەدەستدانی ڕێسا ناسراوەکانی میعماری نیە، [بەڵکو] دۆزینەوەی ئەو ڕێسایانەیە کاتێك ماناگەلێك دروست دەکەن بەدەر لەوەی بە تاکەمانای ئەو [ڕێسایانە] وەردەگرێت.[٥٤] ئەوەی کە ئێمە فەزای میعماری وەك دەق تەماشابکەین دەگەڕێتەوە بۆ گوتاری بونیادگەری. لێکچونی شارو دەق لەبەرهەمەکانی رۆلان بارت دا هاتووە.

بەلام دێریدا کرداری میعماری لەگەڵ کرداری نووسین دا بەیەك شت دادەنێ. ئەو بە ئاماژەکردن بۆ قسەی نیتچە لە (هەنووکە مرۆڤ) دا کە پرسیویەتی (بۆچی من ئەوەندە کتێبی باش دەنووسم؟) دەپرسێت (بۆچی ئاینزمان وا باش دەنووسێت؟).[٥٥] نووسین لە گوتاری سەنتەریزمی ئاخاوتن دا (پاشکۆی پاشکۆیە)، لەنێوان ئاخاوتن و مانادا ماوەیەك هەیە. بەدەربڕینی ئەفلاتوون نووسین دووجار لەمانا دوور ئەکەوێتەوە. دێریدا لەم ماوە (تیوریەوە) ئەو دەرئەنجامە وەردەگرێت کە مانا بوونی نیە. ئێمە بۆ ماناو ماوە پەیوەندی دادەهێنین. گراماتۆلۆژی (زانستی ئەم داهێنانەیە). وەك چۆن لە نمونەی شاری چۆڵ‌و جێماو دا، ئەو کارەساتە - هەرچیەك بوو - زانستی پێکهاتەو بونیادی پەیوەندیە لوژیکی‌و سیمانتیکیەکان‌و دواجار زانستی داهێنانی مانای، داهێنا.

کەوابوو لە سنوری گوتارێکدا کە لە بونیادی خۆیدا ڕەنگدانەوەی میتافیزیکیای ئامادەبوونە، رادەوەستین. بەم مانایە دێرێدا هەرگیز قبوڵی نەکرد کە پێکهاتە شکانی بە مانای دابڕانی لەگوتاری فەلسەفی مۆدێرن بێت. دەزانین کە ئەم گوتارە پشت ئەستوورە بە میتافیزیکی ئامادەبوون، واتە گوتارێکی (سەنتەریزمی ئاخاوتن) ە. بەلام تەنیا بەکارکردن لە سنووری ئەم گوتارەو ڕەخنەگرتن لێی، دەکرێت سەرجەم ئەوەی نەیتوانیوە دەرببڕێ (یان بزانرێ، یان بەگریمانە وەرگیرێ، یان ئامادەبێت) بدۆزینەوە. ڕێك وەك زەردەشت کە ناچاربوو خەڵوەتگای خۆی لە لوتکەی شاخەکان بەجێ بهێڵێ، بەلام ڕێگایەکی نەدۆزیەوە بۆئەوەی بچێتە ناو خەڵکەکەوە (مەترسی بکات). کەوابوو ئەو ستایشەی ئاراستەی ئەو بەندبازەکرد کە (مەترسی) کردووە.

پێشنیاری دێریدا بریتی نیە لە دابڕان لە گوتاری مۆدێرن یان داهێنانی گوتارێکی تازە، واتە گەیشتن بە ئەڵتەرناتیفێکی دروستکراو، کۆمەڵەیەکی دیسان دروستکراو لەلۆجیکی بەڵگەهێنەرەوە. نیتچە و هایدگەریش لەچوارچێوەی قبووڵ کراوی گوتاری مۆدێرن دا، کاریان کرد. تەنیا بەخۆخستنە ناو ئەم چوارچێوەیەوە دەکرێت وەك دێریدا (لە وتاری - ئەفسانەی سپی - دا) ئاماژە بکەین بۆئەو جێگەیەی نیتچە نەیتوانی [تیایدا] جیاوازی بکات لەنێوان مەجازەکانی دەربڕینی فەلسەفی‌و چەمکە فەلسەفیەکاندا. واتە بچینە دوای ئەوخەیاڵەوە (کە پشت ئەستوورە بەمیتافیزیکی ئامادەبوون) کە چەمك (مەدلوولی گوزارە فەلسەفیەکان) دەردەبڕێت. ئەگەرچی نەك بە زمان، لایەنی کەم بەفیکرو نەیزانی فیکر و [واتە نیتچە نەیزانی] کە لەنێوان چەمك‌و دەربڕین (ئاخاوتنی زەینی) دا چ ماوەیەکی نەبڕاوە هەیە.[٥٦] بەڵێ دەکرێت بەیارمەتی گوتاری فەلسەفی مۆدێرن لەگەڵ خودی خۆیدا بجەنگین (وەکو جەنگ لەگەڵ دنیا، زمان، دەق)دا. دێریدا بەتایبەتی لەدوا نووسینەکانیدا پێی لەسەرئەوە داگرت کە پێکهاتە شکانی

ناتوانێ لەدەروونی نەخشەی مۆدێرنیتی، رابکات. تەنانەت کاتێ دەیەوێت بونیادی سستی بەڵگە هێنانەوەکانی ئاشکرابکات، یان پەنجە بخاتە سەر ئەو دژایەتیە دەروونیانەی کە چەمکە پێکەوە بەستراوەکانی ئەم پرۆژەیەیان دروست کردووە. پێکهاتەشکانی هەمیشە بیری لە بەڵگەنەویستە فەلسەفیەکانی مۆدێرنیتی کردووەتەوە، [بەڵام] بیرکردنەوە لێیان لە هاوقسەیی لەگەڵیدا جیانیە. هاوقسەیی نەك بەمانای قبووڵ کردنی دەرئەنجامەکانی وتووێژ، بەڵکو بەمانای (هەوڵدان بۆ دەرهێنانی ئیمکانات لەناو دڵی ئەم یەك ئیمکانەوە). لەڕێی ئەم هاوقسەییەوە دەقەکانی رۆشنگەری و لایەنگرانی رەخنەکاری‌و پێکهاتەشکانی (شیکردنەوە) دەبن بەیەك. دەنا کارەکە دەبێت بەشێوەیەك یاری کردن بە وشەکان. یاریکردن بە وشەکان، کەم نیە. هەر دەقێك شێوەیەك یاری کردنە بە وشەکان. هەرمانایەك ڕێسای یاریەکی تازە پیشان ئەدات. هەر راڤەکردنێك داهێنانی رێسایەکی تازەیە. بەڵام ئەگەر ئەم یاریە بیەوێت بزانرێت، دەبێت روون بکرێتەوە.[دەبێ] کەسێ بە ئەگەری ڕێسا بێ ئەژمارەکان ئاشنا بکات. وتوێژ لەگەڵ ethos یان ئەخلاقی روشنگەری، ئیمکانی ئەوە دەدات کە باوەڕی ناوەندی بە (ئامادەبوونی مانا) بێ بایەخ بێت.

پێکهاتەشکانی واتە خوێندنەوەی دەقێك ئەوەندە لە نزیکەوە کە جیاوازیە چەمکیەکان – ئەو جیاوازیانەی دەق لەسەر بناغەیان راوەستاوە – سست ببێ‌و لەناوبچن. ئاشکرا دەبێت کە ئەم جیاوازیانە لەسەرەتاوە پێکەوە نەگونجاوبوون‌و لەسەر بناغەی نەشازەکان راوەستاون. بەم شێوەیە دەق پێوەری دەروونی خۆی، پێوەری جیاکاری لەنێوان چەمکەکان دا لەدەست دەدات. پێکهاتەشکانی ئەوە نیە کە لەبارەی دەقێکی تایبەتەوە ئەم نەگونجانە پیشان بدەین. ئەم کارە زۆربەی رەخنەگران بە (شێوازی جیاوان) لەبارەی زۆربەی دەقەکانەوە ئەنجامیان داوە. بڕوای دێریدا ئەوە نیە کە دەکرێت ئەم کارە لەبارەی هەردەقێکەوە ئەنجام بدەین. هەر دەقێك کە میتافیزیکی ئامادەبوون پێکهاتەی فۆرمەلەو دەست نیشان بکات. کەوابوو دەبینین پێکهاتە شکانی جۆرێك لە (خود ئەندێشی) شە، واتە دەق خۆی خۆی دەخوێنێتەوە و ئەومانایە وەلاوە دەنێت کە لەسەر بنەمای میتافیزیکی ئامادەبوون، دارێژراون‌و ئیمکاناتی (مانایی) تازە تاقی دەکاتەوە. واتە پێ‌دەخاتە سنووری بێ مانابیەوە. [پێ‌دەخاتە] پاننتایی ئەوەی (ناکرێت قسەی لەبارەوە بکرێ) (فنگشتاین).

ئایا دەکرێت بڵێین کە هەردەقێك – هەرچیەك بێت – بۆ دێریدا وەك شیعر دێتە ئاراوەو وەك شیعریش دەخوێنرێتەوە؟ بەڕاستی خوێندنەوەی شیعر زیاد لەهەر شێوەیەکی (خوێندنەوە) لە میتۆدی پێشنیاری دێریداوە نزیکە. دەکرێت هەر شیعرێك بەهۆی راڤەکردنە زۆرەکان و تەنانەت بێ ئەژمارەکان، بخوێنرێتەوە. بەنکوڵیکردن لە نەبوونی مانایەکی راشکاو و یەکتا، هەردەقێك لەبەردەم (تێگەیشتنە جیاوازو بێ ئەژمارەکان دا) دەکرێتەوە.

زمان ناتوانێ بەسترابێ بە ئەزموونی ئامادەو راستەوخۆوە. چونکە بە وتەی سۆسێر بەستراوە بە جیاوازی (و ونبوون) ەوە. کاتێ دەڵێین (چ کتێبێکی باشە!) یان (دامێنی سەوز) رووبەڕووی دراوێکی زمانی (دەقی ، گوتاری) بووینەتەوەو توانای گەڕانەوە بۆ ئەزموونێکی راستەوخۆو نازمانیمان، نیە، ئێمە تەنیا کۆمەڵێ مانامان لەبەردەست دایە، مەدلوول هەمیشە نادیار دەمێنێتەوە. ئەم خاڵە بەمانای ئەوە نیە جیهانی دەرەوە، واتە جیهانی بابەتەکان، بوونی نیە. بەڵکو بەومانایە دێت ناکرێت پێناسێکی هاوبەش، تاکانە و بڕاوە بۆ شتەکانی دنیای دەرەوە

پێشکەش بکەین. مانای هەر رستەو گوزارەیەك لە یاری زمانیدا دروست دەکرێتو ئەزموونێکی سەربەخۆ لە شتەکان کە لە دەرەوەی ئەم یاریە زمانیە فۆرمەلە ببێت، بوونی نیە، (و) مومکین نیە.

جیهانی بابەتەکان وەك دەقە، هەرگیز ئەو مانایەی نیە کە دەیڵێتو ئەو شتە ناڵێت کە لەسەریدایە. پێکهاتە شکانی لەسەردەق چڕدەبێتەوە بەڵام لەوێدا ناوەستێت، کاری دێریدا پێکهاتەشکانی دەقەو ئەم شاردنەوە کاریەی دەق لەبارەی دەقە فەلسەفیەکانەوە بەهەمان ئەندازە بەڕاستی دەزانێ کە لەبارەی دەقە هونەریو ئەدەبیەکانەوە [بەڕاستیت دەزانێ]. فەلسەفە بانگەشەی ئەوە دەکات (لەڕاستیدا لقێکی گرنگ لەعەقڵانیەتی فەلسەفی هاوچەرخ، بانگەشە ئەکات) کە دەستی گەیشتووە بە زمانێکی پەتی، واتە چیدی گوتارێکی خوازەیی نیەو بۆ تێگەیشتنی پێویستمان بە تیۆرەی دەربڕین نیە. دۆزینەوەی شکستی فەلسەفە (یان لقێکی) لەم رووداوەدا بەمانای تێگەیشتن لەبێ توانایی زمان، لەڕاکردنیدا لە مەجازەکانی تیۆرەی دەربڕین. ناسینی ناهوشیاری دەقی فەلسەفی پەیوەندی بە تێگەیشتنی رووبەڕی خوازەی دەربڕینی فەلسەفیەوە، هەیە. سەنتەریزمی دەنگ پەیوەستە بە ئامادەبوونی مانا یان میتافیزیکی ئامادەبوونەوە. لەئەفلاتونەوە تا (زانستی مرۆیی تازە) هەمیشە قسەی ئاخاوتنو دەنگ لەقسەی نوسین بە گرنگتر ناسرا. هەمیشە گومانی ئەوە دەکرا لە ئاخاوتن دا مانا ئامادەیە، واتە بەهۆی بیستنی حەرفو ئاماژە دەنگیەکان دەتوانین (مانای واقعی) یان لەڕێی ئالوگۆڕی زمان، فکرو واقیعەتەوە، بدۆزینەوە. لێرەدا پەیوەندییان بەستۆتەوە بە بیرۆکەی رووبەڕووی دوو یان چەند خود لە وتو وێژێك دا. کەوابوو نووسینیان بە پەیوەندیەکی ناکامڵ زانیوە. هەرگیز ئیمکانی تاقیکردنەوەی یەکسەری ئەندێشەکان تیایدا بوونی نیە. ئاڵوگۆڕی ماناو واقیعەت، زمانو ئەندێشە تیایدا، یان مومکین نیە یان زۆر سنووردارە. لێرەوە قەدیس ئەگۆستین دەیگوت کە (نووسین، شێوەی گێڕوتنە) و هەمیشە بەزیادە، یان بە پاشکۆی مانا دەژمێررێت. لە فایدروسی ئەفلاتوون دا بەروونی ئەتوانین ببینین کە ئاخاوتن و نووسین لەیەك پلەو پایە دانانی بەهاییدا دادەنرێنو پەیوەندیەك وەردەگرن کە هەر لەسەرەتاوە گرنگتربوونی ئاخاوتن زامن دەکات. بە وتەی ئەرستۆ (ئەو دەنگانەی بەهۆی دەنگەوە دروست دەبن، سیمبۆلەکانی هەلومەرجێکی فیکریو وشەکانی نووسین سیمبۆلەکانی ئەو وشانەن کە بە دەنگ دروست دەبن).[٥٧] دێریدا بە باسکردنی ئەم پەیوەندیە بە ئەنجامێکی گرنگ دەگات: هەموو دوالیزمێکی بەرامبەر دەبێتە هۆی پایەو پلە دانانێکی بەهایی.

دێریدا لەباس کردنی فایدرۆسی ئەفلاتوون دا پیشانی داوە کە ئامانجو مەبەستی فەیلەسووف لەم دەقەدا ئەوەیە کە ئاخاوتن بەرزترە لە نووسین. بەڵام سەرنج لەدەقەکەی ئەفلاتوون ئەیسەلمێنێ کە نووسین (یان بیرۆکەیەکی تایبەت لە نووسین) لە فکری فەلسەفی و هەرشێوەیەکی عەقڵانیەت کە ئاڕاستەی چونایەتی، پانتایی، سنوورو لۆژیکی زمان (چ زمانی فەلسەفی یان شتێکی دی) بێت، جیا نابێتەوە، ئەم خاڵە بەمانای بەرزبوونی نووسین نیە بەسەر ئاخاوتندا. هەردووکیان لەماناوە دوورنو هیچیان ناتوانن بانگەشەی نزیکی خۆیان بکەن لەواقعییەتی شتەکانەوە، بەڵام ئەو پلەوپایەدانانە بەهاییەی کە بەلایەنگری ئاخاوتن، نووسین بەبێ توانا دەزانێ، زۆرتر بەهۆی باوەڕ – کردن بە ئەگەری ئامادەبوونی ماناوە دەبێتە هۆی هەڵەی زۆر.

دێریدا لە کتێبی (لەبارەی گراماتولۆژی) یەوە دەری خستووە کە ئامانج و مەبەستی رۆسۆ ئەوە بوو بیسەلمێنێ سروشت لە ژیانی مرۆڤدا سەرچاوەو بنەمای هەرشتێکی باش و تەندروست و راستەو بە پەرەسەندنی کلتور پێ بە پێی پێشکەوتنی کۆمەڵگاکان، شێوەی ئاڵۆزترو بەرزتر لە رێکخستنی کۆمەڵایەتی و تەکنیکی فۆرمەلە بووەو (بەمەش) لە ئیمکانی پەیوەندی مرۆڤ بەرەگەزەکانی سروشتەوە کەم بووەوە. بەم شێوەیە مرۆڤ لەو (حەقیقەتە بونیادیە) دوورکەوتەوە. ئەم بیرۆکەیەی رۆسۆ کە لەبونیادو جەوهەریدا (دژی رۆشنگەری)یە (و لە بیرۆکەی رۆمانسیە ئەڵمانیەکانەوە زۆر نزیکە) دەورێکیشی بۆ زمان دادەنا. زمان لەم دووریە لە سروشت و نزیکبوونەوە لە بونیادە ئاڵۆزو تەکنیك و کلتوریەکان، بەشێوەیەکی روو لە زیاد بەکارهێنانەکانی ئاڵۆز تر بووە تا دواجار فۆرمەلەی بیرۆکە ئەبستراکتەکانی کرد کە لە (دۆخی سروشتیەوە) زۆر دوورن. کەوابوو هەموو شتێك مانای رەسەن و سروشتی خۆی لەدەست دا. ئەومانایەی کە لە ئاخاوتنێکی سادەی بێ ئارایشتدا هەم بەدەست دەهات و هەم دەردەبڕرا، لەناوچوو بەهۆی پێشکەوتنێکی هاوئاهەنگەوە، زمانێکی ئاڵۆز فۆرمەلەبوو کە لە (دەوڵەمەندی سروشتی) دەنگەکانی کەم کردووەتەوە، رۆسۆ تا ئەو جێگەیە چووە پێشێ کە گوتی موسیقا لە هاوئاهەنگی دەنگەکانی ئاخاوتنەوە فۆرمەلە بووە، بەڵام پێ بە پێی پێشکەوتنی ژیانی کۆمەڵایەتی لەو دەنگانەی ئاخاوتن دوورو بەردەوام زیاتر لەشێوازەکانی (نووسین) نزیك بۆوە.(٥٨)

رۆسۆ دیسان نمونە دێنێتەوە کە لەدۆخی سروشتیدا ژیانی جنسی، سۆزدارەو وەك ئاخاوتن سادەو بێ ئارایشتە، شێوەیەکی گواستنەوەی هەست و پەیوەندی سروشتیە. بەڵام لە ژیانی کلتووریدا ئەم لایەنە سروشتیو غەریزیە لەناو دەچێت. لە بەراوردی رۆسۆدا لەنێوان ئاخاوتن / کرداری سروشتی جنسی لەلایەك و نووسین / دەستپەڕ لەلایەکی دیەوە، دەبینین کە رۆسۆ سروشتی بوون لە (ئامادەبوون) ەوە بەدەست دێنێ. بابەتی ونبوو (غائب) ناسروشتیە. لە عەشقی جەستەیی و گوتاردا پەیوەندی نێوان تاکەکان ئامادەیە لەکاتێکدا لەنووسین (و لە دەستپەڕ) دا پەیوەندیەکە زیهنیە و پشت ئەستوورە بە ونبوون.(٥٩)

رۆسۆ لەم رووەوە دەڵێت کە نووسین (پاشکۆیەکی ترسناکی) ئاخاوتنە، شتێك کە جوانی، غەریزە، ژیان، هەست سۆزو دەنگی سروشتی وێران دەکات. پاشکۆ یان بە زمانی دێریدا Supplement لوجیکێکی دوولایەنەی هەیە. لەلایەکەوە شتێك دەتوانێ وەك پاشکۆی شتێکی کامڵ بزانرێ، کە لەم حاڵەتەدا لە (زیادەیەك) زیاتر نیە. لەلایەکی دیەوە شتێك دەتوانێ لایەنی ناکامڵی شتێکی دی تەواو بکات کە لەم حاڵەتەدا کەم تازۆر بە بەشێکی ئۆرگانیکی ئەو شتە دەژمێررێت (وەك بەشی پاشکۆ یان addendum لە فەرهەنگەکانی زمان دا کە دوا گۆڕانکاریەکانی پەرەسەندنی زمان دەکاتە هاوڕێی دەقی سەرەکی فەرهەنگەکە). بەبڕوای دێریدا دەکرێت لە ئاماژەی رۆسۆدا بۆئەوەی نووسین پاشکۆی ئاخاوتنە، هەردوو لایەنەکەی پاشکۆ دەرك بکەین. رۆسۆ لەبارەی سەرچاوەی زمانەوە نووسیویەتی کە زمان سەرەتا وەك ئاوازێکی غەریزی و سروشتی فۆرمەلەبوو (گونجاو لەگەڵ رێساکانی ئاخاوتندا) پاشان گۆڕا بۆ سیستمێکی ئاڵۆز (گونجاو لەگەڵ رێساکانی نووسین دا). هەر لەبەرئەمەش بەهاکەی کەم بووەوە و دابەزی. زمان تەنیا دەتوانێ لەسەر بنەمای رێکەوتن – نامە هاوبەش و قبوولکراوەکان، پەیوەندی لەنێوان ئەو

کەسانەدا دروست بکات کە بەکاری دێنن. بەڵام ئەم رێکەوتننامانە لەسەر بنەمای پێش گریمانەکان، هاوتەنیشتی سیستمی دەنگە جیاوازەکانو مانا جیاوازەکان، دروست بووە. تیورەی رۆسۆ (کە لە هەمەکیترین شێوەی خۆیدا تاڕادەیەك لەتیورەکانی سوسێر دەچێت) پشت ئەستوورە بە میتافیزیکی ئامادەبوون، واتە (پشت ئەستوورە) بەو بیرۆکەیەی [کەبڕوای وایە] لەگەڵ سیستمی دەنگەکاندا، مانا ئامادە دەبێت هەر لەبەرئەمەش (تیورەی رۆسۆ) ئەو بەڵگەنەویستە لەگەڵ خۆیدا دێنێ کە [بڕوای وایە] ئاخاوتن پاسروشت لەنووسین پاکەلتوور، بەرزترە. بەڵام بەوتەی دێریدا لوژیکی باسەکەی رۆسۆ وەك لوژیکیە باسەکەی ئەفلاتوون، هەڵدەگەڕێتەوە. ناتوانین کۆمەڵگایەك وێنا بکەین مەگەر لە پلەیەکی پەرەسەندنی مێژوویدا کە بە هەرحاڵ لە (دۆخی سروشتی ئومێداویەوە) دوورە. هیچ سیستمو رێسایەکی کۆمەڵایەتی بوونی نیە (تەنانەت لە (سەرەتاییترین) شێوەدا کە بتوانین وێنای بکەین) کە لە کلتووردا فۆرمەلە نەبووبێ. بونیادی ژیان لە هیچ کۆمەڵگایەکدا ناتوانێ بە تەواوی غەریزیو سروشتی بێت. بەهەرحاڵ کۆمەڵێ رەمز هەن کە تاکەکان رێکەوتننامەکانیانی قبوڵکردووە، شێوەیەك دابەشبوونی کاری کۆمەڵایەتی هەیە، و شێوەیەك لە پۆلێن کردن، دەسەڵاتە جیاوازەکان (هەیە) کە بە ناچاری دەرئەنجامی کلتوری دەخەنەوە: لە رێساکانی سیستمی خێزانیەوە تا پێکهاتەیەك لە جادووگەری - پزیشکی، لە شکڵێك زانینی دانراو کە لە پێداویستیە تەکنیکیەکانی ژیانی رۆژانەوە هاتووە، تا گرنگترین دەزگای سیمۆلۆژی واتە زمان. بنەمای ئەخلاقی تێڕوانینی رۆسۆ لەبارەی سەرچاوەی ژیانی کۆمەڵایەتیەوە، ئەوەیە سروشت دروستکەری سەرجەم چاکیەکانە. بەڵام هەمیشە (چاکیە کلتووریەکان) لەدابو

نەریتەکانو رێسا ئەخلاقیو رێساکانی ژیانی جنسی، خێزانیو خزمایەتیەوە لەدایك دەبنو فورمەلە دەبن. رێسای سەرسەختی رۆسۆ چ لە زمان، چ لە ئاستی نووسینو چ لە ژیانی کلتوریدا، نەفی دەکرێت. دەکرێ ئەم خاڵە بە وردی لەنمونەکەی تریدا واتە لەمۆسیقاشدا، بسەلمێنرێت. ناکرێت تەنانەت وێنای یەك ملۆدی پەتی بکەین، هیچ ملۆدیەك، تەنانەت سادەترین و سەرەتاییترین شێوەی، قابیلی وێناکردنو لێدان نیە، ئەگەر لە زەمینەی هارمۆنیەکدا نەبێت، واتە پشت ئەستوورە بە پێش زەمینەی پێکهاتەی دەنگەکان، پێشکەوتنی ئاکوردەکان و .. ئەم پێش زەمینەیە بەناچاری پانتایی بەردەوامی میلیۆدیەك دادەهێنێ. ئەم خاڵە تەنانەت لەبارەی دەنگێکی یەکتاوە (تا ئەو شوێنەی وەك رەگەزێکی مۆسیقی بهێنرێتە ئاراوە) راستە.
دێریدا لەخوێندنەوەی دەقەکانی ئەفلاتوونو رۆسۆدا، راڤەیەکی تازە پێشکەش ناکات. ئەو هەوڵ ئەدات دەری بخات کە زمانی ئەم دەقانە بەناچار پێچەوانەی مەبەستی نووسەرەکانی، رەفتاری کردووە. واتە زمان بەپێی سەنتەریزمی ئاخاوتن دەچێتە پێشێ بۆئەوەی جەخت لەسەر گرنگی نووسین بکات و لەو لوژیکە جیابێتەوە. میتافیزیکی ئامادەبوون وەك لۆژیکێك لەهەر دەقێك دا، دەری دەخات کە زنجیرە پلەی نرخاندنی چەند بەسادەیی و ئاسانی دەتوانێت هەڵگەڕێتەوە. ئەم (گۆڕانە بۆ دژی خود) ئەم لۆژیکە کە ناسەقامگیری بەڵگەنەویستەکانی خۆی پیشان دەدات، بەمانایەك پێکهاتەشکانی: (هێزی دەروونی دەق) ە.
پێکهاتەشکانی، پێناسە هەڵگر نیە. دێریدا هەمیشە رەخنەی لەوە گرتووە بمانەوێ پێناسەی بکەین لەبەر ئەم هۆیەش وشەکە بە قابیلی (وەرگێڕان) نازانێ. لە وەڵامی نامەی لێکۆڵینەوەیەکی ژاپۆنیدا (بەناوی) ئیزوتسۆ (کە

بەرهەمەکانی بۆ خوێنەری فارسی ئاشنایە) دەنووسێت کە ناکرێت پێکهاتە شکانی بەوردی هەمیشە بەیەك وشە یا یەك زاراوە، دەربڕین.[٦٠]
ئەگەر بکرێت حەقیقەتێك لەپێکهاتەشکانیدا بدۆزێتەوە ئەوەیە کە ئێمە بەدەرئەنجامێك بگەیەنێت: هەر گوزارەیەکی لەم چەشنە (پێکهاتە شکانی واتە..) سنووردارکردنی مانایە بەچوونیەکی.و لە بنەڕەتدا پێکهاتەشکانی بەدوای ئەوەدا دەگەڕێت وشەی وەك (واتە) (یا بابەتی لەم جۆرە وەك (بریتیە لە ...) بۆبابەخ بکات. ئەگەر پێناس بگات بە چوونیەکی یان گونجانی دال‌و مەدلوول (ئەوا) بەناچار نکوڵی هەمەکی مانایی‌و زیندوو، لێ‌دەکرێ. ئاماژەی زمانەوانیش هەر لەبەرئەوەی لەم (چوونیەکیە) جیایە، کارایی پەیدادەکات. پەیوەست بوونی بەبێ سنووری دەلالەتەکان (کە دێریدا ناوی دەنێ جیاوازی، یان بە زمانی خۆی Difference) ئیمکانی ئەوە نادات لە (یەك پێناس دا جێی بێتەوە). بەلام ئێمە دەتوانین ئەو خاڵە روون بکەینەوە کە بۆچی تێکشکانی پێکهاتەی دەقێك پێویستە. بەپێی ئەو تێڕوانینەی کەدێریدا بە (میتافیزیکی رۆژئاوایی) لەقەڵەمی ئەدات، هەردەقێك (هەر کۆمەڵێ دەلالەتی جیاوازی) خاوەنی مانایە کە تیایدا ئامادەیە. کارو ئەنجامی زانست (و بەمانایەکی هەمەکی: کارو ئامانجی لێکۆڵینەوە) دۆزینەوەی ئەم مانایەیە. لەبەرئەوەش کە مانا بەهەرحاڵ بوونی هەیە، کارەکە دەتوانێت دواجار بەئەنجامێك بگات. هەرچەندە ئەم کارە هەندێ جار ئاسان‌و هەندێ جار بە گران ئەنجام ئەدرێت. بەلام مانا هەرگیز ئامادەنیە. ئەگەر گریمان ئامادەش دەبوو، لەبەرئەوەی زمان لەبونیادە جیاوازەکان دروست بووە (بە وتەی سۆسێر لە بونیادە جیاوازەکان، پەیوەندیە جیاوازو بەرامبەرەکان) و هەمیشە مانا دوادەخات، کەوابوو (مانا) دەرنابڕێت.

دێریدا لە خوێندنەوەی بەشێك لە پارچەیەکی درێژی هۆسریل دا بەناوی (سەرچاوەی هەندەسە) (کە لە کتێبی – قەیران – دا هاتووە) پیشانی دا کە تەنانەت حەقیقەتە هەندەسیەکانیش نمونەیی نین‌و بەپێچەوانەی بڕوای هۆسریلەوە (کە رەگی لە نەریتی ئەقلیدیسدا هەیە) (لە سنووری رەهادا نین). هوسریل لە نووسینەکەی خۆیدا بەم شێوەیە بەلگەی هێنابووەوە کە حەقیقەتە هەندەسیەکان هیچ پەیوەندیەکیان بەنووسینەوە نیە. بەلام دێریدا پیشانی دەدا کە لە خودی نووسینەکەی هوسریلدا دەکرێت رستەگەلێك بدۆزینەوە کەلە سەر ئەم پێش گریمانەیە بونیاد نراون کە بۆ نموونەیی بوونی حەقیقەتی هەرشتێك ناتوانین لەبواری حەدسی پەتیدا لێیان بکۆڵینەوە، بەلکو دەبێت وێنای شکڵێکی مێژوویی لە زانین بکەین.. شکڵێك کە بەناچار بەستراوە بە نووسینەوە.

بە وردبوونەوە لە باسەکانی دێریدا کە زۆر بەکورتی و بە ئاماژەکردن باسم کرد، ئەم خاڵە دەزانرێ: دێریدا بەشێوەیەك بەدوای هەمان پرسیارەوەیە کە زهنی کانتی بەخۆیەوە خەریك کردبوو: چۆن زهن دەتوانێ پەرەبسێنێ کاتێك رووبەڕووی ژمارەیەك مەسەلەی کۆتایی دەبێتەوە کە پەیوەندی بە ماهیەتی خۆیەوە هەیە؟ کاتێ بیر لەخۆی دەکاتەوە، خۆی هەڵدەسەنگێنێ‌و پرۆژەگەلێکی دروستیش لەهەمان بابەتەوە دەخولقێنێ؟ ئەم پرسیارانە، دێریدا وەك کانت بۆهێنانە ئارای مەسەلەی مۆدێرنیتی رادەکێشێ. لە دوا کتێبدا کە تائەمڕۆ لە دێریدا بڵاوبۆتەوە واتە (خێوەکانی مارکس) جارێکی دی دەگەڕێتەوە بۆ مەسەلەی بێ سەروبەری جیهانی مۆدێرن و دەری دەخات کە چونکە تێگەیشتنی بیریاری شۆڕشگێڕی سەدەی پێشوو [واتە مارکس] لەدوای هەمان بێ سەروبەری زیهندا مابووەوە، واتە گرفتاری ئەو (مەسەلە

کۆتاییانه) بوو، نەیدەتوانی جگە لە جیهانێکی (بێ سەرویەر) و (نەگونجاو) شتێکی دی بناسێ. ئەم کتێبە وەك دوابەرهەمەکانی دێریدا بە زمانێکی ئاڵۆز و پڕ لە ئاماژە و کینایە نووسراوە. ئەو لە خێوێکەوە کە لەیەکەم دێڕی (مانیفیست) دا باسکراوە، دەست پێدەکات [و] لەخێوی باوکی هاملێتەوە، پاشان وتەی هاملێت لەپاش بینینی خێوی باوك بەبیر دەهێنێتەوە کە باسی (سەردەمی نەگونجاو) دەکات (The time is out of joint) (پەردەی ١، لاپەڕە: ٥).[٦١] دێریدا لەم (نەگونجانی سەردەمەوە) بەهۆی نووسینەکانی پۆل ڤالێری، مۆریس بلانشۆو مارتین هایدگەرەوە دەگات بەنکوڵیکردن [لەم] سەردەمە. مارکس چۆن سەردەمەکەی قبووڵ نەدەکرد؟ ئەمڕۆ گرانی کاری ئێمە لەم (زەمانە نەگونجاوەدا) ئەوەیە کە لە نکوڵی کردنیشدا بێ توانایین. وەك چۆن چەمکی دادپەروەری (Dike) بۆ هایدگەر لە قسەکانی ئانا کسیمندر دا تەنیا بەمانای دادپەروەری (Das cerechte) نیە بەڵکو هاوکاتە لەگەڵ Adikiu کە هەم نادادپەروەریەو هەم بێسەروبەریو هەم نەگونجانی ڕۆژەکان.[٦٢]

مارسلوس لە سەرەتای نمایشەکەی شکسپیردا بەهۆراشیۆ دەڵێت: (تۆ خاوەنی زانینی هۆراشیۆ. لەگەڵی دا قسەبکە) بەڵام خێوەکە لەگەڵ هۆراشیۆدا قسە ناکات. دێریدا پیشانی ئەدات کە یەکێك لە زانایانی سەدەی پێشووش نەیتوانی لەگەڵ خێوێك دا قسە بکات کە وای دەزانی (و بەتوندیش لەسەر ئەو باوەڕەبوو) ئازادی لەگەڵ خۆیدا دێنێ. خێوێك کە بەبڕوای ئەو هەم زادەی ڕۆژگاری نوێ بوو، هەم پەیامەکەی بەکۆتایی دەگەیاند. بەڕاستیش ئەو خێوە یەکێك لە خێوەکانی مۆدێرنیتی بوو، ڕەنگە هەر لەبەر ئەم هۆیەش نەیتوانی ئازادی بهێنێ.

## سەرچاوەکان:


1. W.e. Connolly, Political Theory and Modernity, Oxford, 1991, p.1.
2. G. Raulet ed, Weimar ou leplosion de la modernite, Paris, 1984, p.19.
3. H. Meschonic, Modernite, Modernite, Paris, 1988.
4. C.Jencks, The Language of postmdern Architecture, London, 1977.
5. I. Howe , The Decline the New, New york, paris, 1985.
6. J-F. Lyotard, La condition postmoderne, Paris, 1985.
7. J-F.Lyotard, Lecture denfance, Paris, 1991.
8. J. Derrida, Ulysse Gramophone, Paris, 1987.
9. G.Deleuze, F. Guattari, Kafka, pour une litterature Mineur, Paris, 1984.
10. G.Deleuze, Critique et clinique, Paris, 1993, pp. 14-15.
11. J-F. Lyotard, "Du bon usage du postmoderne" Magazine Litteraire, mars 1987, p. 97.
12. M.Berman, All That Is Solid Melts Into Air, New york, 1982, p.15.
13. A. Portoghesi, Postmodern, London, 1978. P.8.
14. Le courbusier (Eduard Jeanneet- Gris), Towards A New Architacture, tra F. Etchells, London, 1972, p. 184.
15. Ibid, p.79, p. 181.
16. C.Jencks, the language of..., p. 9.
17. R. Venturi, Complexity and Contradiction in Architecture, New york, 1966.
18. C.Jencks, The Language of..., p.132.
19. G.Deleuze, Differnce et repetiton, Paris, 1976, P. 384.
20. ف. نیتچە، چنین گفت زرتشت، ص (٣٤١-٣٤٥).
21. G.Deleuze, Differnce et ..., p. 387.
22. M. Heidegger, Essais et confernces, pp. 116-147.

هەروەها سەیری وتارێکی تری هایدگەر بکەن (ئاخاوتنی نیتچە
M.Heideggerسەبارەت بەوەی کە خوا مردووە) لە:, Chemins
qui ne menent nulle part, pp. 173-219.
23. M
. Heidegger, Essis et..., p.124.
24. ف
. نیتچە، چنین گفت زرتشت، ص ٢٠٦.
25. ھ
.س . پ . ص (٣٠٧-٣٠٨).
26. M
. Heideggerg Essais et..., p.143.
27. أ
. یونگر، عبور از خط، ترجمة و تقدیم. هومن، تقریر .م. ال
احمد، تهران، (١٣٤٦).
کتێبەکە لە ساڵی ١٣٤١ دا وەرگێڕاوە و دوو فەسڵی (تەنها
دوژمارەی کیهان ماه) دا بڵاوکراوەتەوە.

28. M. Heidegger, Questions. Vol. 1 pp.195-252.
29. Ib
id, P. 200.
30. M
.Heidegger, Nitzsche, vol. 2, pp. 205 –206.
31. Ib
id, pp. 211- 219.
32. Ib
id, p. 233.
33.
34.
حوکمی هایدگەر لە وتاری (چونیەکی و جیاوازی) دا لە:
Ibid, p.285.
35. Ib
id, pp.209-210.
36. M
.Foucault, Politics, Philosophy, Culture, ad. L.D.
Kritzmam, London, 1990, p. 35.
37. F.
Nietzsche, The Anti –Christ, p. 187.
38. J.
F. Lyotard, La condition postmodern, p. 7.
39. Ib
id, p. 95.
40. Ib
id, p.11.
41. Ib
id, p.13.
42. Ib
id, p. 16.
43. Ib
id, p. 17.
44. Ib
id, p. 23.
45. J-
F. Lyotard, Moralites Postmoderns, Paris, 1993.
46. J-
F. Lyotard, La condition..., p. 35.
47. J-
F. Lyotard, Le postmodern explque aux enfants, Paris,
1988. P. 28.
48. G
. Vattimo, La fin de la modernite, tra Ch. Alunni, Paris,
1987, p. 105.
49. Ib
id, p. 106.
50. Ib
id, p. 154.
51. Ib
id, p. 167.
52. Ib
id, p. 8.
53. Ib
id, p. 170.
54. J
Derrida, Lecriture at ia difference, p. 13.
55. C
h. Norris. A. Benjamin, What is Deconstruction? London,
1988. P. 27.
56. J.
Derrda, Psyche, Paris, 1987. Pp. 495-508.
57. J.
Derrida, Marges da philosohie, Paris. 1979, pp. 247-324.
58. A
ristotle, Categoris and De Interpretation, tra. J-L. Ackrill,
London, 1990. P. 43.
59. س
لەیری پێشەکیەکەی ژان ستاروبینسکی بکەن لە:
J-J. Rousseau, Essais sur Iorigine des langues, ed. J.
Starobinski, Paris. 1990.
60. ب
. احمدی، ساختار و تاویل متن، ج ٢، ص ص (٤٠٣-٤٠٤).
61. J.
Derrida, Psyche, p. 393.
62. J.
Derrida, Spectres de Marx, Paris, 1993m p. 19.
63. M
.Heidegger, Chemins..., pp. 262-304.

# مرۆڤی بێ خوای سەردەمی مۆدێرنیزم و پۆست مۆدێرنیزم

■ جۆن . ك . مۆرای

● و: م . خالید

## ١- مرۆڤی بێ خوای سەردەمی مۆدێرنیزم

ئێمە لەم سەردەمەدا بەرەو رووی دوو جۆر ئینسانی بێ خوا ئەبینەوە، یەکەم، مرۆڤی ئاکادیمی بێ خوا، کە سیمای بێ باوەڕیی ئەریستۆکراتی سەدەی هەڤدەو هەژدەیە، هاندەری بێ باوەڕی ئەو ئەوە بوو کە دەیویست بەبێ خوا لە جیهان بگات و روونی بکاتەوەو مەبەستیشی لە جیهان، سروشت و مرۆڤ و مێژوو و کۆمەڵگابوو.

دووەم، مرۆڤی بازاڕیی بێ خوایە کە سیمای بێ باوەڕیی سەرمایەداریی سەدەی نۆزدەهەمە. هاندەری بێ باوەڕیی ئەو تەنها ئەوەبوو کە ئەیویست بەبێ خوا، کامەرانیو خۆشگوزەرانی ئەم جیهانە مسۆگەر بکا.

بە پێویستی ئەزانم هەر خێرا ئەمە بڵێم کە روونکردنەوەی سەرەوە، روونکردنەوەیەکی زۆر سادەو سەرەتایی مەسەلەیەکی مێژووییە. چونکە، بۆ نموونە: بە هیچ شێوەیەك لایەنی سیاسی مەسەلەکەی لەبەرچاو نەگرتووە. ئیلحاد یان بێ باوەڕی ئەرستۆکراتی سەردەمی رۆشنگەریی فەرەنسا، هۆکاری سیاسیشی هەبوو.

یەکێك لە ئامانجە گرنگەکانی رەخنەگرتن لە دین - یان وردتر بڵێین، رەخنە لە ئایینزای کاسولیك و ئەو یاسایانەی کەلیسا کە پەیوەندییان بە ژیانی کرمەڵایەتیەوە هەیە ئەوەبوو کە هێزی پادشا لاواز بکرێو رێگە خۆش بکرێت بۆ رەخنەگرتنی راستەوخۆ لە دەسەڵاتی

بێ چەندو چوونی پادشا کە لەلایەن پایەبەرزانی کەلیساوە پشتگیری ئەکرا. بێ باوەڕیی سەرمایەداریی سەدەی نۆزدەهەمیش هۆکاری سیاسی هەبوو.

ئامانجی دوژمنایەتی کردنی دین لەم سەدەیەدا بریتیبوو لە ریشەکێش کردنی پاشماوەکانی سستەمی فیودالّی و پایەو پلەی ئەرستۆکراتەکان‌و سامانی مولّکدارە گەورەکان، کە هەر هەموویان پەیوەندیەکی نزیکیان لەگەڵ کەلیسادا هەبوو. لە سەدەی هەقدەو هەژدەو تەنانەت سەدەی نۆزدەهەمیشدا، باسکردنی مەسەلە دینیەکان بە بێ رووبەڕووبوونەوەی مەسەلە سیاسی‌یەکان‌و بە پێچەوانەوە، کارێکی ئەستەم بوو، وەك چۆن لەو سەردەمەو پاش ئەویشدا باسکردنی مەسەلە میتافیزیکیەکان بەبێ باسکردنی مەسەلە دینیەکان، ئەستەم بوو. پاش دارمانی پێکهاتەی هەڵوەشاو و ناسەقامگیری سەدەکانی ناوەڕاست لە پڕێکدا کۆمەڵێ سیستەمی شێواوی فکری‌و بواری کرداری سەریان هەڵدا.

مێژووی بێ باوەڕیی نوێ بە شێوەیەکی داخ هێنەر بە مێژووی بە حساب (ئازادییە نوێکان) ەوە گرێ دراوە. دیارە ئەمە رووداوێکە، کە رەنگە بکرایە رووی نەدایە، بەڵام بەکردەوە رووی داوە. بەهەرحاڵ لایەنە سیاسیەکەی بابەتی کوفرو بێ باوەڕی لەوە ئاڵۆزترەکە لە لێکۆڵینەوەیەکی کورتدا باسبکرێت.

هەروەها من لەو بڕوایەدام کە ئەم لایەنە، شتێکی بەڕێکەوت و ئاکامی بارودۆخێکی مێژوویی بووەو رووادنیان شتێکی پێویست نەبووە. هەروەها هۆکاری سیاسی ناتوانێ مەسەلەی سەرەکیی بێ باوەڕی، کە لە بنەڕەتدا لایەنێکی دینی‌و فکری هەیە، پێناسە، یان روون بکاتەوە. چونکە ئەگەر هەرگیز هیچ پەیوەندیەکیش لەنێوان کەلیساو تەخت‌و تاجی دەسەلاتدا نەبوایە، دیسان مرۆڤی بێ خوای سەردەمی پۆست مۆدێرنیتی پەیدا ئەبوو.

بە رای من مەسەلەی سەرەکیی بێ باوەڕی، رونکردنەوەی سەرچاوەی مەیلی بێ باوەڕییە، لە بنەڕەتدا ئەم سەرچاوەیە کە دیاردەی روحیەتی نادینی‌و دیاردەی سەردەمی مۆدێرنیتیە، جگە لە مەیلی مرۆڤ بۆ تێگەیشتن لە جیهان و ژیان لە جیهاندا، بەبێ خوا، هیچی تر نیە.

روونکردنەوەی سەرچاوەی روکردنە کوفرو بێ باوەڕی، ئەرکێکی گەورەیە لە مێژووی بیرکردنەوەو کەلتوورو دیندا، من لەنێوان هۆکارە کاریگەرەکاندا تەنها تیشك ئەخەمە سەر هۆکارێکی ئاڵۆز، واتە دەسکەوتی سەدەکانی ناوەڕاست. لەو سەردەمەدا سێ رووداوی گرنگ روویدا کە لە مێژووی بێ باوەڕیدا رۆڵی چارەنووس سازیان هەبووە.

یەکەم رووداو ئەوەبو کە مەسەلەی (خوا) بوو بە مەسەلەیەکی میتافیزکی‌و ئەپستمۆلۆژی‌و زمانی، کە ئەبوایە عەقڵی فەلسەفی یەکالای بکردایەتەوە.

بەم جۆرە، بۆ یەکەم جار لە مێژوودا، ئەم مەسەلە (چوار لایەنیە) [1] راستەوخۆ لە بەرامبەر عەقڵی مرۆڤدا راوەستا. بەجێهێنانی ئەم ئەرکە هەنگاوێکی بێ پەروایانە بوو . چونکە دانانی مەسەلەی (خوا) لە بەرامبەر لێکۆڵینەوەی عەقڵانیدا، بانگەشەیەك بوو بۆ خیانەتکردن لە نەریتی عەقڵانی. لە سەردەمی سەدەکانی ناوەڕاستدا نەریتی عەقڵانی لە راستیدا نەریتێکی (عەقڵانی - باوەڕی) بوو. لەم نەریتەدا تێگەیشتنی عەقڵانی خۆی لەگەڵ باوەڕی مەسیحیدا دەگونجان‌و ئەوەی راستی بێ لە حاڵەتی سەلماندنی مەسیحیەتدا نرخ و پایەی بەدەست ئەهێنا. لێرەوە، لە نەریتی لەم چەشنەدا، ئەقڵ رێگای بەخۆی نەئەدا بە دەرئەنجامی بێ باوەڕی بگات لەم رێگەیەوە خیانەت لەخۆی بکات.

لە راستیدا ئەم خیانەتە کاتێك روویدا کە مۆدێرنیتی، قەڵەمڕەوی عەقڵو باوەڕی لەیەك جیاکردەوە. لەم جیاکارییەدا بوو کە مەیلی نوێی بێ باوەڕی سیمای خۆی دەرخستو رێگاکرایەوە بۆ دەرئەنجامەکانی بێ باوەڕی فەلسەفەی تازە. ئەمە یەکەم لایەنی چیرۆکی بێ باوەڕیە، لایەنی دووەمیش پەیوەندیەکی نزیکی بەم لایەنەوە هەیە.

رووداوی دووەم ئەوەبوو کە فەلسەفەی تۆماسی، فەلسەفەی ئەرەستویی قبوڵ کرد. لە باسی ئێستای ئێمەدا، بایەخی ئەم رووداوە لەوەدایە کە ئەم قبوڵ کردنە روانگەیەکی بەرامبەر جیهان لێکەوتەوە کە لەگەڵ روانگەی پێشووتر، کە نەریتێکی ئاگۆستینی پەروەردەی کردبوو، جیاوازییەکی بنەڕەتی هەبوو.

لە نەریتی ئاگۆستینیدا، جیهان گۆڕەپانێك بوو کە مرۆڤ ناچار بوو تیایدا بەهۆی ئەو تەسەورەوە کە لە زەینی خۆیدا بۆ خوا هەیەتیو بە یارمەتی ئەو نیشانانەی کە لە خوا بەدەستیەوەیەتی، بەردەوام بێت لە گەڕانی خۆیدا بۆ دۆزینەوەی خوا، جیهان بە شتێك لە خوا ئەزانراو بایەخیشی ئەگەڕایەوە بۆ ئەم تایبەتمەندیە.

بەڵام لە روانگەی تۆماسی نوێدا، جیهان سیستەمێکی پشت بەستوو بە خۆو خودموختارو تەواو لەخوا جیاواز بوو. کەوا بوو دەبوو بەهۆی عەقڵو لەسەر بناغەی بنەما فەلسەفیەکانو یاساکانی بیرکردنەوەی عەقڵانی بخرێتە ژێر بیرکردنەوە لەسەر بنەمای کتێبی پیرۆز بەوەلانانی خواکان، ئەهریمەنەکانو ژمارەی زۆری ئافرێنەرەکان (demiurges) ئەفسانەی لە جیهان داماڵیبوو.

(ئاکوئیناس) یش بە یارمەتی (ماتریالیزمی وێنەیی) ی ئەرەستو (ئەگەر بکرێ تیۆرییەکەی ئەرەستو، واتە پێکهاتەی بوونەوەرانی مادی لە مادەو وێنە، بە ماتریالیزمی وێنەیی لەقەڵەم بدەین) روانگەی ناوبراوی بڵاوکردەوە. ئەو، تیۆری کتێبی پیرۆزی، کە بە گوێرەی ئەو تیۆرییە جیهان سیستەمێکە لەواقیعیەتەکان کە لە دەرەوەی سیستەمی خوایین و ئەگەرچی پیشاندەری بوونی خوایە بەڵام بریتی نیە لە ئەو - کردە تیۆرییەکی فەلسەفیی رێکخراو. لەو رووەوە کە ئەم سیستەمە پیرۆز نەبوو گەڕان بۆ دۆزینەوەی نهێنیەکانی شتێکی کوفر ئامێز و حەرام نەبوو. سەرەڕای ئەمە مرۆڤ بەهۆی ئەوەوە کە عەقڵی هەیە، بە هاو وێنەی خوا [٢] دائەنراو دەسەڵاتداری دەسنیشانکراوی ئەو بوو لە جیهاندا. بەڵام لێرەدا جارێکی دی لەشێوە تێڕوانینی سەدەکانی ناوەڕاستدا بۆ جیهان وەك بابەتێك لەبەردەم تێگەیشتنی عەقڵی مرۆڤدا، بانگەشە بۆ خیانەتکردن لەنەریتی عەقڵانی خۆی حەشاردراوە.

فەلسەفەی سکولاستیك بەشێوەی تۆماسیەکەی، شێوازێك لە توێژینەوەی ژیرانەی (چ فەلسەفی، چ زانستی) سەلماند کە لە رووی شێواز ناسیەوە (ئیلحادانە) بوو. چونکە بە (ئەزموون) دەستی پێدەکرد نەك بە خوا . لەگەڵ ئەمەشدا ئەم شێوازی لێکۆڵینەوە لەناو نەریتی عەقڵانیدا، بەو جۆرەی کە فەیلەسوفەکانی سکولاستیك تێگەیشتبوون، بەکارنەبرا، کەواتە تاکە شێوازی لێکۆڵینەوە نەبوو، ئەو راستییەی کە بۆی ئەگەڕا تاکە جۆری راستی لەقەڵەم نەئەدرا. هەروەها ئەو شێوازانەی بۆ گەیشتن بە یەقین بەکاری ئەهێنا تاکە شێواز نەبوو کە هەبێ. راستی (حەقیقەت) وەك بینایەك وابوو کە چەند نهۆمێکی زۆری هەبوو. هەڵبەت ئەم لێکچواندنە رەنگە گومڕاکەربێت. کەواتە واباشترە لەبری ئەوە بڵێین کەیەك جیهانی حەقیقەت هەبوو کە تێیدا شێوە جیاوازەکانی حەقیقەت و لەگەڵ ئەویشدا شێوازگەلی جۆراوجۆر بۆ گەیشتن بە

حەقیقەت – (کە لەگەڵ فرەبوونیدا یەکیەتیەك لەنێوانیاندا هەبوو)– ئەبینرا.
سەرەڕای ئەمەیش، لە سەدەکانی ناوەڕاستدا ئەم باوەڕە پتەوە باڵادەست بوو کە لەنێوان دەرئەنجامە ئاڕاستەکراوەکانی بیرکردنەوەی عەقڵانی و ئامۆژگاریە ئایینیەکاندا، ناتوانێ و نابێ هیچ جیاوازیەکی بێ چارەسەر هەبێت.
خیانەت (لە نەریتی عەقڵانی سەدەکانی ناوەڕاست) کاتێك روویدا کە مۆدێرنیتی، ئەقڵو ئیمانی لەیەك جیاکردەوە، و پاشان بەو دەرئەنجامە گەیشت کە تەنها یەك جۆر حەقیقەتی ئەقڵی و یەك شێوازی گەیشتن بەو حەقیقەتەو یەك پێوەریش بۆ یەقینێك کە لەم ڕێگەوە بەدەست دێ هەیە.
لەم ئەنجامگیریەدا، روکردنە ئیلحاد لە بیرکردنەوەی نوێدا روونتر و ئاشکراترە. چونکە ئەمە پتر بە مانای دەست تێوەردانی زانستگەری بوو لە ڕەوتی ئەقڵانیەتدا ئەگەر میتۆدولۆژیای زانستی، نائایینیە، کەوایە، و ئەگەر تاکە میتۆدولۆژیایەکی (متمانەدارە)، کە ئەڵێن وایە، کەواتە ئەقڵ هیچ ڕێگایەکی لەبەردەمدا بۆ گەیشتن بە حەقیقەتی باڵا، بەم شێوەیە لە بنەڕەتدا هیچ حەقیقەتێکی باڵاو لە ئەنجامدا هیچ خوایەك بوونی نیە. چونکە لە ڕێگەی میتودولۆژیای زانستیەوە ناتوانین بە شتێك بگەین کە نیشانەی بوونی خوابێ.
تا ئەو کاتەی کە مۆدێرنیزم وەفادارە بە مەیلە بنەڕەتیەکەی خۆی واتە بە روونکردنەوەی جیهان بەبێ خوا، ئەوا هیچ ناڕەزاییەکی بەرامبەر بە گفتوگۆ لەبارەی خواوە دەرنەدەبڕیی، هەڵبەت بەو مەرجەی ئەم گفتوگۆیە لەدەرەوەی ئەکادمیاو لە دەرەوەی شوێنە گشتیەکاندا، بکرایە. بەڵام گرفت لێرەدا بوو کە بۆچی ئەبێ گفتوگۆی لەم بابەتە هەبێ. بە شێوەیەکی وردتر، نەخشەی بنەڕەتی نوێ کە لەسەر بناغەی پێناسە و روونکردنەوەی جیهان بەبێ خوا بوو، پێویستی بەنەخشەیەکی تر هەبوو تاکو خوا – کە لە کۆنەوە لە زەینی مرۆڤدا پەیوەندی بە جیهانەوە هەبوو – پێناسە بکا. بە زمانێکی راشکاوتر بڵێین، گرفتی بێ باوەڕیی نوێ ئەمەبوو کە بۆچی خوایەك کە نەبووەو نیە، لە زەینی مرۆڤدا بوونی هەیە. ئەم گرفتەیش لە لۆژیکی مۆدێرنیزمدا بە ئاسانی چارەسەرکرا: (لەو رووەوە کە ئەقڵ و باوەڕ دوو بواری نەگونجاوی رۆحن، (کەواتە) خوا ناتوانێ هیچ پەیوەندیەکی بە قەڵەمڕەوی ئەقڵەوە هەبێ، لەبەرئەوە ئەبێ بیگوێزینەوە بۆ قەڵەمڕەوی جیهانی خەیاڵ. ئەم تیۆریە کە ئایین زادەی وەهم و خەیاڵە تا سەدەی نۆزدەیەم وەك تیۆریەکی کلاسیکی مۆدێرنیتی لێهاتبوو، و ئەتوانین لەم سەدەیەشدا بەشێوەگەلی جۆراوجۆر لەگەڵی شوێندا بیدۆزینەوە، بۆ نموونە بوونی ئەم تیۆرییە لە فەلسەفەی مارکسدا بووە هۆی ئەوەی کە ئەم کەسایەتیەی سەردەمی پۆست مۆدێرنیزم ببەسترێتەوە بە سەردەمی مۆدێرنیزمەوە.
تیۆری نوێ، بە تەواوەتی خۆی لە قوتابخانەیەکی ئایینیو فەلسەفی و مێژوویدا ئاشکراکرد کە جێی خۆیەتی ناوی (مۆدێرنیتی تەعمیدکراو) ی (Modarnism christened) لێ بنێین.
روانگەی مەسیحی، مەسیحیەتی بە ئاینی رووداوەکان ئەزانی، واتە ئاینێکە کە تیایدا باوەڕ لەسەر بناغەی رووداوە مێژووییەکان دامەزراوە. بەڵام مەسیحیەت ئاینی بڕوا وبۆ چوونیشە، واتە دینێکە کە تیادا باوەڕ بەشێوەیەك دەرئەبڕێ، کە راستنو لێرەوە پەیوەندیی بە حەقیقەتی باڵا (خواو خواست و ئیرادەی ئەو بۆ مرۆڤ) هەیە. لە روانگەی رۆحیەتی دژە ئەقڵی نوێوە، ئەم وتەیە بێ مانایە و داوایەکی پڕوپووچە و لە راستیدا هەر ئەو شتەیە کە مارکسیستێك بە

عیرفـــان گـــەری یـــان عیرفـــان هەڵبەســـتن (Mystification) ناوی ئەبا.

مۆدێرنـــــیزم لەســـەر بناغـــەی بابەتـــە سـەرەکیەکەی خـۆی (هەڵبـەت ئەگـەر بـەدوا دەرئەنجامی لۆژیکی خۆی بگەیـەنین) ناچار بوو بڵێ: مەسیحیەت دینی ئەفسانەکانە. چونکـە ئـەو رووداوانـەی بناغـەی مەسـیحیەتی پێکـهێناوە، هـەرگیز روویـان نـەداوە بـەڵکو بەرهـەمی ئـەزموونێکن کـە مـرۆڤ لـە ژیـان لـەناو جیـهاندا بەدەستی هێناوە و لە مێژوودا پیادەی کردووە. وەك چـۆن هـەرگیز سیسـی فـۆس [٢]، یـان گردوبەردێك بوونی نەبووەو هـەروەهایش هـەرگیز مەسیحێك لە جیهاندا نەژیاوە و قـەت مردوویشـی زیندوو نەکردوەتەوە. هەردوو ئەفسـانەکە بۆیـەك مەبەسـت بـەکار ئـەبرێن ئـەویش دەربڕینـی ئەزموونی مرۆڤە، جا چ بۆدەرخسـتنی شکست و نـائومێدی مـرۆڤ لـەم جیهانـەدا بێـتو چ بـۆ دەرخستنی ئـاوات و ئـارەزووی مـرۆڤ بـێ بـۆ ژیـانێکی بـەرزتر (لەجیـهانێکی تـردا). هـەردوو ئەفسانەکە حەقیقـەتێکی نامێژوویمـان پیشـان ئەدەن. هیچیان باسـی واقیعیـەت ناکـەن، بـەڵکو تەنها باسی کۆمەڵێ شتی خەیاڵی ئەکەن.

جگە لەوەش وەك چۆن رووداوە مەسیحیەکان ئەفســـانەیینو حەقیقـــەتی مێژوویـــان نیـــە، (هـەروەهایش) بـڕواو باوەڕەکـانی مەسـیحیەتیش سیمبۆل گـەلێکن کـە حەقیقـەتی ئـەنتۆلۆژییان نییە، ئەم باوەڕانـە بـە هیـچ شـێوەیەك خـاوەنی بایەخێکی رەهاو ژیرانە (ئەقڵانی) نین کـە لایـەنی بەرجەسـتەی بـوون (واتـە بوونـی خـواو خواستەکانی) دەردەبڕن، بـەڵکو بایـەخێکی رێژەیـیو زانسـتیو هەسـتیارانەیان هەیـە کـە گوزارشـت لەلایـەنی زیـهنی ئـەزموونی ئـایینی ئەکەن. واتە ناتوانن مانـای ئـەو کرادارانـەی خـوا لەمێژوودا ئەنجامی ئەدات لە قاڵبی ئەو گوزارانەدا دەربڕن کە نرخـی هەمیشـەییان هەیـەو ئەمـەش ئەوە ئەگەیـەنێ کە کرداری لـەم بابەتـە هـەرگیز رووی نـــەداوە. بیروباوەڕەکـــانی مەســـیحیەت دەربڕینێکی نیمچە فەلسەفی تەنها لەوێدا وانـەی فەلسەفی پێشکەش دەکات کە لە بەرامبەر ژیانی خۆیدا دەیگرێت...

(دەربڕینێك) کە دڵگیرییـەکی تێپـەڕی هەیـە. تەنها ئـەم کاردانـەوە گەلـەن کـە تاکـە رووداوەی راستەقینەی دینین، لەبەرئـەوە مەسیحیەت لـە هەردوو لایەنـەوە چ وەك دینی رووداوەکـان و چ وەك دینـی بڕواکـان، خـەیاڵاویو زادەی وەهمـە ئەمـە ئـەو دەرئەنجامـە بـوو کـە مـەیلی نـوێی بـاوەڕی بـەرەو ئاکـامی حـەتمی خـۆی کشـا بیرکردنـەوەی نـوێ وتـی ئەگـەر ئەتانـەوێ باسـی خوا بکەن، تکایە ئەمەتان لەبیر نەچێت کە تەنـها باسی خۆتان ئەکەنو بەس.

سـێهەمین و گرنگـترین رووداوی گـەورەی فیکری لـە سـەدەکانی ناوەڕاستدا بابـەتی بـاس هـەڵگری ئافراندن بـوو. ئـەم بابەتـە گرنگـترین کێشەی فەلسـەفەی مەسیحیەت بووەو هەمیشـە گرفت لێرەدایە کە چۆن بێ کۆتاو کۆتا، پێویست و شیمانە، کـاتیو هەمیشـەیی، رەهـاو رێژەیـی، ئـەتوانن پێکـەوە بوونیـان هـەبێو سـەرچاوەی شوێنەوار بن. ئەم مەسەلەیەش دوولایـەنی هەیـە، یەکەمیان لایـەنی میتافیزیکـەو دووەمیـان لایـەنی ئاکاری.

دەتوانرێـــت مەســـەلە میتافیزیکیەکـــەی پەیوەندی نێوان خواو ئافرێندراوەکان بە ئاسـانی بخەینـە روو: ئەگـەر خوا هەیـە ئەگـەر خـاوەنی سیفەتی تایبەتی خۆیەتی، ئەی چۆن شـتێکی تـر ئەتوانێ بوونی هـەبێ؟ لـەوە ناچـێ کـە جگـە لـە بوونی بێ کۆتایی، پێویست، هەمیشەییو رەهای خـوا جێگایـەك هـەبێ بـۆ بوونێکـی کۆتـاییدار، ئەگەردار، کاتیو رێژەیـی. بـۆ نـەریتی عـەقڵانیی بەواتای سـەدە ناوەڕاستییەکەی، پێویست بـوو کە بڵێ ئەم کێشـەیە تـەنیا کێشـەی تەئلیفـە. بـە

واتایەکی تر گرفتی نێوان کۆکردنەوەی حەقیقەت گەلێکە کە لە دوو جەمسەری جیاوازدان، بەڵام دژایەتیەکیش لە نێوانیاندا نییە. فەیلەسوفەکانی سکۆلاستیك کە ئەم مەسەلەیان بەم شێوە دەربڕیبوو، سەرکەوتووانە یەکلاییان کردبۆوە، بەڵام خودی هێنانە ئارای ئەم مەسەلەیە بانگەشەیەك بوو بۆ خیانەت کردن لە نەریتی ئەقڵی. بیرکردنەوەی نوێ کە کۆڵی دابوو، بڕیاری دا کە مەسەلەکە بەشێوەی هەڵبژاردن لەنێوان دوو ڕێگای دژ بەیەك دا بخاتە ڕوو. لەم بڕیارەوە لەو هەڵبژاردنانەدا کە لێی دەکەوتەوە. مەیلی نوێ بەبێ باوەڕی بە تەواوەتی خۆی ئاشکراکرد.

دوو ڕێگای باسکراو، ئاشکراو ڕوونن. تۆ ناچاری یان بڵێی تەنها خوا هەیە، یان بڵێی تەنها جیهان، کە لە هەردوو باردا ئەنجام هەرکوفرو بێباوەڕییە. گریمان تۆ ڕێگای یەکەم هەڵئەبژێری و ئەڵێیت: تەنها خوا هەیە. لەم حاڵەتەدا، لەو ڕووەوە کە جیهان بەهەموو ڕوونی ئەزموونیەوە بوونی هەیە، کەواتە جیهان ئەبێ شتێکی خوایی بێ. ئەگەر وابێ تۆ یەکێك لە فۆرمەکانی یەکێتی بوون (وحدة الوجود) ت هەڵبژاردووە، کۆنترین فۆرمی یەکێتی بوون (هەمووشت خوایە) واتە (ڕۆحگەری Aninism) ی سەرەتایی، ئێستا ئیتر کارامە نییە چونکە بۆنی ناخۆشی خورافە پەرستی لێدێ. بەڵام ئێوە ئەتوانن تێفکرانی (گنۆسی) کۆن چاکسازی بکەنەوەو جۆرێك لە فۆرمی (یەکێتی بوون) ی (بەدەر لەپرۆسە) [٤] هەڵبژێرن کە لایەنی خەیاڵی کەمترەو بە ڕواڵەت لایەنی فەلسەفییەکەی بەهێزترە. یان ئەتوانن (یەکێتی بوونی دینامیکی) هەڵبژێرن کە لەسەر بنەمای ئەم تیۆریە خوا بەردەوام لە حاڵەتی دەرکەوتندایە. هەروەها ڕەنگە هەڵبژاردنەکەتان بەگوێرەی فەلسەفەی سەدەی نۆزدەیەم مۆنیسمی ئایدیالیستی بێ [٥]، بەم واتایە کە تەنها نمونەی ڕەهاو ڕاستەقینە، خوایەو هەموو شتەکانی تر بەرجەستەبوونی کۆتایی ئەون. لەهەرکام لە حاڵەتەکانی سەرەوەدا ئێوە ڕێگای کوفرو بێ باوەڕیتان هەڵبژاردووە، چونکە (یەکێتی بوون) واتە ئیلحاد چونکە ئەگەر هەموو شت خوا بێ کەواتە هیچ شتێك خوا نییە. بەشێوەیەکی ڕوونتر بیرۆکەی (یەکێتی بوون) وەك ڕەتکردنەوەی ئافرینەرەو ئەگەر خوایش ئافرێنەر نەبێ کەواتە خوانییە، لێرەوە ڕەوتی ڕوونی مەیلی بیری نوێ بەلای بێ باوەڕیدا بە ڕاشکاوی دەرئەکەوێ. بیرکردنەوەی نوێ دژی بوونی خودی خوا نییە بەڵکو دژی ئەم بڕوایەی مەسیحیەتە کە ئەڵێ خوا ئافرێنەری جیهانە.

گریمانەی دووەم ئەوەیە کە تۆ بڵێی تەنیا جیهان بوونی هەیە، واتە جیهان تەنها شتێکە کە بوونی هەیە، یان لانی کەم تەنها شتێکە کە بوونی بایەخی هەیە. جیهانی ماددی (کە مرۆڤیش ئەگرێتەوە) سەربەخۆو بێ نیاز پشت بەخۆ بەستووەو هەمیشە و تەنانەت لە ئەزەلەوە هەبووە. ئەگەر بکرێ باسی سەرچاوەی جیهان بکەین ئەبێ بڵێین کە جیهان بە شێوەیەك خۆی خۆی دروست کردووە.

بەهەرحاڵ جیهان خۆی ڕوونکردنەوەی خۆیەتی. لەدوای ئەم جیهانەوە یان لە پشت ئەم جیهانەوە هیچی تر نییەو بە هیچ جۆرێك خوا بوونی نییە. (ئەم ڕوانگەیە) بە سرتە ئەڵێ (ئەستێرەکان کوێرانە ئەخولێنەوە). لەم حاڵەتەدا ئێوە ماتریالیزمتان هەڵبژاردووە. تەنها ئەوە ماوەتەوە کە جۆرەکەی (جۆری ماتریالیزمەکە) دەسنیشان بکەن. (ماتریالیزمی ڕواقی) [٦] ی کۆن بۆ مرۆڤی سەردەمی نوێ. ڕەنگە لە ڕادەبەدەر خەیاڵ پەروەرانەو بە ئاشکرا نازانستیانە بێ. سەرەڕای ئەویش، ڕەوشی ڕواقیەکان (لە ڕادەبەردەر) ئەقڵیە، بەڵام ئێوە ئەگەر هێشتا بەسەرەتای سەدەی نۆزدەیەمەوە



بەستراون، ئەتوانن ماتریالیزمی میکانیکی هەڵبژێرن و بە رازاندنەوەی بە پەرەسەندگەری (کاملبوون گەرایی) [٧] کۆتایی سەدەی نۆزدەیەم نەختێ رەنگ و رووی ئەمڕۆیی پێ ببەخشن. لەهەرحاڵ دا ئێوە بێ باوەڕیتان هەڵبژاردووە، ئەمەیش حەقیقەتێکی ئاشکرایە و بە گشتیش پەسەند کراوە. بێگومان بێ بڕوایان عەوامیش ئەم حەقیقەتەیان قبوڵ ئەکرد چونکە ئەو (واتە بێ باوەڕی عامی) دیاردەی گەورەی سەدەی نۆزدەیەم بوو، و تیوری ئەرنست هیگڵی بەو شێوەیەی کە بەتیۆری داروین کامڵ کرابوو، بەدوایین گفتی ژیرانە دەزانی.

ئەگەری ئەوەش هەیە کە ئێوە بڵێن گەشبینیی زۆر ژیرانەی سەدەی نۆزدەیەم نەختێك کۆن بووە و وێڕای مارکس، مۆنیزمی مادی، بەتایبەت جۆری میکانیکیەکەی بە کەم بایەخ و شتێکی رووکەشانە بزانن، و بتانەوێ ماتریالیزمی دیالیکتیکی پۆلس - بە واتا مارکسییەکەی - هەڵبژێرن. کە لەم حاڵەتەدا، ئەبێ زۆر وریا بن، ئەگەر هێشتا ئەتانەوێ لە مەیلی بێ باوەڕی بەدوور بن. ئەم بابەتە بابەتێکی ئاڵۆزە بەڵام من بە تامەزرۆییەوە هەوڵ ئەدەم بەشێوەیەکی ئاسان روونی بکەمەوە، گەلێ روونە و مارکسیش بە ئاشکرا قبووڵی کردبوو کە بێ باوەڕی (ئیلحاد) بنەمای بابەتی ماتریالیزمی دیالیکتیکییە (هەڵبەت بە مانا مارکسییەکەی). بەڵام بە پێچەوانەی رای مارکس ئەمە هیچ روون نییە کە بێ باوەڕی ئەنجامی ماتریالیزمی دیالیکتیکی (بە واتا مارکسییەکەی) بێ. ئەگەر قبووڵی بکەین کە ئەم تیورییەی لەمەڕ واقعییەت تەنیا تیورییەکی فەلسەفی - زانستییە و وەك هەموو تیورییەکانی فەلسەفی - زانستییەکان ئەتوانێ بە پەرەسەندنێکی رەخنەیی بگا، واتە ئەگەر ماتریالیزمی دیالیکتیکی (بە مانا مارکسییەکەی) بەهۆی هێزی جادوویی مەیلی سیاسی بەلای کۆمەڵگای نا ئایینیەوە ببێتە بڕوایەکی دۆگماو نەگۆڕ (بەو جۆرەی کە لە سۆڤیەتی جاران دا بوو) لەم حاڵەتەدا ماتریالیزمی دیالیکتیکی ئەتوانێ بە ئەنجامێکی خوا پەرستانە بگا، ماتریالیزمی دیالکتیکی مە رج نییە بەئەنجامی کوفرو بێ باوەڕی بگات.

من ئەڵێم ئەگونجێ کە بگا، هەڵبەت توێژەرانی تر هەن کە ئەڵێن بێگومان ئەگا، بەڵام من هەر ئەوەندە ئەڵێم کە ئەگونجێ بگا. بەڕای کەسانی تر بابەتی باسکراو بابەتێکی توێژینەوەییە واتە ئەبێ لێی بکۆڵینەوە کە رەخنەی زاتی لە ماتریالیزمی دیالیکتیکی ی مارکس چ شتێکمان بۆ ئاشکرا ئەکات. ئایا دەری ئەخات کە رێگا بۆ پەیوەندی ئەم جۆرە ماتریالیزمە لەگەڵ باوەڕ بەخوا دا کراوەیە، یان بەستراوە؟ ئەم مەسەلە لە ئەمڕۆدا بایەخێکی تایبەتی هەیە، بەڵام من رووبەرووی

نەبوومەتەوە، چونکە بە رای مـن (کە لـە کتێبی پیرۆزەوە وەرگیراوە) کوفر و بێ باوەڕی ئاکامی هیچ تیوریەکی فەلسەفی یان زانستی نی‌یە، بەڵکو بڕیـارو هـەڵبژاردنێکی ئـازادە کـە لـە هـەموو تیوریيـەك لـە پێشـترە، هەڵبـەت فەلسـەفەگەلی بێباوەڕانـە، واتـە ئـەو فەلسـەفانەی کـە لەگـەڵ باوەڕ بەخوادا ناگونجێن، هەن. ئـەم مەیلەو ئـەو گوزارەیـەی کـە ئـەم مەیلـە دەری ئـەبڕێ (هیـچ خوایەك بوونـی نی‌یـە) سـەرچاوەی ئیلهامی ئـەم فەلسەفانەن نەك دەرەنجامی ئەوان.

بـە گشـتی دوو جۆر فەلسـەفەی بـێ بـاوەڕی هەیـە، یـەکێکیان (مۆنـیزمی یـەکێتی بـوون – Pantheist Monism) و ئەوی تریان (مۆنـیزمی ماتریـــالیزم – Monism Materialism). بەشێوەیەکی سادەتر، تەنها یەك جۆر فەلسەفەی بێباوەڕی هەیە، ئەویش تاك گەرایی‌یە (مۆنیزم). و ئاشـکرانی‌یە ئایـا فەلسـەفەی ماتریـالیزمی دیـالیکتیك تـاك گەرایـە (مۆنیزمـە) یـان نـا؟ تـاك گەرایی ئەیەوێ مەسەلەی بەیەك ئاشنا کردنەوەی نێوان خواو جیهان کە لە سـەدەکانی ناوەڕاستدا چەسپی بوو، بکا بەمەسـەلەی هـەڵبژاردنی خـوا، یان جیهان، کە لە سـەردەمی نوێدا پـەیدابووە. ئەم خواستەی تاك گەرایی پێشینەی بەڵگەکاریو بەڵگەداری نیە، بەڵکو پیشاندەری مەیلی ئینسانە بەکوفرو بێباوەڕی، مەیلێك کە ڕۆحـی دەسـەڵاتە بەسەر سەردەمی مۆدێرنیتدا.

ئـەم دوو جـۆرە فەلسـەفەیە کـە لـە بنـەڕەتدا هەریـەکن، تیوریگـەلێکی دیـاریکراون. بـەڵام تیوری‌یەکی نادیاریش هەیە کە پتر لـەوەی ئـەقڵ بڕیاری لەسەردابێ، ئاکامی پەککەوتنی ئەقڵە. ئێـوە ئـەتوانن (بڕیـاری هەڵواسـین) [8] لـە قوتابخانەی دیاردەناسی‌ی نوێدا هەڵبژێرن، واتـە لەکاتی ڕووبەڕووبوونەوە لەگەڵ مەسەلەی بـوون، یان میتافیزیکدا بڕیار دەرنەکەنو بـەپێی ئـەریت ڕێگەی هەڵواسین و دواخستنی بڕیـار بگرنـە بـەر.


دارووین

ئەم قوتابخانەیە زۆر بە وردی (دۆخ) واتە ئـەوەی لەدەروونو دەرەوەی ئینساندا ئەبینرێ. وەسـف ئـەکات، بـەڵام هیـچ بڕیـارێکی بوونـی لەسـەر دەرناکات.

دیاردەناسی هاوچەرخیش لـە بـەکارهێنانی بەهێزی کرداری (هەیە) لە رستەی ئـەریدا خۆی ئەپارێزێت. ئەگەر ئێوە بەرەو ئـەم قوتابخانەیـە پاشەکشێ بکەن، ئەوا ئـەبێ بەتـەواوەتی خۆتـان لە بـاسو خواسـی ئـاڵۆز سـەبارەت بـەخوا – بەشـێوە تۆماسـی‌یەکەی – بپـارێزن. یەکـەم مەسەلە، واتا ئایا خوا هەیە؟ ئـەتان وەستێنێت، چونکە ئەم مەسەلەیە لەو مەسەلانەیە کە لەسـەر بنـەمای قوتابخانـەی ددیاردەناسـی هاوچـەرخ نـاتوانن لـێی بدوێـن، لـەم حاڵەتـەدا بـە (نازانمگەری میتافیزیکی) [9] قایل دەبن.

ڕەنگە بڵێین ئـەم جـۆرە (نازانمگـەری) یـە شێوەیەك لـە کوفـرو بێباوەڕی‌یـە کـە پلەیـەك

لەخوار بت پەرستیەوەیە، چونکە بت پەرست لە سەلماندنی هەبوونی خوادا وەستانی بۆنی‌یەو گومانیشی نی‌یە، بەگوێرەی شایەتیی حەکیمی قەومی بەنی ئیسرائیل [10]. بت پەرست بەدوای خوادا دەگەڕێو گومانی نیە کە ئەتوانێ بیدۆزێتەوە، بەلام لە بەرامبەر پرسیاری دووەمدا واتە خوا کێیە؟ تووشی هەڵەو گومڕایی ئەبێ. ئەم هەڵەیەی ئەو قابیلی لێبوردنو چاوپۆشی نی‌یە بەلام رەنگە حەکیم بڵێ کە ئەو کەمتر لە (نازانمگەری) قابیلی سەرزەنشتە، هەرچەند (نازانمگەری) ی نوێ دیاردەیەکە کە حەکیمی قەومی بەنی ئیسرائیل هەرگیز رووبەڕووی نەبووەتەوە.

ئێمە لە نووسراوەکانی حەکیمانەی [11] قەومی بەنی ئیسرائیلدا رووبەڕووی گوماندارێك ئەبینەوە کە بەدەست جیهانەوە ماندوو بووە، بەلام باری رۆحیەتی ئەو لەگەڵ باری رۆحیەتی (نازانمگەریی نوێ) دا تەواو جیازازە.

نازانمگەری نوێ چونکە ناتوانێ خوا بناسێ، خۆی لەقەرەی سەلماندنی (بوونی خوا) نادات. رەنگە بگوترێ کە ئەم گەوجیەی (نازانمگەر) لە گەوجیی بت پەرست خراپترە، چونکە نازانمگەری تەنیا رەتکردنەوەی خوا نی‌یە بەڵکو بە راشکاوی رەتکردنەوەی ئەقڵیشە. راستە کە زاتی خوا لە قەڵەمڕەوی ئەقڵ باڵاترە بەلام بوونەکەی وانی‌یە. لە روانگەی حەکیمی قەومی بەنی ئیسرائیلەوە بوونی خوا ئەو حەقیقەتەیە کە ئەبێ هەموو مرۆڤێك زانیاری لەسەری هەبێت. ئەم حەقیقەتە لەنێوان ئەو حەقیقەتانەی کە پێویستە مرۆڤ بیزانێت، لە پلەی یەکەمدایە، چونکە ئەگەر کەسێك لە بەرامبەر ئەو حەقیقەتەدا نەزان بێت، ئیتر بۆی نی‌یە خۆی بە ئینسان واتە بوونەوەرێکی خاوەن ئەقڵ دابنێ.

نازانمگەری جۆرێکە لە بێباوەڕی کە خۆی لەقەرەی گۆڕەپانی مەعریفە نادا کەسی نازانمگەرا تەنانەت بەدوای خوایشدا ناگەڕێ، ئەو ئەیەوێ رەوتی ئەقڵ کە زاتی (گەوهەری) ئەقڵە بە مل هوڕی رابگرێ. پۆڵس سەبارەت بەم بزاڤی ئەقڵە بە ئەنجومەنی ئاریۆپاگۆسی [12] وت:

ئەم بزاڤە (سوسەو گەڕانە) بەلام ئاکامی ئەم گەڕانە ئەبێ بە گەیشتن بە خوا کۆتایی پێ بێت. بۆ ئێمە خوا شتێکی دوورە دەست نی‌یە. ئەو (لە هیچ کام لە ئێمەوە دوور نی‌یە)، هەروەها نازانمگەری وەك بێ باوەڕی‌یەك وایە بەوپەڕی هیوابڕاوی و نائومێدیی‌یەوە. نازانمگەر ئەڵێ گەڕان بەدوای خوادا زۆر پڕ مەترسی‌یە و لە توانای مندا نیە. ئەمەیش سووك کردنی ئەقڵەو خوا لەبەرچاو دوور ئەکەوێتەوە. بێگومان ئەمەیش بۆ ئەو نمایشە گەورەیەی ئەقڵ، سەرئەنجامێکی خراپەو مایەی تەمەڵی‌یە، ئەو نمایشەی کە ئەفلاتوون لە سەرەتای دیمەنی یەکەمیدا، دەرکەوت و هەواڵی سەرسوڕهێنەری (ئەرکی باڵا) ی فەلسەفەی راگەیاند. ئەفلاتوون وتی: قەڵەمڕەوێکی باڵا هەیە کە بەرزترە لە پلەی ئەقڵی مرۆڤ و وەك پێوەرێك وایە بۆی، بەلام گەیشتن بەم قەڵەمڕەوە ئەستەم نی‌یە.

لێکدانەوەیەك لەمەڕ بێباوەڕی ئەرستۆکراتی‌یەوە لە چاخی مۆدێرنیزم دا پێشکەش کرا ئەوە پیشان ئەدات کە ئەم بێ باوەڕی‌یە دوو خەسڵەتی هەیە:

یەکەم: وادەرئەکەوێ کە دەرەنجامی بە ئەقڵانی بوونو پاساودانە، چونکە ئەڵێ (کەواتە بەم پێیە خوایەك بوونی نی‌یە). بەلام ئەمە رواڵەتێکی درۆزنانەیە، لە پشت ئەم ئەنجامگیریە بە رواڵەت عەقلانیە، هێزێکی ماندەر هەبوو بۆ نەخشەیەکی بنەڕەتی کە ناکرێ هیچ بەڵگەیەکی ئەقلانیانەی بۆ بهێنینەوە، ئەم ئەنجامگیریە بێ باوەڕانەیە تەنیا ئەیتوانی وەك مەیل بەبێ باوەڕی وەك نەخشەو بەرنامەیەك، بەهۆی ئەم

نەخشەو بڕیارە کردارێکی ئازادی سەرەتاییەوە خۆی دەربخات، لەحاڵێکدا کە نەریتی سەدەکانی ناوەڕاست تەنیا دانی بە جیاوازیان دا نابوو نەک لە یەکتر دابڕینیان، بەڵام بیری نوێ ئەوەی دەرخست بیرکردنەوەی نوێ بڵێ بواری باوەڕ لە بواری ئەقڵ جیایە. هەروەک چۆن بواری خەیاڵ لە بواری وێناکردن و هەروەها لەبواری حەکایەتی خەیاڵی جیایە.

بڕیارێکی تری بیری نوێ تایبەت بوو بە جەوهەری حەقیقەتەوە. لە دیدی نەریتی سەدەکانی ناوەڕاستەوە، بواری حەقیقەت بەهۆی هێزە زۆرەکانی ئەقڵەوە پەیوەندی بەبواری بوونەوە هەیەو، لەم رووەوە ئەم نەریتە لە بواری حەقیقەتدا بڕوای بە لێکچوون هەبوو بەڵام بیری نوێ ئەمەی کە حەقیقەت یەک واتای تاکی هەیە بە ئەسڵێکی باوەڕ پێکراو دانا.. بە واتایەکی تر تەنها یەک حەقیقەت هەیە، نەک کۆمەڵێ حەقیقەت کە یەکیان گرتبێ.

دوایین بڕیاری بیری نوێ جیاکردنەوەی خواو جیهان بوو، لە حاڵێکدا کە نەریتی سەدەکانی ناوەڕاست قایل بوو بە کۆکردنەوەیان. بیری نوێ ئەیووت یان خوا، یان جیهان. بەڵام نەریتی سەدەکانی ناوەڕاست ئەیووت خواو جیهان. ئەبێ لەم بڕیارە چارەنووس سازانەدا بەدوای رەگو ریشەی بێ باوەڕی ئەکادیمدا بگەڕێین. نەک لە هیچ بەڵگەو پاساو هێنانەوەیەکدا.

دووەم: بە تەواوی ئەتوانین ئەم بێ باوەڕییە لەیەک رستەدا کۆبکەینەوە: (لەبەرئەوەی کە ئێمە بۆ دەرک و روونکردنەوەی جیهان هیچ پێویستمان بەخوا نیە کەواتە خوایەکیش نیە). لەم رستەیەدا تێزو بەرنامەی نوێ زیاتر بە روونی خۆی ئەنوێنێ. ئاشکراکردنی جیهان بەبێ خوا، کارێک بوو کە بیری نوێ ئەیویست بیکا.

ئەم بیرە (خوای ئاشکراکەر) ی رەت ئەکردەوە، لە حاڵێک دا ناوی تایبەتی خوا خولقێنەرەو لەکتێبی حیکمەت (سلێمان ١٣،٣) دا بەسەنعەت کار هاتووە، خوا کەسێکە کە هەیەوبەبێ ئەویش هیچ شتێک ناچێتە ئەقڵەوە، چۆن بەبێ ئەو هیچ شتێک بوونی نیە.

ماهیەتی ئەم لایەنەی بیری نوێ لە گفتوگۆیەکی بەناوبانگی نێوان ئەستێرەناسی گەورە (پیرسیمون لاپلاس) و ناپلیونی برادەری، کە پاشان بوو بە باڵوێزی یەکەم دا بەجوانی دەرئەکەوێ. لاپلاس بەرگێ لە کتێبە مێژوو سازەکەی بەناوی (روون کردنەوەی سیستەمی جیهان) ی لە هەمان ساڵی دەرچوونیدا واتە ساڵی ١٧٩٦، پێشکەشی ناپلیۆن کرد. ناپلیۆن دەستخۆشی لەبرادەرەکەی کردو وتی: ئەم روونکردنەوەی جیهانە شایەنی ستایشە، بەڵام (لەم کتێبەدا هیچ یادێک لەخوا نەکراوە). رستەیەک کە لاپلاس لە وەڵامی ناپلیون دا بە زمانی هێنا، گەوهەری ماهیەتی بێ باوەڕی ئاکادیمی ئەدرکێنێ. لاپلاس وتی: (من پێویستم بەو تیورییە نەبوو). هەروەها ئەم رستەیە لێکچوونی نێوان بێ باوەڕی ئەرستۆکراتی و پەرەسەندنی باشتری سەرمایەداری ئەخاتە روو. کە لە تایبەتمەندییەکانی سەدەی نۆزدەیەم بوو. کەسانی خۆش گوزەران لە بازاڕدا ئەیان وت (چ بە زمانی فەرەنسایی قسەیان کردبێ یان بە زمانی ئینگلیزی یان هەرزەمانێکی تر):

ئێمە هیچ پێویستییەکمان بەخوا نیە، کەواتە خوا نییە. خۆ ئامانجی ئەوان ئەوەنەبوو کە پێناسەی جیهان بکەن بەڵکو تەنها ئەیان ویست تێیدا بژین. لەدیدی ئەوانەوە راستییە ئابوورییەکان تاکە راستی بوون لە ژیاندا. ئەوان پێیان وابوو کە تەنها کاروپیشە گرنگە بۆ ژیانیان. (هەڵبەت ئەم بنەما روون و زۆر گرنگە لە کۆنەوە پێش ئەوەی باس بکرێ بە کردەوە بەڕێوە ئەچوو) و خوا هیچ پەیوەندیەکی بەکار و پیشەوە نییە. بۆ سەرکەوتن لە بابەتە

ئابووری‌یه‌کاندا که تاکـه بابـه‌تی گرنگـن خـوا پێویست نیه.

پێم وایه پێویست ناکا هه‌ڵوێسته بکه‌ین‌و له‌مه زیاتر ده‌رباره‌ی ئـه‌م بێ بـاوه‌ڕی یه بدوێین که ئاکامی بیرو هۆشی په‌رت‌و بڵاوه. ره‌نگه بایـه‌خی سه‌ره‌کیی ئه‌م جۆره بێ باوه‌ڕییه، له‌وه‌دابێت که مه‌سه‌له‌ی خوایی به‌شێوه‌یه‌کی خه‌ڵك په‌سه‌ندانه، واتـه بـه‌گوێره‌ی واقعیـه‌ت‌و هه‌وڵـه ئـابووری‌و کۆمه‌لایه‌تیـه‌کان، ئه‌خسـتـه بـه‌ر بـاس نـه‌ك به‌شـێوه‌یه‌کی ئه‌رستۆکراسـیانه‌ی زانسـت‌و فه‌لسه‌فه. ئـه‌م چه‌شنه بـێ باوه‌ڕییه، هـه‌روه‌ها رێگه‌ی بۆ بێ باوه‌ڕییه‌کی تـر ، واتـه بـێ بـاوه‌ڕی کرێکاری، یـان بـه حسـابی (پـوپ پیـوس) ی یانزه‌هه‌م (له دین وه‌رگه‌ڕانی خـه‌ڵکان) ی خـۆش کرد. بێ باوه‌ڕی ئه‌وان به‌هۆی بێ ده‌ربه‌ستی‌یه‌وه بـوو. ئـه‌م بـێ باوه‌ڕیـه لـه سـه‌ده‌ی نۆزده‌یـه‌م دا لـه‌بێ بـاوه‌ڕی پێشـوو چاره‌نووس ساز تـر بـوو چونکه بوو به لانکه‌زای مارکسیزم.

پێـش ئـــه‌وه‌ی به‌ســه‌رده‌می مودێرنیتـــه‌دا تێپـه‌ڕین، لانـی کـه‌م پێویسـته سـه‌باره‌ت بـه جۆرێکـی تـر لـه بـێ بـاوه‌ڕی که به‌رهـه‌می ئـه‌م سه‌رده‌مه بوو، نه‌ختێك بدوێین. ئه‌م بێ باوه‌ڕییـه بێ باوه‌ڕی شاری یان بێ باوه‌ڕی سیاسی بوو، که له ژێر ناوی خوازراوی (دژ بـه رۆحیانیـه‌ت Anticlericalism) دا خـۆی نوانـد و بــه که‌ره‌سـه‌ی زاتـی‌ی تیـوری سیاسـی حکومه‌تـه نـا ئایینه‌یه‌کان (Letatlaigue) له‌قه‌ڵه‌م ئه‌درا. ئـه‌م روانگه‌یه له‌سه‌رده‌می رۆشنگه‌ی‌و شۆڕشی مه‌زنی فه‌ره‌نسادا ته‌شـه‌نه‌ی کـرد، ئه‌گـه‌رچی پێشینه‌ی زۆر کۆنتری هه‌بوو. دوو پرنسیپی بالاده‌ستی بـێ بـاوه‌ڕی شـاری واتـه پرنسـیپی لێکنــه‌ترازان‌و ده‌ســه‌لاتی تــه‌واوی ده‌وڵــه‌ت‌و پرنســیپی جیاکردنــه‌وه‌ی کڵێسـا لــه ده‌وڵــه‌ت، ئـــه‌م دوو پره‌نسیپه له کامڵترین شێوه‌ی‌دا خۆی لـه‌کۆماری سێهه‌می فه‌ره‌نساداو یاسای جیاکردنه‌وه‌ی کڵێسا له‌ده‌وڵه‌ت له ساڵی ١٩٠٥ دا خۆی بینیه‌وه.

به‌م شێوه‌یه مه‌یلی نوێ بۆ بێ باوه‌ڕی نه‌ك به ته‌نها له ئاکادیمیاو بازاڕا په‌ره‌ی سه‌ندو به‌ڵکو لـه شاره‌کانیشدا بـلاو بـووه‌وه. ئـه‌م مه‌سـه‌له‌یه بـوو به‌چاوگـه‌ی بنه‌مایه‌کی سیاسـی – ئـایینی، کـه کۆڵه‌که‌ی بنچینـه‌ی حکومه‌تـه نـا – ئایینی‌یه‌کان پێك ئه‌هێنێ، به‌گوێره‌ی ئه‌م بنه‌مایه، ئایین ته‌نها مه‌سه‌له‌یه‌کی که‌سی‌و ده‌روونیه که په‌یوه‌ندی بـه ویژادنی تاکه‌وه هه‌یه، ئایین ئه‌وپـه‌ڕی ره‌بتـی بـه نوێژخانه‌ی کڵێساوه هه‌یه و شتێکه په‌یوه‌ندی به کڵێساوه هه‌یـه کـه لـه‌م حاڵه‌ته‌یشدا، بـه‌گوێره‌ی پێناسه‌ی بنه‌مای جیاکردنه‌وه‌ی کڵێسا له‌ده‌وڵه‌ت به بابه‌تێکی شه‌خسی له‌قه‌ڵه‌م ئـه‌درێ. پرنسیپی ناوبراو ئه‌ڵێ: خواو ئایین بۆیان نی‌یه داوای ئـه‌وه بکه‌ن که پله‌و پایه‌یه‌کی گشتگیریان هـه‌بێ، واتـه جێگایه‌ك له‌مه‌یدانی کۆمه‌ڵگاداو رۆڵی سه‌ره‌کی له کرداری گشتگیری حکومه‌تدا.

به‌گوێره‌ی پێناسه‌ی سه‌ره‌وه ژیانی به‌کۆمـه‌ڵ خوای تیا نی‌یه، واته به‌بێ خـوا بـه‌رده‌وام ئـه‌بێ. هه‌روه‌ها چه‌مکی ئایینی کۆمه‌ڵ‌و چه‌مکی کۆمه‌ڵی خودایی، لـه سیفه‌تدا تووشـی دژه‌کـان ئـه‌بن. خـه‌ڵکیش، وه‌ك حکومـه‌ت. بـه ره‌سمـی کـافرو بێ‌بـاوه‌ڕن واتـه بـێ بـاوه‌ڕی فه‌لسـه‌فه‌یه‌کی کۆمه‌لایه‌تی‌یه که یاسای جیاکردنه‌وه‌ی کڵێسا لـه ده‌وڵـه‌ت دای رشتووه. ئـه‌م یاسـایه پرنسـیپی سیاسـی – ئـایینی‌ی جیابوونـه‌وه‌ی ئـایینی لـه سیاسه‌تی هێنایه دی‌و رایگه‌یاند که قه‌ڵـه‌مڕه‌وی حکومـه‌ت دا، کڵێسـا بـه هیـچ جۆرێـك بوونـی گشـتگیری نیه‌و هـه‌روه‌ها کڵێسا پایـه‌ی یاسایی نی‌یه‌و له باری مافه‌وه هیچ حسابێکی بـۆ ناکرێ، که‌واتـه ناتوانـێ چالاکی گشـتگیری هـه‌بێ، لـه راستی‌دا نـابێت کڵێسایه‌ك لـه ئارادا بمێنێتـه‌وه، به‌م جۆره بـه‌پێی یاسا په‌رستگه‌ی خـوا وێران کرا. هه‌ڵبه‌ت ئه‌گه‌ر خـوا بیویستایه ئـه‌یتوانی لـه دڵی خه‌ڵکی‌دا جێگای خۆی بکاته‌وه، به‌لام لـه‌ناو کۆمه‌ڵگادا جێگایه‌کی بۆ نه‌مابووه‌وه. خـه‌ڵك وه‌ك

کۆمەڵگا خوایان قبووڵ نەبوو و بڕوایان بە بوونی نەبوو، ئەوان ئەیان وت (خوا لەکۆمەڵگادا وجودی نی‌یە).

بەم شێوەیە لە سەدەی نۆزدەیەم دا دیاردەیەك کە (کتێبی پیرۆز) بەناوی (خەڵکانێ کە خوا ناناسن) باسی کردوون، جارێکی تر لە فۆرمێکی نوێدا سەری هەڵدایەوە. ئەم دیاردەیە (بێ باوەڕیی شار) بوو کە (پاپا پیۆس) ی نۆیەم لە (پێرستی هەڵەکان) داو (پاپا لیۆی سیانزەیەم) لە گەڵێ بەیاننامەدا کە دەری ئەکرد بەتوندی دژایەتی خۆیان لە بەرامبەری‌دا دەربڕی. ئەم دیاردەیە لایەنێکی ناسەقامگیری بەخۆوە گرتبوو، واتە لەلایەکەوە هێشتا بەسەردەمی مۆدێرنیزمەوە بەسترا بوو، لەلایەکی ترەوە سەر بە سەردەمی پۆست مۆدێرنیزم بوو. چونکە لە پێشەکی‌یە سەرەکی‌یەکەی‌دا هاتووە کە (حکومەت لە ژیانی بەکۆمەڵی خۆیدا هیچ پێویستی بە خوا نی‌یەو لە راستی‌دا خوا هیچ پەیوەندی‌یەکی بە سیاسەتەوەنی‌یە)، ئەمەش لە تایبەت مەندی‌یەکانی هزری سەردەمی مۆدێرنیزمە، بەلام لە سێ لایەنی ترەوە، بێ باوەڕی سیاسی لە کۆمارەکانی فەرەنساو لەوڵاتە ئەوروپی‌یەکان کە لاسایی فەرەنسایان ئەکردەوە پردێکی بەرەو سەردەمی پۆست مۆدێرنیزم هەڵبەست.

یەکەم: مەیلی سیاسی بەلای بێ باوەڕی‌دا، شێوەی نکولی کردنی خوای مێژوویی بەخۆوەگرت، واتە رەت کردنەوەی‌خوایەکی سیاسی کە خەڵکی دروست کردووەو لەناویان دا ئەژی و وەك هێزێکی بەتوانای رەها جڵەوی چارەنووسی بەدەستەوەیە. ئەمە دیاردەیەکی نوێ بوو، چونکە ئەوەی کە لە سەردەمی مۆدێرنیزم دا نوکولی لێ ئەکرا خوای جیهان بوو، واتە خولقێنەری جیهانێ کەزەمین و ئاسمانەکانی خولقاندبێ، بەلام ئەم بێ باوەڕی‌یە واتە ئەم (خەڵکە بێ خوا) نوێیە کە خاوەن توانای رەها رەت ئەکەنەوە تایبەت مەندی سەردەمی پۆست مۆدێرنیزمە.

دووەم: ئەو دیموکراسی‌یە تۆتالیتارەی کە لەسەردەمی رۆشنگەری‌و شۆڕشی مەزنی فەرنسا کەوتەوە، شێوەیەکی نوێی لە بێ‌باوەڕی سیاسی لێ‌کەوتەوە کە لە رووی بێ باوەڕی‌یەوە، باپیرە گەورەی هەق‌و دادی دیکتاتۆریی تۆتالیتاریتەی کۆمۆنیزم بوو. ئەم دیکتاتۆریە کە لە مارکسیزم‌و شۆڕشی جیهانیی کۆمۆنیزمەوە سەرچاوەی گرتبوو، بێ باوەڕی‌یەکی پەیماندارانەی وای پێك هێنا کە هەرگیز مێژوو بەخۆوە نەیدیبوو.

سێیەم: بێ باوەڕی شار کە لە سەردەمی مۆدێرنیزم دا، پەیدابوو، ئەم سەردەمەی تێپەڕاند، چونکە شتێك بوو بالاتر لە راونینێك بۆ واقعیەتەکان، ئەم بێ‌باوەڕی‌یە بوو بە بەشێك لە بناغەکانی حکومەت‌و بەم سەپەری دەسەلاتە بوو بەهێزێکی مێژوویی کە بەهێزو تواناوە وە تەواو وشیارانە نەك هەر تەنها واقعیەتە سیاسیەکان، بەلکو هەموو واقعیەتەکانی - لەوانە چەمکی ژیاری (حضارة) - ی گۆڕی. ئەمە تایبەتمەندێکی ترە بۆ بێ باوەڕی شار کە لەسەردەمی پۆست مۆدێرنیزمدا لەگەڵ بەنموونە کردنی هزری مارکس پەیدابوو.

## ٢- ئینسانی بێ خوای سەردەمی پۆست مۆدێرنیزم

لە سەردەمی ئێستادا دوو جۆر ئینسانی بێ خوای تازە پەیدابوون، لەبەرئەمە ناچارین ناوێکی تازە بۆ ئەم سەردەمە دابنێین. هەرچەند (پۆست مۆدێرنیزم) ناتوانێ بە تەواوەتی وەسفی ئەم

سەردەمە بکا، بەڵام لانی کەم لەگەڵ پێشاندانی جیاوازیی ئەم سەردەمەو سەردەمی مۆدێرنیزمیشدا ئەوە ئەگەیەنێ کە درێژەی سەردەمی مۆدێرنیزمە.

جۆری یەکەم، مرۆڤی بێ خوای شۆڕشی جیهانیی کۆمۆنیزمە. کە ناتوانین بڵێین تاکە کەسێکە، بەڵکو یەك گروپ، یەك چین، و باشتر بڵێین یەك حزبە، ئەم مرۆڤە – واتە مرۆڤی بێ خوای شۆڕشی کۆمۆنیزم – خەڵکانێکی دروست کرد کە تەعبیرەکەی کتێبی پیرۆز واتە (خەڵکانێ کە خوا ناناسن)، پڕ بە پێستیانە. دنەدەری بێ باوەڕیی ئەمان لەگەڵ دنەدەری بێ باوەڕی سەردەمی مۆدێرنیزمدا جیاوازە.

ئینسانی سەردەمی مۆدێرنیزم ئەیویست ئەو جیهانەی کە راستەوخۆ و جیاواز لەخۆی رووبەڕووی بووەتەوە، بەبێ خوا روون بکاتەوەو لێی تێبگا، بەڵام مرۆڤی نوێی کۆمۆنیست ئەیەوێ ئەم جیهانە بگۆڕێ [١٣]. مەبەستی ئەو لە جیهان هەر ئەو شتەیە کە مارکس لە (سروشت) دا بەدی ئەکرد، واتە هەموو سیستەمی بەرهەمهێنانی مادیو پەیوەندییە مرۆڤایەتییەکان کە هێزی (کار) ی ئینسان بەدرێژایی مێژوو دروستی کردوون، جیهان جیهانێکی پیشەسازیو بەرهەمی کارو پیشەی مرۆڤە، بەم مانایە سروشت بەبۆچوونی مارکس، (لەشی نا ئۆرگانیك – inorganic body) ی مرۆڤە. لە قوتابخانەی مارکسیزم دا ئینسان و سروشت ئەبن بەیەك و ئیتر بە تەواوەتی لەیەك جیا نین، چونکە سروشت بەرهەمی کاری خۆیەتی. بەم شێوەیە سروشت ئاوێنەیەکە لە خۆیدا مرۆڤ ئەنوێنێتەوە، و بەواتایەکی باشتر ئاوێنەیەکە کە مرۆڤ خۆی تیدا ئەبینێو لەم رووەوە سروشت خودی مرۆڤە.

کاتێك کە سروشت وردەکارییەکانی خۆی ئاشکرا ئەکات هێزە دەروونییەکانی مرۆڤ دەرئەکەون، ئینسان لە رێگەی سروشتەوە کە بەرهەمی کاری خۆیەتی، هەبوونی راستەقینەی خۆی ئەبینێتەوە، مرۆڤی مارکسیست ئەیەوێ سروشتی ئینسان، کە واتایەکی هێندە ئاڵۆزی هەیە بگۆڕێو ئەم گۆڕینەیش نە تەنها بەبێ خوا، بەڵکو لە رووی دژایەتیو دوژمنایەتی خواوە ئەیکا، بە کورتی هەروەك مارکسیش بە راشکاوی وتوویەتی، خواستی کەسێکی مارکسیست (سەرکوتکردنی خوا) یە.

جۆری دووەم ئینسانی بێ خوای شانۆیە، من لێرەدا وشەی (شانۆ) هەر بەو مانایە بەکار ئەبەم کە بیکۆن بەکاری بردووە. ئەو (بتەکانی شانۆ) ی لە کۆمەڵە چوارینەکەی بتەکانی مرۆڤ (بە واتایەکی تەجریدی تر، دەمارگیرییەکانی مۆڤ) دا لە پلەی چوارەم دا داناوە. منیش هەروەك ئەو شانۆ بەجیهانی وەهمو خەیاڵە گشتییەکان، ماتەمە هاویەشەکانو ئەو هەستانەی کە هەموو خەڵکی تێیدا بەشدارن ئەزانم. لە راستیش دا شانۆ جیهانێکە کە تێیدا خەیاڵو سۆزە نمایشتیەکان کەرەسەی دەربڕینی بیروباوەڕن. مرۆڤە بێ خوا نوێیەکەی ئێمە پاش دروست کردنی شانۆیەکی لەم بابەتە تێیدا نیشتەجێ ئەبێت، ئامانجی ئەو دروست کردنی ئەم شانۆیەو تاڕادەیەکی زۆر ئەم ئامانجەیش لە رێگەی هونەرەوە دێنێتە دی. هونەرگەلێك وەك چیرۆك نووسین، بەتایبەتیش نووسینی شانۆنامە (کە لە پێش دا ناوی (سیناریۆی پووچ گەرا) [١٤] ی بە ناوچەوانەوەیە)، شێوەکاری پەیکەرسازیو تەنانەت هونەرە نمایشتیەکان، ئەم مرۆڤە نەبە مانای مەزنو کۆنی وشەکە فەیلەسووفە نەبە مانا نزمەکەی ئەمڕۆش، هیچ بایەخێك بە میتافیزیك و مەعریفە ناسی نادات و لە راستیدا پارێزەری جارانو دوژمنی ئێستای میتافیزیکە. لە بەرامبەردا خووی داوەتەوە دیاردە ناسی واتە

خەریکی وەسف کردنی (بارودۆخ) ی ئینسانە مەیلیشی بەلای ئاکار (اخلاق) دا هەیە، بەلام تا ئێستا نەیتوانیەوە ئاکارێك دابنێ جگە لە (ئاکاری دۆخ – ethic of situation)، کە لە راستی دا ئاکار نی‌یە، بەهەرحاڵ، ئەگەر مرۆڤناسی بە زانستێك بزانین کە لە سروشتی مرۆڤ ئەکۆڵێتەوە، ئەو هەرگیز روو لەم زانستە ناکات. چون گریمانەی ئەو ئەمەیە کە مرۆڤ هیچ سروشتێکی نی‌یە، بە رای ئەو ئینسان (ماهیەت) نیە بەڵکو تەنها یەك ئامادەگی‌و جۆرە کردەیەکەو ئەگەر مانا سەرەتایی‌یە عیبری‌یەکەی وشەی بوون (وجود) لەبەرچاوبگرین، ئەتوانین بڵێین کە تەنها یەك بوونە، واتە پەیدابوونێك: (standing forth) ی بەردەوام کە هەموو ساتێك چالاك و ئازادە.

مرۆڤی بێ خوای شانۆ بەپێچەوانەی مرۆڤی بێ خوای ئاکادیمی، نایەوێ بەبێ خوا جیهان روون بکاتەوەو لێی تێبگا، لە روانگەی ئەوەوە جیهان پووچ‌و بێ هوودەیە (absurd). ئەو هەر بەو حسابەیش خوازیاری گۆڕینی جیهان نی‌یە، چونکە ئەم گۆڕانە هەرچی بێ، ناتوانێ ئەم جیهانە لە پووچی رزگار بکا. ئامانجی ئەو تەنها بەدی هێنانی وجودێکی بێ خوایە بە واتایەکی وردتر ئامانجی ئەو (بەدی هێنانی خودی خۆیەتی) یان بەدی هێنانی ئینسانێکی بێ خوا کە لەم جیهانەدا بتوانێ بژی.ئەو جیهان بەبێ خوا ئەزانێ چونکە ئیرادەی لەسەر ئەوەیە کە جیهان وەك خۆی بێ خوا بێ. بە کورتی ئەو نایەوێ خوایەك هەبێت.

لە درێژەی باسەکەدا ئەمەوێ تایبەتمەندی‌یەکانی ئەم دوو جۆرە بێ باوەڕی‌یەی سەردەمی پۆست مۆدێرنیزم بخەمە روو. سەرەتا باسی ئەو تایبەتمەندییانە ئەکەم کە هەردوو جۆرە ئینسانە بێ خواکەی سەردەمی پۆست مۆدێرنیزم، سەرەڕای جیاوازیە زۆرەکانیان، تێیدا هاوبەشن، پاشان بە کورتی باسی خەسڵەتە تایبەتی‌یەکانیان ئەکەم.

ئینسانی شۆڕشی کۆمۆنیزمی جیهانی و ئینسانی شانۆ لە شەش خەسڵەت دا هاوبەشن، ئەم خەسڵەتانە چ بە جیاو چ پێکەوە، پیشاندەری ئەوەن کە هەردوو جۆرە ئینسانەکە سەر بەیەك سەردەم (یان یەك فەزای رۆحی) ن لە کە لەگەڵ سەردەمی مۆدێرنیزم دا جیاوازە، بەلام پەیوەندی تایبەتیشی لەگەڵ دا هەیە.

خەسڵەتی یەکەم: هەردوو ئینسانەکە رووبەڕووی مەسەلەیەك بوونەتەوە. پێشتر وتم کە باوەڕی مەسیحی‌و یەهودی لەسەرئەوەی کە خواو جیهان قابیلی کۆبوونەوەن بوو بە هۆی پەیدابوونی دوو مەسەلە:

یەکەم میتافیزیکی‌و ئەوی تر ئاکاری.

مەسەلەی یەکەم بریتی بوو لە: کە چۆن ئافرێنەرو ئافرێندراو ئەتوانن هەردووکیان بوونیان هەبێت‌و هەردووکیشیان چاوگەی کاریگەری بن؟ ئەم مەسەلەیە کە هزری سەدەکانی ناوەڕاست، بەشێوەیەکی فەلسەفی باسی کردبوو و رێگەچارەیەکی فەلسەفیشی بۆ دانابوو، هزری نوێیشی تەواو بەخۆیەوە سەرقاڵ کرد.

مەسەلەی دووەم کە هەمیشە سەرنجێکی ئازار هێنەری ویستووە، ئەمڕۆ بەهۆی چەند هۆکارێکی مێژوویی‌و تیوریکەوە – کە لێرەدا مەودای باسکردنیان نی‌یە – بوونەتە ناوەندی سەرنج. مەسەلەکە ئەوەیە، کە ئەگەر خوا هەیەو ئەو جۆرەیە کە هەیە، واتە هەم ئافرێنەرەو هەم بەتواناو رەهایە کەواتە چۆن ئەبێت ئەم جیهانە وابێت کە ئێستا هەیە، واتە شوێنی هەموو چەشنە بەدفەڕی‌و گۆڕەپانی مەینەتی‌و هەژاری‌و چارەڕەشی مرۆڤ!

هیچکەس ناتوانێ خۆی لەم مەسەلە بدزێتەوە، ئەم مەسەلەیە بۆ هەموو کەس

تاقیکردنەوەیەکە. وەك چۆن کە تاقیکردنەوەیەك بوو بۆ قەومی بەنی ئیسراییل ئەوکاتەی کە لە (مەسە) یان (مەریبە) دا تووشی بەڵای تینویەتی بوون لە بیابانیدا. ئەمە تاقیکردنەوەی ئەقڵی ئینسانی نیە، چونکە مەسەلەی خراپە، بە پێچەوانەی بابەتی میتافیزیکی کەرێگە چارەی فەلسەفی هەڵ ئەگرێ، بەتەواوەتی فەلسەفە ئەخاتە لاوە. بەڵکو بابەتێکە بۆ تاقیکردنەوەی ئیرادەو هێزی هەڵبژاردنی مرۆڤ، چونکە ڕاڕایی مرۆڤ لە واقعییەتی ئامادەبوونی خوا وەك دەسەڵاتدارێکی خێرخواز و چارەسازی جیهان لەگەڵ [illegible] بەدفەڕی و خراپەکە هاوسەنگی ئەم واقعییەتەن، رەت بکاتەوە.

ئیتر لێرەدا پرسیارەکانی مرۆڤ فەلسەفی نین، بەڵکو مێژوویی و وجودین. ئینسان ئەپرسێ: (خوای من لەکوێیە؟ ئایا زیندووە؟) ئەمە بابەتێکە کە ئینسانی شۆڕش و ئینسانی شانۆ هەرکامیان بەشێوازو گیانی تایبەتی خۆیانەوە، ڕووبەڕووی ئەبنەوە.

خەسڵەتی دووەم: ئەم تایبەتمەندیە کە لە خەسڵەتی یەکەمەوە وەرگیراوە، ئەمەیە کە هەردوو ئینسانەکە ئەفسانەی مەرگی خوایان قبوڵە. نیچە وتی: (ئەم خوا کۆنە بە ڕاستی ئیتر زیندو نیە، ئەو بە تەواوەتی مردوە) (ئەم ڕستەیەم لە کتێبی زەردەشت بەم جۆرە ئاخافت هێناوەتەوە، بەڵام لە زۆریەی کتێبەکانی تری نیچەدا ڕستەی لەم بابەتە هاتووە) جێی خۆیەتی کە بپرسین، نیچە بۆچی ئەم هەواڵەی، کە بە (هەواڵی ترسناک) ناونابوو، ڕاگەیاندو مەبەستی لەم هەواڵە چی بوو؟.

وەڵامی نیچە هەرشتێك بێ، ئەم ئەفسانەیە لەسەردەمی مۆدێرنیزمدا باو نەبوو. لەو سەردەمەدا، ئینسان بە بەهانەی باشی ئەقل گەرایی، بەمە قەناعەتی کردبوو کە بڵێ خوانیەو بەس، واتە وجودی خوا حەقیقەتێکی ئەقڵی نیەو هەرگیزیش حەقیقەتێ نەبووە، بەڵکو تەنها یەك وەهم و خەیاڵ بووە. جیهانی عەقڵ، کە جیهانی ڕاستەقینەی ئینسانە، پێویستی بە خوا نیە. بەڵام ئەفسانەی مەرگی خوا، بە پێچەوانەی بیرکردنەوەی سەردەمی مۆدێرنیزم، باس لە واقعییەتێکی مێژوویی ئەکەن، واتە گۆڕانکارییەکە لە پرۆسەی ڕووداوەکان و ڕێبازێکی نوێیە بۆ چارەنووسی ئینسان. لەبەرئەمە، ئەم ئەفسانەیە پڕە لە هەست و هەژان، چ ئەم هەست وهەژانە، تووڕەییەکی ئاگرین بێ، یان نائومێدیەکی دڵمرێن، یاخود خولیایەکی شێتانە، سەرەنجام بانگەشەی مرۆڤ ئەکات کە بڕیاردەرکاو نەخشەی نوێ دابڕێژێ.

لەمەڕ خواوە، ئەقڵ و باوەڕ، هەرچی ئەڵێن، با بیڵێن، حەقیقەت ئەوەیە کە خوا لەمێژوودا کە جیهانی بڕاوەی ئینسان و مەیدانی کردەوەیەتی، چووەتە دەرەوە. نیچە بە ئەفسانەکەی خۆی و بە ئاگاییەوە، مەسەلەیێك کە سەردەمی مۆدێرنیزم لە ڕووی ناپاکی نیازەوە خۆی لێ لادابوو، بە ڕاشکاوییێکی ترس هێنەرەوە ئەهێنێتە ئاراوە. چون تۆ تەنها بەو بەهانەی کە هەندێ کەس وایان وتووە، ئەتوانی بڵێی جیهان پێویستی بە خولقێنەرێك نیە کە ڕوونکەرەوەی جیهان بێ، بەڵام بۆت نیە بڵێی کە ئەم جیهانە پێویستی بە دەسەڵاتدارێکی بەڕێوەبەریش نییە. چونکە هیچ کەس ناوێرێ بڵێ: ئەگەر خوا مردووە ئەی کێ دەسەڵاتداری ڕەهاو بێ چەندو چوونە؟ تەنانەت لە باری نیاز ناپاکیشەوە ناتوانی خۆت لەم پرسیارە بدزیتەوە؟ جا ئەمە پرسیارێك بوو کە ئیسنانی شۆڕش ی (کۆمۆنیزم) و ئینسانی شانۆ، هەرکامەیان بەشێوازی تایبەتی خۆیان بەگوێرەی بنەمای هاوبەشی مەرگی خوا ڕاستەوخۆ ڕووبەڕووی بوونەتەوە.

خەسڵەتی سێیەم: ئەم خەسڵەتە کە دیسان ئاکامی خەسڵەتی یەکەمە، ئەمەیە کە بێ

باوەڕیی شۆڕش و شانۆ بنەمایەکە بڕاوەتەوە.ئەم بێ باوەڕییە تەنانەت زەحمەتی ئەوە بەخۆی نادات کە خۆی لەبەرگێکی تـرا بنوێنێ‌و بڵێ مـن ئەنجام گیرییەکەم راستگۆیەو هەر لەبەر ئەوە لە بێ باوەڕیی ئاکادیمی راشکاوترو راستگۆترە. سەرەڕای ئەمانەیش بێ باوەڕی نـوێ بەهۆی خۆپیشاندانی راستگۆیانەیەوە وەك بنەمایەکی بڕاوەو بڕیارێکی ئازادی سەرەتایی کە خۆی بە پێویستییەکی دیالیکتیکی لـە قەڵـەم نـەداوە، پێگەی هێزەکانی لە گۆڕەپاندا گۆڕیوە. خەڵکانی سەر بە ئاکادیمیست لایان وابوو کە بۆ رەتکردنەوەی خـواو بـڕوا بەئەو و بـۆ رەتکردنەوەی بەڵگە کۆنەکانی بڕوا بە ئەو ئەبێ دەسەو داوێنی پاساو هێنانەوەبن. (لە سەردەمی مۆدێرنیزم دا) بڕوا بەخوا بڕوای زۆرینەی خەڵكو (تین) بوو، بەڵام بێ باوەڕی نوێکاری و دژایەتی کردنی رای گشتیو (ئانتی تیز) بوو، چاخی رۆشنگەری ئەم راستییەی بە جیاوازکردنی نێوان دەمارگیری‌و روون ئەندێشی، قبوڵ کرد. بەڵام ئەو هەڵوێستانەی کە تا پێش سەردەمی پۆست مۆدێرنیزم نەگۆڕیوون، ئێستا گۆڕدراون.

بێ باوەڕی بنەمایەکی بڕاوەیە و ئەفسانەی مەرگی خوا رای زۆرینەی خەڵکەو بووەتە (تیز-Thesis). بۆئەوەی ئانتی تیز (Anti thesis) واتە باوەڕ بەخوا، متمانە پەیدا بکا، کەسی مەسیحی ئەگەر ئەتوانێ، ئەبێ دووبارە خـوا زیندوو بکاتەوەو ئیمانیش بۆ سەلماندنی خۆی بەڵگە بهێنێتەوە.

پێویستە ئەمەش بڵێم کە بێباوەڕی بنەمای بڕاوەی هاوچەرخ لای وایە کە هـزری سەردەمی مۆدێرنیتی بە راستی لەپێناوی رەت کردنەوەی باوەڕدا ئەنجامگیری ئەکرد. ئەم بابەتە بێگومان بەسەر مارکس دا دەسەپێت، چونکە ئەو لە هەندێ بابەتی جۆراوجۆردا بە هەمان شێوازی بێ باوەڕی ئاکادیمی - بۆنموونە لە رەت کردنەوەی چەمکی خولقاندن دا - ئەنجام گیری بەکار ئەبا.

بەڵام تەنیا شتێك كە خوێنەری بەرهەمەکانی لـێی تێدەگەن ئەوەیە کە مارکس تەنانەت لەشێوەی مەسەلەکە نەگەیشتووە. بۆ نموونە مەسەلەی بەردەوامبوونی جیهان لەگەڵ مەسەلەی ئەگەری گونجانی دا تێکەڵ ئەکات، ئەو پتر بەو تیوریانە قایلە کە راستەوخۆ لە فیورباخی وەرگرتووە. واتەئەوەی کە ئایین وەهەمو خەیاڵەو خوا خولقاوی هێزی خەیاڵی ئینسانە. هەروەرها کە باسمان کرد ئەم تیوریە هی سەردەمی مۆدێرنیزمە، بەڵام بێ باوەڕی مارکسیستیو بێ باوەڕی شانۆی بۆ دواوە ناگەڕێنەوە ئەم تیوریەیان نەکردووەتە بنەماو سەرچاوگەی خۆیان.

هیچ کامیان بۆئەوەی پاساوێك بۆ مەیلەکەی خۆیان - واتە مەیلی سەرکوت کردنی خواو بە غایب زانینی - بە هیچ جۆرێك نە بۆ دواوە ئەگەڕێنەوە نە ئاوڕیش لە ئەنجامگیرییەکانی چاخی مۆدێرنیزم ئەدەنەوە.

خەسڵەتی چوارەم: مرۆڤی شۆڕش‌و مرۆڤی شانۆ لەم رایەدا تەباو کۆکن کە خوا تەنیا شتێکی زیادە نییە کە پشت گوێ بخرێ‌و ئاوڕی لـێ نەدرێتەوە، بەڵکو هەڕەشەیەکی جدییە کە ئەبێت لە دژی خەبات بکرێ‌و شەڕی لە کۆڵی خەڵك بکرێتەوە. خوا وەهمێکی بێ وەزن نییەو کەلێکیش زیانبارە. ئەم دوو مرۆڤە بەبێ خوا بوون قایل نین‌و هەردووکیان زۆریش دژەخوان. ئەوان بێ باوەڕنین، بەڵکو دوژمنکارن‌و خوای بەتوانای رەها بە دوژمنی خۆیان ئەزانن، مەیل بەلای سەرکوت کردنی خواداو بە غایب زانینی لێرەوە سەری هەڵداوە.

خەسڵەتی پێنجەم: ئەم دوو مرۆڤە دژە خوا نوێیە، بۆ دوژمنایەتی جدی خۆیان لەگەڵ خوادا بنەمایەکی هاویەشیان هەیە. بە رای ئەوان خوا

وەك خولقێنەری سروشت و دەسەڵاتدار بەسەر مێژوودا دوژمنی ئازادیی ئینسانە. ئەگەر خوا هەیەو ئینسان ئەخولقێنێو بەتایبەت ئەگەر حکومەت ئەکا بەسەریدا، کەواتە ئازادیی ئینسانەکان لەکوێدایە، واتە ئینسانی ئازاد مانای نیە. هەڵبەت لێکدانەوەی ئازادی بەلای ئەم دوو مرۆڤەوە گەلێ جیاوازە، بەڵام بەم هەموو جیاوازییەوە، هەردووکیان لەسەر ئەوە رێکەوتوون کە ئازادی بریتییە لەئۆتۆنۆمیی رەها (autonomy absolute) بێجگە لەم حاڵەتە، هەر ئازادینیە. ئازادی بەمانای سەربەخۆییەو سەربەخۆیی بەمانایی تێپەڕاندنی هەمووسنوورێکە، بەم پێیە ئەگەر ئازادیی خوا لە سەروی ئازادیی ئینسانەوە بێتو لە ئەنجامدا ئازادیی ئینسان سنووردارىكا، ئەو ئازادییە هەر نامێنێ. ئینسان ئەبێ خوای جیهانی خۆی بێ، ئێستا ئەم جیهانە چ سروشتەکەی مارکسیستی بێ، یان پوچییەکەی شانۆ یەکان، جگە لەم حاڵەتە ئینسان، ئینسان نیە.

خەسڵەتی شەشەم: مرۆڤی شۆڕش و مرۆڤی شانۆ، هەرچەن لە وەسفی ئازادیدا جیاوازییان پێکەوە هەیە بەڵام لەخاڵێکی ناوەرۆکدا هاودەنگ و کۆکن: هیچکامیان بایەخ بۆئەو ئازادییەی سەردەمی مۆدێرنیزم دانانێن. لە چاخی مۆدێرنیزمدا باس لە ئازادیگەلێکی بەحساب نوێ، مافی مرۆڤو هاووڵاتیانو باس لەو ئازادییانەی کە یاسا ئەتوانێ دەستەبەریان بێت، کراوە.

بەڵام ئازادیی راستەقینەی مرۆڤ بەم شێوازە یاساییە بێ بەهایانە نایەتە دی، چونکە ئەم شێوازانە هیچ پەیوەندییەکان بە ئازادییەوە نییە، ئینسان تەنانەت ئەگەر لە هەموو ئازادییە نوێکانیش بەشداربێ، هێشتا هەر کۆیلەیە.

بەڵام کۆیلەی کێ؟ هەردوو مرۆڤەکە بەیەك دەنگ وەڵام ئەدەنەوە: کۆیلەی سروشتی خۆی، هەرچەند هەرکامیان وشەی سروشت بە واتای تایبەت خۆی بەکار ئەبا. مرۆڤی شۆڕش ئەڵێ: ئەبێ مرۆڤ لە لەشی نائۆرگانیکی و رێك نەخراوەی خۆی (مەبەستیان سروشتە) لە رێگەی رێکخستنییەوە لە کۆمەڵگای کۆمۆنیستیدا رزگار بکرێ. مرۆڤی شانۆ ئەڵێ: ئینسان ئەبێ لەرێگەی بەدیهێنانی پووچییەوە لە ماهیەتی خۆی رزگار بکرێ.

لەهەردوو حاڵدا ئازادیی پەیوەندی بە بیرڕواو یاساوە نییە بەڵکو پەیوەستە بە کردەوەو مێژووەوە. مەسەلەی ئازادی مەسەلەی دەستەبەر کردنی ئەو ئازادییە نییە کە بە شێوەیەك دابین کراوە، بەڵکو مەسەلەی دابین کردنی خودی ئازادییە کە هێشتا بوونی نییە. کاتێك کە مرۆڤی شۆڕش و مرۆڤی شانۆ بڕیاری ئازاد کردنی ئینسان ئەدەنو ئەیانەوێ ئازادی بکەن، لە راستیدا وەك ئەوەیە بیانەوێ ئینسان بخولقێنن، خولقاندنێکی نوێ، کە یەکەم مەرجی، خواو بە غایب زانینیەتی.

ئێستا ئەمەوێ هەندێ دەربارەی مرۆڤی دژەخوای شۆڕشی جیهانی کۆمۆنیزمەوە بدوێم، ئامانجی من تەنیا پیشاندانی ئەم راستییەیە کە ئەم ئینسانە لە مێژوودا دیاردەیەکی نوێیە.

یەکەم: مەیلی کەسی مارکسیست بەلای دژە خواییدا، نەوەك ئەو گەمژەیەی[١٥] کە لەتەوراتدا ناوی هاتووە کە لەسەر بنەمای مەیلی تاکەکەسی بەرەڵاو بێ لغاوەوە. نەوەك فەیلەسووفەکانی چاخی رۆشنگەری فەرەنسا لەسەر بناغەی مەیلی لەخۆبایی بوونو ئەقڵ پەرستی. بەڵکو رەگی بێ باوەڕیی مارکسیزم لە جیهانی رووداوەکان دایە واتە لە مەینەتی و چارەڕەشی مرۆڤدا، کە راستییەکەی کۆمەڵایەتییەو نابێ لە جیهانی بیرو باوەڕو تیورییەکان دا بۆی بگەڕێین. ئەم بێ باوەڕییە ئاکامی پەستیو تووڕەیی مرۆڤە لە

بارودۆخی مێژوویی خۆی لەسەردەمی تەکنیك و پیشەسازیدا، لە ناخی بێ باوەڕییەك دا کە سەرچاوە سەرەکییەکەی مەسەلەی خراپەو گەندەڵییە، بنەمایەکی ئاکاری هەیە کە لەسەر ئەو بنەمایە، نەك هەر نابێ خراپەو گەندەڵی هەبێ بەڵکو بە هیچ جۆرێك بوونیشی ژەکفەری[*] ناکرێ. ئەم ئەسڵە هێندە رەهایە کە تەنانەت خوای کتێبی پیرۆزیش وەك بابەتێکی پێویست بۆ حکومەتەکەی بەسەر جیهاندا قبوولی ناکا. ئەو خراپەو گەندەڵی بەخراپ ئەزانێ، بەڵام بە شتێکی دوور لە ژەکفەری نازانێ. هەروەها کە پۆلس ی پیرۆز وتوویەتی: (خوا لە بەرامبەر خراپەو گەندەڵی دا (ژەکفەری) ئەنوێنێ، بەڵام ئەمڕۆ ئەم مەسەلەیە وەك تاوانێك وایە لە دژی تاوانێك وایە لە دژی خوادا. بەگوێرەی ئەم تاوانە، خوا نابێ لە بەرامبەر خراپەو گەندەڵیدا ژەکفەری بێ‌و چون ژەکفەرە، کەواتە خوانیە. بەم شێوەیە خوا لەبەر خودی خۆی نکوولی لێ ئەکرێ. ئەم بێ باوەڕیە کە تێیدا، ئینسان، خوا بەهۆی ئاکارێکەوە کە پتر لە خودی خوا لە ئەم ئەچێ، رەت ئەکاتەوە، پاکترین و بە گورترین جۆری بێ باوەڕییە. ئەم بێ باوەڕیە گەلێ لە بێ باوەڕیەکانی سوکی ئینجیل و تاك گەرایانەی بێ بایەخی فەلسەفە، مەزنترە. بێ باوەڕیی مارکسیستی هەرچەن نەگەیشتوەتە ئەم ئاستە، بەڵام بەرەو ئەم مەبەستە دەڕوا.

دووەم: مەیلی مارکسیستێك بۆ ئازادی، ئاکامی توورەیی ئەوە لە بەدبەختی مرۆڤ. بردیایۆف ئەگێڕێتەوە کە: پرسیاریان لە زانخوازێکی[**] روسی کرد کە لە پاریس خوێندنی تەواو کردبوو ئەیەویست بگەڕێتەوە بۆ روسیا: کە ئایا چ شتێك لە فەرەنسادا پتر لە هەموو شت سەرنجی راکێشای؟ لە وەڵامدا وتی: (فەرەنسا بە هیچ شێوەیەك ئازادیی تێدا نیە). ئەم وەڵامە سەیرە پیشانی ئەدا کە لەنێوان چەمکی ئازادیی لە چاخی مۆدێرنیزمداو چەمکی ئازادیی لە هزری مارکسیستی دا چەن مەودای هەیە. لە روانگەی مارکسیستێکەوە، ئازادیی راستەقینە واتە دەسەڵاتدارێتی بەمەبەستی گۆڕینی سروشت، گۆڕینی مرۆڤ‌و کۆمەڵگا، بیناکردنی جیهانێکی نوێ‌و دەستپێکردنی مێژوویێکی نوێ. کاتێك کە ئینسان ئەو پێداویستیانەی کە لە دیالکتیکی ماتریالیزمی مێژوودا شاردراوەن، دەرك بکا، ئەم توانای‌و دەسەڵاتەی دەست ئەکەوێ‌و ئەم دەرك کردنە ئەیکا بە حاکمی مێژوو.

ئازادیی راستەقینەی مرۆڤ تەنها بریتیە لەم دەسەڵاتدارێتیە کە لە مێژوودا هەموو ساتێك بەکارئەبرێ. ئەم ئازادیە واتە ئەم بەکاربردنی هێزەیە بەسەر پرۆسەی مێژوودا، هەمان ئازادیی رەهایە ئینسانی شۆڕش کە خاوەنی ئەم ئازادیە بوو لەمانای مێژووتێدەگات. بەواتایەکی تر، مانایەکی نوێ بە مێژوو ئەبەخشێ و بەرەو رێبازێکی نوێ کە لە کۆتاییەکەی جیهانێکی بەدور لە مەینەتی‌و چارەڕەشیە ئاراستەی ئەکات.

سێهەم: دوژمنی سەرەکی ئازادیی، بەمانا مارکسیستیەکەی، خوا بە مانا رەهاکەی رەهایە "خوا ئاگایی"، ئەو جۆرەی کە کتێبی پیرۆز لێکی داوەتەوە، سەرچاوەی سەرەکیی لە خۆدابران و لەخۆ نامۆبوونی مرۆڤە. ئەمە چەمکێکی ئاڵۆزی مارکسیستیە بەڵام ئێمە بۆ مەبەستەکەی ئێستا ی خۆمان ئەوەندە بەسە کە بڵێین لەخۆنامۆبوون دژی ئازادیە. بە واتاییکی وردتر و هەژێنراوتر، لەخۆنامۆبوون، ئینسان لە ئازادیەکانی خۆی بێبەری ئەکات. ئینسانێك کە خوا بە توانایێکی رەها بزانێ، رادەستی[***] وەهم و خەیاڵە. بە وەهم و خەیاڵ زانینی خوا، ئەگەر نەڵێین ئاکامی رزگاربوونی ئینسانە لە

فەلسەفەی سەردەمی مۆدێرنیزم، ئەتوانین بڵێین، ئاکامی ئەم حەقیقەتەیە کە کەسی مارکسیست ئەیەوێ خوا وەهم و خەیاڵ بێ. خوا جگە لە دەستکردێکی یان ئافرێندراوێکی خودی ئینسان، شتێکی ترنیە. مارکس ( لە گوتارێکی بەناوبانگیدا کە تێیدا ئایین بە (ئەفیونی گەل) ناو ئەبا ئەڵێ: (خوا ئاهی ئینسانی ستەمدیدەیە). مرۆڤ بۆ ئارامکردنەوەی خۆی لەکاتی مەینەتیدا، هێزێکی خەیاڵی، کە دەسەڵاتداری مێژووەو ئەتوانێ لە نەهامەتی رزگاری بکاو مێژوو بەرو بەهەشتێك ببا کە لەودیوی خۆیەوەیە، لە ئاسمانی خەیاڵدا دروست ئەکا. بەڵام ئەمە لە راستیدا تەنها رەنگدانەوەی مەیلەکانی خودی ئینسانە، هەربۆیە ئەم رەنگدانەوەو ئەم خەیاڵە رەنگدراوەیەو بڕوا بەم خەیاڵانە هەمووی زیان بەخشەو پیشاندەری لەخۆنامۆبوونی مرۆڤن. مرۆڤ لەئەنجامی باوەڕ بەخوادا لەگەڵ خودی راستەقینەی خۆیدا نامۆ ئەبێ. ئەو ئەم توانایەی هەیە کە خۆی بێ، واتە بەتوانای رەهابێ، بەڵام کە باوەڕی بە خوا هەبوو ئەوتوانایەی لەدەست ئەدا. ئەرکی مێژوویی مرۆڤ ئەوەیە کە سروشتی خۆی بگۆڕیو لە شە نائۆرگانیکیەکەیشی (واتە سروشت) کە لەحاڵی حازردا بەرەو کۆیلایەتیو چارەرەشی ئەبا، رێك بخاتەوە، واتە مەینەتیێك کە لە رابردوودا لە خەسڵەتەکانی کۆمەڵگای فیۆدالیتە بوو و ئێستاش لە تایبەتمەندیەکانی کۆمەڵگای کاپیتالیزمە لەخۆی دوور بخاتەوە. بەڵام ئینسان، لەگەڵ باوەڕ بەخوادا ناتوانێ ئەم ئەرکە بەجێ بهێنێ.

کەواتە ئەبێ خوا ئاگایی لەناو ئینسانەکانی نوێی شۆڕشدا ریشەکێش بکرێ. هەروەها خوا، بە تەواوەتی سەرکوت بکرێ، واتە هەم لە ژیانی کۆمەڵایەتیو هەم لە ژیانی تاکیدا ئەبێ دەربکرێ. مارکسو میراتبەرەکانی، فریوی ئەو دروشمە پوچەڵەی مرۆڤە بێ خواکانی سەردەمی مۆدێرنزمیان نەخوارد، کە ئەڵێ: ئایین بابەتێکە تەنها پەیوەندیی بە تاك و بە کەسەوە هەیە. ئەوان ئەوەندە زیرەك بوون کە تێبگەن، ئایین تەنانەت بەشێوەی باوەڕێکی کەسیش، لە هەموو بابەتێکی تری کۆمەڵایەتی، کۆمەڵایەتی ترە. کەواتە لە کۆمەڵگای ئایدیالی مارکسیزمدا هیچ کەس، تەنانەت لە خەڵوەتی لە دڵی خۆیشیدا، بۆی نیە بڵێ: (خوا لێرەدایە، بەتوانای رەها ئێستا زیندوەو خەریکی کارە.) کەسێکی وا، گەمژەیەو بەدابڕاو لە شۆڕش لەقەڵەم ئەدرێ، شۆڕشێك کە هەموو سەرکەوتنەکانی بەسەرکوتکردنی خواو ریشەکێش کردنی باوەڕ بە دەسەڵاتدارێتی ئەو بەسەر مێژووەوە بەستراوە.

لینین، کە میراتگری مارکس بوو، ئەم خاڵە زۆر گرنگەی گەلێ راشکاوتر لە مامۆستاکەی دەربڕیوە. ئەو لە ساڵی ١٩٠٥ دا وتی: رەنگە حکومەت بیەوێ ئایین وەك بابەتێکی تەواو شەخسی لەقەڵەم بدات بەڵام ئەمە تەنها مشوورێکەو سازانە لەگەڵ گیانی کاپیتالیزمی مۆدێرندا. لە دیدی حیزبی کرێکارانی سۆسیالیتی شۆڕشگێڕەوە، ئایین بەهیچ جۆرێ بابەتێکی شەخسی نیە بەڵکو ئایدیۆلۆژیکیە، لەم رووەوە پەیوەندی بە حیزبەوە هەیەو لەئەنجامدا شتێکی کۆمەڵایەتیە. لە خەباتی ئایدیۆلۆژیکیدا، خەبات دژی ئایین رۆڵی بناغەیی هەیەو راگەیاندنی بێ باوەڕی بۆ راگەیاندنی حیزب زۆر پێویستە. کەسێکی مەسیحی، واتە کەسێك کە خوا بە توانای بێ چەندو چوونو رەها ئەزانێ و پێی وایە کە ئەو لێرەو لەم ساتەو لەمێژوودا لەگەڵ ئێمەدایە، لە حیزبی ئێمەدا جێگای نیە و کاتێ کە حیزب بەسەرکەوتنی شۆڕش سەربکەوێ، کەسێکی واله هیچ کوێ، جێگای نابێتەوە.

چوارەم: ئەفسانەی مەرگی خوا لەپێداویستیەکانی ئایدیۆلۆژیکی شۆڕشە.

هەڵبەت مەرگی خوا تەنها ئەفسانەیێك نییە، بەواتایێکی وردتر، لە پشت رواڵەتی ئەدەبیی ئەفسانەوە، حەقیقەتێکی زانستیانە هەیە. ئەو حەقیقەتەیش ئەمەیە کە ئینسانی شۆڕش بەدەرکێکی زانسیانە لە مێژوو گەیشتووە و لە مانای مێژوو تێگەیشتووە. ئەوتێگەیشتووە کە مێژوو سروشتی ئینسان دروست ئەکا، نەك خوا، و ئەمەیش واتە مەرگی خوا، کاتێ کە مرۆڤ لە رێگەی مێژووەوە خۆی ناسی و تێگەیشت کە ئافرێندراوی مێژووە، نەك هی خوا، ئیتر خوا مردوە، ئەو مردو لەگۆڕەپانی مێژوو دەرکراو ئینسانیش وەك دەسەڵاتداری مێژوو بەجێ هێشت.

پێنجەم: مرۆڤی دژە خوای شۆڕش وەك لایەنی ئەو سنوورەی کە بۆ ئەرکە مێژووییەکەی لەبەرچاوی گرتووە، دیاردەیەکی نوێیە. چونکە ئامانجی ئەو یەکالاکردنەوەی مەسەلەی خراپەو گەندەڵی نیە. ئەو، ئەم حەقیقەتە ئەزانێ کە هیچ رێگایەك بۆ چارەسەری ئەم مەسەلەیە شیاوی قبوڵ کردن نیە مەگەر لایەنی کردەوەی تێدا هەبێت واتە بەڕاستی ئینسان لە کۆتو بەندی خراپەو گەندەڵی رزگار بکا. بەم پێیە، ئەرکێك کە بە ئەستۆی گرتووە، ئەرکێکی کردەییە.

ئەو هەروەها ئەمەیش ئەزانێ کە مەسەلەی خراپە تەنها بەدەستی کەسێك رێگەچارەی کردەیی خۆی ئەبڕێ کە بتوانێ پیشانی بدات کە خراپە لە راستیدا خراپە نیە بەڵکو چاکەیە (واتە شەڕ تەنها شەڕ نیە بەڵکو خێرە). لە نەریتی کتێبی پیرۆزدا ئەم توانایە تەنها خوا هەیەتی و بەس . بەتوانای رەها. تەنها لەبەر ئەوە لە بەرامبەر خراپەدا کە لەم جیهانەدا ئەکرێ، ژەکفەری پیشان ئەدات، چونکە ئەتوانێ کارێ بکات کە ئەم ژەکفەرییە (دادوەرییەکەی بخاتە روو) (رۆمییەکان کتێبی سێیەم، ئایەتی ٢٦).

ئەمڕۆ ئینسانی شۆڕش لە هەموو کاتێکی تر باشتر ئەتوانێ ئەم کارە بکات، چونکە ئەو ئەمڕۆ خاوەنی ئەو توانایەیە ئەمە بنچینەی سەرەکیی رەوشتی شۆڕشە. لە روانگەی ئەوەوە خراپە ئەتوانێ رەوا بێ و تەنانەت ئەکرێ خراپە بەدەستی ئەنقەست ئەنجام بدرێ، بەڵام بەو مەرجەی لەپێناوی بەدیهاتنی ئامانجەکانی شۆڕش دا بێ. دەسەڵاتداری نوێی مێژوو ئەتوانێ وا پیشان بدات کە بەدبەختی ئێستا (چ خودی ئینسان بەسەر خۆی هێنابێ و چ بەسەریاندا سەپاندبێ) لە راستیدا چاکەیەو خێری تێدایە، چونکە لەپێناوی بەدیهاتنی ئامانجەکانی شۆڕش دایە.

لەکاتی سەرهەڵدانی کۆمەڵگای جیهانیی کۆمۆنیزم دا، مەسەلەی خراپەکاری، بە کردەوە یەکالا ئەبێتەوەو لەم کاتەدایە کە دادی رزگارکەری مرۆڤی دژەخوا دەرئەکەوێ. مێژووی رزگاریی لە کتێبی پیرۆزدا لە کاتێکەوە دەست پێ ئەکا کە (یەهوە Yahweh) وەك خوایەکی ئامادەو زیندوو هاتە خوارەوە تا قەومەکەی خۆی لە نەهامەتیو کۆیلایەتی میسر رزگار بکا. ئەم مێژووە ئاماژە بۆ ئامانجێك ئەکا کە هەم یەك واقعیەتە و هەم یەك هێما، واتە گەڕانەوە بۆ سەرزەمینی بەڵێندراو کە جۆگەکانی هەنگوینو شیری تێدایە. بەرواری نوێی رزگاری، لەکاتێکەوە دەست پێ ئەکا کە ئینسان تێگەیشتووە کەوا خوا نەك هەر رزگارکەری نییە بەڵکو خولقێنەریش نییەو ئەمەیش بەمانای مەرگی خوایە، ئەم مێژووەیش ئاماژە بۆ ئامانجێك ئەکا کە تەنها واقعیەتە نەك هێما. دەسەڵاتداری نوێی مێژوو، واتە حیزبی کۆمۆنیست، پەیمانی دێرین واتە بردنی خەڵك بۆ سەر زەمینی بەڵێندراو، دووپات ئەکاتەوە، بەڵام ئەمجارە هەرێمی سەرزەمینی بەڵێندراو هەموو گۆی زەوییەو چوونە ناویشی لە داهاتوودا

سەرئەگرێ. هێماکانی هەنگوینو شیر هەروەك خۆیان ماونەتەوەو لە هەرکامەیان بەشی هەموو کەس دابین ئەکرێ، بەلاّم بەلای سەرووی ئەم سەرزەمینەو هەموو خەلّکانەوە ئالاّیەك ئەشەکێتەوە کە وەبیر هێنەرەوەی ئەو ئالاّیەیە کە پاش سەرکەوتنی (یوشع) بەسەر (ئەمالیك Amalek) ەکان دا، موسا بەرزی کردەوە، تەنها بەم جیاوازیەوە کە لەسەر ئەم ئالاّیە نووسراوە (خوا نی یە، خوا مردووە).

شەشەم: مرۆڤی شۆڕش دلّنیایی یەکی تەواو نوێ لەخۆ پیشان ئەدات کە لەگەلّ پلەی ئەودەسەلاّتدارێتی یەی کە بە ئەستۆی گرتووە، گونجاو وشیاوە، هەلّبەت ئەوە وەك (کۆندۆرسە) نی یە کە بە دلّنیای یەکی تەواو و بەلاّم قابیلی شکان، کە تایبەت بە ئەقلّ گەڕایی پێشین بوو، لەسەرهەلّدانی روو ئەندێشەیو لەناوچوونی دەمارگیری دلّنیابێ. مارکس وتی: (راو ئەندێشەکان هیچ کارێکیان پێ ناکرێ)و میراتبەرەکانیشی بە تەواوەتی بروایان بە قسەکەی کرد. ئەوان بیروڕاکانی مارکس یان بەهێز موتربە کرد و کردیانە حکومەتێکی گەورە کە هەموو تواناکانی خۆی بۆ بەرەو پێش بردنی شۆڕش خستووەتە گەڕ، شاگردەکانی مارکس زۆر چاك ئەزانن کە چۆن کەلّك لە هێز وەربگیرێ بۆ پاراستنی ئەندێشە. ئینسانی نوێ (کۆنت) یش نی یە کە خۆی بەم بڕوایە دلّخۆش بکا، کە مێژووی خۆی کۆتایی بەسەردەمی فەلسەفەو ئیلاهییات ئەهێنێو چاخی نوێی زانست دەست پێدەکات. ئینسانی نوێ ئەزانێ کە مێژوو هەروەها کە پێویستی بە دەسەلاّتدار هەیە، پێویستی یشی بە خزمەتکار هەیە کە کارەکانی بۆ جێبەجێ بکا.

گەورەترین لەخۆبردوویی ئینسان ئەوەیە کە خزمەتکاری مێژووبێ. چونکە لەم خزمەتکردنەدا، قوولّترین رەگی دلّنیایی خۆی ئەدۆزێتەوە. ئینسانی نوێ نموونەی ساختەی هەمان (خزمەتکاری یەهوە) یە کە ئەشعیای دووەم چەن شیعرێکی بۆ هۆنیوەتەوە. ئەو، لە خۆبوردەیەو پارەو لەزەتیش ناتوانێ تووشی خراپەو گەندەلّی بکات. ئەو پەیمانی بەستووە کە سەختی ی کاری بەردەوام، کە ئەرکی بنەڕەتی ی چینی کرێکارە، ژەکفەری بکاو لەم رێگەوە بەدیهاتنی ئامانجەکانی شۆڕش پێش بخات.ئەم ئینسانە نوێیە ئەیەوێ حکومەتی دیکتاتۆری بەسەر هەموو جیهاندا بسەپێنێ، بەلاّم تەنها بەمەبەستی رزگارکردنی جیهان. ئەو تەنانەت خوازیاری مەرگی خۆیەتی و بەم کارەشی ئەبێتە هۆی لەناو بردنی حکومەتێك، کە کەرەسەی هێزی خۆیەتی، بەلاّم تەنها لەبەرئەوەی کە تەنانەت بە باجی مەرگی خۆیشی بووە، خەلّك رزگار بکاو بەرەو ژیانێکی نوێ لە کۆمەلّگایێکی بێ چیندا بیانبات. هەلّبەت ئەمە رووداوێکە کە ئەمرۆ بەرچاو ناکەوێ بەلاّم ئەو، روودانی لەداهاتوودا بە شتێکی بێگومان ئەزانێ. (بە چاوی ئیمان گەلێ لە شتە نەدیدەنیەکان ئەبینرێ).

دەست ئەنقەست، خەسلّەتەکانی ئینسانی شۆڕش -م بەشێوەیێکی عیرفانی تەواو کرد. چون لام وایە ئەگەر باری عیرفانیەکەی کەلاّمی ئینسانی دژە خوای شۆڕش نەبیستین، ناتوانین بەتەواوەتی دەرکیان بکەین.

وەسفکردنی جۆری دووەمی بێ باوەڕی لە چاخی پۆست مۆدێرنیزمدا، کە مرۆڤی نوێی شانۆ هێمایەتی، گەلێ دژوارە. چونکە ئەو تازە هاتووەتە ناو مەیدانەوەو هێشتا ئامانجەکانی بەتەواوەتی روون نی یە، سەرەڕای ئەمانەیش، ئاخافتن لەسەر مرۆڤی شانۆ وەك ئاخافتن لەسەر مرۆڤی مارکسیست ئاسان نی یە، چونکە ئینسانی مارکسیست یەك سیما واتە یەك رووی هەیە، ئەویش بەکۆمەلّێك هێلّی نەگۆڕ و دیارەوە، وەك

کەسێکی بەساڵاچوو بە پیشەیەکی نەگۆڕو دیارەوە، بەڵام ئینسانی شانۆ یەك ئینسان نییە بەڵکو کۆمەڵێکی زۆر ئینسانەکانە کە لە یەکتر جیاوازو جیان و لێکچوونی ئەوتۆ لەنێوانیاندا نابینرێت، لەم رووەوە پێناسەکردنی سیمای ئەو ئەگەر ئەستەم نەبێ، دژوارە. رەنگە نموونە باڵای ئەم چەشنە ئینسانە (ژان پۆل سارتەر) بێت، هەرچەند هەندێ لە مرۆڤەکانی شانۆ ئەم لێکچوونە رەت ئەکەنەوە.

ئەتوانین سارتەر بەشێوەیەکی نائاسایی و پێچەوانە، بە فەیلەسوفێکی سکۆلاستیك بزانین، چونکە پەیوەندی ئەو لەگەڵ پێشگۆییەکانی نیچەدا وەك پەیوەندی فەیلەسووفی سکۆلاستیك وایە لەگەڵ پێشگۆییەکانی (سەردەمی نوێ) (مەبەست چوار ئینجیلەکەو نامەی نوێنەرانە). فەیلەسووفە سکۆلاستیکەکان کە پێشەنگیان (ئانسێلم) بوو، بە بنەمای (ئیمان ئەهێنم تاکو تێبگەم) دەستیان پێکرد.

پرسیاری فەیلەسووفی سکۆلاستیك ئەمە بوو کە ئایا ئەوەی باوەڕ ئەیلێ ماقووڵە؟ بەڵام سارتەر بە ئەفسانەی مەرگی خواوە دەست پێ دەکات. مەرگی خوا بۆ سارتەر تاکە کۆڵەکەی باوەڕیەتی و ئەمەیشی بێ سێ و دوو قبووڵ کردووە. کەواتە پرسیاری ئەویش وەك پرسیاری فەیلەسووفی سکۆلاستیك وایە، واتە ئایا ئەوەی باوەڕ ئەیلێ ماقووڵە؟ ئەگەر بمانەوێ پرسیارەکەی سارتەر وردتر روون بکەینەوە ئەبێ یەکێك لە وشەکانی پرسیارەکە بگۆڕین، چونکە وشەی ماقووڵ (Intellgible) بێگومان لە روانگەی سارتەرەوە ناماقووڵە، ئەو هەرگیز ئەم وشەیە بەکارنابا، چونکە ئەوکاتە ناتوانێ مەبەستی خۆی دەربڕێ. کەواتە پرسیارەکەی ئەو لەگەڵ پرسیاری فەیلەسووفی سکۆلاستیك دا نەختێك جیاوازە. بەشێوەیەکی راستتر، پرسیارەکەی سارتەر ئەمەیە، کە ئایا ئەوەی باوەڕ ئەیلێ، واتە خوا مردووە، بۆژیان ئەشێ یان نا؟ ئامانجی ئەو ئەمەیە کە بەدیهاتنی مەرگی خوا دەستبەریکاو جیهانێك بهێنێتە دی کە خواکەی مردووەو هەروەها وەسفکردنێکی دیاردەناسانە لە ئینسانی بێ خوا بخاتە روو. ئامانجی گشتی مرۆڤی شانۆیش، کە سارتەری کردووە بە نموونەباڵای خۆی، هەر شتێکە لەم بابەتە، هەڵبەت بۆ تەواوکردنی بابەتەکەمان پێویستە چەند خاڵێکی ناسك زیاد بکرێ کە من هەوڵ ئەدەم بەشێوەیەکی گشتی باسیان بکەم.

یەکەم: خاڵی دەستپێکردنی مرۆڤی شانۆ، جیهانی رووداوەکانە نەك جیهانی باوەڕەکان. ئەوەی لەسەرەتاوە لەبەرامبەریدایە مەسەلەی خراپەیە. ئەو جیهانا بەم جۆرە ئەبینێ کە کامۆ (هەڵبەت خودی کامۆ نەك ئەو کامۆیەی وا لەژێر کاریگەریی نەفسیەت و ئامانجەکانی سارتەردا بوو). لە کتێبی (ئینسانی یاخی) دا بینیویەتی. ئەوەی ئەو ئەیبینێ بایەخێکە کە مەرگ گەمارۆی داوەو بەردەوام بەشێوەگەلی جۆراوجۆر (کە هەمان شێوە جۆراوجۆرەکانی مەرگە) هێرشی ئەکرێتە سەر. دوای مەرگیش هیچ شتێك نییە. هەندێك لە مەینەتییەکانی مرۆڤ گشتییە، وەك، جەنگی درندانەو رەفتاری توندوتیژ لە ئۆرگانەکانی کاری ناچاریدا، کە هەردووکیان ئەنجامی ستەمکاری یان گەوجایەتی سیاسەت مەدارانە. هەندێکیش لە مەینەتییەکان تاکی و کەسین وەك، بێ تاوانێك کە ئازار ئەدرێ یان کەسێکی بەئەمەك کە خیانەتی پێ ئەکرێ، یان دڵدارێ کە رەفتاری ناجوامێرانەی لەگەڵ ئەکرێ، کەسێکی بەرێز کە تاوانێکی سووکی بە ناڕەوا ئەدرێتە پاڵ و هەروەها نەخۆشییەکان و شکستەکان و لاوازییەکان. ئینسانی شانۆ ئەم دیمەنە دڵتەزێنانە نەك بە رەشبینی و بەدگومانییەوە بەرامبەر بە مرۆڤ، – کە لە

هەموو لایەکەوە رووبەڕووی ئەم مەترسیانە ئەبێتەوە –، بەڵکو بە سۆزو هاودەردی یەوە، سەیر ئەکا. حاڵەتی دەروونی ئەو پێچەوانەی حاڵەتی دەروونیی مرۆڤی مۆدێرنیزمە کە بیروڕاکان لە چاوی‌دا درەوشاوە بوون.

دەروونی ئەو تاریکی دای گرتووەو هەست بە کۆتایی هاتن‌و تێکشکاندنی بوون (وجود) ئەکاو ئەمەیش ئەبێتە هۆی بێ تاقەتی‌و پەشێوی‌و نیگەران بوونی. گیانی ئەو لەبەرامبەر قابیلی پێش بینی نەبوونی مێژوودا ئەلەرزێ. ئەم مرۆڤی چاخی پۆست مۆدێرنیزمە لە پەشێوی‌و دڵە راوکێ‌دا ئەژی.

دووەم: مرۆڤی شانۆ بەدوای روونکردنەوەو تێگەیشتنی جیهانی بینراودا ناڕوا، بەڵکو تەنها ئەیەوێ لەم جیهانەدا بە ئازادی بژی. تێگەیشتنی ئەو لە ئازادی، نادیارو ئاڵۆزە، بەڵام ئێمە بۆ مەبەستی ئێستای خۆمان، تەنها ئەوەندە بەسە کە لە دەستەواژەکەی سارتەر کەڵك وەربگرین‌و بڵێین کە مرۆڤی شانۆ ئەیەوێ (دروستکەری خۆی، یان داهێنەری خۆی – Inventor of himself) بێ. ئەم خواستە، پەرۆشی‌یە بەڵام نەك لە جۆری خۆش خەیاڵانەی باوی کۆن، مانای ئەم خواستە ئەوەیە کە ئینسان ئەبێ پووچی جیهان‌و هەروەها پووچی خۆی دەرك بکا. مرۆڤ یەك ماهیەت نی‌یە، واتە لە قووڵایی دەروونی‌دا هیچ ماناو ماقووڵیەتێك نی‌یە، ئینسان هیچ سروشتێکی نیە، واتە لە قووڵایی دەروونی‌دا هیچ کۆمەڵە سیستەمێکی هێزی بزوێنەری نی‌یە کە ببێتە هۆی کارێکی ئامانجدار و گونجاو. ئەم مەسەلەیە نەك هەر لەسەر ئینسان بەڵکو لەمەڕ جیهانیشەوە راستەو لەم حاڵەتەدا جیهان ئەبێ. بە جیهانێکی شانۆیی کە تەنها بەکەڵکی شانۆدێ. با ئەمانە هەمووی وابێ‌و کەس هەوڵی گۆڕانیان نەدا، چونکە ئینسانی شانۆ بەپێچەوانەی مرۆڤی مارکسیست، ئازادی بەمانای ئەگەری گۆڕینی جیهان نازانێ. بەڕای ئەو ئەگەری لەم بابەتە شتێکی ئەستەمە. ئینجیل ئەڵێ: (جیهان تاریکە) و بەم شێوەیە حەقیقەتێکی ئەگۆڕو باڵاتر لە زەمەن دەرئەخات، بەڵام ئینسانی شانۆ ئەڵێ جیهان پووچ و بێ مانایە. بەم جۆرە ئینجیل جیهان تەنها بە نهێنی‌یەك ئەزانێ بەڵام مرۆڤی شانۆ ئەیکا بە مەتەڵێکی رووت.

کەواتە، چوارچێوەی ئامانجی ئینسان دیارەو ئەخشەی بنەڕەتیی ئەو لەم چوارچێوەیەدا ئەمەیە کە ئازاد بێ. لەروانگەی ئەوەوە ئازادبوون بەم مانایە کە بەتەنیایی و بە کەماڵی لە بەرامبەر بوونی خۆیدا پابەند بێ‌و بەرپرسیارێتی کامڵیشی بە خودی خۆیەوە بێ. مرۆڤ ئەیەوێ لە رووبەڕووبوونەوە لەگەڵ پووچی جیهاندا خودی خۆی بێ. ئامانجی ئەوەیە کە خۆی رزگاربکا. خۆی بدۆزێتەوەو تێبگا.

ئەم (خۆ) یە تەنها یەك ئازادی و سەربەخۆیی رەهاو لە راستیدا هەمان ئەو شتەیە کە ئەو ئەیەوێ دای بێنێ و دروستی بکا. لە جیهانێکدا کە لە هەموو بارێکەوە پووچە ئەمە بەتەنها ئەرزش لەقەڵەم ئەدرێ، بەڵام ئەم ئەرزشەیش خۆی پوچە. لەم حاڵەدا ئامانجی ئینسان هەر لەسەرەتاوە مەحکوم بە شکستە، چونکە ئەگەر بیەوێ ببێتە خاوەنی ئەم ئازادی‌یە، ئەبێ خوابێ و ئەمەیش پووچی‌یەکی دووبەرامبەرە. مەسەلە تەنها ئەمە نیە کە ئینسان ناتوانێ ببێ بەخوا بەڵکو لە راستیدا ئەگەر بیەوێ خوا بێ، ئیتر ناتوانێ بوونی هەبێ چونکە خوا بوونی نیە.

سێیەم: مرۆڤی شانۆ ئەفسانەی مەرگی قبوڵە، بەڵام بەمانایێك تێی دەگا کە تایبەت بەخۆیەتی. ئەو، بەپێچەوانەی ئینسانی سەردەمی مۆدێرنیزم، نایەوێ بوونی خوا رەت

بکاتەوەو تەنانەت زەحمەتی ئەوە بەخۆی نادات کە ناڕاستی بوونی بەلگە کۆنەکانی بوونی خوا بسەلمێنێ. مەسەلە چوارلایەنیەکەی سەدەکانی ناوەڕاست – واتە ئایا خوا هەیە؟ ماهییەتی چیە؟ چۆن بیناسین؟ چۆن ناوی بەرین؟ – بۆ ئەو هیچ مانایێکی نیە. پرسیاری ئەو هەمان پرسیاری کتێبی پیرۆزە، واتە ئایا خوا لێرەیەو ئێستا لەگەڵ ئێمەدایە؟ بەلام وەلامێکی نەگەتیف بەم پرسیارە ئەداتەوە.

بەواتایێکی وردتر، ئەو ناڵێ کە خوا مردووە، چونکە ئەمە بەمانای ئەوەیە کە خوا کاتی خۆی بووەو لەگەڵمانا ژیاوە. ئینسانی شانۆ لەیەک حاڵەتی ڕۆحیدا باسی نادیاری خوا ئەکا. ئەویش لەحاڵەتی هەست بە تاوان و ترسدایە ترس لەوەی کە ڕەنگە خوا نادیار (ناپەیدا) نەبێ، ڕەنگە ئەو تەنها ئەوکاتەی کە بەڕاستی بوونی هەیە نادیار ئەبێ. هەست بە تاوانیش بۆئەوەی کە خوا تەنها لەبەر ئەوە ناپەیدایەکە ئینسان پشت گوێی خستووە. بەلام مرۆڤی شانۆ لە حاڵەتی ڕۆحی تردا کە پیشاندەری ئیرادەیێکی بێ باوەڕیی پتەوترە، ئەڵێ خوا غایبە. ئەو کاتێ کە ئیرادەی پۆست مۆدێرنیزمانەی تەواو بەهێز ئەبێ لەمەیش تێ ئەپەڕێو ئەڵێ خوا هەر ئەبێ غایب بێو بەم وتەیە خواستی بنەڕەتی خۆی دەرئەبڕێ. هەڵبەت هۆکەیشی ئاشکرایە: ئەگەر خوا لەناو خەلکدا ئامادەبێ، ئینسان ئازادیی خۆی کە یەکێکە لە خواستە بنەڕەتیەکانی مرۆڤی شانۆ لەدەست ئەدا. ئەگەر خوا ئامادەبێ کەواتە ئەوە کە ئینسان دروست ئەکاو ئەوە کە ماهییەتو سروشت بە ئینسان ئەبەخشێ. لەم حاڵەیشدا، ئیتر ئینسان ئازاد نیە کە خۆی لە نەبوون، واتە لەحاڵەتی نەبوونی سروشتو ماهییەت، دروست بکا. ئەگەر خوا ئامادەبێ، بوونی ئینسان، کە ماهییەتیشی ئەهێنێتەدی، ئەبێتە چارەنووسێک و بەس، چارەنوسێک کە مرۆڤ خۆی هەڵی نەبژاردوە. لەحاڵەتێکە وادا هێزی هەڵبژاردنی بەتوانای ڕەها کە بالاترە لە هێزی هەڵبژاردنی ئینسان، بەسەر ئینساندا ئەسەپێندرێو هێزەکەی مرۆڤ بۆ دروست کردنی خۆی لەژێر ئەو هێزەدا ورد ئەبێو لەناو ئەچێ. ئەگەر خوا ئامادەبێ و ئەگەر وەک ئازادێکی بالادەست تر لە بوونی مێژوویی ئینساندا دەست تێوەردانی هەبێ، ئیتر ئینسان ناتوانێ بوونی هەبێ چونکە ژیانی خوا بەمانای مەرگی ئینسانە.

لەبەرئەمانە ئەبێ ڕاگەیەندرێ کە خوا مردووەو غایبەو ناپەیدایە. ئەم ڕاگەیاندنە، کردەوەیێکی ئیرادەیی‌یەو پیشاندەری خواستی بنەڕەتیی ئینسانە بۆ بەغایب زانینی خوا. ئینسانی شانۆ، وەک ئینسانی سەردەمی پۆست مۆدێرنیزم لە نەریتی مارکسیستیدا، لە بنەڕەتدا دژە خوایە، بەلام بەپێچەوانەی مارکس، نایەوێ خوا سەرکوت بکاو لەمێژوو دەری بکا. (ئەگەر ئەو بتوانێ مێژوو دەرک بکا، کە لە ڕاستیدا دەرکی ناکا، دەرکی ئەو لەمێژوو لەگەڵ دەرکی مارکس یەکسان نیە).

ئەگەر ئێوە چەمکی (فەرامۆش کردن) ی خوا لەکتێبی پیرۆزدا وەربگرنو بەمانافرۆیدیەکەی کە هەروەک ماناکەی کتێبی پیرۆز وایە دەرکی بکەن، وردتر ئەتوانن خواستی مرۆڤی شانۆ وەسف بکەن. خواستی ئەو ئەمەیە کە خوا لەبەشی (خودئاگا) (Consciousness) دا ڕاوبنێ. ئامانجی ئینسانی شانۆ دەرکردنی خوا لە ویژدانی (خود ئاگا) ی خۆیەتی. هەرچەن لەم حاڵەتەیشدا خوا لەقوولای ویژداندا بوونی هەیە. ڕای خوا ناسی ئێوە هەرچی بێ، لەم بابەتەدا ئەبێ قبوڵی بکەن کە ئەم ئامانجە پێویستی بەمەترسییەکی جیدی سایکۆلۆجیانە هەیە.

وتمان کە مرۆڤی شانۆ سیمایێکی لێڵو نادیاری هەیەو نەخۆی توانیویەتی پێناسەیێکی ڕاستی خۆی بکاو نە کەسێکی تر. بەلام بەهەرحاڵ

سیمایێکی نوێیە کە ئێمە تەنانەت لێرە، واتە ئەمریکا، نابێ پشت گوێی بخەین. رەنگە ئێمە تەنها لەبەرئەوەی کە هێشتا لەچاخی مۆدێرنیزمدا ئەژین (یان پێمان وایە کە لەم چاخەدا ئەژین) و هەروەها لەبەرئەوەی کە مەسەلەی خراپە (شر) تا ئێستا کەمتر ئەم ولاتە خۆشبەختەی خستۆتە ژێر کاریگەریی خۆیەوە، مرۆڤی شانۆ بەلامانەوە نامۆیە، بەلام ئەبێ زۆر زیاتر لە پێشو سەرنجی بدەین، چونکە ئەو دادوەر (حەکەم) ی چاخی مۆدێرنیزمە. فەرامۆشی نەکەین کە ئەوجیهانەی کە ئەو (مرۆڤی شانۆ) بەپوچی ئەزانێ و بوونی مرۆڤ کە ئەڵێ خوای تێدا غایبەو ئەو ئازادییەی ئینسان کە تەنها بە شکست و ناکامی ئەزانێ هەمووی ناکامی سەردەمی مۆدێرنیزمن. ئێمە ئەمرۆکە ئەبینین مەسەلەی خراپە، مێشکی ئەوی داگیرکردووە، هۆکەی ئەوەیە کە ئەم مەسەلە کۆنە بەشێوەی ئالۆز و بەرچاوی نوێی، میراتی چاخی مۆدێرنیزمە کە بە ئەو گەیشتووە.

دادوەری لەسەر ئینسانی شانۆ، کە خۆی یەک دادوەرە، کارێکی دژوارە، بەلام ئەگەر بریار بێ ئەم دادوەرییە بەگوێرەی کتێبی پیرۆز، لام وایە باشترین کتێب، حیکمەتی سلێمان بێ. هەرچەن ئەبێ هەندێ گۆرانکاری تێدابکەین، حەکیمی بەنی ئیسرابیل هەرگیز لە ئەسکەندەرییەی میسر، — کە لەوکاتەدا پایتەختی فەرهەنگی جیهانی ژیارە (حضارة) بوو و لەوێدا هەموو جۆرە ئینسانێك سەبارەت بەمەسەلەی خوا گفتوگۆیان ئەکرد، — لەگەڵ ئینسانێکی لەم چەشنەدا رووبەڕوو نەبووەتەوە. ئەگەر زانای بەنی ئیسرابیل لەگەڵ مرۆڤی شانۆی سەردەمی پۆست مۆدێرنیزمدا رووبەڕوو ببوایەتەوە، بەم جۆرە لەبارەیەوە دادوەری ئەکرد: (ئەم ئینسانە شایانی سەرزەنشتی کەمترە، چونکە رەنگە ئەو لەگەڕانی خۆیدا بۆ دۆزینەوەی خوا لەرێگەی راست لای دابێ. ئەو تەواو نوقمی بارودۆخی ئینسان ئەبێ و ئەیەوێ پەی بە ناخی ببا، بەلام هەروەهایش رێگە بەخۆی ئەدا کە گیرۆدەی رواڵەتە دەرەکییەکان بێ و چ ترسناکە ئەو شتانەی کە ئەیبینێ.)

ئەمە یەکێکە لە دووپاساوە کۆنەکان (بەراوردی بکەن لەگەڵ حکمەتدا بەشی ۱۳ بەندی ٦،٧) کە هەڵبەت پاساوێکی باشترە بەلام هێشتا بەهانەیێکی رەوانیە.

ئێستا کاتی ئەوە هاتووە کە لەم لێکدانەوە درێژە، بەلام هێشتا پوختەنەکراوەدا، لەمەڕ مەسەلەی (خوا لە رابردوو و ئێستادا) ئەنجام گیرییەك بکەین. لانی کەم یەك ئەنجام هەیە کە ئەتوانین بیکەین بە دوو بەشەوە:

یەکەم:

بەڕاستی ئەتوانین بڵێین کە مەسەلەی خوا لەسەردەمی مۆدێرنیزم دا، ئەو جۆرەی کە مرۆڤی بێ خوای ئاکادیمی هێنایە ئاراوە، تارادەیەك درێژەپێدانی هاتنە خوارەوەی مەسەلەی خوایە لە سەدەکانی ناوەڕاست دا، — بەو شێوەیەی کە (ئاکو ئیناس) باسی کردبوو —. لە هەردوو سەردەم دا بابەتە بەرباسەکان لەیەکسانییەوە نزیك بوون چونکە باس لە بوون، ماهییەت، ناسین و زمان ئەکرا.[16] بۆ هەردوو لایەن واتە فەلسەفەی سکۆلاستیك و مرۆڤی بێ خوای ئەکادیمی، بابەتی سەرەکی ئەمەبوو کە خوا چیە؟ مەسەلە ماقوولیەتی خواو هەروەها لە پەیوەندی لەگەڵ ئەوەدا ماقوولیەتی جیهان بوو. بەلام لەسەردەمی پۆست مۆدێرنیزمدا ئەم مەسەلەیە پووچ بووەتەوە چونکە ئەگەر خوا، ئەو جۆرەی کە چاخی پۆست مۆدێرنیزم گریمانەی لێ ئەکا، مردەووە ئیتر بۆچی باسی ماقوولیەتی خواو هەروەها ماقوولیەتی جیهان بکەین؟ بەڕاستی چ پێویستی بە باسە؟ ئێمە ئەبێ یەکێك لەم دوو کارەبکەین: یان لەبەرئەوەی

کە ئینسان ئازادە کە جیهان بگۆڕێ، جیهان بگۆڕین، یان لەبەرئەوەی کە ئینسان جگە لە بەخشینی مافی هاتنە دیی جیهانی (بەبێ خوا) ئازادییەکی تری نیە، تەنها مافی هاتنە دی بە جیهان ببەخشین.

دووەم:

لەسەردەمی پۆست مۆدێرنیزمدا مەسەلەی خوا ئەگەڕێتەوە بۆ ئەو بارودۆخەی لەکتێبی پیرۆزدا هاتووە. هەڵبەت لەبری باسی گەڕانەوە ئەبێ بڵێین، ئەم مەسەلەیە لە قووڵاییدا، کە هەمیشە تێیدا بووە _واتە لە قووڵایی مێژوودا کە گەلێ خوارترە لە ئاستی ڕووداوەکانی ڕۆژانە و لە قووڵایی دڵی مرۆڤدا کە گەلێ قووڵترە لە ئاستی بیری ڕۆژانە) هاتووەتە سەرەوەو خۆی ئاشکراکردووە. مەسەلەی خوا ئەمڕۆ تەنها لە ئاستی بیروبۆچوون و سەلماندن، واتە ئاستێك کە باسی ماهییەت و بوونی تێدا دەکرێ، نامەوەتەوە، بەڵکو لە پلەی مێژوویی – وجودی، کە تێیدا باس لە ئامادەبوون یان غایب بوون‌و ڕوون بوون یان لێڵی ئەکرێ، جێگیربووە. ئەمە هەمان پلەو ئاستە کە خوای بەنی ئیسرایيل لەکاتێکدا کە قەومەکەی خۆی بەسەر کردەوەو لەکۆیلایەتی‌و کۆت‌و بەند ڕزگاری کردن، مەسەلەی خوای تێدا جێگیر کرد. مرۆڤی شۆڕش‌و مرۆڤی شانۆیش کە ئێمەیان بەسەرکردۆتەوە (ئەگەر نەڵێین بۆ ڕزگارکردنمان) جارێکی تر ئەم مەسەلەیەیان لەم ئاستەدا داناوە.

ئێمە کە ئەڵێین بڕوامان بەخوا هەیە، بۆ سپاس کردن لە دوو چەشنە مرۆڤی بێ خوای سەردەمی پۆست مۆدێرنیزم، کە میراتبەری سەردەمی مۆدێرنیزم‌و ئامۆژگارییەکانی ئەو سەردەمەیان بەشێوەیێکی باشتر هێناوەتە ئاراوە، بەڵگەمان هەیە. بەڵگەکانمان ئەمەیە کە ئەوان مەسەلەکەی ئێمەیان کە مەسەلەیێکی ئایینی‌و لە ڕاستیدا مەسەلەیێکی ئینسانییە لە قووڵاییەوە بۆ هێناویانەتە ڕوو، و بە شێوەیەکی نزیك بە ئاشکراو بەڕوونی باس کردووە. ئەوان ئەم مەسەلەیەیان بە ڕوونی‌یەکی تاڕادەییێك ترس هێنەرو لەدەستەواژەیێکی ڕێك‌وپێکدا کە ئێمە ڕاچڵەکێنێ و لە گرنگ بوونی مەسەلەکە ئاگامان بکاتەوە، دەربڕیوە. واتە(خوا مردوە) لەم حاڵەتەدا دەربڕینی ئێمەو مرۆڤی سەردەمی پۆست مۆدێرنیزم دژی یەکن، چونکە ئێمە ئەڵێین خوا زیندوە.

مەسەلەکە لێرەدایە کە ئایا چ شتێك ئەفسانەیەو چ شتێك ڕاستەقینە؟ ئایا وتەکەی نیچە ئەفسانەیە، یان وتەی ئینجیل؟ ئەوەی مارکس ئەیڵێ ئەفسانەیە، یان ئەوەی موسا ئەیڵێ؟ قسەی سارتەری پاریسی‌ئەفسانەیە، یان گوتەی پۆلس تارسۆسی؟ ئایا خوا ئەوجۆرەی کە پێغەمبەری سەردەمی پۆست مۆدێرنیزم ڕایگەیاندوە، مردوە، یان بەگوێرەی پێشگۆیی دێرین تر هێشتا زیندووەو وەك (کەسێك کە هەیە) بوونێکی نەمری هەیەو هەمیشە بە گفتی خۆی وەفادارە؟ ئەوگفتی داوە هەمیشە لەگەڵمان بێ تەنانەت تا کۆتایی سەردەمێك کە تێیدا، چاخی مۆدێرنیزم و پۆست مۆدێرنیزم تەنها دوو ساتی کەمن لەدیالکتیکی درێژخایەنی مێژوودا.

هەروەها ئەتوانین مەسەلەکە بەشێوەیەکی ئەمڕۆیی کە بەبیرهێنەرەوەی شێوەی دەربڕینی کتێبی پیرۆزیش بێ باس بکەین: ئایا بوونی خوا بەهێزکەری بوونی مێژووی ئینسانە، یان ڕووخێنەریەتی؟ ئایا بۆئەوەی کە ئینسان بوونێکی ئازادو چالاکی هەبێ پێویستە کە حوزوری خوا، بەوشێوەی کە تەورات‌و ئینجیل ئەڵێن، دەرك بکاو قبوڵی بکا، یان ئەو جۆرەی کە مرۆڤی شۆڕش‌و مرۆڤی شانۆ ئەیڵێن، بیخاتە پشت گوێ‌و نکوڵی لێ بکا؟ ئایا بۆ ئەوەی خەڵکی بوونیان هەبێ، واتە وەك هێزێکی ڕێکخراو

بۆ گەیشتن بە چارەنووسێکی مێژوویی تیبکۆشن، پێویستە کە نکولی لەخوابکەن، یان ئەبێ خۆیان بەئۆمەتی ئەو بزانن؟ ئایا دان نان بە بوونی خوا لە مێژووداو لەخود ئاگایی زەینی مرۆڤدایە کە ئەبێتە هۆی لەخۆنامۆ بوونی ئینسان، یان سەرکوتکردن و دەرکردنی ئەو لەمێژوو و پاشەکشێ پێکردنی لەخود ئاگاییدا؟ ئایا زانیاری لەمەڕ خواوە ئەبێتە هۆی دەست کێشانەوەی ئینسان یان کۆمەلگا، لە پلەی مرۆڤایەتیو شارستانیەتیو کەوتنە ناو تەلەزگەی پوچی و نەبوونەوە، یان، نەناسینی خوا دەبێتە هۆی ئەوە؟

١٩٩٩/١/٩

**م. خالد**

پەراوێزەکان:

١) بابەتی چوار لایەن بریتیە لە: ١- ئایا خوا هەیە؟ ٢- چ ماهییەتێکی هەیە؟ ٣- چۆن ئەبێ بیناسین؟ ٤- چۆن ناوی ببەین؟ بابەتی یەکەمو دووەم لایەنی میتافیزیکیان هەیەو بابەتی سێهەم لایەنی مەعریفەییو بابەتی چوارەم لایەنی زمانی هەیە.

٢) لەکتێبی پیرۆزدا هاتووە کە: (وەخوا وتی ئینسان لەشێوەی خۆم و وەك خۆم دروست بکەین تاکو بەسەر ماسییەکانی زەریاو باڵندەکانی ئاسمان و ئاژەڵەکان و بەسەر هەمووزەمیندا و هەموو خشۆکەکان، کە بەسەر عەردا ئەخشێن فەرمانی رەوایی بکا. هەر بۆیە خوا ئینسانی لەشێوەی خۆی ئافراند) (سفری سەرهەڵدان، ئەسکی یەکەم، ئایەتی ٢٦،٢٧).

٣) Sisyphus: سیسی فۆس لە ئوستورەکانی یۆنانی کۆنەو پاش ئەوەی کە پادشای مەرگ واتە تاناتۆس ئەی مرێنێ و بە نەخشەیێکی فێڵاوی (پێش مردن بە ژنەکەی ئەڵێ کە پاش مردنم پرسەم بۆ دامەنێ تەعزیەم بۆ مەگرە - کەچی کە ئەمرێ لەلای هادێس، خوای جیهانی ژێرزەمین یان جیهانی گیانەکان گازەندە ئەکا کە ژنەکەم نەریتی ئایینی بەجێ نەهێناوەو بەهیچی نەزانیوم ئیزنم بدە با بچمەوە جیهانی سەرەوەو سزای بدەم) دێتە جیهانو ئینجا خۆی لە پادشای مەرگ ئەشارێتەوەو ناگەڕێتەوە بۆ جیهانی ژێرزەمین، بەلام (هەرمس) کوڕی زیۆس خۆی وەلامی ئەم سەرکەشیەی ئەداتەوەو ئەیگەڕێنێتەوە بۆ جیهانی مەرگ، هادیس بۆئەوەی پێش بەڕاکردنی دوبارەی بگرێ، ئەرکێکی بۆ دەست نیشان ئەکات، واتە سیسی فۆس ئەبێ بەردێکی گەورە بەتل دان بباتە سەرگردێك ئەمە لەحاڵێکدا بوو کە بەردەکە هەر کە ئەگەیشتە سەرگردەکە خێرا بەرو خوار تلۆر ئەبویەوەو سیسی فۆس ناچار بوو دوبارە هەوڵی سەرخستنەوەی بدات بەم شێوەیە سیسی فۆس گیرۆدەبوو و بیری راکردنی لەسەر دەرچوو.

٤) (بەدەر لە پرۆسە) (emanationist) لە پیتی e کە لە زمانی لاتینیدا بەمانای (بەدەر لە) و وشەی mano کە بەمانای (پرۆسە) یە پێك هاتووە، لەم تیورییەدا جیهان لە ئاکامی بەرەکەتی خواوە دروست بووەو هەموو بوونەوەرێك لەجیهاندا مەیلێکی دەروونی بۆگەڕانەوەو یەککگرتن لەگەڵ سەرچاوەکە واتە خوادا لەخۆیدا هەست دەکا.

5)idealist monism.

٦)ماتریالیزمی هەیوانیی کۆن ancient stoic materialism وشەی Stoicلە وشەی (Stoa) ی یۆنانیەوە کە بەمانای (هەیوان) ە وەرگیراوە. هۆی ئەم ناونانەیش ئەوەیە کە (زنون کیتیۆنی -٢٦٤-٣٣٥ پ.ن) دامەزرێنەری ئەم قوتابخانەیە، واتە فەلسەفیەکانی لە یەکێك لە هەیوانەکانی ئاسینادا ئەوتەوە. قوتابخانەی هەیوانیی کۆن روانگەییێکی ماتریالیزمیی هەیەو لەو بڕوایەدان کە تەنها مادە، واقعییەتی هەیە.

٧) بە بڕوای (کامڵبوونگەرایان) گیان لەبەرانی ئەم جیهانە دانەدانەو سەربەخۆ نە ئافرێندراون؛ بەلکو لە ئاکامی پرۆسەی کامڵبوونی تاکە گیانلەبەرێکدا وردە وردە زۆربوون و پەرەیان سەندوە، ئەم تیۆریە لەکۆنەوە هەبووە، بەلام چارلز داروین بەخەباتی بیست ساڵەی خۆیو کۆکردنەوەی گەلێ بەلگە زۆر شتی سەلماند.

٨) epoche: وشەیێکی یۆنانیە بەمانای هەڵواسین و دواخستنی بڕیار، لەم رێبازەدا پێش گریمانەکانی روانگەی سروشتیی مرۆڤ وەك بڕوا بە هەبوونی جیهانێکی بەدەر لەم جیهانە ئەخرێتە ناو کەوانەوەو هیچ بڕیارێکی لەسەر نادرێ، ئەم کارە ئەبێتە هۆی ئەوەی کە سەرنجی مرۆڤ بەلای ئەودیاردانەدا بچێ کە لە پرۆسەی ئەزموندا، یارمەتیی زانیارییەکانی بدات.

٩) نازانیاریگەری میتافیزیکی – Metapysical agnosticism – وشەی agnosticism لە پیتی a کە لە زمانی یۆنانیدا بە مانای (نە – نا) واتە (not) ی ئینگلیزیەو وشەی guosis بەمانای Knwledge (زانست – زانیاری) پێک هاتووە ئەم دەستەواژەیە لەمانای تایبەتی خۆیدا بریتیە لە گومانکردن لەمەڕ هەموو بابەتەکانی میتافیزیك و بەتایبەت مەسەلەی لەمەڕ خواو مانەوەی ڕۆح و جیهانی جیاواز لەم جیهانە. کە ئەم دەستەواژەیە بۆ یەکەم جار لەلایەن (تۆماس هێنری هاکسلی) ەوە لە سالّی ١٨٦٩ دا بەکاربراو هاتە ناو فەلسەفەوە.

10) sage of israel.

١١) حەکیمی قەومی بەنی ئیسراییل، بەو نوسراوە حەکیمانە و فەلسەفیانەی قەومی یەهوود ئەوترێ کە پێش زایین نووسراوە، ئەم نوسراوانە بریتین لە پێنج کتێب لە کتێبی تەورات (عهد عتیق) کە بریتین لە: ئەیووب، پەندەکانی سلێمان، کۆمەلگا، حیکمەتی سلێمانو حیکمەتی یەسوع کوڕی سیراخ.

١٢) ئاریرۆپاگۆس Areopagus. لە زمانی یۆنانیدا بەمانای گردی مریخەو بە ئەنجومەنی بالّای دەستوری و دادوەریی یۆنان ئەوترا کە ئەرکیان پتر سزادانی تاوانبارانی پیاوکوژیو سوتاندن بوو بەلّام لەسەردەمی ئیمپراتۆری ڕۆمدا بەشێوەیێکی بەرفراوان لە تاوانی ئایینی وەك کوفر بەرامبەر بەخواکانیشی ئەکۆلّیەوە.

١٣) ئیشارەتە بە قسەکەی مارکس کە وتویەتی (فەیلەسوفەکان، تەنها راڤەی جیهانیان کردوە، بەلّام ئێمە ئەمانوێ جیهان بگۆڕین).

١٤) سیناریۆی پووچ theater of absardity – بزافێك بوو کە سالّی ١٩٥٠ دا بەتایبەت لە فەرەنسا و لەسەردەستی سیناریۆ نووسانێك وەك سامۆییل بیکتو ئۆژێن یۆنیسکۆ گەشەی کردو بلّاوبوویەوە. ئەوان وجودی مرۆڤیان بە بێماناو بێ ئامانج و پووچ ئەزانی و هەولّیان ئەدا لەرێگەی سیناریۆکانی خۆیانەوە ئەم مەبەستە بگەیەنن. لەم جۆرە سیناریۆیانەدا، دارشتەی چیرۆك رەوتێکی واقعی و مەنتیقی نەبوو، دیالۆگەکان بێماناو گالّتەجاڕی و تەکراری بوون. ئەم بزاڤە گەلێك بە قوتابخانەی دادابیزم و سوریالیزمی هونەری ئەچێ.

١٥) گەمژەی ئینجیل – biblical fool، ئیشارەتە بە ئایەتی یەکەم – مزموری ١٤ لە کتێبی مزامیر کە ئەلّێ: (ئەو کەسەی کە پێی وایە خوا نیە گەمژەیە. کەسێکی ئاوهایش گەندەلّەو هیچ دیاردەیەکی چاکەی تیا نیەو هەموو خراپەیەکی لێ ئەوەشێتەوە).

١٦) بڕوانە بۆ پەراوێزی ژمارە (١).

سەرچاوە گۆڤاری ژمارە ١١/١٢ ی ئەرغەنون (فصلنامەء فلسفی، ادبی، فرهنگی ارغنون – شمارە ١١/١٢ پائیزو زمستان ١٣٧٥).

* ژەکفەری، یان ژەکفەری بە مانای (صبر و تحمل) ە، و ژەکفەری بە مانای صابر

* * زانخواز – لە دوو وشەی زان + خواز پێکهاتووەو بەمانای خوێندکاری زانکۆیە.

*** رادەست: بە مانای دیلی دەستو پێ بەستراو، واتە دیلی زنجیر کراوە.

# ڕووبەڕووبوونەوەی هاوچەرخو ناسنامەی فەرهەنگی

■ داریوش شایگان

● و: ڕێبوار سیوەیلی

ئێمە قسە لەو ڕووبەڕووبوونەوەیە دەکەین کە لەئاسیا بۆتە هۆی گۆڕانکارییە فیکرییەکان. خەمی ئەو بێناسنامەیە دەخۆین کەئەمڕۆ هەڕەشە لەشارستانیەتە دێرینەکان دەکات. هەروەها بەدەست ژینی دوولایی‌و نەخۆشمانەوە دەناڵێنین. واتە بەدەست ئەو دژایەتییە وجوودیەی کە لە ئەنجامی ڕووبەڕووبوونەوەی دوو جیهانبینیی تەواو جیاواز هاتۆتە دی.

ئەو لایەنانەی کەپەیوەندییان بەدوو شێوەی جیاوازی بوونەوە هەیەو لەئەنجامی بەیەك گەیشتنیاندا ناچارمان دەکەن پەرچە کرداری چاوەڕوان نەکراویان لەئاستا بنوێنین بەداخیشەوە لەئاکامی ئەم تێکەڵ بوونەدا بیری زانستی بە جۆرێك لەگەڵ عیرفاندا دەخەملێنن، هەروەك چۆن عیرفانیش بەهۆی ڕوونکردنەوەی زانستیانەوە بریندار دەکەن.

بەڵام با بزانین مەبەست لەم ڕووبەڕووبوونەوەیە چییە؟ ئایا ئەم ڕووبەڕووبوونەوەیە هێزێك نییە لەبەرامبەرماندا خۆی دەنوێنێ‌و دەیەوێت بچینە شەڕە جەنگو مەیدانەوە؟ ئایا لەم ڕووبەڕووبوونەوەیەدا ڕەگەزی بێگانەی وا نابینرێت کەپێویستە لەبارودۆخی ئێمەدا تێبینی بکرێن. ڕەگەزێکی بێگانەی ئەوتۆ، کە لەگەڵ بێگانەبوونەکەشیدا داوای ئەوەمان لێ دەکات تا یەکسانییە لەدەست چووەکە بهێنینەوە دۆخی خۆی؟ ئەم

رووبەڕووبوونەوەیە هەرچەندە بەهێزتر بێت، ئەو کۆششانەیش کەمەبەستیان دەست بەسەراگرتنێتی زیاتر دەکەونە گیان کێشانەوەو ڕۆژ بەڕۆژ گرنگیی شیکردنەوەی بارودۆخەکەو ناسینی هۆیەکانو بەدەست هێنانی ئەو ئامرازانەش کە یارمەتیمان دەدەن بۆ لەناوبردنی زیاتر خۆی دەسەپێنێت. دەستگرتن بەسەر هەر جۆرە رووبەڕووبوونەوەیەکی هاوچەرخدا یەکسانیی هێزە کاریگەرەکانو تەبایی بنەمایی‌یان لەو ململانێیەدا دەبێتە هۆیەك بۆ لەدایك بوونەوەی نوێ، بۆ خۆبیناکردنەوەو دۆزینەوەی هێزی نوێ. ئەمەش هەمان دیاردەیە کە ئێمە زیاتر لەنزیك بوونەوەی ژیارەکاندا، لەو ڕێنیسانسە کەمو زۆر سەرکەوتووانە کە لەناوەوەی هەر فەرهەنگێکدا بەئەنجام گەیشتوون، دەبینینەوە.

ئەمەش هەمان شتە کە لەشێوەی (ڕێنیسانسی کارولنێژی)، سەدەی نۆیەمی ئەوروپاو ڕێنیسانسی ئاینیی هیندۆ لەهەمان سەدەدا کە بەهۆی هەوڵەکانی (شانکارا)و (کۆماریلا)وە لەهیندستان هاتنەدی. یاخود لەشێوەی ڕێنیسانسی گەورەی سەدەی شازدەیەم لە ئەوروپا بەدی دەکەینەوە. دیسانەوە هەر بەو هۆیەشەوە کە ئێمە وەرگێڕانی نووسراوە عەرەبییە فەلسەفییەکانو بۆ لاتینی لە سەدەی دوازدەیەمی زاییندا بە کارێکی سوودبەخش لە قەڵەم دەدەین، سوودبەخش لە بواری ئەو رووبەڕووبوونەوەیەدا کە لە ئاست بیری سەدەکانی ناوەڕاستدا بینیویەتی. هەروەها وەرگێڕانە تیبتیو چینییەکانی بەرهەمی بودایی (ماهایانا)و وەرگێڕانی بەرهەمە کلاسیکیە سانسکریتەکان بۆ فارسی لەسەدەی شازدەی زاییندا، لەهەمان بابەتن. پاشانیش هەوڵدانەکانی ئەکبەر شا لە هیندستان لە پێناوی تێهەڵکێشکردنی مەزهەبیدا پێویستە لەبەرچاو بگیرێن. ئەو هەوڵدانانەی لە بەرهەمەکانی (داراشکۆ)ی کوڕی شای جیهاندا، بە لووتکەی بەرزییان گەیشتن.

ئەم نزیکبوونەوەو گفتوگۆو ڕێنیسانسانەی لە ناوەوەی تاکە ژیارێکدا ڕوودەدەن، بە دڵنیایی‌یەوە بۆ کەسانێك کە هۆی دژایەتی کردنیان بوونو ئیلهامیان لێوە وەرگرتووەو بەسەریشیاندا زاڵ بوون، دوو ڕۆڵیان بینیوە:

لەلایەکەوە شوێنی بەرەنگاربوونەوە بوونو لە لایەکی دیکەشەوە بەدیهێنەری ئازادیو پشکووتەی هێزە داهێنەرەکانیان بوون.

(جۆن سکۆتۆس ئیروگینا) لەم ڕووەوە روخساری بنەڕەتی ڕێنیسانسی کارولنێژییە، چونکە توانیویەتی پێکهاتەیەکی جەسوورانە لەبیری ئیفلاتوونی نوێو ئاینی مەسیحی دروست بکات. پێکهاتەیەکی وا کە لەسەر هەوڵی باووباپیرانی یۆنانی بەندە. ئەم پێکهاتەیە هەرگیز مەیسەر نەدەبوو ئەگەر هەردوو شێوەی بیری یۆنانیو مەسیحی، لەگەڵ هەموو جیاوازییەکی زۆریشیاندا بواریان بە ئەزموونی مەعنەویی مرۆڤ نەدابایە تا گەشە بکات. ئەگەر (شانکارا) لەلایەکەوە ململانێ لەگەڵ دینی بودا دەکاتو لەلایەکی دیکەشەوە ئیلهامی لێوە وەردەگرێت، هۆکەی ئەوەیە (بێ جەوهەریی) بوودایەتی، هێما بۆ ئەزموونێکی بوودایی دەکات کە لە پلەی (ئاتمان)ەوە نزیکە هەروەك چۆن لە قوتابخانەی (ئەدڤایتا ڤیدانتا) یا دەردەکەوێت، هەروەها بەو هۆیەوە کە (کارما) پەیوەندێکی نەپچراوی هەردوو جیهانبینیەکەیە. گەر داراشکۆ دەیەوێت عیرفانی هیندۆو سۆفیزمی ئیسلامی لە شێوەیەکی زۆر بزێوانەدا یەك بخات، هەرچەندە پەیوەندیی ئەم شێوەیەش سەرنجراکێشە، بەو هۆیەوە کە ئاینی هیندۆ و ئاینی ئیسلام، لە ئاستی ئەزموونی میتافیزیکییانەدا خاوەنی یەك بینایی گونجاونو هەروەها ئایدیالی مرۆڤو

چارەنووسی ئەو مرۆڤە لە جیهانداو یاسا وجوودییەکەی لەهەردوو جیهانبینی هیندۆیی و ئیسلامیدا وەك یەکن. لەلایەکی دیکەشەوە ئەگەر بیرکردنەوەی ئیبن سیناو ئیبن ئەلروشد، فەیلەسووفە خۆراواییەکان ناچاردەکەن لە بەرامبەر سەرسەختیی خۆرهەڵاتدا بچنە سەنگەرەوە، ئەوا لەبەرامبەری جەبری یۆنانی ـ ئیسلامیدا (خەڵق کردن لە عەدەم) خۆی دەنوێنێ، کە لە ئیرادەی مەسیحییەتەوە سەرچاوە هەڵدەگرێ، هەروەها ئەگەر لافاوی وجوودو خەڵق کردن لە عەدەم لە ململانێدان و پێکدادانیانەو ئەمەش دەبێتە زانەوەی بیرورا، ئەوە هەموو ئەو لایەنانە لەو خاڵەوە سەرچاوە هەڵدەگرن کە ئیسلام و مەسیحییەتی یۆنانی (بوو بە یۆنانی) لەگەڵ هەموو جیاوازییەکی گەورەی نێوانیشیان، بڕوایان بە سەرچاوەیەکی رۆحانیی بەرزتر هەیە، بۆیە ئەزموونی عیرفانی کەسانێکی وەك (ئیبنولعەرەبی)و (ماستەر ئۆکهارت) لە رەچەڵەکدا هەر یەکن، ئەگەرچی فەزای فەرهەنگییان لەرووی شێوەی پەروەردەبوونەوە جیاوازە.

بەڵام ئایا لەرووبەڕووبوونەوەی هاوچەرخدا هەمان یەکسانیی جەوانمەردانە، یاخود هەمان گونجانی قووڵ بەدی دەکەین؟ هەرگیز! هۆکەیشی ئەوەیە بۆ یەکەمجار لە مێژووی مرۆڤدا پەیوەندی ئینسان بەخوداو سروشتەوە لە بێخەوە ژێرەوژوور دەبێت و ئەم گۆڕانکارییە قووڵەش لە خۆراواوە بەرەو لای ئێمە رێ دەکا.

لەخۆراوای سەدەی شازدەو حەڤدەیەمدایە کە سەردەمی پیشەسازی دەست پێ دەکاو لە هەمان سەدەشدایە کە زانست وەك هێز دەناسرێت (فرانسیس بێکۆن) مرۆڤ دەکرێتە فەرمانڕەواو خاوەنی جیهان (دیکارت). هەروەك چۆن (کەونیەت)ی یۆنانی و (خودا ـ هومانیزم) تایبەتمەندی بیری مەسیحیەت بوو، هومانیزمیش دەبێتە تایبەتمەندی بیری سەردەم و فەلسەفەش جێی خۆی بۆ مرۆڤناسی چۆڵ دەکات. لەو سەردەمەشەوە بیری زانستی ـ تەکنیکی کە زادەی زانستە سروشتییەکان بوو، جێگە بەناسین و لێوردبوونەوەی عیرفانی چۆڵ دەکات، ئەم ناسینەش تا ئەو سەردەمە بە توندی ئەو بەهایانەی دەپاراستن کە پەیوەندی قووڵی نێوان ژیارە جیاوازەکانی لە ئەستۆ بوو، بەم پێیەش تەباییەکە بە سەختترین و بنەبڕترین شێوە تێك دەچێ:

لەو سەرەوە لەخۆرئاواوە دەست بەسەراگرتن، هێزە دەستدرێژی و داگیرکەر تەپوتۆز دەکاو لەمسەریشەوە (خۆرهەڵات) بەرگریکردنێکی گرژ لەشێوەی زەینی گۆج بوودا خۆی دەنوێنێ. چەندە ئەم هێرشە بێ ئامان و بێ بەزەییە، ئەوەندەش هێزە بەرگری کەرەکان بەدوورن لەپتەویی دێرینەی خۆیان و لە ئاکامیشدا ناتوانن خۆیانی لەبەردا بگرن. هۆی چییە ئەو هێزانەو ئەو گونجانە قووڵەی کە لە رابردوودا ببووە هۆی لێدانی دڵی پێکهاتە سەرکەوتووەکان و بەردەوام تازەکەرەوە بوو، ئیدی وجوودی نەماوە؟ هۆکەی ئەوەیە نەك شێوەی رووبەڕووبوونەوەی ئەوڕۆکەو هۆیەکانی لەهی پێشوو ناچێت، لەو سەرچاوەیەوە ئاو ناخواتەوە، بەڵکە دژی ئەو سەرچاوەیەشە! بۆچوونە نوێیەکان نەك هەر گرنگییەکی ئەوتۆ بەناسینی عەینی، بەسرووشت و رزگاریی ئینسان نادەن، بەڵکە بەشێوەیەکی پراکتیکی رووت بیر لە دەست بەسەراگرتنی سروشت و هەل و مەرجە ئابوورییەکانی ژیانی مرۆڤیش دەکەنەوە. دەتوانرێت بگوترێ هەموو ئەو بەهایانەی کە ئێمە ساڵەها بوو پاراستبوومان و بەهۆیانەوە پەروەردەیەکی رۆحی و تێڕوانینمان بۆ جیهان پێکەوە نابوو، لە ناکاو وەکی کۆمەڵێك تاوانی تاڵ لێمان وەدەرکەوتن و ئێمەش لەوە حاڵی

بووین کە واقیعیەت جگە لەپشت بەستن بە (هێزو ئیرادە) کە لە رووخساری (هۆمۆ تەکنۆلۆژی کۆس)دا خۆی دەنوێنێ، شتێکی دیکە نەبووەو نابێت !.

مەبەست لە روویەڕووبوونەوەی هاوچەرخ، خاڵی یەکتر بڕینی چەندین چەمکی بنەڕەتییە کە هەر لە سەرەتای دروستبوونیانەوە تا ئێستا جۆرە گۆڕان و بەرەو پێشەوە چوونێکی تایبەتیان دیوە، هەر بەم بۆنەیەشەوە لە ئەنجامی پێشکەوتن و گۆڕانکاری لەخۆشیاندا، کرۆکی بیری خۆراوا پێکدەهێنن. ئەوەش ئەو چەمکانە لە گۆڕەپانی روویەڕووبوونەوەی هاوچەرخدا بە دوایین شێوەی گۆڕانی خۆیان گەیشتوون و ئەوڕۆکە وەك چەمکی زۆر تایبەتی خۆ دەنوێنن، شتێکە لە ئەنجامی خوێندنەوەی (بیری زاڵ)دا واتە، ئەو بیرە هەڵگری ئەو چەمکانەیە بە روونی دیارە، هەروەها بە تێبینیکردنی ئەو گۆڕانکارییانەی ئەو چەمکانە لە ئەندێشەی بیریارە گەورەکاندا پاش تێپەڕبوونی چەندین سەدە بەدییان هێناون، ئەو لایەنە ئاشکرا دەبێت. لەلایەکی دیکەشەوە بە تێبینیکردنی لایەنی مێژوویی ئەم گۆڕانکارییانە، ئەوەمان دێتە پێش چاو کە چۆن رەوتی ناوبراو بەرەو دنیایی کردنی جیهان، واتە رووتکردنەوەی لە سەرچاوە رۆحی و تەمسیلییەکانی و بێ رۆحکردنی سروشت و بەندکردنی مرۆڤ لەدەوری غەریزەکانی هەنگاوی ناوە. ئەو بیرە زاڵانەش بەگشتی بریتین لە: (بیری خوڵقاندن لە عەدەم) بیری رەوتی مێژوویی (سۆبجەکتیڤیزم)ی زەین، کە لە لایەکەوە لە جیهانی هەستپێکراو ئازادەو لەولای دیکەشەوە لەجیهانی عەقڵانی دابڕاوە. ئەو لەویەتی ئیرادەیەك کە سەرەتا بە پەیوەندی لەگەڵ ئیرادەی هەڵبژێرەر (خوایەکی تایبەت) مانای خۆی بەدەست دەهێنێت و پاشانیش وەك ئیرادەی مرۆڤی تاك رۆڵی خوڵقێنەر لە ئەستۆ دەگرێت و لە شێوەی (منی موتڵەق) و ئیرادەی بەهێزەوە گرێ دراو (ناوی کتێبەکەی نیچەیە ـ و) خۆی دەنوێنێت. سەرەنجام (کۆسمۆس)ی یۆنانی شوێنی خۆی بۆ دووریی هەندەسی، واتە بە شتکردنی گشت سروشت، چۆڵ دەکات و بەرهەمی ئەم گۆڕانکارییەش سەرەتای سەدەی زانستی و تەکنیکی و دەسەڵاتی جیهانی بیری تەکنیکیە..

بێ هیچ دوو دڵییەك ئیرادەی بێسنووری ئەو (خودا تایبەت)ییەی کەئیدی نەك بەپێی بیری ئەفلاتوونی نوێ، کە بەهۆی لافاوەوە جیهانی لە عەدەم دەهێنایە بوون، بەڵکە بەهۆی دەسەڵاتی رەهای خۆیەوە ئەو کارە دەکات. ئەو خودایەی کە ئیدی (مادده) بەرەگەزی بنەمای عەدەم نازانێت، هەروەکوو بیری ئەفلاتوونی و ئەرستۆیی جەختیان دەکرد، بەڵکە بە دروستکراوی دەستی خۆی دەزانێت، بەم پێیەش گوناه ـ پەیوەندیی بەرەتکردنەوەو (نفی)یەوە نامێنێت، بەڵکە راستەوخۆ دەبەسترێتەوە بە ئیرادەی هەڵبژاردنی بوونی مرۆڤەوە، کە ئەم لایەنە لەلایەکەوە غروور وەك حاڵەتێکی باشتر لەکڕنووشبردن و خۆ بەبچووکتر زانین دەبینێ و لەلاکەی تریشەوە پەیوەندیی خۆی بەماددەوە دەپارێزێت کە ئەم مەسەلەیەش لەسەدەی سێزدەیەمەوە، کە زانستە سروشتییەکان پەرەیان سەند، گەشە دەکات.

چەمکی ماددە لەبیری (رۆجێر بیکۆن)دا بەدووی کرۆکی جووڵە دەروونییەکاندا وێڵەو لەبیری نیکۆلاوس کۆزانۆس و جێوردانۆ برۆنۆدا دەبێتە هێزی بێبڕانەوەی یەزدانی و بەم شێوەیەش لەسەدەی شازدەیەم بەرەو دواو لە رێی دۆزینەوەکانی (کۆپلەر) (کۆپەرنیك)و(گالیلۆ)وە دەبێتە بیرێکی ریازی و میکانیکی لەئاست سروشتدا تاوەکوو لەئەنجامدا بە پلەی هەڵوەشاندنەوەی (نموونەی جەوهەری) دەکات.

هەروەها پێویستە ئەوەش بگوترێ کە لە نێوان ئەو تێڕوانینە باڵایەی ماددە بەدەستی دەهێنێت لە لایەکەوەو گرنگیی زۆری هەستەکان‌و جەستەو غەریزە سروشتیەکانی مرۆڤدا پەیوەندییەك هەیە. ئەم غەریزانەش لەلای (هێرمان یاکۆبی) وەك جەوهەری تاکە کەس دەردەکەون‌و لەگەڵ تێڕوانینەکانی ناتورالیستەکان (الطبیعیون)و پۆزەتیڤیەکاندا بە قۆناغی گریمانی (مرۆڤی کەرەسە خوڵقێنەر) کۆتایی پێ دێت. واتە ئەو گریمانەی کە جیاوازیی نێوان مرۆڤ‌و ئاژەڵ، بە جیاوازییەکی رێژەیی دەزانێت نەك جیاوازییەکی (خودی)ی. لەم تێڕوانینەیشەوە ئیدی رۆح پەرچبوونەوەی عەقڵێکی بەرزتر نییە، بەڵکە دیاردەیەکی پچڕاوە لە سروشت.

ئەو لایەنانەی رەوتی مێژوو دەستنیشان دەکەن، یا ئەوەتا مەیلی جنسانی (لبیدۆ)ی لای فرۆیدن، یاخود ئیرادەی بەهێزەوە بەسراوی شۆبنهاوەر، نیچە و ئادلەرن، یاخود مەیلی بەرهەمهێنان‌و جۆراوجۆرەکانی بەرهەمهێنانی لای مارکسن کە بەشێوەیەکی گشتی لەغەریزەی خۆراکەوە سەرچاوەیان هەڵگرتووە.

بێجگە لەمانەیش دەتوانین پەیوەندیی نێوان دوو خاڵی دیکەش دەستنیشان بکەین کە یەکەمیان (مەسیحی بوون)ی مێژووە لە دوو شێوەی رابردوو و دوایی خۆیدا، کە وەك پرۆسەی خەڵق کردن‌و هاتنەخوارەوەی ئادەم‌و پاشانیش گەڕانەوەی مەسیح‌و رزگارکردنی ئادەمیزاد خۆی دەنوێنێت. خاڵی دووەمیش، گریمانە مەزنەکانی مێژوون کە لەلای (هیگل) وەك نزیکبوونەوەی رۆح لە خود ـ ەوە دەردەکەوێ‌و لەلای کارل مارکس دەبێتە دیالەکتیکی ململانێی چینایەتی‌و لەبیری دیلتاییشدا ساختومانی هۆکارەکانی دەورەیەکی مێژوویی پێك دەهێنێت. بیری دنیایی بوونی ئامانجە مەسیحییەکان هەرگیز وەك هێڵێکی بێبڕانەوە نەدەهاتە دی ئەگەر بهاتباو چەمکی ئیرادەو کار، بەو جۆرەی کە لەبیری مەسیحییەکان هەرگیز وەك هێڵێکی بێبڕانەوە نەدەهاتە دی ئەگەر بهاتباو چەمکی ئیرادەو کار، بەو جۆرەی کە لەبیری مەسیحییەتدا وەك خەڵق کردن لەعەدەم دەردەکەوێ، لەدێر زەمانەوە جێگەی چەمکی یۆنانی بۆ بوون نەگرتباوە، دیارە گەر وا نەبوایە هەرگیز (فۆزیس)ی یۆنانی نەدەگۆڕا بۆ (ئاسۆی مێژوویی) تاوەکو جووڵەی مێژوویی لەبەرامبەر گەیشتنی مەبەستەکانیدا، ئاسان بکات، ئەو حاڵەتەی کە (ژێلبەر دۆران) (بت پەرستیی مێژوو)ی ناو ناوە.

بێگومان ریشەیەکی گۆڕانکاری لە بنەمای (سۆبجەکتێڤیزم‌و دەرونیەتی) ئاگۆستینەوە بەرەو (بنەمای تاکە کەسی) (دۆنس سکۆتۆس)و لەوێشەوە رووەو بیری رەخنەگرانەی (ئیکهام)و(کۆگیتۆ)ی دیکارتی‌و پاشانیش بەرەو (مۆناد)ەکانی (لایب نیتز) دەکشێ. هەمان رەوت لەلای (نیتشە) دەبێتە (کرداری کارپێکراو)ی ئەو (من)ە رەهایەی کە خۆی دەسەپێنێ‌و لەلای (شتێرنەر) دەبێتە (منی خالیس) کە هەر جۆرە هاوکارییەك رەت دەکاتەوەو پاشانیش لەلای (سارتەر) دەبێتە تاك‌و مەحکوومە کراو بەئازادی.

هەر بەم جۆرەش، پەیوەندییەك لەنێوان ئەو لەویەتی ئیرادە، بەمانای ئیرادەیەکی بێبڕانەوەی خودایەکی تایبەت‌و نموونەکانی لەلایەکەوە، وەك سەربەستیی ئیرادە لەلای (کانت) هەروەها ئیرادەی بەهێزەوە گرێدراوی نێتشە لەلایەکی دیکەوە بەدی دەکرێت. بە تێبینیکردنی ئەم رەوتە مێژووییە دەتوانین بڵێین: لە گۆڕانکارییەکانی بیری خۆراوادا، جووڵەیەك لە سەرەوە بۆ خوارەوە لەعەقڵەوە بۆ غەریزە، لە نییەتەوە بەرەو مێژووپەرستی، لە رۆحانییەتەوە بەرەو عەقڵانییەت، لەرۆچوونی مەدهۆش ئاسای مرۆڤەوە بەزاتی موتڵەقدا بەرەو خۆپەرستی‌و بە

دەوراچوونی ئەو نەفسەی کە لە بەرامبەری خوادا یاخی دەبێت، بەدی دەکرێت. بەم پێیەش ئەو پرسیارەی لێرەدا سەر هەڵدەدات ئەمەیە: ئایا لەودیو ئەم گۆڕانکارییەوە چەند یاسایەکی کاریگەر بەدی دەکرێن، ئەگەر شتی وا هەیە، ئایا ئەم یاسایانە تایبەتن بەمرۆڤی خۆرئاواییەوە، یاخود یاسای جیهانگرەوەن؟

ژیارەکانی ئاسیا ماوەیەکی زۆر دووریوون لەرەوتی ئەم گۆڕانکارییە گەورانە. بەڵام بە دەسپێکردنی چاخی کۆلۆنیالیستیو داگیرکاریی ئەو وڵاتانەی لە ئاست دەسەڵاتی تەکنیکی خۆراوادا لاواز بوون، ئاشکرا بوو کە ئەم رەوتە مێژووییە گەڕانەوەی بۆ نییەو ئەو دەستانەیش کە جووڵێنەری ئەم بزووتنەوەیەنو بەرەو پێشەوەی دەبەن زیاتر پەیڕەوی یاسای سوود وە دەست هێنانن، تاوەکوو نزیکبوونەوەی مەعنەوی شارستانییەتە جیاوازەکان لە یەکدی. لەو رۆژەوە کە ئەم مێژووەی تێدا بووە مێژوویەکی جیهانی، بە ناچاری ئێمەیش بەر شاڵاوی دەکەوین، بەڵام نەك بەو هۆیەوە کە خۆمان لە دروستکردنیدا دەستمان هەبووە، بەڵکە لەو رووەوە کە ئێمە هیچ شك نابەین تا لە ئاستیدا بمانپارێزێ.

هەر لەبەر ئەوەیشە پرسیارەکە وەك خۆی دەمێنێ: مەبەست لەم رەوتە مێژووییە چییە؟ ئایا ئەوە رۆحی گەورەیە کە لەم مێژووەدا پەخش دەبێتەوە تاکو لەلای هیگڵ ببێتە (زەمینەی) بێبڕانەوەی مرۆڤو ئەم مرۆڤە ئاگایی بەدەست بهێنێتو بە (ئازادی)ی خۆی شاد ببێت؟ یاخود بەو جۆرەی کە(مارتین هایدگەر) بیری لێکردەوە، ئەم مێژووە (مێژووی لەبیرچوونەوەی وجوود)ە؟ ئایا بەوجۆرەی کە شیعەکان بۆی دەچن مێژوو چاودێرە بەسەر دوارۆژەوە، یاخود وەك هیندۆکان دەڵێن، مێژوو قۆناغێکی پێشکەوتووی کالی یۆگایە، واتە دواسەدەی وجوودی گەردوونە کە لە دوارۆژدا جیهانێك لەناو دەبات؟

بێگومان هەر وەڵامێکی ئەم پرسیارە بدەینەوە پەیوەندیی بەو دیدگایەوە هەیە کە ئێمە هەڵیدەبژێرین، یاخود لەوانەیە بتوانین هەڵیبژێرین. بەڵام لە وەڕووخستنی ئەم پرسیارانەدا مەبەستمان زیاتر پشت بە بیروباوەڕ بەستنە بۆ وەڵامە ئیحتمالییەکان نەك پشت بەستن بە زانست، وەك مانا پڕاوپڕەکەی ئەم وشەیە.

ئێستاش دەمانەوێت بەشێوەیەکی گشتی لەو گۆڕانکارییانە بکۆڵینەوە کە لەئەنجامی رووبەڕووبوونەوەی هاوچەرخدا هاتوونەتە ئاراوە. لەراستیشدا ئەم رووبەڕووبوونەوەیە خاڵی پایانی قۆناغێکە کە دوو هەزارو پێنج سەد ساڵی بەسەردا تێپەڕدەبێت.

لەم رووبەڕووبوونەوەیەدا کە ئەمڕۆ ئێمە گیرۆدەی بووین سەراپای ئەو رەوتە فیکریانە بەشدارن کە بزوێنەری ژیانی خۆراوان: لەچەمکی (ئیرادەی بە هێزەوە بەسراو)ەوە بیگرە تا بیری تەکنیکیو ئەزموونگەری کە زیاتر ئامانجە پراکتیکەکان جەخت دەکاتو لێرەیشەوە مانای رەوتی مێژووی پیرۆزی مرۆڤ تا سنووری ئەو ئاستەی کە خۆی تێدایە دادەبەزێنێ. ئەم نزمبینییە دیاردەیەکە بەقسەی بیریارە ئەمریکییەکان، رەهەندی مەعنەوی بیرکردنەوەی لەمرۆڤدا بە شێوەیەکی سەخت تەنگ کردۆتەوە. بەم مانایەش بێت زۆربەی مرۆڤی سادە ئەو کەسانەن کە هەموو شتێك بە شێوەیەکی تۆقێنەر دەسەپێننو بەرزترین شتی مرۆڤیش دەخەنە مەترسییەوە.

هەروەك چۆن زانایەکی هاوچەرخ دەڵێت: (مرۆڤ شتێکی دی نییە جگە لە میکانیزمی بیۆکیمی، کە لە سیستەمێکی سووتەمەنییەوە

وزە بەدەست دەهێنێتو هەمان سیستەم وزەی کۆمپیوتەرەکانیش دابین دەکات).

ئەوەی لێرەدا سەرنجمان رادەکێشیێو شتێکمان بۆ روون دەکاتەوە عیبارەتی (شتێکی دی نییە جگە لە ...) کە مرۆڤ لەهەموو بوارە زانستییەکاندا، بە پاشکۆی یاسایی شتەکان دەبینیێو لە ئەنجامیشدا وەك بوویەکی نەنگ (عەیبدار)و (کەموکوڕ) لە جەرگەی سروشتدا دایدەنێت.

بەم شێوەیەش وێنەی جوانیی مرۆڤ لەجیهاندا وەکو هەڵمێکی چڕی نێو بیرورا دژەکان، دەبێتە قوربانیو لەنێو دەچێت. ئاکامی ئەم کارەش دروست بوونی ئەو رێڕەوانەیە کە لەسەر بنەمای ترسو داپڵۆسینو دروست بوونو لەگشت لایەکەوە ئەدەبیاتی نوێیان تەنیوە. یاخود پچڕانی ئەو پارسەنگە فەرهەنگییەیە کە لە تەمومژی خۆیدا هونەر ون دەکاتو پاشانیش چەمکی (پووچ ـ عبث) بێ بناغەیی ئارمانو خەونە زیوینەکانی یۆتۆپیە مەزنەکان دەکاتە بڵقی سەر ئاو.

ئەم ئایدیایانە هەرچەندە بەلای (مرۆڤایەتییەکی لێك هەڵوەشاو)ی وەك ئەوەی ئێمەشەوە جێی ختوورەو گومان بن، هەرگیز ناتوانن ببنە ئەو ئامانجانەی کە ئێمە بەدرێژایی چەندین سەدە بەدەستمان هێناونو بەها فەرهەنگییەکانی خۆمانمان لەسەرەوە قایمو پتەو کردوون.

ئێمە هەرگیز خاوەنی (فەلسەفەی مێژوو) نەبووین، چونکە هەرگیز بوون (هستی) بەلای ئێمەوە تەنیا رووداوێك یان تەنیا کردەوەیەك نەبووە. بەلای ئێمەوە مێژوو، مێژووی پیرۆزە، یاخود راستتر بڵێین: مێژوو بەلای ئێمەوە رۆژی وادەو پەیمانە. مێژوو لە ئیسلامدا، هەر لە ئادەمەوە تا محەمەدی پێغەمبەر جگە لەسەرپۆش هەڵمالین لەرووی حەقیقەتێکی ئەمر شتێکی دیکە نییە، کە ئەم حەقیقەتەش بە (حەقیقەتی محەمەدی) ناویانگی رۆیشتووە. بەلای شیعەی دوانزە ئیمامیشەوە (کۆتایی مێژوو)) بریتییە لە گەڕانەوەی ئیمامی دوازدەیەم کە ئێستا نادیارەو ئەم سەردەمەش بۆ ئێمە سەردەمی (چاوەڕوانی)یە.

ئەو چالاکیو رۆچوونانەی (ڤیشینۆ) یاخود فەتحەکانی (شیڤا) بەلای هیندۆیەکی باوەڕدارەوە کە لە رۆخ رووباری (گەنگ)دا خۆی



لەئەندێشەیەکی قووڵدا نوقم کردووە، زیاتر لەحەقیقەتەوە نزیکن، تاوەکو شەڕەکانی ئیسپانیای سەردەمی لۆیی چوارەم بەلای فرانسییەکانەوە. لێدوان لە بوون بەشێوەی (بێ هەل و مەرج) وەك (بەرەهمەن) جەختی دەکات، بەهۆی بیری (ئەزموونگەری)یەوە هەر هێندە بەلای هیندۆیەکەوە تاوانە وەك (هێزی ئەفسووناویی خەیاڵ) بەلای راسیۆنالیستێکی ـ عەقڵانی ـ دیکارتەوە.

ئەو لایەنو غەریزانەی کە مرۆڤناسی ئەم سەردەمە دەبەن بەرێوە، رێكو راست هەر ئەو

بزوێنەرە دەروونیو فەرمانڕەوایانەی نەفسن، کە هەر موسوڵمانێکو هیندۆیەك گەرەکیانە خۆیانی لێ رزگاربکەن. هۆی ئەم خاڵە ئەوەیە کە رزگاربوونی مرۆڤ بە تەواوی بەسراوەتەوە بە لەناوبردنی ئەو (نا ئاگایی)یەی، بۆ نموونە لەلای قوتابخانەی یۆگا حوکمی چەند کاریگەرییەکی شاراوەی بەردەوام دەکاتو لە(کارما)یەکەوە سەرچاوەی هەڵگرتووە کە لە ئەنجامی چەندین جار زانینەوە وەبەرهەم دێت.

لەو جیهانبینییەدا، گەورەییی مرۆڤ بەوە دەستنیشان ناکرێت کە ئیرادە بەهێزەوە بەسترابێت، بەڵکە بەوە دەستنیشان دەکرێت کە خۆمان لەو هێزە رزگاربکەین. هەر لەبەر ئەوەیشە شەریعەتەکانی خۆرهەڵات وەك هیندی، ئیسلامیو چینی زیاتر جەختی کرداری بێ پاداشت دەکەن ـ وەك بیری (بها گاڤات گیتا) لە هیندستان، یاخود ئاینی (تاوۆ) لە وڵاتی چین. بۆیە لەخۆرهەڵات پێکهاتووی وێنەی مرۆڤ لەنێو تەمو مژی (یزم)ەکاندا، کە هەر یەکەیان پشت بە پارسەنگو جیهانبینی تایبەت دەبەستن، هەڵناوەشێت، بەڵکە بیری (گشتی بوونی مرۆڤ) لە هەموو قۆناغەکانی بووندا شێوەی خۆی دەگرێت.

تەماشا دەکەین لێرەدا مرۆڤ (زەمینە)یەکی دابڕاوە لە رووداوەکان کە لەزۆنگاوی عەدەمدا گیری خواردبێتو بوونی ئەم مرۆڤە بە ئازادییەکەیەوە گرێ درابێت، بەڵکە مرۆڤ (جیهانێکی بچکۆلە)ی بێمەودایەو لەگەڵ سەراپای قۆناغو پایەکانی بووندا پەیوەندییەکی دەروونیو ئەفسووناویی هەیە. بەم پێیەش، جیهان نە درەوشانەوەی عەقڵێکی لاوەکییەو نە تۆڕێکی چنراوە لە یاساکانی فیزیاو ریازیات (ماتماتیك). بەڵکە ئامادەبوونە لە گشتێکدا کە ئەم گشتە لە کەشفو چاودێریدا دەردەکەوێت نەك لە عەینییەتی شتەکاندا. لێرەیشەوە ئیدی خودا، نە خواستێکی بێ مەرجی عەقڵی پراکتیکییە لەلای (کانت)و نە تیشکێکە لە رۆحی مرۆڤدا (لەلای فیۆرباخ)، نە زادەو لەدایکبووی نامۆبوونی ئایینییە لەلای (مارکس) بەڵکە درەوشانەوەیەکی پیرۆزو بەدیهییەتێکی بێهۆیە.

ئەم بەدیهیاتە بنەمایەك بەر لەرۆشناییو تەنانەت بەر لەهەر رۆشناییەکیش کە لە عەقڵەوە لەدایك دەبێت، بینایی حەقیقەتمان بۆ دەکات، نەك وەکوو بەدیهیاتە خۆپەسەندەکانی (کۆگیتۆ)و پێشبینییە روونو ناوەزەکانی دیکارت.

هەر شارستانیەتو بیرکردنەوەیەك لە جیهان، پێکهاتوویەکە پارچەکانی گشتێکی ـ کل ـ ئۆرگانیکیانە پێك دەهێنن. هەر بەم هۆیەشەوە (ئوسوالد شپینگلەر) دەڵێت: (ئایا کەس هەیە بزانێت لە نێوان ژمێریاری دیفرانسێلو بنەماکانی دەوڵەتی دەسەڵاتداری سەردەمی لویی چواردەیەمداو لە نێوان شێوە دەوڵەتی سەردەمی دێرین لە (پۆلیس)ی یۆنانو هەندەسەی (ئەقلیدس)دا و لە نێوان (پروسپکتیڤی بۆشاییەکانی هونەری وێنەکێشانی خۆراواو دەست گرتن بەسەر شوێندا بەهۆی رێگای ئاسن، تەلەفۆنو چەکە دوور هاوێژەکانو لەنێوان (کۆنتیرپۆیین)ی مۆسیقاو سیستەمی ئابووریی قیاسیدا، پەیوەندییەکی قووڵ لەرووی شێوەوە بەدی دەکرێ؟)

هەر ئەم پەیوەندییە بنەماییو شێوە پەیوەستە قووڵانەن لە لایەنە جیاوازەکانی شارستانییەتدا، بینینی مرۆڤ، چەمکەکانی (کات ـ شوێن) و بە کورتییەکەی ئۆرگانیزمی فەرهەنگێك دەستنیشان دەکەن. لە ژیارێکدا کە هەتا ئێستاش بیری شاعیری ئەفسانەیی وەکوو فەرهەنگەکانی رابردوو، بە زیندوویی ماوەتەوەو لە سەرچاوەی مەلەکووتییەوە ئاو دەخواتەوە، چەندین چەمکی وەکوو کاتو شوێنو هۆ،

پابەندی ساختومانە نموونەیی‌یەکانی رۆحن، نەك یاسا شێوەیی‌و ناوازەکانی عەقل.

ئەوەی وەکوو سەرسەختترین دوژمن لە رووبەڕووبوونەوەی ئەوڕۆکەدا خۆیمان لێ رادەپسکێنێ، هەر ئەو پەیوەندییە شێوەیی‌یە یەکە روخسارە جۆراوجۆرەکانی ژیاری خۆراوای لە گشتێکی ئۆرگانیکیدا پێکەوە تەنیون. دارمانی ئەم سەردەمەی خۆرهەلات بە روونی ئەوەمان پێشان دەدات کە ئەو بەهایانەی لە ژیارەکانی ئاسیادا ملکەچی (دنیایی بوون) بوون، ئیدی نە رەونەقی پێشوویان ماوەو نە متمانەی لەمەوبەریان بۆ خۆیان پاراستووە. بەلام ئەم واقیعیەتە رێگەی ئەوە ناگرێ نیشانەی ئەو باوەڕو بینینو کاتگۆریو هەستکردنە جادوویی‌یانەی لە قوولایی ئەندێشەو بیرەوەریماندا سەرکوت کراون، بەجێ نەمابنو شوێنەواریان جێ نەهێشتبێ. لە ئەمڕۆوە تا سبەی ناتوانرێ رۆحی میللەتێك بگۆڕدرێ. بمانەوێو نەمانەوێ ئەوەی (مرۆڤایەتیی مرۆڤ)، لە بیری ئیسلامو هیندۆییو ژاپۆنییەکاندا (کە لە هەموو میللەتانی دیکەی ئاسیا زیاتر چوونەتە بەرگی خۆراواوە) بە وجوود دەهێنێت، لە کونجی زەینماندا دەمێنێتەوە. ئەم پاشماوانە زۆر جاران لە قوولایی‌یەوە سەر دەردەهێننو خۆیان دەنوێنن، هەڵوێستمان دەستنیشان دەکەنو کار دەکەنە سەر بیرکردنەوەمانو رەوتی عاتیفەو سۆزمان بەرەو جێگەیەك، کێش دەکەن، کەرێكو راست لەم مەیدانی عاتیفەیەدایە ئێمە هەر ئەوەمان لێ جێ دەمێنێت کە لەمەوبەر بووین!

لەنێوان ئەوەی بروامان پێیەتیو ئەوەش کە هەستی پێ دەکەین بۆشایی‌یەکی ئەوتۆ دروست بووە، کە نەك هەر تەنیا بەرەو زایینێکی نوێو هێزە داهێنەرەکان نامانبات، بەلکە تووشی حالەتێکی (شیزۆفرینی)شمان دەکات. ئەو حالەتەش لە کارە هونەریو ئەدەبیەکانماندا رەنگ دەداتەوە، خۆی نیشانەی زەمەنێکە کە پێیدا تێپەڕدەبین.

ئەم بزووتنەوەیە، لەلایەکەوە دەمانشێوێنێو لەلایەکی دیکەیشەوە هێزە داهێنەرەکانمان لە پەلوپۆ دەخات.

لە پەلوپۆمان دەخات چونکە ئێمە لە ئاست رووبەڕووبوونەوەی هاوچەرخدا هیچ جۆرە چەکێکمان بەدەستەوە نییە. تەنانەت توانای هەلبژاردنیشمان نییە، لەبەرئەوەی ئەوە تاقە رێگەیەکە دەبێت بیبڕینو بیری گەڕانەوە لە سەرماندا نەهێلین: چونکە ترسی ئەوەمان هەیە لە خەلکانی دی بەجێ بمێنینو یەکسەر لە لانکی بزووتنەوەی مێژوو بچینە دەرەوە. رووبەڕووبوونەوەی هاوچەرخ. گوتارێکە (خطاب) مێژوو وەك تەنیا چارەنووسێك دەیخاتە بەردەستمان، تەنیا چارەنووسێکی وا کە دەبێت ئێمە بیگەیەنین بە ئەنجام.

تواناو بواری هەلبژاردنیشمان نییە، چونکە ئەوەی بە سەرماندا دەسەپێنرێ بەشێك نییە لەو شتەی کە بتوانین دابەشی بکەینو لە نێوان ئەو بەشانەدا ئەوە هەلبژێرین کە تیماری برینەکانمان دەکات. ئەوەی بەسەرماندا دەسەپێنرێ ساختومانێکە، پێکهاتەیەکی دابەش نەبووە.

ئێمە ئەوە باش دەزانین کە بەشێك لە (گشت)دایەو دەکرێ حسێبی لە سەرەوە بکرێ، بۆیە لە دوای ئەم بەسەرا سەپاندنە دەستمان بە بیرکردنەوە لە چەمکە مێژوویی‌یەکان کردووە. ئەوەتا لەپێشخستنو دواکەوتنی ولاتانی تازە گەشەسەندوو دەدوێینو باس لەدەرامەتی خەلکی دەکەین. بەرنامە دادەرێژینو کۆمپیوتەرەکان سەرنجمان رادەکێشن، لە ئاست تەکنەلۆژیای سەرسورهێنەری جیهانی پێشکەوتوودا ئەفسوون دەمانگرێ.

حەز بە دەسەلاتداری دەکەینو دەکەوینە بازارگردنەوە. لەلایەکەوە خەلکی فێری

خوێندەواری دەکەین و لەلایەکی دیکەشەوە بە پڕکردنی عەمباری مێشکیان لە ڕۆژنامە نابووتەکان هۆشیان تێك دەدەین. ئەوەمان لەبیر نییە ڕەنگە وا باشتر بێ، سەرەتا (میرزا)و بەناو (شت زانەکانمان) لە بنەڕەتەوە پەروەردە بکەینەوە. بە کورتییەکەی، ڕێك و ڕاست ئێمە ئەو کارانە دەکەین کە دژی بەهاکانی جیهانی چەند هەزار ساڵەمانن.

بەڵام چارەنووسی دارو نەداری ئێمە، واتە ئەم بیروڕا کۆنانە، ئەم بیرەوەرییەی لەگەڵ خۆمان هەڵمان گرتووە، چی دەبێت؟ ئایا میراتی ئێمە دەتوانێت ڕەوتی ڕووداوەکان بهێنێتەوە مەداری خۆیان و ئارامگەیەك بۆ ژیانی ناوەوەمان پێکەوە بنێ؟ ڕەنگە، بەڵام بە شێوەیەکی نا ئاگا.

کەفو کوڵی خوێن و هەناسەدانی قووڵی فەرهەنگی و گەڕانەوە بۆ جەوهەر، ئەمانە گشتیان هۆکاری گرنگن، بەڵام لە بوارە ناماقووڵەکاندا، واتە لە سۆزو غەریزەدا.

لەگەڵ ئەوەشدا ئەم هۆکارانە دەبنە شوێنی پێشبینییە لە ئەندازە بەدەرە گەشبینییەکانمان، بەرنامە پڕ شۆڕەکانمان تێك دەدەنەوە، دەبنە ڕێگر لەبەردەم کارە جەسوورەکانماندا، بەکورتی بەشێك لە بوونمان ئەو شتانە ڕەت دەکاتەوە کە بەشەکەی دیمان پێویستی پێیانە. ئەم بارودۆخەش هێندە بەردەوام دەبێت تا بە ئەندازەیەك دەگات کە کاریگەریی تەکنیکی ئامانجە ڕۆشنبیرییەکانمان لە زەلکاوی موستەحیلدا دەمێننەوە.

بێگومان ئێمە هێشتا وەکوو پێویست سەرو ساختمان لەگەڵ تەکنیکدا نییە، لە نێوان (شت بوون)ی شتەکان و ئەو کاتیگۆرییانەی کەتەرازووی کاری ئێمەن هێشتاکە گونجان و جووتبوونێکی تەواو دروست نەبووە. هەر بۆیەشە لە بیری ئێمەدا مایەیەکی جیهانبینی ئەفسانەیی - شاعیری، شێوەی شتەکان دەگۆڕێت و ئەو شتانەمان زیاتر لەشێوەی (یاری)یەکدا دێنێتەوە بەرچاو، تا شتی کارساز. ڕەنگە هەر لەبەر ئەم هۆیەش بێت ئێمەی خۆرهەڵاتی (جگە لە ژاپۆنەکان) لەکارە تەکنیکیەکانماندا هێندە سەرکەوتوو نین.

بەڵام لە لایەکی ترەوە ئێمە بەزەنگی مەترسی بیریارە خۆرئاواییەکان بێدار بووینەتەوە کە بەردەوام لەمەڕ (نوێخوازی) و پیشەسازییەوە دەدوێن. هەروەها لەژێر کاریگەریی ئەو ناڕەزاییانەی کە سەرانسەری جیهانیان لە ئاست بەها زانستی - تەکنیکییەکاندا هێناوەتە لەرزە، بە خۆماندا هاتووینەتەوەو هێواش هێواش دەستمان بە پرسینەوە لە ناسنامەی فەرهەنگیمان و بەها نەمرەکانی نەرێتمان کردووەو ئارادەیەك پەیمان بەو خاڵە بردووە کە دەکرێ ڕووداوەکان بەجۆرێکی تریش ڕوویدەن.

بەڵام لەگەڵ ئەمانەشدا چ کارێکمان بۆ وەدەستهێنانی چارەسەر بەئەنجام گەیاندووە؟ هیچ! دیسانەوە جارێکی دی هەڵەکانی پێشوو دووبارە دەکەینەوە.

ڕێی تێدەچێت ئەگەر بهاتباو سوودمان لە ئەزموونی ئەو کەسانە وەرگرتبا کە لاساییان دەکەینەوە، یاخود لە ئاست بیرەوەریی باو و باپیرانماندا ئەمەگمان دەبوو، بەپێی توانا لەچێشتنی ژەهری تێکشکانەکانیش خۆمان دەپاراست، بەڵام نەخێر! تەنانەت پەلەی ئەوەشمانە بۆڕی ئەوانەش بدەینەوە کە ئاشکرا نییە دەگەنە هەواری مەبەست، یاخود نەء.

ئەی هونەری لەچیدایە؟

ئایا دەکرێ بەو جۆرە قسان لەسەر هونەر بکەین کە پەیوەندی بەلایەنەکانی دییەوە نەبێت و دابڕی بکەین؟ بێگومان نەخێر.

کاتێك ڕۆح زیندووە گەر لەگشت بوارەکاندا چالاك بێت هیچ هونەرێکی واقیعی لە ئێمەدا سەر هەڵنادات گەر بێت و لەژێر کاریگەریی قەڵەمڕەوی لایەنە مەعنەوییەکانی تردا نەبێت. مانای ئەم

قسەیەش ئەوە ناگەیەنێت هەرچی هونەرمەند بیکات شاعیرانەیە. بەڵام پێویستە بارودۆخێکی گونجاو لەئارادا بێت تاکوو مەسەلە رۆحییەکان بپشکوێنو یەکتری ئاوس بکەنەوە. هەر بەم پێیەش دەتوانین باس لە (رۆحی زەمانە)وە بکەین. جا ئەم رۆحی زەمانەیە (وجوود) بگرێتەوە یاخود دیالێکتێکی هەلومەرجەکانی سەردەمی دیاریکراو. هونەری خۆرئاوا دیاردەیەکی دابڕاو نییە لە فەرهەنگی ئەم سەردەمەی خۆراوا. لەم فەرهەنگەدا پەیوەندییەکی قووڵو ئۆرگانێکی لەناو ئەو شۆڕشانەدا هەیە کە لە گشت بوارەکاندا روو دەدەن. جیهانبینییە نوێیەکانیش لەهەمان کاتدا کە دروست دەبنو ئاسۆی روانینمان لە ئاست جیهاندا فراوانتر دەکەن، هەر لەو کاتەشدا ژێرپێمان کە خۆی لە خۆیدا سستو لاوازە، زیاتر خاڵی دەکەن. میکانیکی (کوانتا) ئەوە دەردەخا کە بەشە پێکەوە بەستراوەکانی ماددە ناچنە ژێر یاساکانی فیزیای کلاسیکەوە. لێرەشەوە ئێمە رووبەرووی چەمکی وەك (بێ بڕانەوە)ی نیسبەتو هۆی بوونو ماتماتیك دەبینەوە. کەواتە تا دێت پێکهاتەکانی ماددە تاریکتر دەبنو مەیدانی نەناسراوەکانو نهێنییەکان بەرینتر دەبن.

(فرۆید) لە قووڵایی دەروون دەکۆڵێتەوەو میکانیزمی نائاگایی تاکو (لبیدۆ) دەدۆزێتەوە، (یۆنگ)یش گشتی بوون دەداتە ئەو نائاگاییەو ناوی دەنێ (نائاگایی گشتی) - کۆمەڵی - کە لە سەرچاوەی ئەزەلیی ئادەمیزادەوەیە. کۆمەڵناسانی فرانسەیی لەپێکهاتەی زەینیی نەتەوە سەرەتاییەکان دەکۆڵنەوەو زاراوەی (پێش عەقل) یاخود (پەیوەندیی جادوویی) یان بەسەردا دەبڕن. (ئیدمۆند هۆسێرل) ئاوڕ دەداتەوە لەخودی دیاردەکان و (عاتیفییەتی زەینی) دەدۆزێتەوە. ئا لەم بارودۆخو کەشەدایە، بزووتنەوە مۆدێرنو گەورەکانی هونەر سەرهەڵدەدەن. هەر لە ئیمپرسیۆنیزمو فۆتۆریزمەوە بگرە تاکو کوبیزمو سوریالیزم.

هەر لەم کەشەدایە، (سیزان) گەرەکییەتی سروشت لە شێوەی (لوولەیی، تۆپیو قوچکەیی)دا پێشان بدات.

هەروەها (پۆل کیلە) کە هونەرمەندێکی زانایە، دەیەوێت نەبینراو بکاتە بینراو. ئەمە جگە لەوەی بە تێڕوانینی ئەدەبیاتی ئەم سەردەمەوە بە باشی لەوە تێدەگەین کە لەمدیو ئەم بزووتنەوەو گۆڕانکارییە هونەرییانەوە، چ رەوتێکی توانەوەو لێکدابڕانی فەرهەنگەکان بەدی دەکرێو چۆنیش ورده ورده وێنەی دێرینەی مرۆڤ شوێنی لێژ دەبێت.

زاناکان باسی (نیهیلیزم) دەکەن، (شپینگلەر) پێشبینیی رمانی خۆرئاوا دەکات، پاڵەوانە ئەدەبییەکان نموونەی ترسو دڵەڕاوکێو پووچین، هەروەك چۆن (مالتە)ی پاڵەوانی یەکێك لەچیرۆکەکانی ریلکە، لە جەوهەری (نامومکین)دا بۆ ژیان دەگەڕێ. بەڵام رێكو راست هەر هەمان (نامومکین)ە لە ئەزموونێکی نوێی مەعنەویدا سەرهەڵدەدات. هەر بۆیەشە (ت.س ئێلیۆت) سەرنجمان بۆ لای (خاڵی وەستانی جیهان گەردان) رادەکێشێو (مارتن هایدگەر) باس لە(کەینوونەی وجوود) دەکات کە ئەمەش هەر بیرکردنەوەی بێ بیرکردنەوە، واتە واقیعیەتی وجوودە.

ئێستا با بزانین لەلای ئێمە هونەر لە چیدایە؟

ئایا لەلای ئێمەش هونەر ئەو قۆناغی نیهیلیستییەی تەی کردووە کە بەگشتی باسمان کرد؟

بێگومان رۆحی زەمانەی ئێمەش لە شێوەی ئەو گەردوونەیەدا کە (شپینگلەر) پێشبینی کردووە، بەسەرماندا سەپێنراوە. هونەری خۆرهەڵات وەکوو خۆی ماوەتەوە.

مەبەست لەم هونەرەش ئەو بیرەوەرییە نەمرانەیە کە ساختومانی زەینو ئەو (گشتە) کارسازەیە کە یاسای فەرهەنگیمان دەپارێزێت. لەم یاسا فەرهەنگییەدا، نموونەکان، شێوەکان لە(یەك شێوە بینین)دا دووبارە دەبنەوەو

لەجەوهەری ناوەوەی خۆیاندا ژیان دووبارە دەکەنەوە، نەك لەرووخسارە دەرەکییەکاندا. نیشانەی ئەم خاڵەش ئەوەیە کەوا هونەرمەندەکانمان چەندین سەدەیە هەر ئەو نەخش و نیگارانە دەڕازێننەوە کە لە ئەزموون و ژیانی مەعنەوییەوە ئاویان خواردۆتەوە. لەبەرئەوە مەبەستی هونەرمەندەکانی ئێمە داهێنانی تاکە کەسی و گۆڕان نییە، بەڵکوو وەفادارییە لەئاست بیرەوەری نەتەوەییماندا. ئەو وەفادارییەی بەناچاری تۆوی ژیانەوە و زانەوەی لەگەڵ خۆی هەڵگرتووە.

خاڵێکی دی دەرکەوتنی ئەم وەفادارییە، توانەوەی تاکە لە گشتێکدا کە شوێنی تاکی تێدا سڕاوەتەوە. هەر لەبەر ئەوەشە پەردەی بێناوی داهێنانەکانی هونەری ئاسیا دادەپۆشێ و ئەزموونی مەعنەویەتی گشتی مرۆڤ لەلای ئێمە ئەو گرنگییە بەدەست دەهێنێت، چونکە تەنیا ئەوانە دەرگای بیرەوەرییان بۆ واڵاکراوە کە شتیان لەبیر ناچێتەوەو تەنیا ئەو کەسانەش شتیان لەبیر ناچێتەوە کە خۆیان حەشار نەداوە. خۆنەشاردنەوە واتە پەی بردن بە نهێنییەکان. هەر پەی بردنێکیش دۆزینەوەی جیهانێکە، کەوا ئەوەتا لە دەروونی هونەرمەندا. دۆزینەوەی جیهان بەم مانا تایبەتییەی، بەندە بەتێڕوانینی هونەرمەندەوە بۆ حەقیقەت.

ئەو حەقیقەتەی نەك لەشێوەی شتبوونی شتەکاندا ـ بازنە، چوارگۆشە، یاخود ئەو قەرارانەی دەستی مرۆڤ دروستی کردوون ـ خۆی دەنوێنێ، بەڵکوو ئەو حەقیقەتەی لەگومبەزێکی یاقووتی سارایەکی چۆڵدا دەدرەوشێتەوە، یاخود ئەو حەقیقەتەی لەکەنار تاڤگەیەکەوە فەرمانڕەوایی بەسەر خەڵوەتی (چینی)یەکدا دەکات. یان ئەوەی بزە دەخاتە سەر لێوی (بودی ساتوا)یەك. هەر بۆیەشە نەخش و نیگاری شەپۆل ئاسای خەیاڵ، ئەوەندەی برەو لە هونەری ئێرانیدا پەیداکردووە.

بەڵام ئایا لەو کاتەوە کە بەها هونەرییەکان پووچ بوونەوە، لەو کاتەوە کە گومبەزە یاقووتییەکان لەژێر لافاوی لمی سارادا نغرۆبوون و خەندەی سەر لێوی بودایییەکان کاڵ بۆتەوە، دەتوانرێت بانگەواز بۆ داهێنانەکانی هونەری خۆرهەڵات لەسەر ئاستی رابردوویانەوە بکرێت؟

دیارە هێشتا لێرەو لەوێ پاشماوەی هونەری دێرینەمان ماونەتەوە، بەڵام گەنجینەکانی هونەری دێرینەمان ئەوەتان لەحاڵەتی توانەوەداو هونەرمەندەکانیشمان دەیانەوێت بە نۆرەی خۆیان رۆڵی (پرۆمسیۆس) بنوێنن و دێوی دوودڵی دەستەمۆ بکەن. بەڵام ئایا ئەوانیش قۆناغی دوورو درێژی دارمانی بەهاکان و نیهیلیزم و نامۆبوونیان تێپەڕاندووە؟ واتە ئەو لایەنانە ئەبستراکت و چەمکە یەکلاییانە، ئەو لایەنانەی کە هەلومەرجی واقیعی ژیانێکی سەربەرەو خوارو عەدەمی پێشان دەدەن. ئایا ئەوانیش (ئەو هونەرمەندانە) (میکانیزمی کوانتا)یان لەبوونی خۆیاندا هەستپێکردووەو (ماددە)یان لە (ماددە)بوونیدا دۆزیوەتەوە؟ ئایا ئەوانیش سروشتیان لەشێوەی بازنەو چوارگۆشەدا کردۆتە (شت)؟. نەخێر ئەوان کاری وایان نەکردووە. ئەی باشە ئەمە چ هونەرێکە کە دوورە لە بیرەوەریی نەتەوەیی و دینامیەتی بێبینایی دەسەڵاتی بەهێزەوە بەستراویش ناناسێت؟

ئەو هونەرە وەك سەراپای بوارە مەعنەوییەکانی ترمان لەبڕینی قۆناغی (بەرزەخ)دایە. واتە نە لەداهێنانی دیوانە ئاسای (ڤانگۆخ)ەوە ئاو دەخواتەوەو، نە لە ئاووهەوای ئەفسووناوی و خەیاڵی میناتۆرەکانیشمانەوە سەرچاوە هەڵدەگرێ. هونەری لەو بابەتە، یا ئەوەتا لاسایی شێوەکانی پێشوو دەکاتەوە ـ بەبێ ئەوەی پەی بە مەعنەویاتەکانیشیان ببات ـ یان ئەوەتا دەچێتە ژێر کاریگەری شێوەکاریی هونەری مۆدێرنەوە. بۆیە پێویستە هەموو شتێك لەنوێ ئەنجام بدەینەوە. پێویستە لەسەرەتاوە خۆمان فێری بیرکردنەوە بکەین و خۆمان بژێنینەوە. شارستانییەتە مەزنەکانی ئاسیا، بەبێ تێگەیشتن لە(قەدەری مێژوویی) نە دەتوانن

بزوتنەوەیەکی مەترسیدار دەست پێبکەن‌و نە دەشتوانن ڕۆحی خۆیان ڕزگاربکەن‌و لەکاری داهێنەرانی خوڵقاندنی جیهانی نوێدا بەشداری بکەن. جا بۆ ئەوەی بتوانرێت ئەو تێگەیشتنە بەدەست بهێنرێت پێویستە سەراپای ئەو چەمك‌و دەربڕینانە بناسینەوە کە لە سەدەی پێشووەوە هاتوونەتە نێو ئەندێشەمانەوە. بە واتایەکی دی، پێویستە ئێمە جارێکی‌دی فێری بیرکردنەوە ببین‌و، خۆمان لەوەدا بناسینەوە کە لەواقیعدا تێیداین، نەکوو لەوەدا کەبیری لێدەکەینەوە. پێویستە ئێمە ببینە ئەوەی کەهەین.

ئایا دەکرێ گونجانێك، یاخود سازانێك لە نێوان ڕوویەڕووبوونەوەی هاوچەرخ‌و شێوەی بیرکردنەوەو هەست کردنماندا بهێنینەدی؟ بەواتایەکی دی، ئایا دەکرێ تەکنیك‌و نەرێت ئاشت بکەینەوەو بیرەوەریی نەتەوەیی ڕزگار بکرێت، لە هەمان کاتیشدا خۆمان لە ئاست ڕەنجی (لە دەستدانی بیرەوەرییەکانمان) ڕابگرین؟

ئێمە زۆر کات دەمانەوێت وەك شتێکی بێ زیان تەماشای تەکنیك بکەین کە بەدەردی جۆرەها کار دێت‌و ئەوەمان لەبیر دەچێتەوە، یاخود نازانین کە کرۆك‌و جەوهەری تەکنیك، (تەکنیك) نییە. ئەوەی ڕاستی بێت خەیاڵێکی منداڵانەی ساکارە گەر بمانەوێت تەکنیك لە بەها پێوە گرێدراوەکانی هەڵاوێرین. ئێمە زۆرجاران لەبیرمان دەچێتەوە یاخود نازانین، کە زانست‌و تەکنیك‌و تەکنەلۆژی لەبیری خۆرئاوادا هەرگیز لێکدی جیا ناکرێنەوە، چونکە ئەو دیاردانە ئەنجامی بیری خۆرئاوان. گەر لەم ڕێڕەوە مێژووییەشدا سەرکەوتنی یەك بە دوای یەك و سەرسووڕهێنەرو لافاوی دنیایی بوون هەمیشە کڵپەیان سەندووە، ئەوە لەبەر ئەوە بووە کە میکانیزم بەدیهێنەری تەکنیك بووە. لەو ڕۆژگارەیشەوە سەرکەوتنی ئەم ڕێڕەوە هاتەدی کە (نموونە جەوهەر)ییەکان شوێنی خۆیان بۆ پەیوەندییە ریازییەکان‌و بەها چەندییەکان ـ کمیە ـ چۆڵ کرد. لەو ڕۆژەوە بوو کە زانست وەکو هێزێك، دەستی بەسەر جیهانبینی ئەفسانەیی‌و لێ ووردبوونەوەی مرۆڤدا گرت.

هۆی چییە مەبەستی زانست لای (تاوۆ)ی چینی (ئەفسی بێکردارە)و ئایینی هیندۆیی‌و ئایینی ئیسلام کردەوەی بێ مەبەست‌و ڕازی بوونی (پەروەردگار) تەرویج دەکەن‌و لە لای عارفێکی وەك (ئۆکهارت)یش پچڕان ـ بنەمایەکی بێ چەندو چۆنە. هۆیەکەی ئەوەیە لە کردەوە جێبەجێ کردندا، واتە لەو کردەوەیەی لە (بوونەشت‌و پراکتیك کردندا) کۆتایی پێدێت، هێزێك خۆی حەشارداوە، ئەم هێزە لە کاتێکدا کە بەها مەعریفییەکان پچڕپچڕ دەبن، بوارێکی وا دەخوڵقێنێت‌و پەرچەکردارێکی وا دێنێتە بوون کە لە ئەنجامدا بە کۆتایی هاتنی هەست‌و ئیدراك تەواو دەبێت.

ئەم مەترسییە ناوەکییەی کە لە ماهییەتی گشت جۆرە (کردارێکی بەمەبەست)دا دەبینرێ، و ئامانجی دەست بەسەرداگرتنی سروشت‌و دابەزاندنێتی بۆسەر ئاستی (سەرچاوەی وزە) کە ئەو وزەیەش دەگۆڕێ بۆ کاڵا، لەسەرەتادا لە سروشتی ژیارەکانی خۆرهەڵات‌و تا سنورێکیش لە ژیاری یۆنانیدا ـ بە تایبەتی ئەو کاتەی کە یۆنان وەك بازییەکی بێ مەبەست لەبیری بێ ئەنجام دەیڕوانی ـ دەبینراو هەستی پێدەکرا.

خاڵی سەرنجڕاکێش لێرەدا ئەوەیە کە بیری نوێ بە لەناوبردنی بیرەوەریمان دەست پێدەکات. کاتێك (فرانسیس بیکۆن) هێرش دەباتە سەر پەیکەرەکانی زەین‌و بەنێوی زانستی ئەزموونگەرییەوە تاوانباریان دەکات، لە ڕاستیدا بانگەواز بۆ ئەو دیاردەیە دەکات کە لە سەدەی سێزدەهەمدا پێی گرتبوو و کەسانێکی وەك (ڕۆجێر بێکۆن)و (ئەلبێرتی مەزن) پەلەی ئەوەیان بوو دایسەپێنن. هەروەها کەسێکی وەك (ئۆکهایم)یش ئەو ڕێچکەیەی ئامادە کردبوو کە بۆ ڕێنیسانس‌و سەردەمی نوێ سوودی لێ وەردەگیرا.

پەیکەرەکانی (فرانسیس بێکۆن) بەلای ئێمەوە، بەو مانایەی لە نەریتی ئیسلامیدا هاتووە، واتە ئەو گەنجینانەی کە مرۆڤ لە شێوەی بیرەوەرییدا لە باوباپیرانی خۆیەوە وەریگرتوون و لە ئاستیشیاندا، تا ڕۆژی (وادەو پەیمان)بە وەفاداری دەمێنێتەوە. (بەکاربردنی زانست و پێشخستن)یشی، وەك ئەوەی (بیکۆن) بانگەوازی بۆ دەکات و لە فەلسەفەی نوێشدا دەبێتە جێگەی سەرنجڕاکێشانی (دیکارت)، بۆ خۆی وەرووخستنی ئوسلووبی داگیرکارەو لێپرسراو پیشەیەکە، ئێمە شوێن دەستی لە تەکنۆلۆژیای هاوچەرخدا دەبینینەوەو ئەوانەش کە بەگەڕی دەخەن هەر هەمان (تەکنۆکرات)ەکانی ئەم سەردەمەن.

لەکاتێکدا کەسێکی ئاسایی بۆ پشکووتنی بیری شهودی و ئەفسانەیی نەبێت، ئازادی ناوەوەی مرۆڤیش هەناسە سواردەبێت. ئازادی هەر ئەوە نییە کە شۆڕشگێڕەکان لە ئەنجامی دەست بەسەراگرتنی دەسەلاتداران، یاخود لە بواری نایەکسانە کۆمەلایەتیو سەرکەوتنی تێکۆشانی چینایەتیدا بەدی دەکەن. ئازادی جگە لەهەموو ئەوانەی سەرەوە، بینینێکی بێ مەبەستە لەیاریگای جیهانیدا.

ئەو بینینەی بەقووڵی لە ئایدیالەکانی حیکمەتی خۆرهەلاتیدا دەبینرێن. (ئارهات)ی بوداییو مرۆڤی کاملی ئیسلامیو (ئازادەبوو)ی هیندۆیی، گشتیان نموونەی ئەو بینینە بێ مەبەستەن کە لەیاریگای جیهانیدا چاو هەلدەهێنن. سەبارەت بەوەی بۆچی لەناخی مەسەلەکاندا، دیاردەیەك هەیەو ئەم دیاردەیەش لە فەلسەفەی هیندا وەك پشکووتنی گوڵێکی جادوویی لە بەرەبەیانی ئەفسانەی بووندا خۆی پێشان دەداتو لەئایینی ئیسلامدا بەشێوەی بارینی ڕەحمەتی ڕەنگاو ڕەنگ بەسەر جیهاندا دەردەکەوێتو لای بودایی‌یەتیش وەك پرشنگی گەردوون دەپەڕێتە سەر ئۆقیانووسی ئەزەل خۆی دەنوێنێ، دەتوانین بلێین: لەبەرئەوەی ئەم دیاردەیە بارانی جیهانبینی ئەفسانەیی شاعیری فەرهەنگی خۆرهەلات دەیبارێنێو بەردەوام دووبارەی دەکاتەوە. هەر بۆیە لەبەرئەوەیشە مرۆڤی خۆرهەلاتی سەرنجی بۆلای شتەکان کێش نابێتو خۆی لەنێو ئازادیی خۆیدا وەك ئەو شتە دەبینێ کە ئەوی بە بازی گرتووە.

بەلام کاتێك ئێمە بیر لە زانستو تەکنیکی خۆرئاوا دەکەینەوەو چەندین سەرکەوتنی بۆ مرۆڤ تێدا بەدی دەکەین، مانای ئەوە نییە ئێمە هەر شتێکی دژ بەو زانستو تەکنەلۆژیایە بێت بە واقیعیو شایانی هەستکردنی نازانستیداو نامانەوێت لە تەرازووی زانستیدا هەلیسەنگێنن؟ کاتێك ئێمە دەلێین: فلان شت لەرووی زانستییەوە تاقیکراوەتەوە، لەڕاستیدا سەرچاوەیەکی ڕەها دەستنیشان دەکەین کە گشت دژایەتییەکی وەلاخستووەو لەمەڕ مەعنەویاتیشەوە، ئەگەر مرۆڤێکی بە ڕاوتەگبیربین، ئەوا گۆڕەپانی وەلامەکان پڕ دەکەین لە بیروڕای تایبەتیو تاکە کەسیمان! هۆی ئەمەش ئەوەیە کە بوارە مەعنەوییەکان لە باروودۆخێکی نەگونجاو بۆ درەخشانەوە یان هەرگیز سەرهەلنادەنو ناچار بەرەو بیروڕای تاکە کەسی تایبەت ڕاپێچ دەکرێن. پەیڕەوکارانی قوتابخانەی (ڤیدانتا ـ ویدانتا) دەلێن: (هەر زانستێکی ئەزموونکراو تا ئەو کاتەی پێچەوانەکەی نەخرێتە ڕوو، ڕاستە). کەواتە دەتوانین بلێین مادام (بوون) بە داپۆشراویو پەردەداری بمێنێتەوە، حەقیقەتیش هەروەك زانیاری ئێمە لەمەڕ جیهانی (ئەزموونکراو) خۆی دەنوێنێت.

باشە ئەی ناکرێ ئەوە زیاد بکرێو بگوترێ: کەواتە هەرکات مرۆڤ لە پلەی لێ وردبوونەوەی کامڵ نزیك بکەوێتەوە، بایەخی واقیعیەتی زانستی ـ تەکنیکیش ڕێژەیەکی زۆرتر بەدەست دەهێنێ؟ بەلام ئەم کارە بە ئێمە ناکرێو ئازایەتیو چاونەترسییەکی بێسنووری گەرەکە. زانیاریی ئێمە کە زیاتر لەبوارێکدا چڕ دەبنەوە ناچارمان دەکەن تەنیا لە سنووری زانستێکدا بمێنینەوە. هەر بۆیەشە ئەو پەناگایەی ئەو تاقە

زانسته پێمان دەبەخشێ دەبێتە جێی شانازی پێوەکردنمان! بەڵام هەر ئەزموونێکی مەعنەوی، تەکانێکە لەگۆڕەپانی بووندا و مەترسییەکە تەنیا ئەو مرۆڤانە هەڵدەستان بە بەدیهێنانی کە لە ساتە وەختێکی دیاریکراودا، ساتە وەختێکی شکۆدار، دەیانتوانی سنوورەکان تێك بشکێنن و بازبدەنە ئەودیو سنوورەکانی خۆیانەوە. بەڵام مرۆڤی ئەورۆکە هەرچەندە لە زانستدا دەوڵەمەندتر ببێت، هێندەش جیهانبینی خۆی تەسکتر دەکاتەوەو بەقسەی شاعیرێك: (باڵە گەورەکانی دەبنە رێگر لەبەردەم فڕینیدا).

ئێستاش لە کۆتاییدا ئەوەتا رووبەڕووی هەمان پرسیار دەبینەوە: مەبەست لەرووبەڕووبوونەوەی هاوچەرخ چییە؟ مانای رووبەڕووبوونەوەی هاوچەرخ ئەوەیە کە ئێمە لە ئاست مەترسیی گۆڕانی پەیوەندیی مرۆڤ بە جیهان و سرووشتەوە ماوینەتەوە. لەبەرئەوە ئەم رووبەڕووبوونەوەیە نەك هەر گفتوگۆی نێوان فەرهەنگەکانی ناخەملێنێ، بەڵکو بڕیاری توانەوەی گشتی فەرهەنگەکانی لەلایەن تاقە فەرهەنگێکەوە هێناوە کە ئیدی بۆتە دیاردەیەکی جیهانگرەوە. ئێمەش بەپێی توانای خۆمان، لەو نهیلیزمەدا کە (نیتشە) لە سەدەی رابردوودا تاقە پێشبینیکەرێکی بوو، گێنگڵ دەدەین.

لەم رەوتە مێژووییەدا جیهانبینی ئێمە چاوی بڕیوەتە نەمانی خوداکان و دارمان و بێنرخیی بەها میتافیزیکییەکان. ئەو شتەی کە ئێستا لەخۆرئاوا جۆرێك بەرگریی لە ئاستا پێشان دەدرێ و لەگەڵ باڵکێشانی نهیلیزم بەسەر گشت لایەنێکی ژیاندا، هێشتا هەوڵی بە درۆخستنەوەی دەدرێ. کەواتە ئێمە تازە بیروڕا ساکارەکانی سەدەی نۆزدەیەم دەڵێینەوە و بە خۆشبینییەکی وەهاوە باسی زانست دەکەین، وەك ئەوەی چاوەڕێی عیسای ئاخرزەمان بکەین.

ئەو دووڕیانە دەردەدارەی کە گۆڕەپانی هێنان و بردنی دووڕووی دژ بەیەکی بوونی ئێمەی پێك هێناوە، هەوڵ و کۆششمان شەل و شکست دەکات و دەبێتە رێگر لە بەردەم جووڵەماندا و رێگەی پشکووتنی بیرو بینینمان دەبەستێ. بیرو بینینیش ئەوکاتە داهێنەرو بەرهەمدارە، یان ئەوەتا لە رابردووەوە ئاو بخواتەوە، یاخود وەك حەکیمە موسڵمانەکان دەڵێن: لە رۆشنایی پێغەمبەرێتییەوە تیشك وەربگرێ، یاخود بە تەواوی سەربەخۆ بێت.

واتە لانەی نەتەوەیی چۆڵ بکات و خۆی بداتە بەر ئاو و ئاگر تاوەکوو بنەمای نوێ بەدەست بهێنێت. مێژوویی بیری خۆرئاوا جۆرە هەوڵدانێکە بەرەو بەدەستهێنانی بنەمای نوێ. ئێمەش لەحاڵی حازردا نە توانامان هەیە خۆمان بە رۆشنایی پێغەمبەری بگەیەنین و، نە هێندەش ئازادین تاوەکو دەست بدەینە کارێکی وەك (لسیسی فۆس) و لەبەریشی دەرنەچین.

لێرە دەرکراو و لەوێش حەپەساو. ئێمەی خۆرهەڵاتی لە (بەرزەخی) بێ ئارامی و هەداداندا کە ئاوا زامدارو کە لەلای کردووین و پەرچە کردارەکانیشمان ناچنە بەر تیشکی پێشینییەوە، گرفتار ماوینەتەوە. لە نێوان دوو قوتبدا دەتلێینەوە: لە نێوان (لاوتسێ)و(مارکس)دا، لە نێوان رەفتاری جوامێرانەی سامۆرایییەکان و رقی ئابووریدا. لەو شوێنەی هێزە داهێنەرەکانیش گرژ بینەوە، دەرکەوتنی هەر جۆرە باروودۆخێك بە بیردا دێت، تەنانەت دوورترین و نامومکینترینیشیان.

ئایا دەتوانرێت سازانێك لە نێوان ئەم دوو رووەی بووونماندا بەدی بهێنرێت، کە یەکێکیان بەرەو ئاسایشی کۆمەڵایەتی لەژێر ئایدۆلۆژییەکی دیاریکراودا رامان دەکێشێ و ئەوی دیکەشیان بە قسەی (نوکهارت) بەرەو (بیابانی بوون) یاخود وەك (حافز) دەڵێ بەرەو بانگی جەرەس داوەتمان دەکات؟

هەرکات ئەو نهێنییە پێ بزانین، یاخود ئەم پرسیارە بخەینە روو، ئەوکاتە تا رادەیەك لە خۆمان حاڵی بووین.

**

ئەم باسە لەم سەرچاوەیەوە کراوەتە کوردی:
بتهای ذهنی وخاطره ازلی داریوش شایگان
مؤسسه انتشارات امیر کبیر.
تهران ۲۵۳۵ ثاث اول. ص۱۳ ـ ۳۶.

# ماركیۆزو بنیامین‌و ڕەهەندی ڕۆمانتیكی

■ میشیل لووی

● و. لەفارسی‌یەوە: ئارام جەمال

هەرچەندە نزیكی بیروبۆچوونەكانی ماركیۆزو بنیامین هەردەم جێگای سەرنج بووە، بەڵام هەوڵدانێكی سیستماتیكی بۆ لێكۆڵینەوە لەماهیەتی نزیكی مەعنەوییانەوە نەدراوە. شوڵم لە (رامانێك لەمەڕ خواناسی جوولەكە) دا نوسیبووی كە بنیامین‌و ماركیۆز (لەگرنگترین تیۆرمەندانی مسیانیزمی (*) شۆڕشگێڕن.. كە پەیوەندی‌یە سەلمێندراو یا نە سەلمێندراوەكانیان بەمیراتی جوولەكەوە ئاكشرایە(١) كەواتە ئەم مەسەلەیە سەبارەت بەبنیامین راستە، بەڵام لەبارەی ماركیۆزەوە زۆر ڕۆشن نی‌یە.

مسیانیزمی یەهودی بەئاشكرا یەكێكە لەبنەما سەرەكی‌یەكانی جیهانبینی بنیامین. مسیانیزمی یەهودی بەڕەهەندی دۆزەخ بینی (*٢) (apocalypse)، كارەساتاوی، وێرانگەرو، هەروەها ئومێدیشی بەرزگاری رەهاوە، پەیوەندی‌یەكی زۆر نزیكی لەگەڵ ئانارشیزمی خەیاڵیانەی بەرهەمە سیاسی‌یەكانی دەیەی (١٩٢٠)ی بنیامیندا پێكهێنا. لەگەڵ ئەوەشدا چ تەوژمی مسیانیزمی یەهودی‌و چ تەوژمی ئانارشیزمی خەیاڵی لەیەك بونیادی كەلتوری‌یەوە، واتە لەڕۆمانتیزمی ئەڵمانی‌یەوە بەڕوكارە دژە بۆرژواكەیداو خولیای جیابوونەوە بەرەو كۆمەڵگاو فەرهەنگی پێش سەرمایەداری سەرچاوەیان گرتووە. رەخنەی فەرهەنگی رۆمانتیكی نوێ لەكۆمەڵگای پیشەسازیانەی سەرمایەداری بەڕووبەڕووكردنەوەی كەلتوور (cultuer) لەگەڵ ژیار (civilazation) یاخود رزگاری (Gemeinschaft) لەگەڵ كۆمەڵگادا، یەكێك بووە لەناواخنە سەرەكی‌یەكانی ئەدەبیات‌و فەلسەفەو زانستە كۆمەڵایەتی‌یەكانی



ئەڵمان لەکۆتایی سەدەی نۆزدەهەم و سەرەتای سەدەی بیستەمدا. تەنانەت عەقڵباوەڕێکی وەک ڤێبەر لەبەردەم ئەم کارەدا بەپارێزراوی نەمایەوە.

یەکەمین بەرهەمەکانی بنیامین وەکو نامە زانکۆییەکەی ساڵی (١٩١٩)دا لەمەڕ رۆمانتیکی ئەڵمانی و وتارە ناسراوەکەی ساڵی (١٩٢٢)شی لەبارەی پەیوەندی یە هەڵبژاردنەکانی (Wahlverwandschaften) گۆتە بەئاشکرا لەهەمان بواردایە. بنیامین لە نامەیەکدا هزری مسیانیستی لەئەندێشەکانی هەریەک لەشلگل و نۆڤالیس و نەریتی یەهودیشدا دەخاتەروو.

مارکیوز بەپێچەوانەوە، پەیوەندی بەمسیانیزمەوە (چ لەجۆری یەهودی و چ لە جۆری مەسیحی)و بەشێوەیەکی گشتی بەئایینەوە نی یە. نزیکبونەوەی مارکیوز لەئایین هەروەک نزیکبوونەوەی سەردەمی رۆشنگەری یە لەئایین و، جیهانبینی یەکەی (مارکیوز) بەتەواوی غەیرە ئایینی و بێباوەڕی یە بەخودا. مارکیوز لەئاستی میسیانیزمی یەهودیدا وەک (دەرکەوتنێکی) رۆمانتیکی ئەڵمانی، ئەوەندە هاوڕێی بنیامین نی یە، واتە ئەو رۆمانتیکەی کە حەسرەت بۆ کۆمەڵگاکانی پێش سەرمایەداری دەخوات و نەرهەنگی هونەری لەبەرامبەر کۆمەڵگەی بێ رۆحی بۆرژوازیدا رادەگرێت. لەنێوان نامەیەکی مارکیوزدا بەناونیشانی (رۆمانی هونەری ئەڵمانی) (Derdeutschekunstlerroman) ساڵی (١٩٢٢) و وتارێکی بینامیندا بەناوی (چەمکی رەخنەگرانەی هونەر لەرۆمانتیکی ئەڵمانیدا) لێکچونێکی زۆر دەبینرێت. نامەیەکی زانکۆیی مارکیوز کە لەم دواییەدا بڵاوکرایەوە، بۆ تێگەیشتن لەکامڵبونی هزریی ئەو هەر لەسەردەمی بەرهەمەکانی لاوی یەوە تا دوا بەرهەمەکانی، بایەخێکی زۆری هەیە. ناواخنی ئەم نامەیە ناکۆکی جیهانی وێناندنە لەگەڵ واقیعی ئەزمونی و (ناکۆکی) هونەریشە لەگەڵ ژیانی بۆرژوازیدا. واتە هەمان ناکۆکی یەک کە رۆمانتیستەکان بەشێوەیەکی کوشندە تێی گەیشتوون و دواتر وەسفیان کردووە. هەندێک لەرۆمانتیستەکان بەتایبەتی (نۆڤالیس)، هەوڵیانداوە بە لەبەرچاوگرتنی جیهانی ئەزمونی بەسەر ئەو دوالیزمی یەدا زاڵ بن و لەجێگەیدا واقیعێکی یوتوپیایی، واتە جیهانێکی خەیاڵیانەی نوێ دابنێین، کە تیایدا ئاشتی و ئارامی، عەشق و فریا (*) باڵا دەستن، کەسانی تری وەک گۆتەش لە (ئازارەکانی ڤارتەری لاو)دا نیشانی دەدەن کە عەقڵیەتی ئایدیالیستیانەی هونەرمەند دەبێتە هۆی دژایەتی یەکی رادیکالانە لەگەڵ سیستمی واقیعدا، دژایەتی یەک کە کۆتایی یەکەی تەنها تەسلیمبوونە بەمەرگ. هەندێک لەرۆمانسی یەکان وەک "ئی.تی.هوفمان" شەیدای هێزە کۆن و

تاریکەکانی ئیحساسات بوون کە جیهانی هەموویان تووشی هەرەشەی نابوودی دەکرد. بەبۆچوونی مارکیوز بەشی زۆری رۆمانە هونەرییەکان (واتە ئەو رۆمانانەی کە قارەمانی سەرەکی تیایاندا هونەرمەندە) خاوەنی رەهەندێکی رەخنەگرانەن لەبەرامبەر بەپیشەسازیبوون و بەئامێربوونی روو لەزیاتری ئابووری و ژیانی فەرهەنگیدا، واتە رەوتێك کە سەرتاپای بەها مەعنەوییەکان نابوود دەکات و دەیهاوێژێتە پەراوێزەوە. مارکیوز جەخت لەسەر ئەوە دەکات کە مەبەستی راستەقینەی زۆر لەنووسەرانی رۆمانتیکی و رۆمانتیکی - نوێ گۆڕینی ریشەییانەی ژیان و لابردنی سنوریەندییە تەنگەکانی ماتریالیزمی بۆرژوایی بووە. بەم جۆرە، مارکیوز ئەم دەستەیە لەنوسەران بەراورد دەکات بەسۆشیالیستە خەیاڵییەکانی وەك رۆژگاری "فۆریە" (3).

هەندێك لە بۆچونەکانی مارکیوز لەنامەکەی رۆمانی هونەریانەی ئەڵمانیدا کەم تا زۆرێك لە (عەشق و ژیار Eros and civilization) و مرۆڤی تاك رەهەندیدا سەرلەنوێ دووبارە دەبێتەوە. لێکچوونێکی سەرسوڕهێنەر لەکامڵبونی عەقڵی مارکیوزو بنیامیندا هەیە: سەرەتا رۆمانتیکی ئەڵمانی و بابەتە هونەرییەکان سەرنجی راکێشاون، پاشان لەدەیەی (١٩٢٠)دا لەژێر کارتێکردنی (لوکاش)و (کورش)دا دەچنە ژێر کاریگەریی مارکسیزمەوەو دواتر لەدەیەی (١٩٣٠)دا لەگەڵ دامەزراوەی لێکۆڵینەوە کۆمەڵایەتییەکانی فرانکفۆرتدا* هاوکاری دەکەن. هەردووکیان بەتوندی رەخنە ئاراستەی سۆشیال دیموکراتەکان دەکەن و هەرچەندە خوازیاری ئاڵوگۆڕێکی شۆڕشگێرانەی سۆشیالیستین، بەڵام پەیوەست بوون بەپارتی کۆمۆنیستەوە رەت دەکەنەوە. پێدەچێت لەئەڵمانیا یاخود لەپاریس (١٩٣٣) بەیەکتر گەیشتبن. لەسەر ئەم بناغەیەو بەپێی ئەو زانیاریانەی کەلامە، تا ئەو دەمەی بنیامین لەژیاندا مابوو، لەنوسینەکانی مارکیوزدا هیچ ئاماژەیەك بەو (واتە بنیامین) نەدراوە (4). ئەم بێدەنگییە لەپای چییە؟ یەکێك لە گریمانەکان دەتوانێت ئەوەبێت کە مارکیوز پاش رزگاربوون لەقۆناغی هایدگەری لەسالانی (١٩٢٨ - ١٩٣٢) بەخێرایی لە رۆمانسییەت دوورکەتەوەو، ئەو لێکدانەوە مارکسییەی هەڵبژارد کە پەیوەندی بەنەریتی عەقڵباوەڕیانەی رۆژئاواوە هەبوو، یاخود بەدەستەواژەیەك لەئەفلاتونەوە بەسوکرات و لەرۆشنگەرییەوە بەهیگڵ گەیشت.

مارکسیزمی مارکیوز لەسەراپای ژیانیدا هەردەم لەنێوان هەردوو جەمسەری رۆمانتیکی و عەقڵباوەڕیدا ئەمسەرو سەری دەکرد. ئەم دوو جەمسەرە لای مارکیوز لەگەڵ یەکدا ناکۆك نین، لەڕاستیدا نەفیکردنەوەو دژایەتی نێوان ئایدیاو ئەو واقیعەی کە هەیە ئەو توخمە هاوبەشەیە کە گەوهەری بنچینەیی بیرکردنەوەی ئەو پێك دێنێت. لەپێشەکییەکی نوێدا کە مارکیوز لەسالی (١٩٦٠)دا لەسەرکتێبی (عەقڵ و شۆڕش - Reason and Revolution) نوسیویەتی، پەرەگرافێکی زۆر سەرنج راکێش هەیە کەتیایدا ئەم بابەتەی بەڕاشکاوی خستۆتە روو: (دیالەکتیك و زمانی شاعیرانە... لەسەر بنەمایەکی هاوبەش بەیەکدەگەن. رەگەزی هاوبەش لەهەردووکیاندا، گەڕانە بەدوای.. زمانی نەفیکردنەوەدا وەك (رەتکردنەوەیەکی مەزنە) (5). ئەڵقەیەکی دی کە لەنێوان عەقڵباوەڕی و رۆمانتیزمدا هاوبەشە، بەرپرسیارییە لەبەردەم بەها مرۆییە چۆنایەتییەکان واتە بەها مەعنەوی و ئاکارییەکان لەبەرامبەر بەها سەرتاپا چەندایەتییەکانی بازاڕی سەرمایەداری. لەلایەکی ترەوە مارکیوز عەقڵ بەشێوەیەکی تەواو وێنەیی و ئامرازیی تێناگات، بەڵکو بەجەوهەرێکی

دەزانێـت کـە لەپیشەسـازی سـەرمایەداری‌و تەنانەت لـەئۆردووگا زۆرەملێکاندا بوونـی هەیـە. یـەکێتی ئـەم دوو جەمسـەرە (واتـە جەمسـەری رۆمـانتیکی‌و عـەقڵباوەڕی)، نیشـاندەری یـەکێتی بەرهەمەکانی مارکیوزەو، لەسەر ئەو جەختکردنە تایبەتی‌یە (رۆمانتیکی یاخود عـەقڵباوەڕ)انەوەیە کە قۆناغە جیاوازەکانی پەرەسـەندنی زەینـی خۆی بەسەریدا دەسەپاند.

لەدەیـــەکانی ۱۹۳۰و۱۹٤۰دا جەمســـەری عـەقڵباوەڕی بـاڵ بەسـەر ئەندێشـەی مـارکیوزەدا دەکێشـێت پـاش سـاڵی (۱۹۲٥) واتـە پـاش بڵاوبوونـەوەی بیبلیۆگرافیـا لەگـەڵ راڤـەکردنی بەرهەمـەکانی شیللەردا، بـەدرێژایی سـێ‌دەیەی یەك بـەدوای یـەکدا هیـچ ئامـاژەیـەك لـەبارەی مەسەلە هونەری‌و ئەدەبی‌و فەرهەنگی‌و هـەروەها رووبەڕووبونـــەوەیان لەگــــەڵ واقیعــــدا لــــە بەرهەمـەکانی مـارکیوز نـابینرێت. هەرچـەندە مـارکیوز لەسـاڵی (۱۹۳۷)دا وتـارێکی لـەبارەی (خەسـڵەتی پۆزەتیڤانـــەی فەرهــــەنگ)ەوە بڵاوکردەوە، بـەڵام ئـەم نوسینە لـەبری ئـەوەی بۆچوونەکانی ساڵی ۱۹۲۲ی تیا دووبارەبێتـەوە، کەچی بەتـەواوی رادیکاڵترین ئەفیکرنـەوەی ئـەو بۆچوونانەیە. بەپێی ئەم وتارە، فەرهەنگی بـاوو ئـەدەبیات بەتایبـەتی، بەپاراسـتنی جیـهانێکی ئومێدبـەخش لەبەرامبـەر ژیـانی رەشـۆکیانەی رۆژانـەدا، رۆڵێکـــی ئـــایدیولۆژی‌و پارێزگارانــــە دەبینێت، (بـۆ نموونـە) باسـی جوانـی (دەروون - Seele) دەکرێـت‌و بەسـەریدا هــــەڵدەدرێت، بۆئەوەی پاساوی بەخت رەشـی جیهانی مـاددی بداتەوە: (ئازادیی "دەروون" دەکرێتە بەهانـە تـا جەستە دووچاری ئازارو، ئەشکەنجەو کۆیلەیـەتی بێتـەوە. ئـازادی دەروون سـوودبەخش بـوو بـۆ تەسلیمبونی ئایدیۆلۆژیانەی (بـوون) بە ئـابووری سەرمایەداری.. دەروون مایەی ئارام بەخشـینە.. شـادی‌یەکانی دەروون شایســـتە تـــرو کـــەم ترسناکترن لەشادی‌یەکانی جەستە). بـەم جـۆرە پێدەچێت مارکیوز بڕوای وابێت کە جیاوازی‌یەکی سـەرەکی لـەنێوان فەلسـەفەو ئـەدەبدا هـەبێت، لەوخاڵەدا کە پەیوەندی بەهەڵومەرجی بـاوو بـاڵا دەسـتەوە هەیـە، (جوانـــی هونـــەر - لەبەرامبـەر حەقیقـەتی تیۆرەدا - هـاو ئاهەنگە لەگـەڵ ئـەو خراپەیەی کە هەیە.)

بەم جۆرە مارکیوز لەبەرامبەر ئەم چوارچێوە (پۆزەتیڤی‌یـــەی) فەرهــــەنگو ئــــازادی‌و سەروەری‌یەی خەیاڵدا، ئەریتی فەلسەفەی عەقڵی دیکـارت، کـانت‌و هیگـڵ دەهێنێتـە پێـش کـە بەچـەمکی (دەروون) بێگانەیـەو رەخنەیـەکی عەقڵانیانەی لەرۆح هەیـە. سـەرەڕای ئـەوەی کە چەمکی دەروون یـەکێك لەتایبەتمەندیـەکانی ئـەو تەوژمانەیـە کـە بڕوایـان بەعـەقڵ نی‌یـە، لـەمێژوو باوەڕیانـەی رۆمـانتیکی (هێردەر)ەوە بیگـرە تـا دەگاتـە تـێزە نوێکـانی هێـزە باوەڕەکـان (هـێز وشـەیەکی خۆشەویسـتە لــە ئایدیولوژیــای فاشیسـتیدا) {بـەڵام} (هیگـڵ لـەچوارچێوەی لایەنگرانی دەوڵەتە هێز باوەڕەکاندا نی‌یە. هیگـڵ لایـەنگری رۆح بـوو، {بـەڵام} دەوڵەتـە نوێکـان لایـەنگری نـەفس.) دیـارە مـارکیوز ئاگـای لەخەسڵەتی تـاك لایەنـەی دادپـەروەری هونـەرو ئـەدەبیاتی بـاوی سـەردەمی بۆرژوایـی هەیـە. مارکیوز ئەوە دیاریدەکات کە هونـەرو ئـەدەبیاتی بـاو (تەنـها شـێوە چەقبەسـتووەکانی (بـوون) ئاڕاستە ناکەن، بەڵکو نیشاندەری دەردو رەنجی هەمان بوونیشن؛ (واتە) نەك هـەر سـازش لەگـەڵ ئـەو شـێوە بـاڵا دەستانەدا بکـەن، بـەڵکو لـەناو خۆیاندا یادەوەری ئەو شتەشیان هـەڵگرتووە کە دەبووایە ببێت. لـەو رووەوە کـە هونـەری مـەزنی بورژوایـی... وێنـەی جوانـی خـەڵك‌و شـتەکان‌و شادی سەروزەوی بەرەنگی شادی ئەم جیهانـەوە کێشاوە... (ئەوا) لەبونیادی ژیانی بۆرژوازیدا نەك هـەر دڵدانـەوە نی‌یـە کـە... (بـەڵکو) خـەمی

جیابونەوەش ماوە). دواتر ئەم دیدگایە دەورێکی چارەنوسسازی لەبەرهەمەکانی مارکیوزدا دەبینێت. لەگەلّ ئەوەشدا لەساڵی ١٩٣٧دا ئەم تێڕوانینە وەك توخمێکی لاوەکی ئاوێتەی چەمکی هەمەکیانەی هونەر دەبێت وەك (دیاردەیەك)ی(پۆزەتیڤانە): (فەرهەنگ دەبێتە خزمەتکاری بوون. ئایدیای شۆشگێڕانە لەهونەردا دەگۆڕێت بەفاکتەرێك بۆ ئاراستەکردنی بوون. چونکە هونەر بەرجەستەکەری جوانی ئەو رەوشەیە کە هەیە. خاڵی کۆتایش لەسەر هەستی جیابوونەوەی شۆشگێڕانەیە.)) ئاشکرایە مارکیوز بەم چوارچێوە تیۆرییەوە هەر دووردەبێت لەهەڵوێستە زەینییە ستاتیکیو فەرهەنگییەکانی بنیامین(6).

رەنگە بتوانرێت لەسەر بناغەی ئەو ئاراستە عەقلانییەی کە لەسییەکاندا بەسەر وتارەکانی مارکیوزەدا زاڵبووەو، لەساڵی ١٩٤١دا لەگەلّ بڵاوبوونەوەی کتێبی (عەقلّو شۆڕش)دا بەلوتکە دەگات، ئەوە روونبکرێتەوە کە بۆچی مارکیوز بەرامبەر بە بەرهەمەکانی بنیامین بێ بایەخ بووە. بەپێچەوانەوە مەیلی زیاتری مارکیوز بەرەو جەمسەری رۆمانتیکی لەپەنجاکانو شەستەکاندا، یەکێك بێت لەنیشانەکانی کەشفکردنی سەر لەنوێی بنیامین. گەشەکردنی ئەو گۆڕانە تازەیە لە فیکری مارکیوزدا دەتوانرێت لەو پێشەکییە جیاوازانەدا ببینین کە لەساڵەکانی ١٩٤١، ١٩٥٤، ١٩٦٠ لەسەرکتێبی، (عەقلّو شۆڕش) نوسیویەتی. مارکیوز هێشتا لەساڵی ١٩٤١دا (رۆحی عەقلانیانەی ئەمریکایی) پیرۆز دەکرد، لەراستیدا ئەم بەپیرۆزراگرتنە تەرجومەیەکی راشکاوانەی سیاسیانەی چالاکییەکانی مارکیوز بووە وەك راوێژکارێکی (دژە فاشیستی) بەرێوەبەری خزمەتگوزارە ستراتیژییەکانیئەمریکا لەجەنگی جیهانی دووەمدا، بەڵام مارکیوز پاش کۆتایی هاتنی جەنگی ساردو مەکارتیزوم* لەدەیەی پەنجاکانداو پاش لێکۆڵینەوەی قووڵتر سەبارەت بەکۆمەلگەی ئەمریکیش، رەخنەی توندی لەشارستانیەتی پیشەسازیو عەقلانییەتی ئامرازیانەی ئەوان گرت. ئەو (مارکیوز) لە(پاشکۆ)یەکدا، کە لەساڵی (١٩٥٤)دا بۆ چاپی دووەمی کتێبی عەقلّو شۆڕشی نووسیوە، ماهیەتی ناکۆکیانەی نەریتی عەقلباوەڕی رۆژئاوا دیاریدەکات: (لە قۆناغی نوێداو، لەهەمان سەرەتاوە، ئایدیاو واقعیەتی عەقلّ، چەند رەگەزێکی تێدا بوو کە بەڵێنی بەدیهێنانی کۆمەڵگەیەکی ئازادو خۆشگوزەرانی دەخستە مەترسییەوە: کۆیلەکردنی مرۆڤ لەرێگەی چالاکی بەرهەمهێنانیەوە... دەستبەسەراگرتنی سەرکوتگەرانە بەسەر سروشتی مرۆڤو دەوروبەریدا). (7) هەروەها لەناو هەمان پاشکۆدا، کارە چاکخوازە شۆڕشگێڕانەکەی خەیاڵو هونەر سەرلەنوێ کەشف دەکاتەوە، واتە کەشفکردنەوەی ئەو مەسەلانەی کە لەنووسینە سەرەتاییەکانی خۆیدا لەساڵی ١٩٢٠دا دوای کەوتبوو، سەرلەنوێ کەشفی دەکاتەوە.

ئەو قۆناغە نوێیەی (رۆمانتیکییەت) بەکتێبی ئیرۆسو ژیار (١٩٥٥) دەست پێدەکات مارکیوز لەم کتێبەدا بەراڤەیەکی نوێوە لەبەرهەمەکانی فرۆید خولیای سێکسی لەبەرامبەر عەقلانیەتی مۆدێرنێتیدا دادەنێتو دەیکاتە بنەمای کارکردنی خۆی. بەم شێوەیە هونەر (لەتێڕوانینی مارکیوزدا) بەبەراورد لەگەلّ ئەو وتارەی لەساڵی ١٩٢٢دا نوسیویەتیو تیایدا راستی تیۆرە لەبەرامبەر جوانیو وەهمیانەی خەیالکردنەوەی هونەریدا دانابوو، لەکلاوڕۆژنەیەکی تەواو جیاوازەوە دەردەکەوێت: (خەیالپەروەری تا ئەو جێگەیەی کە داکۆکی لە حەقیقەت رەتکرنەوەی مەزنتر دەکات، یاخود تا ئەو جێگەیەی کە بەرامبەر بەعەقلّ، بەشێوەیەکی

پۆزەتیڤانە داکۆکی لە ئومێدی داهێنانی یەکپارچەیی مرۆڤ و سروشتی دەکات کە عەقڵ سەرکوتی کردووە، لایەنێکی ئەبستیمی هەیە.) جارێکی تر نووسەری مەزنی ئەڵمانی (فردریك شیللەر) کە مارکیۆز لەساڵی (١٩٢٥)دا لەبارەی بەرهەمەکانی یەوە لێکۆڵینەوەی کردووە دێتەوە مەیدان. وتارە ستاتیکی یەکانی شیللەر لەگەڵ پیشاندانی ئەوەی کە (دەبێت لە ئازادی هەستەکاندا بەدوای رزگاربووندا بگەڕێین نەك لەئازادی عەقڵدا) یاخود لانی کەم ئەوەی کە {دەڵێت} (یاساکانی عەقڵ دەبێت لەگەڵ پەیوەندی یە هەستی یەکاندا بگونجێت)، ({ئیحساسات} خاوەن چۆنایەتی یەکی تەقینەوەیی یە) بەپێی بۆچوونی مارکیۆز (هێردەر، شیللەر، هیگڵ و نۆڤالیس، تارادەیەك چەمکی لەخۆنامۆبونیان وەك یەك گەشەپێداوە. ئەوکاتەی کە کۆمەڵگای پیشەسازی بەهۆی یاسای بنچینەی بەکارهێنانەوە فۆرمەلە بوو، لەشیکردنەوەی فەلسەفیشدا باسی لایەنە سلبی یەکانی کرا.)(لەدرێژەی ئەم دەستەواژەیەدا وتەیەك لەشیللەر وەرگیراوە) ئەم خاڵە گرنگی یەکی زۆری هەیە؛ مارکیۆز هونەرمەندان، فەیلەسوفان، رۆمانسی یەکان و عەقڵباوەڕەکان و بەتایبەتیش ئەو دوو بڕیارەی کە پێشتر لەساڵی ١٩٣٧دا وەك نوێنەرانی دەروون (Seele) (هێردەر) و رۆح (Geist) هیگڵی خستبووەڕوو، لەبەرەیەکی کۆمەڵایەتی - فەرهەنگیانەدا دایدەنان.

بێ مەلامەت نی یە کە لەکتێبی (ئیرۆس و ژیار)دا، واتە لەیەکەمین نووسینی مارکیۆزدا، کە تیایدا رەهەندێکی رۆمانتیکی لەبیرکردنەوەیدا دەردەکەوێت، دەکرێت (کەشفی دووبارەی) بنیامین بەدی بکرێتەوە. مارکیۆز لەم کتێبەدا بەشێوازی جۆراوجۆر، پەرەگرافێکی گرنگ لە (چەند تێزێکەوە لەبارەی فەلسەفەی مێژوووە) (١٩٤٠) وەردەگرێت و، راڤە و ستایشی دەکات. کاتێك کە مارکیۆز ئەم کتێبەی نووسی، نوسینە سەرەکی یەکانی بنیامین هێشتا بڵاو نەکرابۆوە (مارکیۆز لەچاپی ساڵی ١٩٥٠دا لەتێزەکانەوە Die neue Rund Schau پەرەگرافەکەی وەرگرتووە.) دەزانین کە لەگەڵ بڵاوبوونەوەی بەرهەمەکانی (Schriften)ی بنیامین لەساڵی ١٩٥٥دا بەهۆی "ئادۆرنۆ" وە، رۆشنبیرانی رادیکاڵی رۆژئاوا لەئاستێکی فراواندا پێشوازییان لەبیرو ئەندێشەکانی بنیامین کرد. بەڵام مارکیۆز پێش ئەمەش هەر پەیوەندی بە بنیامینەوە هەبووە، {ئەم گرنگی پێدانەش} هیچ پەیوەندی یەکی بەبڵاوکردنەوەی بەرهەمەکانی یەوە نی یە. لەراستیدا پەیوەندی مارکیۆز (بەبنیامینەوە) لەداینامیکی یەتی دەروونی پەرەسەندنی مەعنەوی یەتی یەوە سەرچاوەی گرتووە. لەبڕگەیەکدا کە مارکیۆز وەریگرتووە، بنیامین وای نووسیبوو: (خولیای دابڕان لەرەوتی مێژوودا پەیوەندی بەچینێکی شۆڕشگێڕەوە هەیە لەحاڵەتی پراکتیکدا.) مارکیۆز بەم شێوەیە باس لەپەیوەندی خۆی لەگەڵ ئەم بڕگەیەو سەرجەم ناوەڕۆکی نووسینەکانی بنیامین دەکات: (تا ئەوکاتەی یادەوەری نەکرابێتە کردەیەکی مێژوویی، چەکێکی واقیعی نی یە. لەم بارەیەوە خەبات لەدژی کات رۆڵێکی چارەنوسساز لەخەباتدا دەگێڕێت دژی دەسەڵات.) یادەوەری رابووردو وەك چەکێك لەشەڕدا بۆ ئایندە: کۆبەندیەکی چاکترو وردتر لەم دەستەواژەیە بەزەحمەت لەدیدگای شۆڕشگێڕانەی رۆمانتیکێکدا هەبوو، دیدگایەك کە مارکیۆزو بنیامین تیایدا بەشداربوون و بەسەر تێڕوانینە سیاسی و ستاتیکی یەکانیاندا زاڵبووە (9).

مارکیۆز لەساڵی (١٩٥٥)ەوە تا سەردەمی دوا بەرهەمەکانی، جارێکی تر هونەرو ئومێدی

هونەرمەندانەو رۆمانسیانە، بۆ جیهانێك کەئاشتیو ئارامی باڵی بەسەردا کێشابێت، سەرنجی راکێشایەوە یەکێك لەتایبەتمەندییە سەرەکییەکانی کتێبی مرۆڤی تاك رەهەند (١٩٦٤). بۆ هەمان مەبەستە. مارکیوز لەم کتێبەدا بەم شێوەیە جەخت لەسەر توانای رەخنەگرانەی ئەم ئومێدە دەکات: (لەراستیدا تێروانینە کلاسیکییەکان بۆ نامۆبوونی هونەری تا ئەو جێگەیەی کە ئاشکراکەری نەگونجانی ستاتیکیایە لەگەڵ کۆمەڵگای گەشەکردوودا، لایەنێکی رۆمانسیانەی هەیە. ئەم نەگونجانە ئاشکراکەری حەقیقەتیانە. ئەوەی کە لەم تێروانینەوە لەبیرەوەریدا دەمێنێتەوەو لەیادەوەریدا جێگیردەبێت، بەئایندەوە بەستراوەتەوە، ئەو تێروانینانەی پەیوەستن بە ئاسودەییەوە، ئاسوودەیی سەبارەت بەبینینی لەناوچوونی کۆمەڵگایەك کە دەست بەسەرکوتکردنی دەکات. هونەرو ئەدەبیاتی مەزنی سوریالیستیانەی دەیەکانی بیستو سییەکان، ئەم ئەندێشانەیان لەهەڵسوکەوتی شۆڕشگێڕانەو ئازادانەی خۆیاندا جارێکی تر دۆزیبۆوە.) (10) دەکرێت لەکتێبەکانی دواتری مارکۆزەشدا هەمان ئەوجۆرە گوزارشتانە لەمەڕ ناکۆکی جیهانی هونەرمەندانە یان شاعیرانە لەگەڵ واقیعیەتی هەبوودا، رەهەندی رۆمانسییەتدا بدۆزرێتەوە. بۆ نموونە لە (نامەیەکدا دەربارەی ئازادی) (١٩٦٩) ستایشی نەگونجانی رەهای شاعیرانی سوریالیستی دەکات کە (رەگەزە سیمانتیکییەکانی شۆڕش لەزمانی شاعیرانەدا) دەدۆزنەوە. (11) بنیامین خۆشی بەهۆی تایبەتمەندییە شۆڕشگێڕیو رۆمانتیکیو ئازادیخوازی سوریالیزمەوە، لەلایەنگرە پڕ لەجۆشو خرۆشەکانیان بوو. لەوتارێکدا سەبارەت بەسوریالیزمی فەرەنسی (١٩٢٩) بەم جۆرەی نووسی: (ئەورووپا لەپاش باکۆنین، تێگەیشتنێکی رادیکاڵانەی بۆ ئازادی نەبووە. سوریالیستەکان ئەم چەمکە رایدکاڵەیان هەڵبژاردووە... ئامانجی سوریالیزم لەسەرجەمی کتێبو هەنگاوەکانیاندا، بەدەستهێنانی هێزی سۆزو جۆشی پێویستە لەپێناوی شۆڕشدا.) (12)

مارکیوز لەکتێبی (دژی شۆڕشو شۆڕش)دا (١٩٧٢) جەخت لەسەرئەوە دەکاتەوە کە لە گرنگترین بەرهەمە هونەرییو ئەدەبی سەدەی نۆزدەهەمدا (مۆرکێکی تەواو دژە بۆرژوایی باڵا دەست بووە. فەرهەنگی باڵا، فەرهەنگی مادییانەی بۆرژوازی بەرەو دادگا کێش دەکاتو نەفی دەکاتو لێی دووردەکەوێتەوە. لەڕاستیدا فەرهەنگی باڵا خۆی لەدنیای کاڵاییو لەتوندوتیژی پیشەسازیو بازرگانی بۆرژواییو، لەخواروخێچی پەیوەندییە مرۆییەکانو، لەماتریالیزمی سەرمایەداریو لەعەقڵئامێری جیادەکاتەوە. {چونکە} دنیای ستاتیکیانە ئەو واقیعە رەتدەکاتەوە.) خاڵێکی گرنگ ئەوەیە کە بەپێی مارکیوز لە(مرۆڤی تاك رەهەند)دا رەسەنترینو رەهاترینو بێئەملاوئەولاترین درەوشانەوەی ئێرۆسێکی کامڵ لەناو بەرهەمە ئەدەبییە مەزنەکاندا، ئەو بەرهەمانەن (کە لەواقیعی وەستاو بڵندتردەبن، واقیعێك کە ئێرۆس نەفی دەکاتو بێبایەخی دەکات.) ئەم بەرهەمانە "پەیوەندییە هەڵبژێردراوەکانی گۆتە" و"گوڵەکانی شەڕ" ی بۆدلێر دەگرێتەوە، ئەو دوو کتێبەی کە لەتێڕامانە ستاتیکیو فەلسەفییەکانی بنیامیندا رۆڵێکی سەرەکیان هەیە(یەکەمین کتێبیان لەدەیەی ١٩٢٠و دووەمیشیان لەدەیەی ١٩٣٠دا. (13)

لە کتێبی مرۆڤی تاك رەهەندا جێگایەکی زۆر تایبەت بۆ بۆچونەکانی بنیامین تەرخان کراوە وەك ئەوەی کە دەیزانن ئەم کتێبە لەپاڵ پیشاندانی رێزێکی بەرچاوو کاریگەر بۆ بنیامین،

بەم جۆرە کۆتایی پێ‌دێت (تیۆرەی رەخنەگرانە.. لەکاتێکدا کە هیچ مژدەیەك نابەخشێت‌و هیچ سەرکەوتنێك نیشان نادات‌و بەنێگەتیڤی دەمێنێتەوە. بەم جۆرە ئەم تیۆرە دەخوازێت بۆ ئەوانە وەفادار بمێنێتەوە کە بەبێ هیچ ئومێدێك ژیانی خۆیان بەختکردو {بەخت} دەکەن، لەپێناوی نەفیکردنی مەزندا. ڤالتەر بنیامین لەسەرەتای فاشیزمدا نووسی: (ئومێد تەنها لەبەر ئەوکەسانە بەئێمە دراوە کەبێ‌ئومێد بوون(14). لەناوەڕۆکی وتارێکی بنیامین لەساڵی (١٩٢٢)دا کە لەبارەی پەیوەندی‌یە هەڵبژێردراوەکانی گۆتەوە نوسرابوو، ئەو برگەیە واتایەکی قووڵی ئایینی هەبوو، لەکاتێکدا مارکیۆز (بەگێڕانەوەی غەیرە ئایینیانەی تایبەت بەخۆی لەبنیامین) راشکاوانە گوزارشتێکی سیاسیان لێ‌دەستەبەر دەکات.

توخمێکی هاویەش‌و خەسڵەتێکی تایبەتی لەفۆرسی بیرکردنەوەی مارکیۆزو بنیامیندا هەیە، کە دەتوانرێت بەئومێدی بێچارە یاخود شۆڕشگێڕی‌یەکی بەدبینانە ناوبنرێت. چ مارکیۆزو چ بنیامین لەگەڵ ئەو بۆچوونەدا نین کە (رەوتی سورشتی)یانەی مێژوو، گەشەسەندنی هێزەکانی بەرهەمهێنان یاخود پێشکەوتنی حەتمیانەی کۆمەڵایەتی، دەبێتە هۆی دەرکەوتنی کۆمەڵگایەکی عەقڵانی‌و ئازاد. لەڕوانگەی ئەوانەوە وەکو ئەوەی کە بنیامین لەتێڕامانێکی سەسورهێنەرەوە گەلاڵەی کردووە، شۆڕشگێڕان دەبێت ئەوە فێرین کە (مێژوو بدەن بەزەویدا). سەرکەوتنی مرۆڤایەتی بەهیچ شێوەیەك پێشتر دانەنراوەو حەتمی نی‌یە. بەوشێوەیەی کە بنیامین لە "فریشتەی مێژوو" دا باسی‌کردووە. سەبارەت بەچەمکی (پێشکەوتن) تەنها (چەردەیەك لەوێرانی) لێدەکەوێتەوە. شۆڕش (مەلەکردن نی‌یە بەئاڕاستەی رووبار)، بەڵکو شەڕێکی بێڕەحمانەیە لەگەڵ هێزە کوێرەکانی مێژوودا، شەڕێکی سەختو درێژخایەنە کەناتوانرێت ئەنجامەکەی پێشبینی‌بکرێت. مارکیۆز لەو پاشکۆیەی کە بۆ چاپی نوێی "هەژدەیەمی برۆمیرای مارکس نووسیویەتی، وەها دەڵێت: (ئاگایی لەشکستو تەنانەت لەبێچارەیی، مولکی راستی تیۆرەو ئومێدەکانیەتی.) ئەو جۆرە رەشبینی‌یە ئیرادەگەری‌یە، نەك هەر تەنها دابڕانێکی زۆری لەگەڵ بێ‌کرداریدا هەیە (وەك خۆبەدەستەوەدان‌و خۆشبینی‌یەکەی کاوتسکی) بەڵکو بەپێچەوانەوە نائومێدانەترین بانگهێشتکردنە بۆ کارکردن‌و، هەنگاونان‌و رووبەڕووبوونەوە.)(15)

لەم بارەیەوە (مرۆڤی تاك رەهەند) قەرزارێکی زۆری تێزەکانی ساڵی ١٩٤٠ی بنیامینە. ئێستا دەکرێت ئەوە تێبگەین کە بۆچی مارکیۆز لەهەمان ساڵی بڵاوبونەوەی کتێبی (مرۆڤی تاك رەهەند)دا، ئەو پێداویستی‌یەی دی کەوتارێك لەبارەی بنیامینەوە بنوسێت، ئەم وتارە کە زۆر ناسراو نی‌یە، پاشکۆیەك بۆ ئەو پێنج وتارەی بنیامین کە نوسینەکانی لەمەڕ (فەلسەفەی مێژوو، رەخەیەك لەسەر زەبروزەنگ ١٩٢١)ەوەن. ئەم وتارەی مارکیۆز هەرچەندە ئەوەندە سیستماتیکی نی‌یە، بەڵام بەئاشکرا خاڵە هاویەشەکان‌و جیاوازەکانی نێوان مارکیۆزو بنیامین دەخاتەڕوو. لەپێشەوەی هەموو مەسەلەکانەوە، چ مارکیۆزو چ بنیامین لایەنگری نەفیکردنەوەی رەهای ئەو سیستمە کۆمەڵایەتی‌یەن کە هەیە. هەردووکیان خوازیاری شۆڕشێکی رادیکاڵ‌و پێداویستی گروپە چەوساوەکان بەسوودوەرگرتن لەتوندوتیژی لەدژی چەوسێنەرانیان) بەڕەسمی دەناسن. مارکیۆز لەمیانەی شرۆڤەکردنی وتارێکی بنیامیندا لەبارەی توندوتیژی‌یەوە (١٩٢١) جەخت لەسەر ئەوە دەکاتەوە:

(توندوتیژی لە دیدگای بنیامینەوە، توندوتیژی‌یەك نی‌یە كە ئەوانەی خوارەوە بەسەر ئەوانەی سەرەوەدا زاڵ بکەن،... توندوتیژی‌یەك كە بنیامین رەخنەی دەكات توندوتیژی‌یەكە لە "بوون"ەوە (Bestehenden) هاتووەو، لەخودی "بوون"ەوە رەوایەتی‌و راستی‌و مافە تایبەتی‌یەكەی بەدەست دێنێت.. بنیامین لەوە جیددی تریوو كە بەهۆی بەڵێنێكی شاراوە لەوشەی (ئاشتی)دا، باوەڕ بەئاشتی بهێنێت.. (16) هەردووكیان دژی هەموو جۆرە ئاشت نەبوونەوەیەكی ریفۆرمیستی‌و قۆناغباوەڕی‌یەكن‌و، شۆڕش بەتەقینەوەیەك دەزانن لە رەوتی مێژوودا، بەسەرەتایەكی سەرتاسەری نوێی دەزانن نەك نوسخەیەكی باشتر لەو سیستەمەی كە هەیەو ئەنجامێكی كەڵكەبووی گۆڕانێكی هێدی هێدی. سەیر لەوەدایە كە، ئەو ئایینده نوێیە، داوای گەڕانەوە دەكات بۆ رابوردوویەكی بەر لەسەرمایەداری، بەهەمان ئەو شێوەیەی كەبنیامین لەژێر وێنە بەناوبانگەكەیدا نووسیویەتی، ئاكام (خۆڕاپسكاندنی دیالەكتیكیانەی پڵنگە بەرەو رابوردوو)، ماركیۆز نەك تەنها لەو وتارەی كەسەبارەت بەبنیامین نوسیویەتی، بەڵكو لەبەرهەمەكانی ساڵانی "١٩٦٠و ١٩٧٠" شدا لەبارەی ئەم مەسەلانەوە، لەگەڵ بنیامیندا هاوبیرن.

لەگەڵ ئەوەشدا، بێ دوو دڵی جیاوازی دیاریكراویان لەنێوانیاندا هەیە سەبارەت بەتێگەیشتنیان لەشۆڕش. ماركیۆز لەشرۆڤەكانی خۆیدا برگەی سەرەكی ئانارشیستیانەی یەكەمین بەرهەمەكانی بنیامین لەبەرچاوناگرێت‌و، هەوڵدەدات كە ناوەڕۆكی ئایینی لەڕێگەی شرۆڤەیەكی تەواو غەیرە ئایینی‌و غەیرە خواپەرستی‌یەوە لەمسیانیزمی بنیامین بەتاڵ بكاتەوە. لەم بارەیەوە {مارلیۆز} دەڵێت: (لە رەخنەگرتنی بنیامین لەتوندوتیژی، ئەو خاڵە دیارە كە مسیانیزم شێوەیەكی درەوشاوەی حەقیقەتی مێژووە. ئازادی مرۆڤایەتی تەنها بەشێوەی نەفیكرنەوەیەكی رادیكاڵانەی ئەوەی كە هەیە، جێگەی تێگەیشتنە، چونكە تەنانەت چاكەش لەژێر باری دەسەڵاتی (بوون)دا بێ‌توانا دەبێت‌و دەبێتە هاوبەشی تاوان. مسیانیزمی بنیامین هیچ روویەكی هاوبەشی لەگەڵ ئایین پەرستیانەی باودانی‌یە، لەڕوانگەی ئەوەوە {بنیامین} گوناهو، بێ گوناه ووتەزای كۆمەڵایەتین.) (17)

رەنگە ئەم لێكدانەوەیە تاڕادەیەك دروست بێت، بەڵام یەك لایەنەیە. هەرچەندە رەهەندی قووڵی خوداناسیانەی بنیامین كەریشەی لەنەریتی جوولەكەدایە، پەیوەندی بەوتەزا كۆمەڵایەتی‌یەكانەوە هەیە، بەڵام ناكرێت ئەم رەهەندە تەنها بۆ ئاستە نزمبكرێتەوە. بیروبۆچونەكانی ماركیۆز هەم نیشاندەری دیدگای خودی ئەوەو، هەم نیشاندەری مسیانیزمی بنیامین. لەكاتێكدا ماركیۆز لەساڵی (١٩٤١)داو لەكتێبی (عەقڵ‌و شۆڕش)دا هێشتا قسە لەسەر نەفیكردنەوەیەكی (بنەڕەتیانەی) ئەو واقیعیەتە دەكات كە هەیەو، لەساڵی (١٩٦٤)دا بەتەواوەتی پەنا دەباتە بەر نەفیكردنەوەیەكی تەواو.

یەكێك لەڕوانگە هاوبەشەكانی تری بنیامین‌و ماركیۆز، ئەوەیە كە هەردووكیان رەخنە نەك تەنها لەسەرمایەداری دەگرن، بەڵكو بەشێوەیەكی گشتی رەخنە لەسەرجەم كۆمەڵگا پیشەسازیەكان‌و تەكنەلۆژیای بەشتكەرو بەرهەمهێنانێك دەگرن كە دەبێتە هۆی لەخۆنامۆبوون‌و، تێكدانی سروشت‌و ئەفسانەی پێشكەوتنیش. هەروەك چۆن ماركیۆز لەوتارێكی خۆیدا سەبارەت بە بنیامین نووسیویەتی: (بنیامین لەبەرامبەر چەمكی نەفرەتاویانەی پێشكەوتنی بەرهەمهێنان كە سروشت

بەپاداشتێکی مفت و خۆڕایی) دەزانێت کە دەبێت سوودی لێوەربگرێت، تیۆرەی کاری کۆمەڵایەتی "فۆریە" دەکاتە سەرمەشقی خۆی کە (لەجیاتی باوەڕبوونی بەسوودوەرگرتن لەسروشت، دەتوانێت ئەو بونەوەرانەی بداتێ کە بەزەبر لەرەحمی ئەودا شاراوەیە.) سروشتێکی ئازادو رزگاربوو شایستەی ئەو مرۆڤە ئازادەیە کە لەزەبروزەنگی ستەمکارانە رزگاری بووە. (18)

ئەم بابەتە یەکێك بوو لەبەڵگەکانیان بۆ رەخنەیەکی توند لەیەکێتی شۆرەوی، کە پێیان وابوو نەیتوانی {واتە شۆرەوی} لەبەرامبەر کۆمەڵگەی پیشەسازی رۆژئاوادا بە بەرهەمباوەڕیو بەشتکردنە تەکنەلۆژییەکەی، بەدیلێکی واقیعی بخاتەڕوو.

لەلایەکی ترەوە، چ بنیامینو چ مارکیۆزیش هەریەکەیان بەشێوەی تایبەتی خۆی، بنیامین لەبواری فەرهەنگیدا لەگەڵ سینەماداو، مارکیۆزیش لەبواری ئابووریدا لەگەڵ ئۆتوماتیکدا دانیان بەتوانای ئازادبەخشانەی تەکنەلۆژیای مۆدێرندا دەنا. هەردوکیان هەوڵیان دەدا بۆئەوەی ماهیەتی ناتەبای پێشکەوتنی ماددیو تەکنەلۆژای پیشەسازی تێبگەن، ئەگەرچی دەرەنجامەکانیشیان وەك یەك نییە {مارکیۆز وەك ئادۆرنۆو هۆرکهایمەرو زێدەتر لەبنیامین رەخنەی لەبەرهەمهێنانی زۆرو بۆری هونەرىو کارە فەرهەنگییەکان دەگرت}.

لەدوا بەرهەمی مارکیۆز بەناوی (رەهەندی جوانناسی ـ البعد الجمالي) (١٩٧٧)دا، جارێکیتر ناوی بنیامین دەهێنرێتەوەو دیسانەوە بابەتە سەرەکییەکەی نووسینەکەی ساڵی ١٩٢٢ی مارکیۆز، واتە ناکۆکییەکانی هونەر (ئەدەبیات) لەگەڵ واقیعی وەستاودا دەبێتە ناوەڕۆکی سەرەکی ئەم بەرهەمە. هەرچەندە لەساڵی ١٩٧٧دا چیدی نوسەرانی رۆمانسیەتی نوێ لە ئارادان، نەوەکو نووسەرانی کلاسیکی، {بەلام} مارکیۆز (بەدناوکردنی رۆمانتیکییەت وەك رەوەندێکی تەواو کۆنەپەرستانە، بەیەکێك لەهەڵە تەواوەکانی دۆگماتیزمی ستاتیکای مارکسی دەزانێت. مارکیۆز لە"رەهەندی جوانناسی"دا (نەفس) لەبەرامبەر بە عەقڵ دادەنێت، بەڵکو ئەوە نیشان دەدات کە هونەر بەرپرسی ئازادی هەستەکانو، خەیاڵو عەقڵە، دیارە عەقڵێکی دابراو لەعەقڵباوەڕی بونیادە باڵا دەستەکان. رەهەندی ستاتیکی بەپەیوەندی لەگەڵ ئیرۆسدا، لەبەرامبەر سەرکوتکردنی غەریزەکاندا، لەدژی جیهانی وەستاوو بەڵێنی ئازادی دەوەستێتەوەو، رۆڵێکی شۆڕشگێڕانە دەداتە پاراستنی یادگاریو بیرەوەری رابوردوو، چونکە (یۆتۆپیای رەسەن رەگو ریشەی لەیادەوەریدایە).

ئەو دوو ئاماژەیەی کە لەم کتێبەدا بنیامین دراوە، نەك هەر تەنها لێکچوونی ئەندێشەکانی مارکیۆز لەگەڵ رەهەندە رۆمانتیکییەکەی هاوڕێکەی ئاشکرا دەکات، بەڵکو تاڕادەیەك وەك دیاریکراوە کە مارکیۆز سەبارەت بەبیروبۆچوونەکانی بنیامین هەیەتی لەبارەی پەیوەندی هونەر بەسیاسەتەوە. وەك بڵێی لەرواڵەتدا مارکیۆز خۆی لە(بنیامینی بۆدلێری) بەنزیکتر دەزانێت وەك لە (بنیامینی برێختی). لەگەڵ ئەوەی کە مارکیۆز یەکێکە لەلایەنگرانی شیعرەکانی برێخت (تەنانەت یەکێك لەشیعرەکانی بەتەواوەتی لە "مرۆڤی تاك رەهەند" دا وەرگرتووە)، بەلام پێی لەسەر ئەو باوەڕەش دادەگرت کە (رەنگە شیعرەکانی بۆ دلێرو رامبۆ لەچاو نومایشە دیالەکتیکییەکانی برێختدا توانایەکی شۆڕشگێڕانەی زۆرترینیان هەبێت). مارکیۆز لە (برێختی) ترین بەرهەمی بنیامیندا بەناوی (دانەر لەجێگەی داهێنەر) رەخنە لە (بەیەککردنی چۆنێتی ئەدەبیاتو سیاسەت لەژێر دەسەڵاتی هونەردا) دەگرێت لەلایەکی تریشەوە بەشێوەیەکی بەرچاو ستایشی وتارەکانی بنیامین

دەکات لەبارەی شاعیرە نەفرەتلێکراوەکانەوە: (بەپێیەی مەوداو جودایی لەمومارەسەکە بەهای ئازادییەخشانەی هونەرەکە پێک دێنێت، بەتایبەتی لەناو ئەو بەرهەمانەدا بەرجەستەیە، بنیامین بەدوای ئەم بابەتەدا چووە لەنوسینەکانی (ئەدگار ئالن پو)و(بودلێر)و(پروست)و(ڤالری)دا. پاشان مارکیوز درێژە بەم راڤەیەی دەدات: (رەخنەی "شاراوەی" ئەم جۆرە ئەدەبیاتە ئیرۆتیکییە (شەهوانی) لەرزگارکردنی هێزە ئیرۆتیک - تێکدەرەکاندا حەشاردراوە کە جیهانی ئاسایی پەیوەندیو رەفتارەکان لەیەک هەڵدەوەشێنێت.) ئەم هێزانە لەماهیەتی خۆیاندا دژە کۆمەڵایەتینو، زەبرێکیان هەیە ژێربەژێر لەبەرامبەر سیستمی کۆمەڵایەتی.) (19)

چ مارکیوزو چ بنیامین، شۆڕشگێڕێکی رۆمانسی بوون: رۆمانسیەت بەو مانایەی کە حەسرەت بۆ فەرهەنگی پێش سەرمایەداری دەخۆن، حەسرەتێك کە لە هونەری مەزنی (یادەوەری رابوردوودا) پارێزراوەو، شۆڕشگێڕێتی لەبەرئەوەی ئەم حەسرەتەیان بۆ رابردوو گۆڕی بەنەفیکردنەوەیەکی رادیکالانەی ئەو سیستەمەی کە هەیەو هەروەها (ئومێدی بێچارەیی) لەپێناو کۆمەڵگایەکی نوێو رادیکاڵ لەداهاتوودا.

ئەم شۆڕشگێڕییە رۆمانتیکییە لەگەڵ مارکسیزمی ئەواندا ناکۆك نییە، چونکە لە بۆچوونەکانی مارکسو ئەنگلزیشدا رەهەندی رۆمانتیکی هەیە، ئەوەندە بەسە تێڕوانینیان سەبارەت بە "کارلایل" و "بالزاك و ئەوانیتر بزانین. دیارە لەسەدەی بیستەمدا مرۆڤی تاك رەهەندی مارکیوز ئەو رەهەندە رۆمانسییەی سەرکوتکردووە. دواجار ئاراستە وەرگرتنی شۆڕشگێڕانەی رۆمانتیکی بەخەباتی چینایەتی نامۆنییە، چونکە چ بنیامینو چ مارکیوز هەریەکەیان بەشێوەی تایبەتی خۆی، سەرجەمی بەرهەمو ژیانو ئەندێشەکانیان لەدوا ئاکامدا بەخەباتی زەحمەتکێشان زانیوە بۆ رزگارکردنیان لەکۆتو پێوەند. *

تێبینی/

١) سەرچاوەی ئەم نوسینەی (میشیل لووی) لەکتێبی (درباره تغییر جهان)(مقالاتی درباره ء فلسفه سیاسی (از کارل مارکس تا والتر بنیامین) وەرگێراوە، انتشارات روشنگیران ومطالعات زنان ١٣٧٦. ل٢٠٢-٢١٨.

٢) هەموو ئەو وشانەی لەکەوانەیەکی بەم شێوەدا { } نوسراون، لەوەرگێڕی کوردییەوەیەو، تەنها بۆ ئاسانکردنی مانای رستەکان بەکارهاتوون.

پەراوێزەکان

1- Gershon Scholem, on Jews and Judaism in Crisis (New York: Schocken,1979), p. 287.

دیسانەوە شولم ناوی بلوخو ئادۆرنۆدێنێت.

- مارکێوز بەئاماژەکردن بەئی.تی.ئەی هوفمان، ئەوە نیشان دەدات کە لەبەرهەمەکانی ئەودا (ناتوانرێت پردێك ٢ بەسەر قوڵایی نێوان سۆزو ئارەزوو جیهانی واقیعدا بکێشرێت)؛ بنیامین لەوتارەکەیدا سەبارەت بە"پەیوەندییە هەڵبژاردەکانی گۆتە" کە ئەمەش هەر لەساڵی ١٩٢٢دا نوسراوە، بەتەواوی هەمان ئەو تێڕوانینە پیشان دەدات: لەداستاندا، لەنێوان سۆزو ئارەزووی (ژیانی بورژوازی)دا قوڵییەك هەیە، بە(پەیوەندییە هەڵبژاردەکانی گۆتە) برهەمی بنیامین لەساڵی ١٩٢٢ لە

– ILLuminationen (Fnank furt a.m: Suhrkamp (1969) P131 بگەڕێتەوە

3- Herbert Marcuse. Der deutsche Kustlerroman, 1922, in Schriften, VoL1 (Froank furt a, m. : Suhrkamp, 1978), pp43-49,86,117-19,133-43.

4- بنیامین لەوتارێکی کورتیندا کە لەبارەی دامەزراوەی لێکۆڵینەوە کۆمەڵایەتی یەکانی فرانکفۆرت نووسی بووی (١٩٣٨) ناوی مارکیۆز دێنێت، هەروەها لەنامەیەکدا بۆ هورکهایمەر بەچاوێکی هاریکاری سەیری رۆڵی مارکیۆز دەکات لەبارەی کاری هاویەش لەسەر کتێبی Autorltat undfamillie بەوتارێکی والتەر بنیامیندا بچۆرەوە بەناوی "Ein deutsches) in Gesammelte"Institut Freier Forchung Schriften,vol.3 (Frank Furt a.m. Suhrkamp 1972)

5- Herbert Marcuse, “preface’ in Reason and Revo Lution (Boston: Beacon press, 1960), P.X.

6- Herbert, Marcuse, “Uber den Affirmativen Charakter der Kultur,” 1937, In Kultur und Gesellschaft, vol. 1 (frak furt a.m. Suhrkamp, 1970), pp. 67-68, 78-81, 89-94.

بنیامین ئەو وتارەی خوێندبۆوەو لەتوێژینەوەیەکداکە لەمەڕ دامەزراوەی فرانکفۆرت (١٩٣٨) بەئاماژەکردن بەمارکیۆز، جەخت لەسەر رووبەڕوکردنەوەی چەمکی رەخنەگرانە دەکاتەوە لەبەرامبەر چەمکی (ئیجابی). بەبیروڕای ئەوو مارکیۆزیش ئەو (فەرهەنگی رەخنەگرانەیە) وەك فەلسەفەی عەقڵ باوەڕو فەلسەفەی هیگڵ نی‌یە: ئەو فەرهەنگە لەڕەگەزە فەرهەنگی‌یەکان پێکهاتووە کە(لەگەڵ بناغەی سەرەتایی‌و دیدگاکانیاندا پەیوەندیدارەو، نکوڵی لەپەیوەندیشیان ناکەن لەگەڵ ئینسانیەتی داهاتوو خودی ئینسانی‌یەتدا.) بنیامین بەپێچەوانەی مارکیۆزەوە، لەجیاتی وەدەرنانی نەریتی فەرهەنگی بورژوایی وەك (ئایدیولوژیا)، (پێویستی رزگارکردنی میراتی فەرهەنگی)و کامڵبونی تێڕوانینە رەخنەگرەکان لەگەڵ ئامانجی (جێگاکردنەوە لەپێناو نەریتی رەسەندا) جێگای سەرنجدانە. بەوتاری بنیامیندا بچۆرەوە:

“Ein deutches Institut, “ PP 525 – 526.

7- HerbertMarcuse, “Epilogue,” in Reason and Revolution ((Atlantic HighLands, N.J: Humanities presss,1954P reprint, 1991), p433.

کەواتە ڕۆی تێدەچێت کە مارکیۆزیش لەژێر کاریگەریی رەخنەگرانەی ئادۆرنۆو هورکهایمەردابێت لەنەریتی عەقڵباوەڕی لە (١٩٤٧) Dialektik der Aufklarung بەڵام بێگومان ئەو بەشێوەی تایبەتی خۆی بەو ئەنجامگیری‌یە گەیشتووە.

8- Herbert, Marcuse, Eros and Civilization, 1955 (London: Sphere Books, 1969),pp132,154.

9- Marcuse, Eros and Civilization, p. 186.

10- Herbert, Marcuse, one Dimensional Man (London: Routledge, 1964), p.60

11- Herbert, Marcuse, AnEssay on Liberation (Boston: Beacon press ,1969), p,33.

12- Walter Benjamin,"Der SurreaLismus," (1929) in Angelus Novus (Frank furt, a.m. Suhr Kamp, 1966),p212.

13-- Herbert, Marcuse, Counterrevolution and Revolt (Boston: Beacon press,1972),p86:marcuse,one Dimen sional Man, p.77.

14- Marcuse, one Dimensional Man, p. 257.

15- Walter, Benjamin, “Theses on The philosophy of History, “1940, in Illu minations (London: J Cape, 1970), pp259 - 261

سەبارەت بە (رەش بینی) مارکیۆز سەیری وتارە سەرنج راکێشەکەی "راسل ژاکۆبی" بکە بەناوی (Reversal and Lost Meanings) لە Critical Interruptions, New Left Perspectives on - Herbert, Marcuse, ed. Paul Breines (New York: Herder and Herder 1970) p70-73.

16- - Herbert, Marcuse, “Nach Woyt” in Walter Benjamin, ZurKritik der Gewalt (Frank fust a.M; Suhr Kap,1965),pp.99-100- 101

17- Ibid. , pp. 101

18- Ibid., pp. 104

19- - Herbert, Marcuse, The AesThetic Dimension (Boston: Beacon press, 1979), pp. Xiij- Xiij, 6-9, 11, 19 – 20, 33,73.

*Messianism لەنەریتی قەومی یەهود تانەمرۆ، فریادرەسێك بەناوی مەسیحیەوە لەئارادایە کە بڕیارە قەومی بنی ئیسرائیل لەچنگی دوژمنەکانی رزگاریکات و بەنوێکردنەوەی کۆمەڵگەو سەقامگیری فریشتە خوداوەند هاریکاری دەگەیەنێت. نوێنەرە جۆراوجۆرەکالنی ئەم فریادرەسە دەتوانرێت لە نوسینە یەکەمینییەکانی جوولەکەو مەسیحیەتدا بدۆزرێتەوە، ئەم دەورە لەسەرشانی عیسی ناسرییە. بەپێی ئەم ئومێدو ئارەزووە واتە ئومێد بە قۆناغێکی نوێ و کامڵ، بزوتنەوەیەك شێوەی گرت کەناوی بزوتنەوەی میسانیستی هەبوو. ئەم باوەڕە لەسەر بنچینەی نەریتی جوولەکەو، لەدەرکەوتنی مەسیحدا دیسانەوە سەردەردەکاتەوە. لەم کۆمەڵەدا لایەنە جیاوازەکانی مسیانیزم جێگای لێکۆڵینەوەیە.

*رزگاری رەها (Redemption) باوەڕی ئایینییە لەمەسیحییەتدا، کەپێی وایە، مرۆڤ دەتوانێت لەگوناهەکانی رزگاری بێت و بەر رەحمەت و گەورەیی خودا بکەون. لەراستیدا ئەم زاراوەیە بەکڕینی ئازادانەی کۆیلە دەوترا.

*Eros and Freya بەپێی ئەفسانە یۆنانییەکان، ئیرۆس، کوڕی ئەفرودیت، عەشقی شەهوانی لەخودایان و مرۆڤەکان جوولاو فریاش خوایەکی بەرجەستەبوونی عەشق و جوانییە.

** مەکارتیزم: لەدەیەی پەنجاکاندا لیژنەیەکی لێکۆڵینەوە لەبارەی چالاکییە دژە ئەمریکاییەکان بەرێبەری سیناتۆر "مەکارتی" چەند لێکۆڵینەوەیەکی سەبارەت بەنفوزی کۆمۆنیستەکان کرد لە دەزگا دەوڵەتییەکان، لەو قۆناغەدا کە تاڕادەیەك هاوکات بوو لەگەڵ سەرەتای هەڵگیرسانی جەنگی سارددا ئازادییە مەدەنی و دیموکراتییەکان کە مبۆوەو بێگوناهێکی زۆر دەستگیرکران و خرانە ژێر چاودێرییەکی توندوتیژەوە.

* ئەم وتارە بۆ یەکەمین جار بەناوی (مارکیۆزو بنیامین: دووڕەهەندی رۆمانسی) لەگۆڤاری "Telos (هاوینی ١٩٨٠)، ل ٢٥ ـ ٣٢، بڵاوکراوەتەوە.

# ڕەخنەو توێژینەوە

- وەرگرتن و مێژووی ئەدەبی



- تیۆرەو مێژووی وەرگێڕان



- کەلتووری گریک لەقۆناغی کلاسیکدا

- جاڕی گەردوونیی مافی مرۆڤ

# وەرگرتن و مێژووی ئەدەبی

■ كیبیدی فارگا

• و: ئەحمەد موفتی

ئەدەب یان باشتر بڵێین ئەو دەقانەی بەدەقە ئەدەبییەكان ناودەبرێن تائێستاش لەچوارچێوەیەكی توندوتۆڵ دا بەشێوازێكی دیاریكراو و دیاریكەر ڕەوانەی پەیامەوەرگر دەكرێن. ئەو چوارچێوەیەش ئەو مێژووە ئەدەبییەیە كە زیاتر لە سەدەیەكە لەڕێگەی كتێبە كورتكراوەكانی خوێندن و فێركردنەوە دانراون. بەو پێیەی تیۆری ئەدەبی لەئەركی دەقەكان و مەرجە كۆمەڵایەتییەكانی ئەو ئەركە دەكۆڵێتەوە، نابێت كێشەی مێژووی ئەدەبی فەرامۆش بكات، بەڵكو بەپێچەوانەوە بۆچوونی ڕەخنەگرانە، لەسەر مێژووی ئەدەبی بەوپێیەی خۆی وەرگرتنی ئەدەب و لێكدانەوەی لەڕێگەی ئەگەرەكانی و شیكردنەوەی ئەگەرەكان، خۆی دەسەپێنێت.

ئەو تیۆرەی كە هەڵگری بۆچوونی هاوزەمان (synchronique) و بێزەمەنییە ناكرێت دەست لە مێژوو هەڵبگرێت و بەسەریدا تێپەڕیبێت. لێرەوە باشتروایە ڕاشكاوانە پرسیاری ئەو شوێنە بكەین كەپێویستە لەچوارچێوەی بیركردنەوەیەكی تیوری سەبارەت بەئەدەب، بدرێت بەمێژووی ئەدەب - مێژووی ئەدەبی هەر لەڕۆمانسیەتەوە تاناوەڕاستی ئەم سەدەیە زانستی ئەدەبی بووە بەزیرەكانە و ئەو توژینگانە بووە كە خوازراوە بۆ ناسینی ئەدەب، بەڵام شوێن و ڕێگای مێژووی ئەدەبی بووە كێشەیەك كە پەیوەندییەكانی نێوان مێژووی گشتی و مێژووی ئەدەبی كەوتە ژێر پرسیارەوە و لێكۆڵینەوەی فۆرمالی كاری ئەدەبی سەركەوتووبوو لەسەر حیسابی پەیوەندییەكانی نێوان بەرهەمەكە و نوسەرەكەی.

- مێژووی گشتی و مێژووی ئەدەبی

١- مێژووی مێژوو

مێژوو چی‌یە؟ ئەو رابردووەی کە (دەیزانین) هەموو رابردوو نی‌یە، بەڵکو لەسەر بنەڕەتی لێ‌هەڵبژاردن بووە، کە بێ‌گومان بەچەند پێوانەیەك بووە - بەوشیاری‌و ناوشیاری، سایکۆلۆژیانەو ئایدیۆلۆژیانە - کەواتە مێژوو بریتی‌یە لەرابردووی هەڵبژێراوو دروست کراو.

لەسەر ئەو بنەڕەتەش پێ‌دەچێت مرۆڤ خۆی بڕیار لەرابردووی تایبەتی خۆی بدات: بەڵام ئایا ئەوە راستە مرۆڤ سەربەست بێت لەدەست نیشانکردنی رابردووی خۆی؟ تۆ بڵێی چەند هێزێکی مێژوویی سەربەخۆ لە گروپە کۆمەڵایەتی‌یەکان‌و یان تاکەکان، نی‌یە، بەواتایەکی‌تر مێژوو چی‌یە ئەگەر بەرهەمی نوسینەوەی مێژوویی (هیستۆگرافی) نەبێت؟ ئەقڵە بەگومانەکان بەبەڵێ وەڵامی ئەو پرسیارە دەدەنەوە (واتە مێژوو بەرهەمی هسیتۆگرافی‌یە "و.")، بەڵام هەموو ئەو ئەقڵانەی مێژوو بەلایانەوە بەدی هێنانی پرۆژەیەکەو مانایەك دەدۆزێتەوە بەنەفی وەڵام دەدەنەوە، ئەوانیش زۆرن لەقدیس ئۆگستین تابوسویە، لەهیگڵ و مارکسەوە بۆ ئەشپنگلەر و تۆینبی. لێرەوە رووبەڕووبونەوەی (لێرەدا دەستەواژەکانی درای Dray بەکاردەهێنین) نێوان فەلسەفەی "رەخنەگرانەی" مێژوو یان "فۆرماڵی"یانەو فەلسەفەی گشتگیری مێژوویان تیۆریانە، دروست دەبێت. لایەنگرانی هەڵوێستی دووەم شێوازێك (شکڵێك) پێشکەش دەکەن کە بەهۆیەوە مانای مێژوو روون دەکرێتەوە، کەواتە یان مێژوو بزوتنەوەیەکی نوسینەوەیە (Lineaire) (وەك بیرۆکەی پەرەسەندن) یان بزوتنەوەیەکی بازنەیی‌یە (بیرۆکەی مێژوو خۆی دووبارە دەکاتەوە) یان دژی ئەوە ئەبێت (بیرۆکەی دیالەکتیکی مێژوو). ئەو ئەگەرانە (فرضیات) لەمێژوودا بەشێوەی بەیاننامە بەناوبانگەکان‌و گفتوگۆ مەزنەکان دەبینرێن، لەم بارەیەوە بڕوانە "پێشەکی کرومویل"[3] یان بڕوانە "ناکۆکی نێوان کۆنەکان‌و تازەگەرەکان" - هەر لەو ئاستەدا لە کتێبە کورتکراوەکانی (Manuel)ی خوێندن دا دەبینرێن کە بەشێوازێکی لەخۆگرتوانە (چمنی) لەزمانە خواستراوەکەیدا دەستەواژەی وەك (پێشڕەو - رائد) یان (دارمان - انحگاگ) و "کاردانەوە - ردفعل" بەکاردەهێنرێت یان کاتێك لەسەر کلاسیزم‌و رۆمانسیەت ی ئەمر دەدوێت، "بڕوانە (چەمك - ماوە" _ concept periode).

بەهەرحاڵ کاتێك مێژووی وشیارو تۆمارکراو سەرهەڵدەدات کە لێکدانەوەی بەرهەمەکانی رابردوو هەڵدەبژێرێت‌و دەلالەتێکی پێ‌دەبەخشرێت. پێ‌ئەچێ بکەوینە دوای گریماس کە دەڵێت "نمونەی لێکدانەوەی بەکارهێنراو بەسڵەمینەوە لەبواری بایۆلۆژیاو ئەوەی کە بەشێوەی ئامانجگەری مەودایی - غائية بعدية - هاتووە a posteriari--finalite لەکاتی ئێستادا زۆر بێ‌لایەن دیارە "گریماس ١٩٧٦: ١٧٨).

هێزی مێژووی سەربەخۆ لەدەسەڵاتمان هەبێت یازن نا، مێژوو بەبەردەوامی بەپێی سەردەمەکەی کە تیایدا روویداوە، نوسراوەو لێرەدا چەند تێبینی‌یەك خۆی دەسەپێنێت.

لەئاستی شکڵی‌و ئیستاتیکی‌دا، تێبینی دەکەین کە مێژوو لەسەردەمی کلاسیکی‌دا، بەرلەهەموو شتێك، وەك رەگەزێك مامەڵەی لەگەڵ کراوە کە مەعریفەیەك دەگەیەنێت. لەبەرامبەری شیعردا دانراوە وەك چۆن راستی Le vrai بەرامبەر راستی چاوەڕوانکراو (الحقيقة المحتملة Le vraisemblable) دادەنرێت، "وەك ئەرستۆ گوتویەتی مێژوو شتەکان وەك خۆی پێشکەش دەکات، شیعریش بەوشێوەیە پێشکەشی دەکات کە پێویستە ببێت". سەرەڕای ئەوەش مێژوونوس پێویستی بەشێوازی ئەدەبی

هەبوو ئەمە لەسەدەیەکدا کەتا ئەوکاتەش بۆچونێکی ئاشکرا لەسەر ئەدەب نەبوو، کە ئەم بۆچوونە تارادەیەك نوێیە، مێژووش وەك ژیرببێژی (eloquence) جگە لە "رەگەزێکی ئەدەبی" زیاتر نەبوو، بەڵام بەپلەیەکی کەمێك نزمتر لەشیعر. مێژوو وەك ژیرببێژی بەزمانی پەخشان نوسراوەتەوە ـ بەڵام وەك شیعر ناوەڕۆکی گێڕانەوە ئامێزی هەیە ـ لەدوا ئاکامیشدا مێژوو شکڵی هەردوو تایبەتمەندی وەرگرتوە ئەوانیش هەبوونی ئامانجێکی دیاریکراوو وەرگرتنی وانەیەکی ئەخلاقی بەشێوەیەکی ناچاری. هەر لەسەرەتای سەدەی هەژدەهەمەوە دوو دیاردەی گرنگ یەکتری دەردەخەن‌و هەریەکەیان ئەویتر تەواودەکات، ئەوانیش دیاردەی چونەوە خۆی (انکماش)ی پلەبەپلەی بواری ئەدەب‌و دیاردەی گەشەکردنی بونیادی مێژوو وەك زانستێکی سەربەخۆ.

تێبینی دەکرێت بەدرێژایی سەدەکان ئاستی مانا ئایدۆلۆژیەکان کە هیستۆگرافی پێدەنەخشرێت، مێژوو لەسەدەی هەژدەهەمەوە تەنها باس کردن‌و لێکدانەوەی‌ئیرادەی خودایی نییە، بەڵکو لەخزمەتی ئامانجەکانی لێکۆڵەرەوەیەکی ئەخلاقی‌و (پسپۆری دەروونناسی) دایە، لونگلیە دیوفێر سنۆی لەساڵی ١٧١٣ دا نوسیویەتی (توێژینەوە لەسەر مێژوو مانای لێکۆڵینەوەیە لە فاکتەرو بیروڕاکان‌و ئەو ئارەزووانەی کە لە مرۆڤدایە تا لەمرۆڤدا قووڵ ببینەوەو لەکۆتاییدا هەموو ئەو وەهمانە ئاشکرا بکەین کە دەتوانن کاریکەنە سەر رۆح‌و ئەو رووداوە کتوپڕیانەی کاردەکەنە سەردڵ، بەمانایەکی‌تر مێژوو مرۆڤ فێردەکات چۆن خۆی بناسێت لەرێگەی ئەوانی ترەوە) بڕوانە "ئیهرارد پاڵماد" ١٩٦٤ ل٣٠.

بەگوێرەی ئەو پێناسەیە مێژوو لەگەڵ ئەدەبدا (بێگومان ئەدەبی کلاسیکی) جیاوازنییە. هەر لەسەدەی هەژدەهەمەوە تا ئەمڕۆ پێگەکانی هسیتۆگرافی هووشیاریەکی ئایدۆلۆژی پێك هێناوە کە دژی چەمکی (پێشووی) مێژووە.

ئاشکرایە ئەو ((مێژووی ئەدەبی))یەی لەسەدەی نۆزدەهەمدا لەدایك بوو نیشانەکانی سەردەمی لەدایك بوونەکەی هەڵگرتووە. "سەردەمی رۆمانسیەت‌و بڵاوبونەوەی خوێندنی عیلمانی لەقوتابخانە": مێژوویەکی نەتەوەیی‌و فەردییە ـ کە دواتر سیفەتێکی باش بەکلاسیکیەتی فەرەنساو رۆمانسیەتی ئەڵمانیا دەبەخشێت ـ تێیدا پەرستنی پاڵەوان هەیەو چەند نمونەیەك پێشکەش دەکرێت کە دەبنە پێشڕەو بۆ لاوەکان.مێژووی ئەدەبی گرنگی زیاتر بەنوسەرەکان‌و پەیوەندیەکانی نێوان نوسەرو بەرهەمەکانی دەدات زیاتر لەوەی گرنگی بەخودی بەرهەمەکە بدرێت. ئەوەش پابەندە بە خوێندنەوە خوێندنی عیلمانی تایبەت بەچاکەکانی مەدەنیەت، یان گەرشیاو بێت چاکەکانی بۆرژوازیەت، وەك رۆلان پارت دەڵێ، مێژووی ئەدەب لەناوەڕۆکدا بابەتێکی قوتابخانەییەو هەبوونی بەدی نایەت تەنها لەرێگەی فێربوونییەوە (خوێندن) نەبێت "(پارت ١٩٧١ ل١٧٠)

٢- زانستی مێژوو

سەرەتا پرسیارێکی پێویست هەیە ئەویش، ئایا هیچ بنەڕەتێك هەبووە لەتۆمارکردنی مێژوو‌داو لەپشت ئەو هەموو رووداوە مێژووییەوە، یان بەشێوەیەکی تر بڵێین ئایا مێژوو زانستە؟ ئایا مێژوو پشتی بەستووە بەچەند رێسایەکەوە کە هەموو زانستەکان پیادەی دەکەن؟ لەراستیدا مێژوو سودێکی تایبەت بەمیتۆدۆلۆژیا دەگەیەنێت، خوازیارە هەموو رێساکانی لێکۆڵینەوە بەشێوەیەکی گشتی دەست نیشان بکرێت. پێویستە زانست بێت، وەك

چۆن پێویستە لێکۆڵینەوە لەسەر رووداوە دەگمەنەکان بکات بەبێ ئەوەی دووبارە بونەوەی تێدابێت، لەبەرئەوە کارێکی گرانە تەواو بەزانستەوە ببەسترێتەوە (هەمان گیروگرفت سەبارەت بە "زانستی ئەدەب" هەیە). بابەتی زانستی مێژوویی چی دەبێت جگە لەرووداو (evenement)؟ کەواتە ئایا هیچ پێودانگێك هەیە رووداوەکان پۆلێن بکات؟

سەرەڕای ئەمانەش رووداوەکان یەك لەدوای یەك تۆمار دەکرێن و مێژوو دەیەوێت لەیەك کاتدا بەشێوەی گێڕانەوەو هۆییانە (سببی) دەریان بخات. کۆکردنەوەی ئەو دوو شێوازە پرۆژەیەکی ناتەواوە لەگەڵ بیری وەهمیا یەکدەگرنەوە post hoc ergo propter hoc لێکۆڵینەوەی رەخنەیش لەسەریان بەجیاجیا گرفتی زۆر گەورەتر دروست دەکات. چۆن دەبێت مێژوو تەنها زانست بێت کەپشت بەشێوازی گێڕانەوە ببەستێت، لەکاتێکدا هەموو زانستەکان تیایدا رێگای تر ئەگرنەبەر بۆ سەلماندن؟ یان ئایا دەبێت سەلماندنو شیکردنەوەی زانستی بەشێوەی حیکایەت بن؟. میگلیز (١٩٧١ ـ ٢٣) دەڵێت (گوتاری مێژوویی لەکاتی رەتکردنەوەی شێوازی سەلماندن کە زۆربەی گوتارە زانستییەکانی پێدەناسرێتەوە، شوێنی لێکدانی دووفاقیانەی نێوان چەند دەستەواژەیەك دەست نیشان دەکات کە خۆیان دژوارن ـ هەرچەندە خوازیارە ببێتە گوتارێکی راستگۆ ـ لەکاتێکدا پێویست دەکات، لەهەمان کاتدا شێوازی گێڕانەوەی تایبەت بەخەیاڵ Fiction بەکاردەهێنێت هەرچەندە داواکاری مەوزوعیەتە ". مرۆڤ لەوتەلانە رزگاری نابێت کە شارستانیمان پێشنیاری دەکاتو پابەندە بەجیاوازی کردن لەنێوان ئەقڵانیو خەیاڵیدا، لەبەرئەوە مێژوو ناچارە بچێتە ئەو پانتاییەی ناکۆکییەوە، کە بەبۆچوونی پۆڵ ڤاین (٤) (١٩٧١ ـ ١٠) رۆمانێکی راستەقینەیە.

با گرفتەکە لەلایەکی ترەوە باس بکەین، کە ئەویش لایەنی شیکردنەوەی زانستییە کە لەسەر بنەمای چەند یاسایەکی گشتی و چەند مەرجێکی دیاریکراو پێك دێت ـ بەگوێرەی دەستەواژەکانی هەمپل (Hemple) لەنوسینە بەناوبانگەکەیدا "کارێکی دەگمەنە چەند یاسایەکی گشتی لەمێژوودا دابڕێژرێتو مەحاڵە مەرجەکانی دیاریکراوبن" یان ناسراوو دیاریکراوبن. لەو باردودۆخەدا بێهوودەیە گەر بڵێین پەیوەندیەکانی هۆ بەئەنجامەوە بەفیعلی لەمێژوودا هەن.

ماوەی پەنجا ساڵی ئەو کێشانە بەبێ وەڵام دەخرێنەڕوو بۆچونی باڵادەست ئەوەبوو زانستە سروشتیو زانستە مرۆییەکان دووبواری تەواو جیاوازن ـ جیاوازی بابەتەکانی وانەکە جیاوازی میتۆدە بەکارهێنراوەکان دادەڕێژێت. بەڵام لەوکاتەوە بارودۆخەکەدا گۆڕرا، لیڤی شتراوس نوسیویەتی "جیاوازی نێوان زانستە مرۆییەکانو زانستە سروشتییەکان لەسەر بنەڕەتی سەربەخۆبوونی ئەو دووبوارە نییە، بەڵکو لەئەنجامی ئەوەیە ناتوانین کێشەکانی بواری یەکەم چارەسەرێکی زانستییانە بکەین". میتۆدۆلۆژیای زانستییەکەو تۆژینگەکان زۆرن، بەڵام یەك زانست هەیە. لەگەڵ ئەوەشدا بیرۆکەی وردەکاری کردن ی زانستی لەزانستە سروشتییەکاندا، بیرۆکەیەکی تازە پێشنیارکراوە وەك نمونەیەکی ئایدیالی زانستەکان بەشێوەیەکی بەرچاو بێهێزبووە. لەبەرئەوەش کاتێك ئەبینین لەلایەکەوە ئارەزووی خودی (الرغبه الذاتية) هەیە بۆ سۆزو لێکۆڵینەوە لەبابەتەکە ئەوا دارشتنی چەند یاسایەکی دیاریکراو شوێنێکی دەبێت، لەلایەکی ترەوە نزیکی یەك تێبینی دەکرێت لەنێوانیاندا کاتێك "یاسای" زانستی دەست لە سیفەتی یەقینی رەها هەڵناگرێتو لەسەر ئەگەرە ئامارییەکان (احتمالية احصائيه) پێك دێت.

٣- مێژووی ئەدەبی

کاتێك لەگونجاندنی کێشە تیوریە ناوبراوەکان سەبارەت بەمێژووی ئەدەبی دەکۆڵینەوە و دەست دەکەین بەگەیاندنی، جۆرێك لە لەق بوون بەدی دەکەین: بەراوردکردن و پێوانەکان و ناکۆکییەکان بوارێکی زیاتر دەدات بۆ دۆزینەوەی تایبەتمەندیەکانی بوارەکەمان بەشێوەیەکی باشتر.

چەمکەکانی - رووداو (الحدث)، گێڕانەوە کەم بایەخ تر دەبێت لەمێژووی ئەدەبیدا وەك لەمێژووی گشتیدایە، لەرووداوەکان نمایش کارن (پیلانی فیدەر) "لە شانۆگەری (جەنگی هێرنانی) راسین دا، شێوازی گێڕانەوە نایەتە ناوەوە تەنها لەچەند ئاستێکی دیاریکراودا نەبێت کە ئەویش بەشێوەیەکی زۆر سادەیە (بۆ نمونە کاتێك لەسەر رەوتە ئەدەبییەکان دەدوێین (ریالیزم پاش رۆمانسیەت هاتە کایەوە).

لەبەرامبەردا "لێکدانەوە" و "سەبەبیەت" دەتوانن رۆڵێکی سەنتەرییان هەبێت لەمێژووی ئەدەبیدا، بەلام دانانی یاسایەکی پوخت بەمەرجە دیاریکراوەکان ئەرکێکی مەحاڵە، کاتێك دەڵێین "سیاسەتی لویسی چواردە سیمای تایبەتی خۆی هەبووە - مەبەست کلاسیکی فەرەنسییە - و بیترارك Petrarque کاری کردبۆوە سەر دوبیلیە DuBellay نمونەی یەکەم بەرجەستەکردنی پەیوەندیەکی سەبەبیی دەرەکییە، (مێژووی گشتی و مێژووی ئەدەبی) بەلام نمونەی دووەم بەرجەستەی پەیوەندیەکی سەبەبیی ناوخۆییە، بەلام ئەو ئامرازانەمان نییە کە پێویستمانە بۆ وەسف کردنی ئەو پەیوەندیانە بەشێوەیەکی زانستی.

لێکۆڵینەوە لەو بابەتە وەرگیراوانە نیگەرانیەتی دروست کردووە بەشێوەیەك لەجەوهەریەکان نزیك دەبینەوە بەوەی (رووداو، گێڕانەوە، سەبەبیەت) دەستەواژە بنەڕەتیەکانی مێژووی ئەدەبی نین. مێژووی ئەدەبی باو رووبەڕووی رەخنەی زۆر بۆوە بەوەی مێژوویەکە گرنگی بەترۆهات (شتە بچوکەکان و.) داوەو هیچ سەنتەرێکی نییە، ئەمە لەکاتێکدا پێویست بوو ناوبنرایە ئەو زانستەی خۆی لەهەموو شتەکان هەڵئەقورتێنێ. (ویلیك ١٩٧٣)، بەلام ئەوەشمان لەیادنەچێت هەڵەکە زۆر قووڵە و کێشەکە مایەی چارەسەر نییە. دژواریەك هەیە کە لانسۆن ئاشکرای کردو بەچەمکی مێژووی ئەدەبییەوە لکاوەو بەم دواییە باتیزون Bateson ئاماژەی بۆکرد ئەوەیە مێژووی گشتی لەوانە دەکۆڵێتەوە کە دەگۆڕێن و مێژووی ئەدەبی ئەوانە دەگرێتە خۆ کە دەمێنێتەوە. لەبەرئەوە مێژووی ئەدەبی ناتوانێت ببێتە بەشێك لەمێژووی گشتی. ئەو خاڵەی مێژووی ئەدەبی جیادەکاتەوە ئەوەیە گرنگی بەرووداوە یەك لەدوای یەکەکان و بونیادەکان نادات، بەڵکو بەبابەتەکان و ئەو شێوازانەی لەرابردوودا هەبوون و تائێستاش هەن (راسین ژیا، بەلام فیدرا تائێستاش دەژی)، لانسۆن (١٩٦٥ - ل٣٣) نوسیوویەتی "رابردوو بابەتی مێژوونوسان و ئێمەشە، بەلام رابردوویەك کە ئەمێنێتەوە: ئەدەب ئەدەبی رابردوو و ئێستایە لە یەك کاتدا. لەو بارودۆخەدا پێویست بوو لەسەر مێژووی ئەدەب لەچەند بوارێکی تری لێکۆڵینەوە (تۆژینگە)کان نزیك ببێتەوە بۆ دۆزینەوەی ئامرازە زانستییە گونجاوەکان لەگەڵ باسکردنی بابەتەکان وەك (مێژووی هونەر، ئازەڵناسی). مەبەست لەمێژوو تەنها گێڕانەوەی رووداوەکان نییە بەڵکو ئامارو پۆلێن کردنیەتی، هەرلەو رێگەیەشەوە دەتوانێت رۆژێك لەرۆژان ببێت بە مێژووی شکڵەکان Histoiredes formes وەك ڤالێری و جینیە وەسفیان کردووە. ئەو شکڵانەش ئەچێتە خانەی یەك لەدوای یەکەکان کە سروشتێکی مێژوویانەی هەیە

(رەگەزە ئەدەبی‌یەکان) ئەوەش رێگەی پێ دەدات لەناو مێژوودا دابنرێت، بەڵام مایەی لەناوچوون نی‌یە بەپێچەوانەی رووداوە یەك لەدوای یەکە مێژوویی‌یەکان ئامادەگیشی لەرووی مەبدەئیەوە لێکۆڵینەوەی یەکانگیربونی ئاسانتر دەکات. پێویستە لەسەر مێژووی ئەدەبی لەهەمان کاتدا گرنگی بەسەر هەڵدانی بابەتە ئەدەبی‌یەکان‌و قۆناغی زانینە یەك لەدوای یەکەکانی بدات. لەوانەیە مێژووی شێوازەکان‌و وەرگرتنیان بێت لەهەمان کاتدا (بڕوانە فۆدیکا ١٩٧٦و یاوس ١٩٧٩). بۆچونێکی لەو شێوەیە لەسەر مێژووی ئەدەب رەگەزە بایۆگرافی‌یەکان دووردەخاتەوە (کە دواتر بۆ جاری دووەم بەئاستێکی تر دێتەوە ناو لێکۆڵینەوە ئەدەبی‌یەکان لەرێگەی رەخنەی دەروونی‌یەوە) ئەو بۆچوونەش لەمیراتی ئەدەبی تەنها چەند شکڵێك لەناو زەمەن دا دەپارێزێت.

لەبەرئەوە پێویستە دوو بۆچوون دابڕێژرێت لەسەر دووبوار یەکەم بواری پارادیگماتیك (Paradigmatique) کە بابەتەکان لەبەراوردێکدا و بە ناونیشانێك‌و مەنزلگەیەك، رەگەزە ئەدەبی‌یەکانی تێدا پێك دەهێنرێت، لەبواری سینتاگماتیك syntagmatique ئەوە دەردەکەوێت کە بە "ماوەکان" ناسراوەو ئەو بۆچوونە سوودی دەبێت لەدەرخستنی سروشتی رەگەزە دیاریکراوەکان بەشێوەیەکی مێژووییانە.

- لێکۆڵینەوەی مێژووی ئەدەبی فەرەنسی

مێژووی ئەو شێوازانە تائێستا سەری‌هەڵنەداوەو ئەوەی گرنگی بەئەدەب دەدات پێویستە کتێبە کورتکراوەکان بخوازرێت‌و ئەوانەش چەند سیفەتێکی جیاکەرەوەیان هەیەو پێویستە لەیەکتری جیابکرێنەوەو شی‌بکرێنەوە. کورتکراوەکان چەندین تۆماری (ناوەکان، مێژووەکان، شوێنەکان، پلەکان، ناونیشانەکانی) تێدایە کە لەچواردەوری چەمکێك کۆبونەتەوە، ئەو تۆمارانە کۆکراونەتەوەو بەگوێرەی چەند یاسایەکی بەهایی (Jugement de Valeur) بەکارهێنراون‌و تائێستا بەئاشکرایی پێویستیان بەداڕشتنەوە هەیە.

سیستمی بەها ناواخنی‌یەکان (القيم الضمنية) کە ئەو تۆمارانە ئاڕاستە دەکات کە لەکورتکراوەکاندا (Manuel) بەتاك هێڵراونەتەوە دروست دەبێت لەسەر بنەڕەتی نەریتە رۆشنبیریەکان کۆك بونێکی نیمچە سەرتاسەری دروست دەکات (سەرسوڕمان لەرابردوو بەبەردەوامی کە بوالۆ لەسەری دەدوێت) لەلایەن هەموو خەڵکەوە، یان لانی کەم رەخنەگران‌و فێرکاران کاتێکیش ئەو سیستەمە لە ئەنجامی گرژی‌و ئاڵۆزیە سیاسی‌و ئیستاتیکی‌یەکان دەگۆڕێت: کەچەند ناوێك دەکوژێنرێتەوەو هەندێکی‌تر زیاد دەکرێن. نمونەش لەسەر ئەوە زۆرەو بەئاسانی دەدۆزرێنەوە: لەسەردەمی کلاسیکی‌دا ناوی دوبارتا (DuBartas) نابیستین کە جێگایەکی پێ‌نەبەخشرا تەنها لەسەردەمی رۆمانسیەتدا نەبێت کە ئەویش (رۆمانسیەت (و.) ناوی ژان پاتیست نرفالی لابرد کە هەندێك پێیان وایە لەنێو شاعیرەکانی رۆمانسیەتدا سەنتەری ترینیانە لەفەرەنسا، سەرەتا لەکتێبەکەی لانسۆندا کەناوی "Pentheon" ە ناونەبرا تاچاپی یانزەهەمی هەمان کتێب کە ئەویش بەتێبینی‌یەك نوسرابوو گوایە کتێبەکە دیفۆرم کراوە ــ بەڵام رابردوو بەکاریگەریی سوریالیزم گۆڕانکاری زۆری بەسەرداهات هەر لەسەردەمی برتیون‌و بزوتنەوەکەیەوە سادلوتریامون‌و رامبۆش خوێندنەوەی جیاوازیان بۆکرا، نمونەی ئەوەش لەکۆمەڵە پاشکۆی (لاگارد میشاردا دەبینرێت، کە گەر بەراوردی بکەین بەپێشوو گۆڕانکاری گەورە روویداوە، کە بەشێوەیەك گۆڕا بوو لەگەڵ

سەلیقەی مۆدرێنـدا دەگونجاو شوێنێکی سەنتەریی بەخشیـیە ئەو نوسەرانەی لەسەردەمێکی نزیکدا لەپەراوێزدابوون (کینو، ئارتۆ، بەتای، لیری.... هتد)

بەگشتی کتێبە کورتکراوەکان ئامارێکی رووتی تۆمارەکان نین، چونکە تۆمارەکان پێویستە لەرێگەی چەند چەمکێکی دیاریکراوەوە پەیوەندیەک لەنێوانیاندا دروست بکات. ئەو چەمکانەش ئەرکیان ریزکردنی تۆمارەکانە، ئەویش پۆلێن کردنی لەهەموو مێژوویی یەتی فراواندا (سەدە) (مەبەست لێی چوارچێوەیەکی زەمەنییە و.)، "ناتیورالیزم" یان چەند سیفەتێکی وەك "پێشرەو"و "ژانسێنیست" (Janseniste)(1) پێ بدرێت. ئەشتوانرێت چەمکەکان بەگوێرەی ئاستی رووتکردنەوەی دەلالیان (التجرید الدلالی) بەسێ توێژ رێك بخرێن و ناودەنرێن: توێژی چەمکەکان ــ ئامرازەکان (المفاهیم ـ الادوات) توێژی چەمکەکان ــ ماوەکان (المفاهیم ــ الفترات) و توێژی چەمکەکان ــ هزرەکان (المفاهیم ــ الافکار).

چەمکەکان ـ ئامرازە بنەرەتی یەکان ئەمانەن

سەدە ـ نەوە ـ رەوت ـ قوتابخانە، بزوتنەوە ــ بەرلە ــ دوای (بۆ نمونە دوای کلاسیکیەت ـ مابعد الکلاسیکیە) ــ پێشرەو ــ خوێندکار ــ نەریت ــ کاردانەوە ــ پەرەسەندن ــ دارمان (انحطاط) ــ بەقۆناغ بوون (التمرحل Periodisation) ــ چارەنوس ـ نەوەکانی داهاتوو ـ وەرگرتن. نوسەر ـ ئەدیب ـ شاعیر ــ رۆماننوس

چەمکەکان ــ ئامرازەکان، لەمێژووی گشتی یەوە خوازراون (جگە لەچەمکەکانی زنجیرەی سێهەم کە زنجیرەی بکەرە رەسەنەکانن و ناتوانرێت ناوبنرێن بەو دەستەواژانەی لەمێژووی ئەدەبی و مێژووی سیاسی دا هاتوون.)

چەمك ــ ئامراز چەند تایبەتمەندێتی یەکی هیستۆگرافی هەیە (وەك خواستنی بایۆلۆژی و تێلێلۆژیك)

ــ چەمك ــ ماوە سەبارەت بەئەدەبی فەرەنسی

رێنسانس ــ بارۆکی ــ مانیەریزم Manierisme(2) ـ پرێسیۆزیتێ (3) ـ کلاسیکیەت ـ رۆشنگەری ـ رۆمانسیەت ـ ریالیزم ــ هونەر بۆ هونەر ــ ناتیورالیزم (سروشت گەرایی) ـ سەمبۆلیزم ـ سوریالیزم ـ پێشرەویی ـ وجودیەت.

توێژی دووەم چەند دەستەواژەیەك دەگرێتە خۆ کەپێشترو ئێستاش دوومانایان هەیە ـ یەکەم دەست نیشانکردنی لەساتێکی دیاریکراودا لە رابردوو، دووهەم ئەوساتە تێدەپەڕێنێت بۆ دەربڕینە ناکۆتاییەکان. لەبەرامبەردا ئەو چەمکە "کلاسیکی" "رۆمانسی" یان "بارۆکی" یانە بەکاردێت تا سەرجەم مێژووی شارستانیەت بگرێتەوە، چونکە بزوتنەوەیەکی بارنەیی یە ئەگەر دیالەکتیکیش نەبێت.

چەمکەکان ــ هزرەکان کە توێژی سێهەم پێك دەهێنێت توێژێکی نامێژوویی و نائەدەبیە لەرووی مەبدەئی یەوە، لەکاتێکیش دا تەنها مانایەکی هەیە سەبارەت بەمێژووی ئەدەبی هەرئەو چەسپاندنی رێزمانە مێژووییەکان دوویات دەکاتەوە.

سەدەی شانزەهەم: هیومانیزم ـ ئینجیلیزم ــ پلێیاد

سەدەی حەڤدەهەم: دیکارتیزم ــ پیاوی بەخشندە، پیاوی ئابڕومەند، پیاوی چاکی ژانسێنیست ــ بیری ئازاد ــ هاوتای بابەتیی Vraisemblable ـ ئەدەب.

سەدەی هەژدەهەم ــ سەنسوالیزم (حسویە)(4) ــ فەیلەسوف ـ حەماسەت ـ رۆشنگەری ـ پێسمیزم (رەشبینی)

سەدەی نۆزدەهەم ـ هەڵچوونی سەدە (اضطراب القرن) ـ بەرزیی ـ زێدەڕۆیی بێمانا ـ پارناسی ـ دارمان ـ شەڕخوازی Satanisme

بەشێوەیەکی ئاشکرا سنوری نێوان هەرسێ توێژەکە دروست نەکراوەو ئەو چەمکانە باس کراون تەنها ئەوان نین کە پێویستە بخرێنە چینەکانەوەو پێویستە چەند لێکۆڵینەوەیەکی دەلالی قووڵ بکرێت بۆ دەست نیشانکردنی بواری وودی هەر توێژێك و بواری ووردی هەموو چەمکێك لەهەر توێژێکدا. لێرەوە دەتوانین بڵێین ئەو سێ توێژەی لەنەخشەکەدا ئامـاژەی بۆ کراوە، رونکردنەوەیەکی ئاشکرای پێبەخشراوە. ڕێگە دەدات بەسەرلەنوێ پێك هێنانەوەی پرۆسە زەمەنییەکانی مێژووی ئەدەبیی باو، و لەبەرئەوە هەموو ئەوانە پێك دەهێنێت کەپێشتر لەبواری داڕێژراوی ماوەکاندا وەسفمان کرد.

بۆ پێك هێنانەوەی ئەوەی پارت (١٩٧١ ـ ل١٧٢) ناوی ناوە ڕێزمانی مێژووی ئەدەبیی باو، پێویستە دووکار بکرێت:

أ ـ لەسەر ئاستی ڕێزمانیی: پێویستە توێژینەوە لەسەر ڕێکخستنە لێکدراوەکان بکرێن لەنێوان ئەو چەمکانەی خاوەنی یەك توێژ یان چەند توێژێکن و "پێشەوای ڕۆمانسیەت" و چارەنوسی ژانسێنیزم (١ ـ ١، ١ ـ ٢، ١ ـ ٣) پێویستە بەتایبەتی مەسەلەی زانینی ئەوەی ئایا هەموو لێکدانەکان ئەکرێن لێکۆڵینەوەی لەسەریکرێت، بەم پێیەش پێویستە چەند پێوانەیەکی پارادیگماتیك ی دابنرێت‌و لێکۆڵینەوە لەسەرئەوە بکرێت کەبزانرێت ئایا هەموو پایەکان یەك شێوەن لەم حاڵەتەدا چەند پێوانەیەکی سەنتاگماتیك دادەنرێت. پێدەچێت ئەو چەمکانەی سەربەتوێژی یەکەمن بەئاسانی ببەسترێتەوە بەچەمکەکانی توێژی دووهەم‌و سێهەم، بەڵام لەبەرامبەردا پەیوەستییە هاوبەشەکانی نێوان هەردوو دوا زنجیرە زۆربەی کات دەگمەنترە لەسروشتی ئەوی‌تر.

ب ـ لەسەر ئاستی سیمانتیك (دلالی): لێکۆڵینەوە لەسەر ئەرکی میتۆدی دژەکان Antonymie و میتۆدی لەیەك چوو (الترادف) Synonymie بکرێت (میتۆدی دژەکان وەك ڕۆمانسیەت لەبەرامبەر کلاسیکیەتدا" ،"کلاسیکیەت بەرامبەر بارۆکی"، میتۆدی سینۆنیمی وەك "ڕۆمانسیەتی کلاسیکیەکان".) دوو نمونەی ورد لەسەرکاری دەلالی لەوجۆرە هەیە، یەکەم پابەندە بەماوەکان‌و دووەم نوسەرە گەورەکان:

١ـ کاری سیمانتیکیانە (دلالی) سوودی لەوەدایە سەدەکان بۆ چەند مەودایەکی کورت دابەش دەکات کە کورترە لەسەدە، نیوەی یەکەمی سەدە لەگەڵ نیوەی دووەمدا بە بەردەوامی رووبەروون، ئەویش بەپێی چەمکەکان ـ ماوەکان (ڕێنسانس ـ بارۆکی، بارۆکی ـ کلاسیکی، ڕۆشنگەری ـ ناتیورالیزم) هەروەها بەپێی چەند دەستەواژەیەك کە چەند یاسایەکی بەهایی دەردەبڕن وەك (گەش بینی ـ ڕەش بینی، ڕێك‌وپێکی ـ ئاژاوە) بەمەش دەتوانرێت ئەم خشتەیەی خوارەوە بۆ سەدەکانی شانزەهەم‌و حەڤدەهەم دابنێین:

| | نیوەی یەکەم | نیوەی دووەم |
|---|---|---|
| سەدەی شانزەهەم | ڕێنسانس | بارۆکی |
| سەدەی حەڤدەهەم | بارۆکی | کلاسیك |
| | گەشبینی | ڕەشبینی |

٢ـ کەڵە نوسەرانی پرۆگرام زۆربەی کات دووانن (ڕۆنسار ـ مالێرب، کورنای ـ راسین، بوسویە ـ فینلۆن، ڤۆڵتێر ـ ڕۆسۆ، بەلزاك ـ زۆلا، سارتەر ـ کامۆ) کاتێك شکڵ ـ یان ناسنامەی ڕەگەزی ئەدەبی بەکارهێنراو ـ بەراورد دادەڕێژێت، ناوەڕۆك ـ ئیستاتیکاو ئایدۆلۆژیا، رووبەڕووبونەوەکان دادەڕێژێت، بەڵام لێکۆڵینەوە

لەسەر نوسەران کە پێویستیان بەتەرپبی ئاسان هەیە وەك (رابلیە، مۆلێر، دیدرۆ، هیگۆ، بروست) زۆربەی کات لێکۆڵینەوەیەکی گرفتاوی دەبێت.

پێشتر چەند پرۆسەیەکمان بینی کە پشتی بەستووە بە رێزمانو سیمانتیك ی تایبەت بەرێزمانی مێژووی ئەدەبی لەئاستی پارادیگماتیك دا، بەڵام بەزیادکردنی لێکۆڵینەوەی یاسا بەهاییە لەخۆگرتووەکانو فەرەزیاتە ئایدۆلۆژیەکان ی پێشوو، چەند پرسیارێك دەست پێدەکات ئەو پێوانانە چین کە کتێبێکی کورتکراوەی میتۆدۆلۆژیا پێویستیەتی بۆ پۆلێن کردنی لقبیانەی ماوەکان (بۆ نمونە" بەر لەکلاسیکیەت" "دوای هەردوو جەنگ") ؟ بەچ یاسایەك بابەتە ئەدەبیەکان لەناو کاتێکی دیاریکراو و لەماوەیەکی زەمەنی بچوکدا پلەبەپلە دەکرێن ("رۆمانی نێوان هەردوو جەنگ" و "تەقلیدو تازەگەری" هتد)؟ لێکۆڵینەوەی ووردی زمان جارێکیتر خۆی بەو ئاستە پێشنیار دەکات: ئەو خواستنە باشانەی ناو کورتکراوەیەکی مەنهەجی چین (وەك مارسلین دیسبورد فالمور: شیعر هاوارەکانی غەزەلی بەجێ دەهێڵێت)؟ ئەو ئایدۆلۆژیا شاراوەی خواستنەکان چین؟ بۆ نمونە ئەو ووتەیەی دەڵێ، پاش پێشڕەویی میراتی ئەدەبیو کلاسیکیمان بەهێز و بەتواناو یەکگرتوویی ئەمێنێتەوە) کامانەن ئەو ئایدیانەی کە لەچەند دەربڕینێکی وەك "موسیە Musset"دا بەدیدەکرێت، کە بەشێوەیەکی سروشتیانە لەناو هەموو شاعیرە رۆمانسیەکاندا خۆی ئاشکرادەکات لە "بەرهەمەکانیدا" و هەندێکیتر "هارمۆنیە" مەزنە لیریکەکانی لامارتین بەهۆی مەزنی هەست کردنیەوە بەسروشت بووە تیایداو کاریگەری ئایینیو دەوڵەمەندی وێنەکانو زۆری جۆرەکانی ئیقاعەکان بووە؟.

لێکۆڵینەوەی رەخنەیی بۆ مێژووی ئەدەبی باو، چەند بونیادێك ئاشکرا دەکات کەلەسەر چەند راستیو بنەمایەك دامەزراونو بنەڕەتە بەهاییە لەخۆگرتوەکانی بونیادی لەسەر پێك هاتوە دەردەخات:

لێکۆڵینەوەیەکی لەوجۆرە ناتوانێت لەچەند پێوانەیەك زیاتر دابنێت بۆ تێگەیشتنی سەرەتاکانی بەقۆناغ کردنی ئاسایی. پێویستە ئەو قۆناغە تێپەڕێنینو یەکەم لێکۆڵینەوە لەسەر چەمکی رەگەزی ئەدەبی بکەین تا بگەینە مێژوویەکی راستەقینەی شکڵەکان، واتە تا چۆنیەتی لێکدانی لایەنی دارشتنی ماوەکانو لایەنی پارادیگماتیکی بەرهەمەکانو رەگەزەکان بناسین. مێژووی ئەدەبی هەوڵێکی بەردەوامی تازەبونەوەیە بۆ پۆلێن کردنی دیاکرۆتی.

---

(١) مەزهەبێکی ئەخلاقی مەسیحی توندڕەوە.

(٢) Manierisne مەبەستگەرا: ئەو تیۆرەیە کە ئەڵێ هەموو شتێك لەمێژوودا بۆ مەبەستێکی دیاریکراو ئاراستە دەکرێت.

(٣) خۆنواندن لە ئەدەبو هونەردا

(٤) Sensualisme: ئەو بۆچوونەیە کەپێی وایە هەموو هزرەکان لەهەستەکانەوە سەرچاوەیان گرتووە.

### کتێبی

# تیۆرەو مێژووی وەرگێڕان

**بەشی دووەم**

**چەند ئاماژەیەکی مێژوویی یان:**

**چەند کورتەیەکی مێژوویی هونەری وەرگێڕان**

و: یاسینی فەقێ سەعی •

(١)

**وتاری یەکەم:**

**وەرگێڕ لەمێژووی دێریندا..**

هەتا ئێستا مێژووی وەرگێڕان لەجیهاندا، وەك مێژووی مۆسیقا، هونەری شێوەکار، ئەدەب.. هتد، نەنوسراوەتەوەو قۆناغە جیاجیاکانی سەرهەڵدانو گەشەکردنی ئەم چالاکیە مرۆییەی گەلانی دنیا دیارینەکراوە. تاکە کەسێك لەم بوارەدا هەوڵی دڵسۆزانەی دابێت، وەرگێڕی بەناوبانگ (ئێدوارد کاری)یە. ئەم وەرگێڕە ناسراوە، بەتواناترین وەرگێڕی فەوریە لەدنیادا، تاکە پسپۆری وەرگێڕانە لەکۆنگرە جیهانیەکاندا، هەر خۆشی یەکەمین خەمخۆری پاراستنو دارشتنی مافەکانی وەرگێڕە، دامەزرێنەری (F.I.T ـ فیدێراسیۆنی نێو دەوڵەتی وەرگێڕان)ە. ساڵانێکی دوورو درێژیش هەرخۆی سکرتێری گشتی ئەم رێکخراوەبوە. ئێدواردکاری. لەبواری ساغ کردنەوەی مێژووی وەرگێڕاندا

چەندین توێژنەوەی نووسیوەو(١) بەڕای (ئاندری ف. فێدرۆرۆف) توێژینەوەکانی دەبنە بنەماو پرینسیپی تیۆرێزەکردنی چالاکی وەرگێڕان(٢)..
بەڵام هەندێ نووسەری دیکە ئەو ساغ کردنەوە توێژینەوانە زۆر بێبەها دەنرخێنن، چونکە لەو بڕوایەدان کە وەرگێڕان لەبەرەبەیانی مێژووەوە هەبووەو سنووری سەرهەڵدانو گەشەکردنی گەلێ فراوانەو دیاردەیەکی نوێی شارستانیەت نییە، هەتا بەئاسانی ساغ بکرێتەوە.

**وەرگێڕان لەسەرەتای مێژوودا.**

لەسەرەتای مێژوودا، لەژیانی خێڵە دوورە پەرێزو دواکەوتووەکاندا، لەو کۆمەڵگا بێیاساو لێکپچڕاوەدا، بێگومان مرۆڤێك هەبووە وەك وەرگێڕ، دوو مرۆڤی زمان جیاوازی لەیەکتر حاڵی کردبێ، مرۆڤێك هەبووە شارەزای زمانی خێڵەکانی دەوروبەری خێڵەکەی خۆی بێت.
(ئێتنۆگیراف - )ی نەمساوی Bernatzik، لەیەکێك لەتوێژینەوە مەیدانیەکانیدا لەنێو خێڵە هەرە دواکەوتوو دوورە پەرێزەکانی باکوری (لاوس)دا کە ناسراون بە (Phi - Tang - Luag) دەگاتە ئەو ڕاستی‌یەی کە لەنێو ئەم خێڵە پەرشو بڵاوەدا، کە دابەش بوون بەسەر ژمارەیەکی زۆر لەگروپی گچکە گچکەدا، کە زۆرجار گروپێك بۆماوەی چەند مانگێك چاوی بەهیچ گروپێکی دیکە ناکەوێ، کەچی خەڵکێکی زۆریان نەك زاراوە جیاوازەکانی خێڵەکەیان دەزانن، بگرە خێڵەکانی دەوروبەریشیان دەزانن لەناو خێڵە جیا نشینەکاندا، هەرچەندە هاتوچۆ گەلێ گرانە، بەڵام چەند کەسێکە بەناوی (تەتەر) هەن کە هەواڵو دەنگوباسی خێڵەکان بەیەکتر دەگەیەننو زمانە جیاوازەکان دەزاننو لەنێویاندا وەك وەرگێڕ کاردەکەن(٣). هەر هەمان لێکۆڵەرەوە، لەگەڕانی بەردەوامیدا بەناوچە جیاجیاکانی دنیادا، ئەو ڕاستی‌یەی سەلماندووە، کە هەمیشە لەسەر مەرزەکانی نێوان دوو وڵات یان دوو نەتەوە، خەڵکانێك هەن زمانە جیاوازەکان دەزاننو کاریان وەرگێڕانە. لەم بارەیەوە (لیڤی شتراوس) هەمان ڕاستی سەلماندووەو لەتوێژینەوەیەکیدا لەناو هۆزو خێڵەکانی ئەمەزۆنی بەرازیلدا گەیشتۆتە هەمان دەرئەنجام.(٤)

کەواتە، هەرچەند بەرەو ڕابردوو بگەڕێینەوە، زیاتر دڵنیا دەبین لەبوونی مرۆڤێك کەچالاکی وەرگێڕانی ئەنجام دابێت، چ لەجۆری فەوری، چ بەنووسین. لەسەدەی دووەمی بەر لەزایینی، لەناو دەوڵەتەکانی (ئاشوری، بابلی، ئیتیتی)ی ئاسیای چکۆڵەدا. کاریەدەستی دەوڵەتی بەناونیشانی (میرزا ـScriba) هەبووە (ئەم کاریەدەستە ئیشی ئەوە بووە نامە بنووسێو بخوێنێتەوە، یان لەزمانێکەوە بۆ زمانێك وەری‌بگێڕێ، یان ڕێنووسە کۆنەکان بکات بەڕێنووسی نوێ). هەربەهۆی ئەم پیشەیەوە زانراوە کە چالاکی وەرگێڕان بەهەردو جۆری (فەوریو نووسین) لەو شارستانیەتە کۆنانەدا هەبووە. وەك لایەنی زمانەوانیش ئاشکرابووەو کە وشەی (ragamou واتە: قسەکردن)ی ئاشوری لەزمانی عەرەبیدا جێگەی خۆی کردۆتەوەو بوە بەوشەی (Targoma ـ ترجمە) وەیان (Tardjouman)، هەر لەعەرەبیشەوە ئەم وشەیە پەڕیوەتە زمانی فەڕەنسی‌یەوە بوە بە (Tarchement). لەکەلتوری فەڕەنسیدا ئەم زاراوەیە هەتا سەدەی هەژدەهەم بەکارهاتووە بەمانای (وەرگێڕی فەوری). وەك سەرچاوەیەك زاراوەکانی (Dragomanno, Turcimanno)ش هەر لەوێوە سەریان هەڵداوە. لەئەورووپای کۆنیشداو بەتەواوەتی لە سەردەمی ئیمپراتۆریەتی (Talami)ی دا وشەی (toltmatch)ی سلاڤی بەکارهاتوەو پاشان

پەڕیوەتە ناو زمانی ئەڵەمانیەوەو بووە بەوشەی (Dolmetscher). بۆ زیاتر سەلماندنی بۆچوونەکانمان لەمەڕ بوونی ئەو جۆرە چالاکیە لەمێژووی دێریندا، دەڕوانینە میسری کۆن و دەوڵەتی پاشایەتی دێرین، دەبینین چەند کارمەندێکی پایەبەرزی دەوڵەتی هەبوون نازناوی پیشەییان (سەرۆکی وەرگێڕەکان - Capo - interprete) بووە. ئەم نازناوە، وەك پلەو پایەیەکی بەرزی دەوڵەتی، وەك تایبەتمەندیەکی بنەماڵە، لەباوکەوە بۆ کوڕ ماوەتەوە، لەلایەن دەسەڵاتی پاشایەتیەوە، بەوپەڕی رێزەوە پارێزگاری کراوە. بەپێی ئەم راستیەیە دەبێت مێژووی وەرگێڕان لەچین و هندستان و ئەمەریکاشدا، دوورودرێژو گەلێ دێرین بێت.

**وەرگێڕان لەکۆندا.**

بەر لەهەموو شتێ، هەوڵی گۆڕینی وەرگێڕان بەچالاکیەکی چەسپاو، لەئامادەکردن و دارشتنی لیستی وشەکانی دووزمان بەرامبەر بەیەك، یان لەدارشتنی فەرهەنگی دووزمان یان زیاتردا دەردەکەوێ. لەم بارەیەوە ئەو (تاتە گڵینە - لوحات طينية) دۆزراوانەی شارستانیەتەکانی ئاسیاسی چکۆڵە چەندین نموونەی لەو بابەتەمان بۆ دەسەلمێنن.

بەڵام یەکەمین بیرکردنەوەی سیستێماتیکی لەبارەی هونەرو پیشەی وەرگێڕانەوە لە(رۆما) دۆزراونەتەوە، لەو شارەی کە لەڕووی پراکتیکیەوە (ئەدەب)ی تێدا هاتۆتە دنیاوە. گەرچی لەسەدا سەد لەبارەی وەرگێڕانەوە نەبێ، بەڵام بەتەواوەتی بەرهەمەکانی (لیڤیۆ ئاندرۆنیکۆ، ئێنیۆ، نێڤیۆ.. هەتا دەگاتە پلاوتۆ، تێرێنتسیۆم جوانترین و گونجاوترین نموونەکانی (ئامادەکرن - اعداد)ن لەزمانێکەوە بۆ زمانێکیتر.

هەر لەیەکەمین سەدەی بەر لەزاینیەوە. کاتێ (چیچێرۆن - Cicerone) دەربارەی وەرگێڕانی گفتوگۆی (Demostene) و (Eshine) قسەدەکات، گەورەترین گرفتی تیۆری لەبارەی وەرگێڕانەوە دەردەبڕێ کە بۆ ماوەی دوو هەزار ساڵ بەسەر پیشەی وەرگێڕاندا باڵا دەست دەبێ: ئەگەر پێویست بێت بەوەفابین بۆ وشەکانی تێکستەکە (واتە: وەرگێڕانی حەرفی) یان بەوەفابین بۆ ئەو فیکرەی لەنێو تێکستەکەدایە (واتە: وەرگێڕانی ئازاد یان ئەدەبی. ئامادەکردن، یان "بێوەفای جوان").. چارەسەی چیچێرۆن لەم دوریانەدا، هەڵبژاردنی بنچینەیی جۆرێکیانە: "من گفتوگۆکەی ئەوانم وەك وەرگێڕێکی ئاسایی مامەڵە نەکردووە، بەڵکو وەك نووسەرێك لەگەڵ رستەو وێنەو ماناکانی ئەواندا هەڵسوکەوتم کردووە، گەڕاوم بەپێی سروشتی زمانی لاتینی خۆمان، وشەی گونجاو بۆئەو مانایانەی ئەوان بدۆزمەوە. کەواتە بەپێویستم نەزانیوە بۆهەر وشەیەکی ئەوان، وشەیەکی لاتینی لەبەرامبەردا دابنێم. لەگەڵ ئەوەشا مانای تەواوەتی و نرخی هەموو وشەیەکی ئەوانم پاراستوە. لەراستیدا هیچ پێویست ناکات لەکاری وەرگێڕاندا ژمارەی هەموو وشەکانی دەقە ئەسڵیەکە بگاتە خوێنەر. بەڵکو پێویستە قورسایی هەموو وشەکان بگاتە خوێنەر". ئەم دێڕانە گەرچی بەسادەو ساکاریی وتراون. بەڵام شایستەی ئەوەن لەجارێك زیاتر بەو زیندوویی و کاریگەریەی خۆیانەوە ببنە بنەمای فۆرمۆڵەکردنێکی ئاشکراو لەلایەکی تریشەوە چارەسەرێکی ئاشکراترن بۆگرفتی وەرگێڕان، کەپاش تێپەڕبونی دوو هەزار ساڵ هێشتا ئەو زیندوێتی و کاریگەریەی خۆیان پاراستوە.

نیو سەدە پاش چیچێرۆن، پیاوێکی وەك ئۆراتسیۆ - Orazio هەمان پێناسەو بیروبۆچوونی نوێکردۆتەوەو چەسپاندویەتی لەوەرگێڕانی نامەکان بۆ پیزۆنێس - Epistola

ad Pisones: بەڵام ئەمجارەیان، هێندەی بۆ پێناسەکردنی "ئامادەکردنی ئەدەبی" بەکارهاتوون، هێندە مەبەستیان لە وەرگێڕان نەبووە؛ کەچی لەگەڵ ئەوەشدا پێناسەکەی (ئۆراتسیۆ)ش توانیویەتی بەرگەی ئەو هەموو سەدەیە بگرێت. ئەمەش دەقی پێناسەکەیەتی: -

(Nec verbum verbo curabis reddere fidus in terpres).

بەر لە ئۆراتسیۆ و چیچێرۆن، لەسێ‌هەمین سەدەی بەر لەزاینی‌دا، لەقەڵەمڕەوی ئیمپراتۆریەتی (تیۆلێمۆ فیلادێلفۆ)دا لەلایەن (سێتانته)وە تێکستە کۆنەکەی تەورات وەرگێڕاوە، کە لەڕووی بایەخەوە هیچی‌کەمتر نەبووە لەنموونەکانی‌تر، بەڵام لەبەرئەوەی دەقی وەرگێڕانەکە لەناوچووە ناتوانین لەبارییەوە هیچ بڵێین لەو تێڕوانینە ڕەخنەیییەی (سان جێرۆلامۆ) زیاتر کە چەند سەدەیەك دواتر لەسەردەمی (سان ئەگۆستینۆ)دا نووسراوە.

لەسەردەمی دەسەڵاتی کەنیسەدا، (ئیڤاگرۆ) ناوێك، کە هاوڕێ‌و هاوتەمەنی (سان جێرۆلامۆ) بووە، کتێبێکی بەناوی (بەسەرهاتی ژیانی سان ئەنتۆنیۆ) وەرگێڕاوە: لەپێشەکی ئەو کتێبەدا پرنسیپێکی گەلێ گرنگی بۆکاری وەرگێڕان داڕشتووە، کە دیارترین بەڵگەی ناو و ناوبانگی پێناسەو بیروبۆچوونەکانی (چیچێرۆن)ە لەو سەردەمەدا. ئیڤاگرۆ دەڵێت : "ئەگەر بەرهەمێك بەشێوازی وەرگێڕانی حەرفی لەزمانێکەوە وەربگێڕینەسەر زمانێکی‌تر، ئەوا بێ‌گومان لایەنی زۆری (مانا)ی تێکستە ئەسڵیەکەمان شاردۆتەوە (...) لەوەرگێڕاندا ئەگەر هەندێ وشەش لەبیربکەین، تووشی هیچ گرفتێك نابین، بەڵام نەگبەتی لەوەدایە کە هەندێ (مانا) گەرچی بچوکیش بێ، لەیاد بکەین". بەڵام لەپاشاندا خودی (سان جێرۆلامۆ)، هەر بۆخۆی لەم بارەیەوە بەنووسینی بابەتێکی ئۆرگانی‌و تیۆری لەسەر (وەرگێڕان) کۆتایی بە سەردەمی کۆن دێنێ بەناونیشانی: "De optimo genere interpretandi"، ئەم نووسینە نزیکەی بیست لاپەڕە بووەو لەکاتی خۆیدا نێرراوە بۆ (پەماکیۆ)، ئەم نووسینەش دیسانەوە سەرتاپا رامان‌و توێژینەوەو لێکدانەوەی گەلێ دەوڵەمەندی، ئەو پیاوە بەئەزموون‌و قاڵ بووەی ئەم بوارەیە، دەربارەی بیروبۆچوونەکانی (چیچێرۆن) لەسەر وەرگێڕان. ئەم دەقانەی کەتا ئەمڕۆ بەبایەخەوە دەخوێنرێنەوە لەسەر دەستی (سان جێرۆلامۆ) پارێزراون. ئەم پیاوە کە لەکاتی خۆیدا بەپێشەنگی وەرگێڕەکان ناوزەدکراوەو یەکێك بوە لەعاشقەکانی کارو پیشەی وەرگێڕان (٦). بیروبۆچوونەکانی (چیچێرۆن)ی لەداڕشتنێکی نوێی چڕوپڕدا کۆکردۆتەوەو لەشێوەی فۆرمۆلەیەکی هەمیشە زیندودا بۆ هەتا هەتایە بایەخ‌و گرنگی پاراستوە، کە دەڵێت:

(Non verbum de verbo, sed sensum exprimere de sensu)

ئەم فۆرمەلە نوێیە، بەرگەی گۆڕنکاریە جەوهەریەکانی چەندین سەدەی گرتووە، بەڵام زمانەوانی مۆدێرن، دەسکاریەکی سەرتاسەریی کردووەو پرسیاری تاقانەی خۆی لەم بارەیەوە، بۆتە دژوارکردنی تەنگوچەڵەمەی وەرگێڕان، کە دەپرسێ: مانا چییە؟ مانای (مانا) چی‌یە؟(٧)

- What is the meaning of meaning?/

**وتاری دووەم:**

**وەرگێڕان لەسەدەکانی ناوەڕاستدا..**

هەروەك بینیمان، بەرلەوەی زمانەوانی ببێتە خاوەنی ڕێسایەك، وەرگێڕان لەدێرزەمانەوە هەبووەو وەك چالاکیەکی ئەدەبی یان تەنگوچەڵەمەیەکی ئەدەبی، جێگایەکی دیارو بەرچاوی هەبووە. سەدەکانی ناوەڕاست، بۆ

وەرگێڕانیش سەردەمی پێشکەوتن و گەشەکردنێکی تایبەتی بووە، چونکە وەرگێڕان وەك گرفتێکی ئەدەبی هەمیشە وابەستەبووە بەهەلومەرجە پراکتیکی یەکانی ئەدەبەوە، کەواتە هەریەو هۆیەوە وەرگێڕانیش زیندووترو گەشاوەتربووە.

مەزهەب، یان باشتر بڵێین فراوان بوونی سنووری بڵاوبوونەوەی ئاینی مەسیحی، لەبارترین و گونجاوترین هۆکارو بزوێنەری وەرگێڕان بووە. بەهۆی بڵاوبوونەوەی ئاینی مەسیحی یەوە. چالاکی وەرگێڕان فراوانتر بووە.

بەهۆی بوون بەمەسیحی یەوە، کاری وەرگێڕ زۆرترو گرنگتر بووە. لەئینگلتەرە لەسەدەی (هەشتەم)دا (بادا)و لەسەدەی دەیەمدا (شا ئالفرێد)و لە سەدەی یانزەهەمدا (ئالفریك)ی هەبووە وەك نموونەی وەرگێڕی هەرە بەتوانای تێکستە پیرۆزەکان. بەهەمان شێوە ئیرلەندە (بانگۆر)ی هەبووە. لەسویسرە دێری (سان گاللۆ) هەبووە کە بەتایبەتی پیاوانی ئاینی تیایدا فێری زمان و وەرگێڕان بوون. لەوڵاتە سلاڤیەکاندا (چیریللۆ)و(مێتۆدیۆ) هەبوون کەدو گەورە پیاوی ئاینی مەسیحی بوون بەپلەی (ڤێسکوڤۆ — Vescovo). ئەم دو پیاوە هێندە پسپۆڕو شارەزابوون، هێندە سەرقاڵی وەرگێڕان بوون، توانیویانە شێوە ئەلفوبێیەکی تایبەتی دابهێنن کە تائەمڕۆ ماوە پێی دەوترێ ئەلفوبێی (Cirillico). ئەمە لەلایەك و لەلایەکی ترەوە پەیدابوونی زمانە نوێ یەکانی بە(نیو لاتینی) ناوزەدکراون، دیسانەوە دەبنە هۆی گەشەپێکردن و بوژاندنەوەی وەرگێڕان.. چونکە زۆربەی هەرە زۆری بەرهەم و تێکستە لاتینی یەکان لەلایەن وەرگێڕە شارەزاکانەوە دەخرێنەسەر زمانی (نیو لاتینی). بۆ نموونە "Cantilene de sainte Eulalie" یەکەمین تێکستی ئەدەبی فەرەنسی یە (ساڵی ٨٨٣ی.ن)،

لەراستیدا ئامادەکردن و وەرگێڕانی بابەتێکە لەزمانی رەشەخەڵکەوە (لاتینی) بۆ سەر زمانی فەرەنسی (نیو لاتینی).

شان بەشانی وەرگێڕانی ئاینی، هەروەها وەرگێڕانی نائاینی دەورێکی کاریگەری هەبووە: بۆ نموونە: "il serment de strasbourg"، یەکەمین (لائحە)ی لەدایك بوونی رەسمی وڵاتی فەرەنسەیە. ئەگەر بەچاوی گومانە سەیری بکەین، دەبینین نووسینەوەی دەربڕینە دیبلۆماسیە لاتینی یەکە بەزمانی رۆمانی. (لائحە) یاسایی یەکان، ئەوانەشی کە پەیوەندی بەدارشتنی رێکەوتنی نێوان خەڵکەوە هەیە، دەبینین هەر هەموویان وەرگێڕانی دەربڕین و بیروبۆچوونەکانی خەڵکن لەشێوەزمانە ئەسڵیەکانەوە بۆ زمانی لاتینی.

دەبێ لەلایەکی ترەوە زنجیرە وەرگێڕانێکی گەلێ گرنگی سەدەکانی ناوەڕاست هەیە لەبیری نەکەین، کە لەوانەیە لەرووی مێژوویی یەوە لەهەموویان گرنگترین: ئەو بەرهەمانەی لە (بوکارا)وە هەتا (بەغداد) عەرەبەکان بەهاوکاری هەندێ جوولەکە نووسیویانن. ئەو بەرهەمانە بەزۆری وەرگێڕدراوبوون لەزمانی (عبری)یەوە یان (گریکی)یەوە، بەرهەمەکانیش نووسینەکانی دکتۆرەکان و فەیلەسوفەکان و ماتماتیك زانەکان و ئەستێرەناسەکان و جۆگرافی زانەکان بوون: لەراستیدا بەهۆی ئەم وەرگێڕانە گرنگانەوە زۆر بەرهەمی یۆنانی سەرلەنوێ لە (قرطبة) و لەتۆلێدۆ (Toledo) جارێکی دی لەدایك دەبنەوەو دەژینەوە.

لەکۆتایی سەدەی دوانزەهەمدا،

( - Maimonide)

کورتەی ئەزمونەکانی وەرگێڕە عەرەب و عیبری یەکان سەرلەنوێ دادەڕێژرێتەوە کە ئەوانیش هەموویان لەبەر رۆشنایی پێناسەکانی چیچیرۆندا، باسیان لەوەرگێڕان کردووە، یان

حەوت سەدە لەوەوبەر (سان جێرۆلامۆ) پێناسەکانی توندوتۆڵترکردۆتەوە. ئەم نووسەرە (Maimonide) لەو بارەیەوە دەڵێت: - (کێ دەیەوێ بەرهەمێك لەزمانێکەوە وەربگێڕێتە سەر زمانێکی دیکەو وا پێنشیاز بکات کە هەمیشە وێڵدەبێت بەدوای وشەیەکی گونجاودا لەبەرامبەری وشەیەکی تێکستە ئەسڵیەکەیدا دایبنێ، بەم کارە گەلێ ماندوو دەبێتو وەرگێڕانەکەشی نادڵنیاو بێسەروبەر دەبێت. ئەم مێتۆدە بۆ وەرگێڕان دروست نییە: وەرگێڕ دەبێت بەر لەهەموو شتێ دەبێ فیکری نێو تێکستەکە تێبگاتو لەلای روون بێت، ئەوجا هەولبدات ئەو فیکرو بۆچوونە جارێکی دیکەو بەشێوەی گونجاو لەزمانەکەی تردا دابڕێژێتەوە، بەو مەرجەی لەدارشتنەوە نوێیەکەدا فیکرو بۆچوونو مەبەستی تێکستە ئەسڵیەکە روونو ئاشکرا بێت. پێویستە لەگەڵ ئەمەشا باسی ئەو تایبەتمەندیەی زمان بکەین، کە لەزمانێکەوە بۆ زمانێکیتر دەگۆڕێ. بۆیە وەرگێڕ بەپێی تێگەیشتن لەفیکرو مەبەستەکان بۆی هەیە هەندێجار پەرەگرافێك پێش و دوابخات. یان هەندێ دەربڕین لەچەند وشەیەکەوە بکات بەیەك وشە، یان بەپێچەوانەوە. ئەوەی لەسەرجەمی چالاکیی وەرگێڕاندا گرنگە، ئەوەیە کەوەرگێڕ سەرکەوتووبێت لەگەیاندنی فیکرو بۆچوونی نووسەردا، ئەوەی لای نووسەر مەبەستە بەبێ کەموکوڕی بگاتە خوێنەر، سەرجەم بابەتەکەش لەلای خوێنەر مەفهوم بێت. واتە وەرگێڕ بەو رۆحەوە بەرهەمەکە بەپێی تایبەتمەندی زمانە تازەکە دابڕێژێ، کە خوێنەر وا هەست بکات بەرهەمەکە نووسینە نەك وەرگێڕان.

### قوتابخانەی وەرگێڕان لە تۆلێدۆ ـ Toledo:

ئەگەر ئیسپانیا لەبارترینو گونجاوترین جێگەی دونیا بووبێتو مەیدانی لێك نزیك بوونەوەو ئالوگۆڕکردنی زانیاریو فەرهەنگی نێوان شارستانیەتەکانی یەهودیو عەرەبیو مەسیحی بووبێت، ئەوا هیچ پێویست بەسەرسوڕمان ناکات، چونکە بۆماوەی سەدەونیوێك، بەتەواوەتی هەتا کۆتایی سەدەی دوانزەهەم، مەنزڵو مناڵانی یەکەمینو گرنگترین قوتابخانەی راستەقینەی وەرگێڕان لەهەموو دنیادا.(٨)

لەو قوتابخانەیەدا بەسەرپەرشتیو هاندانی سەرۆکی قەشەکانو گەورە پیاوانی ئاینی کەنیسە جگە لەوانە وتنەوە چەندین بەرهەمی گرنگ وەك: بەرهەمەکانی Maimonide و Averroe و قورئانو .. هتد، وەرگێڕاونەتە سەر چەندین زمان بەتایبەتی زمانی لاتینی. ئەو وەرگێڕانەی لەوێدا کاریانکردووە بەژمارە زۆربوون بەلام توانراوە تەنها ناوو شوناسی تەنها دوانزە کەسیان ساغ کراوەتەوە، زۆربەیان ئیسپانیو ئینگلیزو یەهودی (لەدین وەرگەڕاو بۆ مەسیحیەت) و عەرەبی پەروەردەی نێو کەلتوری مەسیحی بوون: یەکێك لەهەرە بەتواناترینی ئەو وەرگێڕانە ناوی (جێراردۆ دەکریمۆنە) بووە، کەدواتر لەرێگەی دەستنووسەکانەوە دەرکەوتوە وەرگێڕێکی پسپۆرو بلیمەت بووە.

لەقوتابخانەی تۆلێدۆدا جگە لەوانە خوێندنو وەرگێڕانی بەش بەشی تێکستە ناودارەکانو گفتوگۆو راگۆڕینەوە لەبارەی وەرگێڕانەوە، خوێندکارەکان دەبوایە کاریش بکەن، هەرچەندە قوتابخانەکە لەبنکەو کۆمەڵگە ئاینیەکان چووە، بەلام زیاتر هەولدراوە ژینگەی پێکەوە ژیانو وێستگەی پەیوەندی کردنی بەردەوامی نێوان ئەو خەڵکانە بێت کە زمانی نەتەوەییان جیاوازە، بەو زمانانە لەو قوتابخانەیەدا ئاخافتن کراوەو چالاکی وەرگێڕان ئەنجام دراوە، کە لەوسەردەمەدا زمانە گرنگەکانی شارستانیەت بوون.

لەکاتێدرالی تۆلێدۆو کتێبخانەی نیشتمانی مەدریدا (٩)، پەنجاو دوو دەستنووسی ئەو قوتابخانەیە پارێزراون، کە بەشێوەیەکی گشتی سەدان بەرهەمی جۆراوجۆریان لەخۆیاندا کۆکردۆتەوە. سەرجەمی ئەو بەرهەمانە باشترین‌و زیندووترین بەلگەی چالاکی‌و گرنگی ئەو قوتابخانەیەن..

**دانتێ‌و وەرگێڕان.**

گەرچی لەهەمان سەردەمدا، لەهیچ ولاتێکی تری ئەورووپادا، هیچ جۆرە چالاکی‌و جێگەیەکی وەک قوتابخانەی تۆلێدۆمان بەرچاو ناکەوێت، بەلام چەندین بەلگەی زیندوومان لەملاولا بەرچاو دەکەوێت بۆ سەلماندنی بوونی چالاکی وەرگێڕان (بۆ نموونە وەک بەرهەمەکانی دانتێ) کەبێ دودڵی بەلگەی پڕماناو زیندوون بۆ سەلماندنی کاریگەرێتی چالاکی وەرگێڕان لەهەمان سەردەمداو بەتایبەتیش لەڕووی تیۆرییەوە. (Convivio) پەرەگرافێکی پڕ مانا لەنووسینەکانی خۆیدا تەرخان دەکات بۆ کێشەو گرفتە تیۆریەکانی وەرگێڕان کەپێ‌دەچێت لەبیرو بۆچوونەکانی (سان جێرۆلامۆ) وە سەرچاوەی گرتبێ. جێرۆلامۆ دەیووت (ئەگەر کەسێك لەوە تێنەگەیشتبێ کە چۆن وەرگێڕان دەتوانێ جوانی‌و تایبەتمەندی زمانێك بشێوێنێ، ئەوا باهەر خۆی هەولبدات وشە بەوشە "ئۆمێرۆ ـomero" لەلاتینییەوە وەربگێڕێ).

باوای دابنێین کە لەو تێکستەوە سەرچاوەی گرتبێ، هەرچەندە هیچ ئاماژەی پێنەداوە، بەلام دانتێ ئەو بیروبۆچوونانەی هێناوەو لەئەزموونی تایبەتی خۆیدا وەک شاعیرێك زیاتر دەولەمەندی کردوون. بۆیە نووسیوویە: (لەبەرئەوە دەبێ هەموو کەسێك لەوە ئاگاداربێت کە هیچ شتێك نییە بتوانێ دەربڕینی شاعیرانەی پڕ هارمۆنی‌و تایبەتی لەکاتی وەرگێڕانیدا بۆ زمانێکیتر وەکو خۆی بپارێزێ، بێ‌ئەوەی سەرتاپای تام‌وچێژو هارمۆنی ئەو دەقە تێکوپێك نەدات. ئەوە ئەو هۆیەیە کە (ئۆمێرۆ)ی لەشوێنی خۆی هێشتۆتەوە بەبێ جوڵەو بێ وەرگێڕان بۆسەر زمانێکی دیکە، وەك زۆر بەرهەمی ترمان لەوانەوە بۆ ماوەتەوەو وەرمان گێڕاون. هەر ئەمەشە هۆی ئەوەی کە دێڕە شیعرەکانی (سالتێریۆ ـSalterio)، بێ ئاوازو بێ تام‌وچێژو



دانتێ

بــێ هارمۆنیــەتن کــاتێك لــە(عیــبری)یــەوە وەرگێردراونەتــە ســـەرگریکیو لەویشـــەوە وەرگێردراونەتــە ســەر لاتینــی، هــەر لەیەکــەم وەرگێڕاندا کــەمتر ئــەو تــاموچێژو هارمۆنیەتــە گەیەنراوەتــە خوێنــەر، ئینجــا چ جــای دوجــار وەرگێڕان).

لەفەرەنسا، چەند دەهەیــەك پــاش مردنــی دانتێ، لەساڵی ١٣٦٥ی.ز. (کریستینە دی پیزان) نامەیــەکی نوسیوە بــۆ کوڕەکــەی، کــە تیــایدا نموونەیــەکی گــەلێك چەســپاوو توندوتۆڵــی تۆمــارکردووە کــە چــۆن (وەرگــێڕان) یــان (وەرگێڕانێك) دەتوانــرا لــەدایك بێــت. ئــەم دایکــە شاعیرە، ویستویەتی بۆ کوڕەکەی روون بکاتەوەو بڕوای پێبێنێ کە چەند (کۆمێدیــای خواوەندیــی) گرنگــترو بــاڵاترە لــەچاو (Roman de la Rose). ئــەم ژنــە شــاعیرە لــە نامەیــەکدا نووســیویەتی: (گــەر باشــتر دەتــەوێ گوێــت لەوەســفکردنی بەهەشــتو دۆزەخ بێــت، بــاڵاتر گوێت لەباسکردن تیۆلۆژیــابێت، زیــاتر کــەڵکی لــێوەربگرێ، شــاعیرانەترو کاریگــەرتر کــارت تێبکــەن، ئــەو کتێبــە بخوێنــەرەوە کــە نــاوی (دانتێ)یە، یان هــەوڵبدە یەکێك بۆت بگێڕێتــەو، چونکــە بەشــێوەزمانی (فیۆرێنتیــە - زمــانی دانیشتوانی فلۆرەنسا) نووسراوە: چەندین بابەتی ناســکترو بــەهێزترو گرنگــتر لـــەو کتێبـــەدا دەدۆزرێتـــــەوە، کــــە گــــەلێك لـــــە (Roman de la Rose) کــەی خــۆت زیاتر، بەسەبرە جوانەکەی خۆتەوە دەتوانی هەڵیزانینو فێربوونو تێگەیشتنی لێبقۆزیتەوە). پێنج ســاڵ پاش ئەم رێکەوتە، نیکۆڵــی ئۆرێزمــێ - Nicole Oreme، لەپێشــەکی کتێبــی وەرگــێڕدراوی (بەرهەمــەکانی ئەرسـتۆ)دا، بابــەتێك لــەبارەی وەرگێڕانەوە ئەوروژێنێ، کــە دەبێتــە بەیاننامــەی لەدایك بوونــی کێشــەی وەرگێڕان لــە فەرەنســا (١٣٧٠ی. ن)

هەر لەهــەمان ســەردەمدا دوو گــەورە ئــەدیبی ئیتالی (پێترارکە)و(بۆکاچۆ) پێکەوە هەمان خەون دەبینــن، بەهــەمان ئاســتو ئــارەزووەوە، بــۆ فــێربوونی زمــانی گریکــی. لەســاڵی ١٣٥٤دا، پێترارکە، وەك خەڵاتێك لەبێزەنتینەوە کۆپیــەکی لەدەستنووسی (ئەلیادە) پــێ گەیشــتبوو، کــە نیکۆلاس ســیگێرۆس بۆی نــاردبوو، بۆ کــاچۆش وەرگێڕێکی گریکــی زانــی بۆ پــەیداکردبوو: نــاوی (لیۆنتسیۆ پیلاتۆ)ی خــەڵکی (کــەلابریا)ی ئیتالی بــوو. ئــەم وەرگــێڕە قەشــەیە، ناســراو بــوو بەگریکیزان، گوایە لەکاتی خۆیداو بۆ ماوەیــەکی دووو درێژ لەخوارووی ئیتالیادا چەندین بنەماڵــەی گریکــی ژیــاونو ئــەمیش لەوانــەوە فــێربووە، پێدەچێــت هــەر بــۆ خۆشــی کۆنــە گریکــیی نیشتەجێی ئیتالیا بووبێت.. ئەم وەرگێڕە توانی لەساڵی ١٣٦٠ - هــەتا - ١٣٦٤ ئــەو بەرهەمــە وەریگـــــێڕێ(١٠) و ئـــــەوەی ئێســـــتا لەبەردەستماندایەو لەگریکیــیەوە کــراوە بــە لاتینی، بۆ تــێڕوانینو تێگەیشــتنی ئــەمڕۆمان، وەرگێڕانێکی حەرفییە. هێنــدە حەرفیــیە، بــەڵێ وشــەکان کراون بەلاتینی، بــەڵام هیــچ مەفــهوم نییــە، ئەمــەش تەنــها خــەتای وەرگــێڕ نییــەو پێدەچێت تێکستەکە بەگریکییەکی ســەرەتایی نووسرابێت.

### وتاری سێهەم:
### رێنیسانسو نوێبونەوەی وەرگێڕان

گــەر بڵێــین نوێبونــەوەی وەرگــێڕان لەگــەڵ سەرەتای رێنیسانسدا دەستی پــێکردووە. ئەمــە نەك نامەقییە، بەڵکو هەڵەیەکی گەورەیە، چونکە چــالاکی وەرگــێڕان لەســـەدەکانی ناوەڕاســتدا بەهێزو توانایەکی زۆرەوە درێژەی بەنوێبونــەوەی خۆی داوە. وەرگێڕان بەشێوەیەکی گشتی لەهــەر قۆناغێکــەوە چووبێتــە قۆنــاغێکی تــرەوە. گۆڕانکــاری چەندایــەتیو چۆنایــەتی بەســـەردا

هاتووه. بۆ نموونه، لەسایەی دەسەڵاتی ئاین دا، سەدەکانی ناوەڕاست، بوونە دیارترین سەردەمی میتۆدیو وەرگێڕانی حەرفی (دەقاودەق)، بەشێوەی ڕێزگرتن لە نووسراوە پیرۆزەکان، کە هەر هەمووی بەگوتەی خواوەند ناسراون و بەهیچ شێوەیەك دەسەڵاتی ئاین ڕێگە نادات بەدەسکاریکردنی ئەو تێکستە پیرۆزانە: لەفۆرمولەکردنی پێناسەو دەستورە تایبەتیەکانی وەرگێڕاندا، وەرگێڕە ئاینییەکان، پیاوانی کەنیسە، تیۆلۆژەکان، بەتایبەتی سان جێرۆلامۆ، لەم بارەیەوە نووسیویەتی (لە نووسراوە پیرۆزەکاندا، ریزبەندیی خودی وشەکان، بۆ خۆی نهێنیەکی خوایی گەورەیە)(١١). ئا بەم شێوەیە فەرمانی رەها لەو پارێزگاریکردنەوە سەرهەڵدەدا کە پێویستە هەمو دێڕێك لەو تێکستە پیرۆزە لەداڕشتندا چۆنەو چەند وشەیە، بەهەمان ژمارەی وشەکانیەوە وەربگرێدرێتە سەر زمانەکەیتر: ئەمەیە هۆی سەرەکی ئەو پرکێشیکردنەی هەموو رۆحە ئازادەکانی وەك (ئێڤاگرۆ)و تەنانەت (سان جێرۆلامۆ) خۆشیو هەتا دەگات بە (لوتێرۆ)، هەر هەموویان شێلگیرانە دژی ئەو رێزگرتنە بوون لەژمارەی وشەکانی دێربەدێری کتێبە پیرۆزەکان: پرکێشیکردنێك کە ئەمڕۆ بەجۆرێك لەهەرزەکارییو ناکامڵی سەیردەکرێت، بەڵام لەو سەردەمەدا بەتواناترین و کاریگەرترین هەڵوێستی زیندووی بواری ئەدەبو وەرگێڕان بووە.(١٢)

کەواتە پرنسیپی هەرە سەرەکی ئەوە بووە کە تێکستێك لەتێکستە ئاینییە پیرۆزەکان کاتێك وەردەگێردرێتە سەر زمانێکی تر پێویستە وشە بەوشە وەربگێردرێت، ئەمەش بۆ مسۆگەرکردنی باڵاترین وەفادارییو دیاریکردنی سنووری کارکردن لەپێناوی دوورخستنەوەی هەموو جۆرە مەترسیەکی ساختەکاریی لەوشە خواوەندیەکاندا، بەهۆی داڕشتنی نوێی وەرگێرەکانەوە.

لەدەرەوەی بوارە ئاینییەکەدا، بەپێچەوانەوە، هەڵومەرجی وەرگێران لەسەدا سەد جیاواز بووە: وەرگێران هەرگیز ئەوە نەبووە کە تیۆلۆژەکان مەبەستیان بووە لەو سەردەمەدا. نە مەبەستیان لەوەش بووە کە ئەمڕۆ باسی لێوە دەکرێ. وەرگێڕان گواستنەوەی مانا بووە لەزمانێکەوە بۆ زمانێکی تر. هەرئەوەی ئەمڕۆ پێی دەڵێن (سەرلەنوێ داڕشتنەوەی دەقێك) هەندێ جاریش بەسەربەستیو ئازادیەکی زۆرەوە، دەقەکە کورت دەکرێتەوە یان فراوانتر دەکرێ یان گۆڕانکاری زۆری تێدا دەکرێت بەپێی جۆری دەقەکە، بەپێی پێویستی زمانە تازەکە، بەپێی ئارەزووی سەردەمو تایبەتمەندێتی جێگا. ئەم وەرگێڕانە گەلێجار بەجارێکی دیکە نووسینەوە یان جارێکی تر داڕشتنەوە ناوزەد کراون، بەڵام گرنگترین بنەما پاراستنی مانا بووە. ئەم شێوەیەش لەوەرگێرانی بەسەرهاتی ژیانی زۆربەی (سانت - Santi) ەکانداو شیعرە درێژەکانو رۆمانەکانی سەدەکانی ناوەڕاستدا بەکارهێنراوە. لەهەموو ئەم چالاکیانەشدا، بیروبۆچوونو پێناسە دانانی هەرە جدی، نووسینەکانی دانتیو (Maimonide) بوون دەربارەی باش یان خراپ، ئاسان یان گران، رێپێدراو یان یا ساغ کە لەپرۆسەی وەرگێڕانی راستەقینەدا دەریان بڕیوە، ئەو بیروبۆچوونانەش بەهایەکی گەورەو تایبەتیان هەیە. هاوکات لەگەڵ ڕێنیسانسدا، زمانە نەتەوەییە جیاجیاکان لەدایك دەبن، ئەمەش دەبێتە کاریگەرترین هۆی بڵاوکردنەوەی بیرو هۆشمەندیو گەورەترین گۆڕانکاری بەسەر سروشتی پرۆسەی وەرگێڕاندا دێنن، ئەم زمانە نەتەوەییانە لەهەموو بوارەکاندا چ بواری ئیدارییو کارگێری بوویێ(١٣)، چ وبواری ئەدەبی، یاسایی، دیبلۆماسی، فەلسەفی، زانستی بوویێ توانیویانە رۆڵی کاریگەرو دیاری خۆیان ببینن. ئەم گۆرانکاری گەورەیە شان

بەشانی زۆربوونی چالاکی چاپو بڵاوکردنەوە بووە، کە دیسانەوە بۆتە هۆی زیادکردنی ژمارەی جۆرێك لەخوێنەر کە نەلاتینیو نە گریکی بەهیچ جۆرێك نەزانیوە. تەنانەت کەمترین شارەزایی دەربارەی زمانی عەرەبیو عیبری نەبووە. لەقۆناغی دواتردا هەندێ رێبازی ریفۆرمیست پەیدادەبن، کە وەرگێڕانی تێکستە ئاینییە پیرۆزەکان بۆ سەر ئەم زمانە نەتەوەییانە بەپێویست دەزانن، بەڵام وەرگێڕانی لەجۆری حەرفیو دەقاودەق رەت دەکەنەوەو پرکێشی دەکەن کە بەشێوەی وەرگێڕانی ماناییو سەرلەنوێ داڕشتنەوەی ئەو تێکستانە ئەنجام بدرێت، مانای راستەقینەی تێکستەکان بگۆڕنە سەر ئەم زمانانە، ئەو مانایانەی کە کەنیسە بەردەوام لەبیر خۆی دەبردەوە، چونکە نەیدەویست بەهیچ جۆرێ ریفۆرمی بەسەردا رووبدات. هەر لەهەمان سەردەمدا هێدی هێدی خەڵکی خۆیان دەپاراست کە وشەی (زمانی میللی یان زمانی رەشە خەڵك) لەبەرامبەر ئەم زمانە نەتەوەییانەدا بەکاربێنن، لەچاری زمانی لاتینیدا، کە هەمیشە ئەوەیان دوپات کردبۆوەوە کە تەنها زمانی لاتینی، تەنیا زمانی دنیایە، تەنیا زمانی شایستەو بێگرێوگۆڵە. لەراستیدا (Du Bellay) هێشتا بەزمانی فەرەنسی دەڵێت زمانی رەشە خەڵك، یان زمانی سەر جادە، وە یان (Etienne Dolet) کەلە تێکستەکەی خۆیدا تەنها جارێك ئەم وشانە بەکاردەهێنێ، ئەو دەنووسێ: بەرامبەر زمانی سەرجادەی فەرەنسی، ئیتالی، ئیسپانی، ئەڵەمانی، ئینگلیزی، دەبێ وشەی زمانی فەرەنسی، زمانی ئیتالی.. هتد بەکاربهێنین، هەروەك چۆن دەوترا زمانی لاتینی، زمانی گریکی. لەم سەردەمەدا (لۆتێرۆ ـ Lutero ) لەساڵانی (١٥٢٢ هەتا ١٥٣٤) یەکەمین وەرگێڕانی سەرتاسەریی (ئینجیل) تەواو دەکات بۆسەر زمانی ئەڵەمانی. لەهەمان ئەو ساڵانەدا (نامیلکەیەك دەربارەی وەرگێڕان) دەنووسێ بەناونیشانی (Sendbrief vom Dolmetschen) کە تیایدا زۆر بەتوندی بەرگری دەکات لەو راستییەی کە وەرگێڕان پێویستە کاتێ ئەنجام بدرێت، کە وەرگێڕ مانای شاراوەی تێکستەکە تێدەگاو دەدۆزرێتەوە. هەر ئەویش لەم بارەیەوە دەڵێت: نە کریستیانێکی ساختەچیو نەیەهودییەك دەتوانن هەرگیزاو هەرگیز ئینجیل بەچاکی وەربگێڕن. پێویستە گوێزانەوەی تێکستەکە لە زمانی (رۆیشتوو)ەوە بێت بۆ زمانی (گەیشتوو). ئەمەش گوێزانەوەی حەرفەکان نەبێ، بەڵکو ماناو ناوەڕۆکی هەموو قۆناغەکانی ئەو گوێزانەوەیە بێت: چونکە رێزگرتنی بێسنووری وشەکانی تێکستەکە لاتینیەکە، ماناکان دەکوژێ، زمانی ئەڵەمانی دەکوژێ: هەر لوتێرۆ خۆی دەنووسێت (پێویست ناکات پرس بەوشە لاتینییەکان بکەین تا فێرمان بکات چۆن ئەڵەمانی بنووسین. پێویستە لەماڵدا رووی دەم بکرێتە دایك، لەسەر شەقام روبکرێتە منالْ، لەناو بازاڕدا رووبکرێتە پیاوی بازاڕ، دەبێ دیقەت بدەین دەمو زمانی ئەمانە چۆنە، چۆن ئاخافتن دەکەن، بۆ وەرگێڕانی ئەمانەش دەبێ رێز لەو شێوە تایبەتیەی فێربوونو پەروەردەبوونیان بگرین، تەنها بەم رێگایە ئەوانە لەئێمە تێدەگەنو هەست دەکەن بەئەڵەمانی گفتوگۆیان لەگەڵا دەکرێت).

کەم تازۆر لەهەمان سەردەمدا (ساڵی ١٥٣٥) Calvinisti (کالڤینیست)ەکانی شاری جنێف لەلای خۆیانەوە لەتێکستە عیبریو گریکییەکەوە دەست دەکەن بە وەرگێڕانی (ئینجیل) بۆ سەر زمانی فەرەنسی؛ هەرچەندە ئەمە یەکەمین هەوڵی بەفەرەنسیکردنی (ئینجیل) نییە، چونکە بەرلەمەو یەکەم هەوڵ لەلایەن(Lefevre d' Etaples ١٤٥٠ ـ ١٥٣٧)[14]ەوە دراوەو لەبەرگەوە بۆ بەرگ (ئینجیل)ی کردووە

بەفەرەنسی. لەهەمان ئەو ساڵانەدا قەشەکانی مۆراڤی، هەڵگرانی ڕێبازی (Johann Huss) بۆ یەکەمین جار ئەم تێکستە پیرۆزەیان وەرگێڕاوەتە سەر زمانی (چیکی). بەمەش بناغەی زمانی وێژەیی بۆ گەلی چیك دارێژرا. لەساڵی ١٦١١دا بەناونیشانی (ئینجیلی ئینگلیزی بەپێی دارشتنەوەی شا یەعقوب ـ Re Giacomo) ئینجیلی ئینگلیزی چاپو بڵاوکرایەوە بەزمانی مۆدرێنی ئینگلیزی، کە بووە بەیەکەمین نموونەی ئەم زمانە تازەیە هەروەك چۆن وەرێگرانەکەی (لوتێرۆ)، یەکەمین نموونەی زمانی ئەڵەمانییە. لەڕوویەکیترەوە شان بەشانی شەڕی ئاینی دەتوانین بڵێین، شەڕی وەرگێڕانیش بەرپابووە: بۆ سەلماندنی ئەم رایەش. کەنیسەی کاپۆلیکی بەپەڕی دەسەڵاتەوە داکۆکی خۆی کردووە لەبیرو بۆچونە ئوتۆکراتیە تایبەتیەکانی خۆی دەربارەی تێکستە ئاینییە پیرۆزەکان. رایگەیاندووە کە تەنها هەیئەتی کەنیسەی "ئیکلیچی" میراتگرو پارێزگاریکاری ئەو تێکستانەیە، هەر ئەمانیش بەبریارێکی (سان کۆنچیلیۆ)ی شاری ترێنتۆ کە دەبێت ئاگاداری ئەو تێکستە ئاینییە پیرۆزانە بین کە دەکەونە بەرچاوی خەڵك: هەرهەمان (سان کۆنچیلیۆ) بەئەرکێکی پیرۆزی زانیوە بۆ کەنیسەی خوا کە بزانێت و ئاگادار بێت و خەڵکی هوشیاریکاتەوە کە کام لەو هەموو تێکستە وەرگێڕدراوانە لەلاتینیەوە پەسەندکراوی شارەزایانی ئاینییە. لەبەرئەوە فەرمانێك دەردەکات و رایدەگەیەنێ کە لەهەموو وانەوتنەوە گشتییەکاندا، لەبڵاوکراوەکاندا، لەگفتوگۆکاندا، لەباسکردنی پەیامی پێغەمبەراندا، لەگێڕانەوەی مێژووی ئاینەکاندا، پێویستە رەچاوی ئەو سەرچاوە پەسەندکراوانە بکرێت کە ئەو باسانەیان لێ وەرگیراوە.(١٥) بەتایبەتی سەرچاوە هەرە دێرینە پەسەندکراوەکان کەمێژوویەکی دووروردرێژە لەلایەن کەنیسەوە باوەڕپێکراون(١٦). لەبەرامبەری ئەم وەرگێڕانە حەرفیو دەقاودەقەدا کە زۆر لایەنی گرنگی تێدا بزربووەو وەرنەگێڕدراوە. گروپێك لەداکۆکیکارانی وەرگێڕانی ئازاد پەیدادەبن کەبڕوایان بەمەفهومی دیموکراتیانەی وەرگێڕانی تێکستە پیرۆزەکانە: لەبەرئەوەی ئەم دەقە ئاینییە پیرۆزانە دەکەونە بەردەستوچاوی هەمووکەس کەواتە دەبێت گەلێك روون و ئاشکراو مەفهوم بێت ـ ئەمەش تەنها لەرێگەی زمانی نەتەوەیی خەڵکەوە ئەنجام دەدرێت ـ واتە دەبێ وەرگێڕانی سەرجەم واتای ئەو دەقانە بێت بەزمانێکی پاراوی خەڵکی ئیماندار، نەك وەرگێڕانی حەرفیو دەقاودەق لەلاتینییەوە. (هەر لەبەرئەمەشە کەئینجیلی گروپی کالڤینیستەکان ئەوەی لەبیرنەکردووە کە کەنیسەی گریگ خاوەنی بەلایەنی کەمەوە هەشت جۆر دارشتن و وەرگێڕانی دەقە پیرۆزەکانە بەزمانی گریکی؛ چونکە ئینجیل وەرگێڕدرابووە سەر زمانی ئارامیو سوریای کۆن و فەلەستینی کۆن و قبتیو: خودی سان جێرۆلامۆ خۆشی (هەستی بەمەترسیەکی زۆر دەکرد کە ئینجیل وەربگێڕێتە سەر زمانی هاونیشتمانیەکانی خۆی)؟ بەیەکدادان و مل ملانێی نێوان کاتۆلیکەکان و ریفۆرمیستەکان لەسەر خودی چالاکی وەرگێڕان خۆشی، مەسەلەیەکی هەروا سادەو پەیوەندیدار نەبووە تەنها بەمەعناو واتاوە، لەڕووی فۆرمو رێنووسو وەرگێڕانی حەرفییەوە، بگرە کێشەیەکی گەلێ قوڵتر بووە لەولای هەموو ئەم شتانەوە).

بە پێچەوانەی بوارە ئاینییەکەوە، لەبوارە گشتییەکەدا جگە لەوەی زۆر بەکتوپڕی ژمارەی بەرهەمە وەرگێڕدراوەکان زیاد دەکات، لەچەندین لاوە پێناسەو رێسای گەلێ ووردترو گونجاوتر بۆ هونەری وەرگێڕان دادەهێنن. ماوەیەك لەمەوبەر باسی بۆچونەکانی (لوتێرۆ)مان کرد(١٧). دەساڵ

پاش (لوتێرۆ)، (Etienne Dolet) دێت، لەوتارێکی چکۆلەی چوار لاپەڕەیدا بەناونیشانی (باشترین شێوەی وەرگێڕان لەزمانێکەوە بۆ زمانێکی دی) لەسنوری بەیاننامەو راگەیاندنێکی کۆمپلێتدا، زۆر بەووردیو هوشیاریەوە باسی وەرگێڕان دەکاتو (٥) یاسای بنەڕەتی بۆ دادەنێ، کە تا ئێستەش ئەو یاسایانە بەزیندوویی و کاریگەریی ماونەتەوە:

١/ پێویستە وەرگێڕ زۆر بەباشی لەبابەتو مانای دەقەکە تێبگاتو مەبەستو نیازی نووسەریش حالّی ببێ لەهەڵبژاردنو دەربڕینی ئەو بابەتەدا.

٢/ پێویستە بەهەمان ئاستی زمانی وەرگێڕانەکە، زمانی دەقە ئەسڵییەکە بزانێ. (واتە: بەهەمان شارەزایی لەکوردیدا، بۆ نموونە، فارسی یان عەرەبی یان.... هتد بزانێ، ئینجا ئەو دەقە لەو زمانەوە بکاتە کوردی - وەرگێڕ)

٣/ نابێ وەرگێڕ بەهیچ شێوەیەك رێگەبدات بکەوێتە ژێر کاریگەریی وەرگێڕانی حەرفی یان دەقاودەقی نووسینەکەوە.

٤/ دەبێ وەرگێڕ لەوشەو دەستەواژەو شێوەی بەکارهێنانی زمانە ئەسڵیەکە دوورکەوێتەوەو بەزمانێکی فەرەنسی باش بنووسێ کە لەلای خەڵکی فەرەنسا مەفهوم بێت (واتە: لەئوسلوبی زمانی دەقە ئەسڵیەکە دوورکەوێتەوەو بەئوسلوبی زمانەکەی خۆی وەرگێڕانەکە دابڕێژێ - وەرگێڕ)

٥/ دەبێ وەرگێڕ هەوڵبدات (stile - طراز)ی جوانی خۆی هەبێت، زمانی پاراو و دارشتنی نەرمو خۆشئاواز بێت، رێنووسی یەکگرتووبێت، بەهونەرمەندانە بنووسێو وشكو برینگ نەبێت.

لەساڵی ١٥٤٨دا (تۆماس سەبیلێت - Sebillet) چالاکی وەرگێڕانی وەك جۆرێك لەجۆرەکانی نووسینی ئەدەبی ریزبەندکرد، ئەمەش تەنها رەنگدانەوەی بایەخو گرنگی وەرگێڕان دەردەخا لەو سەردەمەدا: بەهەمان شێوە (Dolet)و(Du Bellay) بەجووتە لەو باوەڕەدابوون کە وەرگێڕ ئەو کەسە داهێنەرەیە کە ئەندامێکی چالاکە لەخێزانی گەورەی نووسەرانداو پێویستە سەرجەم مافەکانی وەك نووسەر پارێزراوبێت. (Sebillet) لەنووسینەکەیدا دەڵێت (وەرگێڕان شێوە شیعرێکی هەرە باوە لەمڕۆمانەدا، زۆر بەجوانیو چاکی لەلایەن شاعیرانو پیاوانی رووناکبیرەوە قبول دەکرێ)(١٨). پاش ساڵێك (Du Bellay)ی بەسێ وتاری دووردرێژ چالاکی وەرگێڕان پیرۆز دەکات، لەکتێبێکیدا بەناونیشانی (Deffence et illustration de lalangue francaise): وتارەکان ئەمانەن: -

*زمانی فەرەنسی هەژارنییە، وەك زۆر کەس وای دەبینێ

*وەرگێڕان بەس نییە بۆئەوەی ستراکچەرێك بدات بەزمانی فەرەنسی

*لەبارەی وەرگێڕە بێ تواناکانەوەو لەبارەی ئەو پێویستیەوە کەشاعیران خەریکی وەرگێڕان نەبن.

هەروەها (Montaiogne) لەلای خۆیەوە وەك خەمخۆری هەموو تەنگوچەڵەمە هەرە زیندووەکانی سەردەمەکەی خۆی، لەبارەی وەرگێڕانیشەوە دەدوێو(١٩) وەك هەمیشە بەپێوەری ئامادەوە، تەعبیر لەبۆچوونو رای خۆی دەکات: لەدژی یاساو پرینسیپەکانی (Du Bellay) کە دەڵێ هەرگیزاو هەرگیز نابێ شیعر وەربگێردرێ، نووسەری (Essais) لەو سنورەدا رایدەگەیەنێ: (گەلێ مایەی خۆشحاڵیە بەرهەمی ئەو نووسەرانە وەربگێڕی کە تەنها ناوەڕۆك بگەیەنیتە خوێنەر: بەڵام گەلێك ترسناکە بەرهەمی نووسەرێك وەربگێڕی کە گەیشتۆتە ئاستێکی گەلێك بەرز لەدارشتنو هونەری نووسینو خەیاڵفراوانیو فەنتازیادا، کە

دەرئەنجام بەرهەمەکەی دەبێتە ئیدیۆمێکی گەلێ لاوان).

کەواتە، بەشێوەیەکی گشتی، هۆکارە ئایدۆلۆژیو ئاینیو فەلسەفیەکانی ڕێنیسانس توانیویانە ئەو گەمارۆیە بشکێنن کە بەناوی (Versio)ی سەدەکانی ناوەڕاستەوە بەسترابوو لەدەوری وەرگێرانی حەرفی؛ هەروەها توانیویەتی بەهۆی بەرهەمە وەرگێردراوە گەورەکانی (چیچێرۆن، ئۆراتسیۆ، سان جێرۆلامۆ)، سەرجەم تەنگوچەڵەمە گەورەکان لەچوارچێوەیەکدا کۆبکاتەوەو بزانێ چۆن بەقوولیی لەبارەیانەوە گفتوگۆ دەکات. بەم شێوەیە لەنیوەی دووەمی سەدەی شانزەدا (Peletier du Mans) - ئۆدیسە وەردەگێڕێ و هەست دەکەین تەنانەت ئەو هەستی ڕێزگرتنە لەجیاوازی شارستانیەت لەوەرگێڕانەکەدا رەنگی داوەتەوە، ئەمە بەمەرجێك هێشتا چەند سەدەیەکی ماوە ئەو جیاوازی شارستانیەتە پاش درك پێکردنی پەسەندبکرێت. لەپێشەکی ئەو وەرگێڕانە شیعریەدا (Peletier) زۆر بەتوندی بەرگریو داکۆکی لەوە دەکات کە پێویستە ڕەنگوبۆی ناوچەییو ناوەکانو تایبەتمەندیی شوێنی ڕووداوی ئەو بەسەرهاتانە لەوەرگێڕانەکەدا بپارێزێ، هەرخۆی لەم بارەیەوە پەرەگرافێکی پڕ مانای نووسیووە (دامالینی بۆنو بەرامەو تایبەتمەندێتی ناوچەییو فەرهەنگیو زمانەوانیو مێژوویی لەوەرگێڕانەکەمدا، واتە دامالینی هەموو لایەنە جوانەکان لەدەقی (ئۆدیسە). دامالینی شێوەی جلوبەرگو شێوەی ژیانو گوزەرانی ئەو سەردەمە کۆنەی گریك لەبەرهەمەکە، ئەمەش بەو بیانووەی کە ئەو تایبەتمەندیانە گەلێك عەنتیکەو سەیرن بۆ ئەمڕۆمان).

لەلایەکی ترەوە دەتوانین بڵێین، گەشەکردنی بزوێنەی وەرگێڕان بەو پێوەرە بێوی، کە چەندین فەرهەنگی لێکدانەوەی مانای وشەکانی دو زمان بەرامبەر یەکتری زۆر بەکتوپڕی پەیدابوونو بەژمارەش هەتا دەهات هەر ڕوو لەزیادبوون بوون.

هەر لەو سەردەمەدا چەندین زمانزانی پسپۆر پەیدابوون کە شارەزایی یەکسانیان لەچەند زمانێکدا هەبوو. ئەمانە کەوتنە بەئەنجام دانی فەرهەنگی (٨) زمانی وەك: گریگی، لاتینی، فیامینگۆ، فەڕەنسی، ئیسپانی، ئیتالی، ئینگلیزی، ئەڵمانی.. قاموسێکی ئەم هەشت زمانە بەیەکەوە لەساڵی (١٥٥٠)دا دروستکراوە. لەساڵی ١٦٧٧دا قاموسێکی (١١) زمانی دروستکراوە جگە لەو هەشت زمانە: عیبری، گالیسی، پورتوغالی، بۆ زیادکراوە. بەم شێوەیە بزوتنەوەی دروستکردنی قاموس ساڵ لەدوای ساڵ پەرەیسەندووە. لەوانەیە لەم کۆتاییەدا ئەوە زۆر گرنگ بێت بەلایەنی کەمەوە بۆ جیهانی کەلتوریی فەڕەنسی، کە ئاماژە بەو مەزھەبە نوێیەی وەرگێڕان بکەین کە ڕێنیسانس توانیویەتیو زانیویەتی بەرهەمی بهێنێ.. هێندەش بەسە کەئاماژە بەساڵانی کۆتایی سەدەکانی ناوەڕاست بکەین کە تەنها دوو دەست نووسی وەرگێردراوی (کۆمێدیای خواوەند) یان بەرچاوکەوتبوو، ئەو دوو دەست نووسەی کە هەرگیز بڵاونەکراونەتەوە: وەرگێڕانێکی بێ ناوی (دۆزەخ) لەسەر شێوەی شیعر دۆزراوەتەوە کە لەسەدەی (پانزەدا) وەرگێردراوە، ئەم وەرگێڕانە بەشێوەی دەست نووس ماوەتەوەو کە تا ئەوکاتە بەچاپ نەگەیەنرابوو) لەساڵی ١٨٩٧دا لەکتێبخانەی نیشتمانی زانکۆی تۆرینۆ دۆزراوەتەوە: دەستنووسێکی تری وەرگێردراوی هەمان دەق (کە ئەویش هەرگیز بڵاونەکراوەتەوە) کە دیسانەوە بەشێوەی شیعر نووسراوەتەوەو کاتی ئەنجامدانی دەگەڕێتەوە بۆ ساڵانی سەرەتای سەدەی (شانزەهەم)، ناوی خاوەنەکەی نەدۆزراوەتەوە، بەڵام توانرابوو

دەسـت نووسـەکە لەسـاڵی (١٨٧٩) وە لەکتێبخانەی پاشایەتی ڤیەننا بپارێزرێ.

لە کۆتایی سەدەی (شانزەهەمدا)، بەتایبەتی لەساڵی (١٥٩٦)دا، وەرگێڕانێکی کۆمپلێتی (کۆمێدیای خواوەندیی) دەکەوێتە بەرچاو کـە لەبەرگەوە بۆ بەرگ، بەشێوەی شیعر وەرگێڕدراوە: ئـەم بەرهەمە لەلایەن (Balthazar Grangier)ەوە ئەنجامدراوە.

ئـەم بەرهەمە بۆماوەی دوسەد ساڵ توانی لەسەرخوانی فەڕەنسیەکان بمێنێتەوە (هەر ئەم دەقە وەرگێڕدراوەی (Grangier) بووە، کـە لەلایەن لویجی شانزەهەمەوە لەیەندیخانەدا، چەند هەفتەیەك بەر لەسێدارەدانی بۆ چەند جارێك (بەهەشت)ی دانتێی خوێندۆتەوە، ئەمەش لەزیندانی ئەو کەنیسە گەورەیەی کە تیایدا بەندکرابوو).

لەکۆتایی سەدەی شانزەهەمدا، وەرگێڕان دەبێتە یەکێك لەبەرهەمە نووسراوە گرنگەکانی کە خەڵکی بەکاریدێنن و بەدوایدا دەگەڕێن و دەیخوێننەوە، ئەگەر نەیڵێین، دەبێتە بەرهەمی باوی ئەو سەردەمە، بەلایەنی کەمەوە دەتوانین بڵێین کەئیتر چیتر وەرگێڕان بەرهەمێکی دەگمەنی ناو رۆشنبیری ئەو وڵاتانە نەبووە.

پەراوێز:

*کتێبی (تیۆرە ومێژووی وەرگێڕان ـ Teoria e storia della Traduzione)

نووسینی: جۆرج مۆنین

وەرگێڕانی بۆ ئیتالی: ستیفانیە مۆرگانتی)

یەکێکە لە کتێبەکانی زنجیرەی (کتێبخانەی چکۆلەی ئیناودی) شاری تۆرینۆی ـ ئیتالیا ـ کەتایبەتە بە(فیلۆلۆژیا، زمانەوانی، رەخنەی ئەدەبی).

ـ بەشی دووەم ـ لەم کتێبە بەناونیشانی (چەند ئاماژەیەکی مێژوویی) یان: ـ (چەند کورتەیەکی مێژوویی هونەری وەرگێڕان) ە. لەلاپەڕەکانی (٢٧ هەتا ٦٧) لەبەر دووروودرێژی ئەم بەشە کردمان بەدوویەشەوە. (٢٧ هەتا ٤٥) بەشی یەکەم و (٤٦ هەتا ٦٧) بەشی دووەم.

ئەمەش ناونیشانی دەقەکەیە:

Georges Mounin
Teoria e Storia della Traduzione.
Piccola Biblioteca Einaudi – Torino
Quint edizione – 1982

*

1) CaRY,E,La traduction dans le monde moderne,

بەتایبەتی لەلاپەڕەکانی ١ ـ ١٠.

2) FEDOROV A.V.,Vvedenie u teoriju perevoda

بەتایبەتی لاپەڕە (٢٠).

هەروەها

- THIEME, HERMAN e GLASER, Beitrage Zur Geschichte des Dolmetschens, Isar – Verlag, Munchen 1956. P.79 (لاپەڕە ٧٩)

لەم سەرچاوەیەدا زیاتر لە (٢٠٠ دوسەد) نموونەی وەرگێڕی فەوریمان دەخاتە بەردەم کە وەك بیبلیۆگرافیایەك بۆ ئەو وەرگێڕانە کراوە لەمێژووی کۆنەوە هەتا ئێستە. لەسێهەم سەدەی بەر لەزانییەوە دەست پێدەکات هەتا سەدەکانی ناوەڕاست و پاشان بۆ سەردەمی مۆدێرن.

3) BERNATZIK,H. A., les esprits des feuilles jaunes, لاپەڕە/ ١٦٩

4) LEVI – STRAUSS,C., Tristes tropiques.

٥) لەشاری (رۆما) یەکەمین بەرهەمی وەرگێڕدراو بەئازادیی بڵاودەکرێتەوە لەساڵی ١٤٦ی بەر لەزاینی. ئەنجومەنی پیران ـ رێکەوتن نامەی کشتوکاڵی (Magone Cartagines) وەردەگێڕێت.

6) LARBAUD,V., Sous l'invocation de saint Jerome, NRF,Paris 1946, ...(٧ـ٥٦) لاپەڕە

٧) ناونیشانە بەناوبانگەکەی بەرهەمی شاکاری (C.K.Ogden) و (I.A. Richards) ـ (نیویۆرك ساڵی ١٩٤١)ە.

٨) پاپای ئەو سەردەمە (ئینێنیۆچێنتسۆی چوارەم) نامەیەك بۆ سەرۆکی زانکۆی پاریس دەنووسێ لە (١٢٤٨/٦/٢٢)دا. داوای چەند خوێندکارێکی لێدەکات کە زمانی عەرەبی و زمانە خۆرهەڵاتیەکانیتر بزانن: ئەمەش نابێتە بەڵگەی ئەوەی کە لەسەدەی سیانزەهەمدا لەپاریس قوتابخانەیەکی تایبەت بەفێربوونی ئەو زمانانە هەبووبێ. چەند ساڵێك دواتر.. لەسەردەمی

فەرمانڕەوایی (Filippo il Bello) کە پاش ساڵی ١٢٨٥ دەسەڵات دەگرێتە دەست. (Pierre Dubois) لەنووسینێکیدا بەناونیشانی (De recuperatione terrae sanctae) پێشنیازێك پێشکەش دەکات کە پەیمانگەیەك بکرێتەوە تایبەت بەو وەرگێڕە فەوریانەی کە شارەزاییان لەزمانە خۆرهەڵاتییەکاندا هەبێت، ئەمەش بەو مەرجەی خوێندکار لەمێرد منداڵییەوە وەربگرێت.. بەڵام ئەم پێشنیازە تەنها بەنووسراوی مایەوەو جێبەجێ نەکرا.

٩) بیبلیۆگرافیایەکی تایبەتی بەم باسە لەگۆڤاری (Babel) ژمارە (٤)ی ساڵی ١٩٦٠دا بڵاوکراوەتەوە لەنووسینی:
DUNLOP. D. M., The Work of Translation di Toledo, لاپەڕەکانی (٥٥-٥٩)

١٠) بڵاوکراوەتەوە لەلایەن (T. Hortis)و(H. COCHIN,) بەناونیشانی (Boccace) لەپاریس ساڵی ١٨٩٠. لاپەڕە (١٥٣).

١١) (De optimo genere interpretandi) ئەم شێوەی مامەڵەکردنە، بۆ نموونە: لەشێوازی تایبەتی ئینجیلی ئێمەدا، توانیویەتی بەرامبەر زمانە لاتینییە نوێکان (Neolatine)، چەندین هەڵۆی زمانەوانی دروست بکات کە لەدارشتنەکەی (سێتانتە)دا پێشتر هەست پێکرابوو: بۆ نموونە وەك زیادبوونی ژمارەی وشە داتاشراوەکان، یان وشەی نەگونجاو لەسەرەتای رستەدا.. هتد.

١٢) هەروەك (Fulke) : -
(To translate precisely is not to observe the number of words).

١٣) لەفەرەنسا، لەسەر داوای (Villers Cotters -) لەساڵی ١٥٣٩دا (فرانچێسکۆی یەکەم) بڕیار دەدات کە پێویستە تەنها زمانی فەرەنسی لەنوسینو بەڵگەنامەو نووسراوەدەوڵەتیەکاندا بەکاربێت.

١٤) ئینجیلی جنێف، وەرگێڕانێکی فەرەنسی ئینجیلی لەبیرکردووە کە لەسەردەمی فەرمانڕەوایی (کارلۆی پێنجەم)ی فەرەنسادا (ساڵانی ١٣٣٧ – ١٣٨٠) ئەنجام دراوە، کە زۆر دواتر بڵاوکراوەتەوە. تەنها باسی ئەو وەرگێڕانە فەرەنسییەی ئینجیلی کردووە کە لەسەردەمی فەرمانڕەوایی (کارلۆی هەشتەم)ی فەرەنسادا ئەنجام دراوە ساڵانی (١٤٧٠ ـ ١٤٩٨).

١٥) بۆ خودی ئەو پرنسیپانەی دەسەڵات خۆیان (La Vulgata) بۆ ماوەیەکی دوورو درێژ لەلایەن کەنیسەوە بەکارهێنراوە. چەندین لاپەڕەی (De optimo genere interpretandi) زنجیرە نموونەی یەك لەوی دیکە خراپتری تێدایە کە دارشتنە گریکییەکەی (سێتانتە) بەکاریهێناونو لەتێکستە عیبریەکەوە وەریگێڕاوە، تەنانەت زۆربەی (ڤاتجێلیست)ەکان تا ئێستاش هەر بەهەڵە وەریدەگێڕن. بەڵام (سان ئەگۆستین) پێشنیاز دەکا هەموو ئەو هەڵانە راست بکرێنەوە کەسان جێرۆلامۆ دەستنیشانی کردون بەپێی ئەم سۆفستە (Sofista) : (ئەگەر شتەکان نادیارن، لەوانەیە کە تۆ خۆت هەڵە بیت: ئەگەر شتەکان ئاشکرابوون، ئەوا لەوەدەچێت کە (سێتانتە) خۆیان هەڵە بوویێتن).

١٦) لەلایەن (Calvino) وە باسکراوە لە: -
Critigues du Concile de Trente et remede contre le Poison.

١٧) ئینجیلی کالڤینیستەکان، لەوەی لوتێرۆ، کەمتر ئازایانە هاتۆتە پێشەوە: هەمان ئەو نوسەرانە رایانگەیاند کە بەهیچ شێوەیەك نەکەوتوونەتە ژێر کاریگەریی هیچ شێوەو جۆرێك لە دارشتنە جیاجیاکانی ئینجیلەوە. بەلکو بەئازادیەکی تەواوەوە کارەکەمان ئەنجام داوە، بەپێی ئەوەی کەچەند بەدڵی (خوای گەورەو مەزن) بێت. لەشوێنێکی تردا نووسیویانە: (هێندەی مەسەلەکە پەیوەندی هەیە بەعیبریەکەوە، ئێمە وشە بەوشە ئەو بەشانەی کەبۆ هەموان ئاشکران وەرمان گێڕاوە، بەپاراستنی تایبەتمەندی خۆیەوە، کە لەمەزیاتر لەتوانادا نییەو ناکرێ بەدەسکارییەوە وەربگێڕدرێن بۆ سەر زمانی خۆمان کە لەوانەیە ماناکەی ون ببێ. لەگەڵ هەموو ئەمانەشا، هێندە تەمەنیان هەیە کە ناتوانرێ بەئاسانی، لەبیربکرێن یان لەتەمومژدا غەرق بکرێن.. بەڵام بەشەکانیتر، تاموچێژمان پێبەخشیوون، ئێستا بالەم بارەیەوە هەندێ شتیتر باس بکەین (.......) لەم حاڵەتەی دوایدا دەستەواژەکان دەگۆڕدرێن کە لەزمانی خۆماندا دایان دەرێژینەوە، بەڵام لەهەندێ شوێنی دیکەدا ناچاربووین کە تاموچێژەکە کەمتر بکەینەوە.. سەرەڕای ئەمانە هەرهەمووین لەسەر سنورەکانی ئازادیی لەوەرگێڕاندا زۆر بەتوندوتۆڵی رێکەوتووین.. تەنانەت لەوەرگێڕانیشدا خۆمان بەناچاری یەکتری دەزانی کە هەر هەموومان لەبەرامبەری وشەیەکی عیبریدا یان گریکیدا هەمان وشە بەکاربێنین..

18) SEBILLET,TH.,Art poetique
١٨) بەرگی (٢) francais, Paris – 1548 لاپەڕە(١٤)

١٩) بەتایبەتی لەماوەی مانەوەی لە رۆما: رۆژنامەی (il journal de voyage Bordas, Paris 1948,) لاپەڕە (١٢٨).

# کەلتوری گریك لەقۆناغی کلاسیکی‌دا

■ کالدویل‌و مێریل

• و: ئازاد صدیق محمد

دەسکەوتە سیاسی‌و کەلتوری‌یەکانی گریك، بەشێوەیەکی سەرەکی دەسکەوتی ئەو خەڵکەبوون کەلەئەسینادا دەژیان. لەقۆناغی کلاسیکی مێژووی گریك دا (لەنزیکەی ناوەڕاستی سەدەی هەشتەمەوە تانزیکەی ناوەڕاستی سەدەی چوارەمی پێش زایین) ئەسینا هونەرمەندی بەتوانا، نووسەری ناودارو بیریاری دانای پێگەیاند کەناوبانگیان خەلکی داهێنەرو دانای شارەکانی دیکەی بەرەو ئەسینا رادەکێشا. پێریکلس، لەچوارچێوەی راگەیاندنی سەرکردایەتی سیاسی‌و کەلتوری ئەسینادا، لەکتێبی (ئەسینا قوتابخانەی هیلاسە) نووسیویەتی: حکومەتی دیموکراتی ئەسینا، پیشەکانی خەلکەکەی، پەروەردەو خوێندنی لاوەکانی، ژیانی کۆمەلایەتی‌و ئاینی هەموو پێکەوە یارمەتی ئەوەیان دا ئەسینا ببێتە مەلبەندی گریك.

ئایینی گریکی رۆڵێکی مەزنی گێڕا لەهەموو قۆناغێکی ژیانی هەموو گریکەکان دا. گەمەو وەرزشیان سروشتێکی ئایینیان هەبوو. هونەری بیناسازی‌یان، هونەریان‌و شیعریان یەکجار زۆر کەوتبوونە ژێر کاریگەری ئاینەوە. فیستیڤالە ئاینی‌یەکانی گریك دەرفەتیان دەرەخساند بۆ شانۆکاران تاشانۆگەری بنووسن‌و بەرهەم بهێنن. دەسکەوتە ئەدەبی‌و هونەری‌یە مەزنەکانی ژیاری گریك بەشێوەیەکی سەرەکی بەسای ئاینەوە ئەنجام دران.

لەکاتێك دا گریکەکان بیری لێکۆڵینەوەیان هەبوو، سەرنجی رابردوویان داو مێژوویان نووسی. ئەو گریکانەی تر کەشانۆگەرییان نووسی هەولیان دا ئەوە بدۆزنەوە کەدەبێت باشترین شێوەی شانۆیی بێت. کاتێك ناچار دەبوون وتار بدەن هەولیان دەدا باشترین جۆری ئاخافتن




بدۆزنەوە. پیاوانی بەتواناو حەکیمی دەوڵەتی گریك هەستیان کرد لەچوراچێوەی ئەرکە گشتییەکانیان دا ناچارن وتاریدەن بۆ خەڵکیو سەبارەت بەرووداوە تراژیدییەکانو پرسە سیاسییەکان بدوێن هەر ئەو پیاوانەی دەوڵەت وتاری زارەکی رەوانبێژی ئەوتۆیان داوە کەبۆ ئێمە بەجێماون. ئەو گریکانەیتر کەقایل نەبوون بەلێکدانەوەی باوی، پەسەندکراو لەنێو گشتی خەڵکیدا، سروشتی گەردوونو مەبەستی ژیانی مرۆڤ دەستیان کرد بەلێکۆڵینەوە لەزانستو فەلەسەفە.

لەسەردەمی پێریکلێسدا (٤٦١ ـ ٤٢٩ پ.ز) هاووڵاتیانی ئەسینا لەسایەی شێوەیەکی دیموکراتی حکومەتدا دەژیان، لەکاتێکدا هاووڵاتیانی ئەسینا لەسەردەمی پێر یکڵیس دا خۆیان فەرمانڕەوایی خۆیان دەکرد، هاووڵاتیانی هەندێك لەشارەکانی ـ ویلایەتەکانی ـ تری یۆنان دا لەلایەن پادشاکان، هەندێکیان لەلایەن ئەریستۆکراتەکانەوە، بازرگانە دەوڵەمەندەکانەوە، یاخود خاوەن زەوییەکانەوە، هەندێکیتریشیان لەلایەن چەوسێنەرەکانەوە فەرمانڕەوایی دەکران، خەڵکی ئەسینا بیرۆکەی دیموکراسییان پێشکەشی جیهان کرد، بێگومان پێویستە ئەوەمان لەیادبێت کەلەئەسینا تەنها هاووڵاتیان مافی ئەو دیموکراسییەیان هەبوو.

هەموو ئەو بیانیانەی کەلەئەسینا دەژیان مافی دەنگدانو وەرگرتنو بەڕێوەبردنی نووسینگەیان نەبوو و مافەکانیتری هاووڵاتیانیان، بۆ نەسەلمێنرابوو. ئەم بیانیانە هاووڵاتی شارەکانی ـ ویلایەتەکانی ـ تری گریك بوون یان خەڵکی زەوییەکانی دیکەبوون. هەروەها کۆیلەکان کەلەماڵەکان یان لەدوکانەکانی ئەسینادا کاریان دەکرد، بێگومان، مافەکانی هاووڵاتیانیان بۆ نەسەلمێنرابوو. وا خەملێنراوە کەلەسەردەمی پێریکلێس دا نزیکەی ١٧٥ هەزار هاووڵاتی، ٢٥ هەزار نیشتەجێی بیانیو ١٠٠ هەزار کۆیلە ـ تێکڕا ٣٠٠ هەزار کەس لەئەسینادا ژیاون.

هەموو هاووڵاتیانی شاری ـ ویلایەتی ـ ئەسیناو هەروەها بیانیەکانیش لەئەسینا لەتۆمارەکانی ئەو دەیمەدا ( eme d)[١] ناونووس کرابوون کەتیایدا دەژیان. هاووڵاتیانی دەیم کۆدەبوونەوە بۆ ئەوەی لێپرسراوە ناوچەییەکان هەڵبژێرنو کاروبارە ناوچەییەکان بەڕێوەببەن هاووڵاتیانی دەیمەکان لەدە عەشیرەتدا یەك دەخران. لەکاتی جەنگدا هەر هاووڵاتییەك باجێکی دەدا کەلە عەشیرەتەکەی وەردەگیرا بەگوێرەی رێژەیەکی دیاریکراو و لەریزی دەستەی عەشیرەتەکەیدا بەشداری جەنگی دەکرد. هەموو ساڵێك پەنجاپیاو لەدە عەشیرەتەکە، بەقورعە، هەڵدەبژێردران بۆ ئەوەی لەئەنجومەنی پێنج سەدیدا کاریکەن کەدامەزراوی سەرەکی فەرمانڕەوایی بوو لەئەسینادا. ئەنجومەنەکە کاروباری ئەسینای بەڕێوەدەبردو پرۆژەکانی گەلاڵە دەکرد بۆئەوەی

لەکۆبوونەوەیەکی کۆمەڵەدا لەلایەن هاووڵاتیانەوە دەنگیان لەسەر بدرێت.

پاش ریفۆرمەکانی سۆلۆن (٥٩٤ پێش زایین) هەموو هاووڵاتی‌یەکی نێرینە کەتەمەنی لەهەژدە ساڵ تێپەڕیبێت ئەندامی کۆمەڵەبوون (ئێکلێس - ecclesia - کەوشەی ecclesiastic کلێسەی لێوەرگیراوەو، لەو کۆبوونەوەیەی - کۆمەڵەدا - هاووڵاتیان مافی قسەکردن‌و دەنگدانیان هەبوو لەسەر هەموو ئەو پرۆژانەی کەئەنجوومەنەکە گەڵاڵەی کردبوون. کلایسشنس (ساڵی ٥٠٨ پێش زایین) ئەنجوومەنێکی لەدە ژەنەراڵ پێك هێنا، یەك ژەنەراڵ لەهەر یەکێك لەدە عەشیرەتەکە، کەسەرکردایەتی سوپاو کەشتیگەلیان دەکردو رۆڵی دەستەی ئەرکانی دەبینی. هەر هاووڵاتی‌یەکی ئەسینایی کەزەوی هەبوویێت شایستەی ئەوەبوو ببێتە یەکێك لەو دە ژەنەراڵەو دەکرا جارێکی دیکە هەڵبژێردرێتەوە. هەروەك بینیمان، پێریکلس، ماوەی سی‌و دوو ساڵ لەو پۆستەدا بوو.

بەرلەسەرهەڵدانی دیموکراسی ئەسینا هەموو کێشە یاسایی‌یەکان لەلایەن خودی پادشاوە یان یەکێك لەئەندامانی خێزانی شاهەنشاهی‌یەوە بڕیاری لەسەر دەدرا، بەڵام ئێستا هەموو ئەو کێشانە دەبرێنە دادگاوەو لەلایەن دەستەیەکی سوێندخواردووی هاووڵاتیانەوە بڕیاری لەسەر دەدرێ. دادگا یاسایی‌یەکان پەرەسەندنێکی بێ وێنەی دیموکراسی ئەسینابوون. هەموو ساڵێك شەش هەزار هاووڵاتی تەمەن سەروو سی‌ساڵ بەقورعە هەڵدەبژێردران بۆئەوەی ببنە ئەندامی دەستەی سوێندخۆران (هیئە المحلفین). ئەو دەستە سوێندخۆرانە دابەش دەکران بەسەر چەند دەستەیەکی ژمارە جیاوازەوە، هەندێك لەو دەستانە لە ٥٠١ ئەندام پێك دەهێنران. ئەو دەستە سوێندخۆرانە بەزۆرینەی دەنگ بڕیاریان لەسەر کێشە یاسایی‌یەکان، لەئەسینادا، دەداو گوێیان دەگرت بۆ ئەو تۆمەتانەی دەدرانە پاڵ خێزانی شاهەنشایی ئەسیناو سەرکردەکانی دیکە. زۆربەی لێپرسراوانی شارەکە بەئەندامانی ئەنجومەنی پێنج سەدی دەستە سوێندخۆرەکانیشەوە مووچەیان وەردەگرت‌و ئەندامانی کۆمەڵەش لەبەرامبەر ئامادەبوون لەکۆبوونەوەکاندا مووچەکانی‌تریان وەردەگرت. بەو شێوەیە هەر هاووڵاتی‌یەك دەرفەتی بۆ دەرەخسا لەحکومەتدا بەشداربێت، هەزار یان دەوڵەمەند بووبێت. وەك هاووڵاتیانی ئینگلستانی نوێ لەکۆبوونەوەکانی شاراندا هاووڵاتیانی ئەسینا لەکۆبوونەوەکانی دەیمەکاندا ئەزموونی سیاسییان کۆدەکردەوەو دواتر زۆرێکیان توانای بەرچاویان نواند وەك ئەندامانی ئەنجومەن، کەسایەتی‌یەکانی خاوەن شکۆی شاهەنشایی یان وەك ژەنەراڵی ئەسینا.

ئەسینا خاوەنی سامان بوو (بەتایبەتی زیوو کانزا لەلۆریۆم) کەلێیانەوە داهاتی دەست دەکەوت. جگە لەوەش کرێباری بەندەرەکان کۆدەکرایەوەو لەسەردەمی پێریکلس دا شارەکانی ئیمپراتۆریەتی ئەسینا باجیان دەدا. غەرامەو رەسم کۆدەکرانەوە ئەو داهاتەی لەو هەموو سەرچاوانە کۆدەکرایەوە بۆ دابین کردنی خەرجی‌یەکانی حکومەت بەکاردەهێنرا. حکومەت داوای لەدەوڵەمەندەکان دەکرد بووجەی تایبەت تەرخان بکەن بۆ کەشتیگەل‌و فیستیڤاڵە ئاینییەکان. لەکاتی جەنگدا بودجەکانی دیکە لەرێگەی باجێکی تایبەتی جەنگەوە کۆدەکرانەوە، هەموو هاووڵاتیان هەرکەسەو بەشێوازی خۆی بەشداری تیادا دەکرد. هاووڵاتیان راستەوخۆ باجیان لەسەر زەوی یان داهات نەدەدا، بەڵام لەکاتی جەنگدا وەك ئەندامی عەشیرەتێك باجیان دەدا.

زۆر بیانی بەشێوەیەکی هەمیشەیی لەشارەکەدا دەژیان. هەروەها ئەوانیش لەتۆماری

دەیمەکاندا لیستەکرابوون. ئەوان، (واتە بیانی‌یەکان) باجێکی بچکۆلەیان دەدا بۆ ئیمتیازی ژیان لە ئەسیناداو لەریزی سوپادا یان کەشتیگەلدا خزمەتیان دەکرد، بەلاّم نەیاندەتوانی ببن بەخاوەنی زەوی یان ببنە هاووڵاتی. بیانی‌یەکان هەندێکیان کرێکاری کارامە بوون‌و ئەوانی تریش سەرقاڵی بازرگانی دەرەکی بوون. هەندێکیان هێندە بەئەمەك بوون بۆ ئەسینا وەك ئەوەی هاووڵاتی بووبن.

لەئەسینا کۆیلەکان نزمترین چینی خەڵك بوون، هەندێك لەکۆیلەکان منداڵی کۆیلەکان بوون، ئەوانی دیکە پیاوانێك بوون کەرفێنرابوون‌و لەلایەن ئەو جەردانەوە فرۆشرابوون بەکۆیلایەتی کەپەلاماری کەنارەکانی دەریای ناوەراستیان دابوو، ئەوانی دیکەش دیلی جەنگ بوون. ئەو جەنگانەی لەدژی شارەکانی - ویلایەتەکانی - گریك‌و ولاّتانی بێگانە بەرپاکرابوون، ئەوانی‌تریشیان ئەوانە بوون کەلەشارو ویلایەتەکان - فرۆشرابوون لەجیاتی قەرزو هێشتا فرۆشتنی قەرزدارەکان کارێکی یاسایی بوو. لەهەندێك لەویلایەتەکاندا - شارەکاندا - باوکان دەیانتوانی ئەو منداڵانە بەکۆیلەیەتی بفرۆشن کەنەیان دەویستن. کارمەندە گشتی‌یەکان - کاتبی فەرمانگەکان، وتەبێژەکان و تەنانەت پیاوانی پۆلیسیش - هەموو کۆیلەی خودی ئەسینابوون. خێزانە دەوڵەمەندەکان، کۆیلەکانیان وەك خزمەتکاری ناومال بەکاردەهێنا، بەلاّم زۆرینەی کۆیلەکان لەدوکان‌و کانەکاندا ئیشیان دەکرد. ئەوان (واتە کۆیلەکان) بەگوێرەی یاسا لەمامەڵەی توندوتیژ دەپارێزران‌و هەندێکیشیان هێندە پارەیان کۆدەکردەوە بتوانن ئازادی خۆیان بکرنەوە. لەدوکانەکانداو لەکاری گشتی رۆژانەدا هاووڵاتیان، بیانی‌یەکان‌و کۆیلەکان شان بەشانی یەکتری ئیشیان دەکرد.

محافز کارێکی ئەسینایی سکاڵای خۆی کردووە لەو ئازادی‌یەی رێگە دەدات بەبیانی‌و کۆیلەکان لەئەسینادا، کاتێك نووسی:




خاڵێکی دیکە ئەو برە نائاسایی‌یەی مۆڵەتدانە دەبەخشرێت بەکۆیلەو نیشەجێ بیانی‌یەکان لەئەسینادا، کەخۆ بادان نایاسایی‌یەو کۆیلەش ناچێتە ئەولاوە تالەسەر شەقام رێگەت بدات لێی تێپەریت. هۆکاری ئەم نەریتە نامۆو تایبەتە لێك دەدەمەوە. وای دابنێ لێدانی کۆیلەیەك لەلایەن هاووڵاتی‌یەکەوە کارێکی یاسایی بێت، زۆرجار ئەوە روودەدات‌و دووبارە دەبێتەوە کەلەوانەیە هاووڵاتی‌یەکی ئەسینایی بەهەڵەدا بچێت لەئاست

کۆیلەیەك یان بێگانەیەکداو لێی بدرێت، چونکە خەڵکی ئەسینا لەکۆیلە یان بیانییەکان پۆشتەترنین، هەروەك لەڕوخساردا باڵادەستییەك یان جیاوازییەکیان نییە، ئەگەر خودی ئەو راستییەی کەڕێگە بدرێت بەکۆیلەکان نوقمی خۆشگوزەرانیو رازاندنەوەبن، لەهەندێك حاڵەتیشدا لەئاستێکی باڵادا بژین، ئەمەش دەبێت واپیشان بدرێت بەمەبەستێکی دیاریکراو ئەنجام دراوە. ئێمە هێزێکی دەریایمان هەیە پشت دەبەستێت بەسامان، پێویستە بەگوێرەی بارودۆخ کۆیلەبین بۆئەوەی کرێی کۆیلەکانمان بەدەست بهێنین، رێگە بدەین کۆیلە راستەقینەکان بەئازادی بڕۆن. هەر لەبەرئەو هۆیەشە ئێمە جۆرێك یەکسانیمان لەئاخاوتنی کۆیلەکانمانو پیاوانی ئازاددا پێکهێناوە، جارێکیتریش لەنێوان نیشتەجێیە بیانییەکانمانو هاووڵاتییە ئازادەکاندا هەمان ئەو جۆرە یەکسانییەی ئاخاوتنمان پێکهێناوە چونکە شارەکە پێویستی بەنیشتەجێیە بیانییەکانی هەیە بۆ ئەوەی پێداویستییەکانی فرەیییەکی لەوجۆرەی هونەرەکان دابین بکەنو بەخاتری هێزە دەریاییەکەشییەتی.

ئەسیناییەکان بەزۆر پیشەوە خەریك بوون. زۆربەی ئەسیناییەکان جووتیار بوون. هەندێکیان لەگوندەکانی ئەتیکا دەژیان، ئەوانی تریشیان لەئەسینادا دەژیانو بەڕۆژ دەچوون بۆ کێڵگەکانیان، بەلێژایی گردەکانەوە بزنو مەڕو گاگەلیان دەلەوەڕاند، لەتەختانی نیمچە لێژی ئەو گردانەدا (کرم)یان دەڕواند. لەهەموو شوێنێك تەخت تر لەو شوێنانە باخی زەیتون دەڕوێنرا. لەنێو ریزیدار زەیتوونەکاندا دانەوێڵە تۆو دەکرا. لەنزیك شاری ئەسینا جووتیاران میوەو سەوزەو گوڵیان دەچاند. لەناو شارەکەشدا زۆربەی کرێکاران لەدوکانە بچووکەکاندا یان لەئیشە گشتییەکاندا ئیشیان دەکرد. لەدوکانە بچکۆلەکانی ئەسینادا خاوەنەکەی، خێزانەکەی، شاگردێك یان دووان، لەوانەیە هەندێك کۆیلە شان بەشانی یەکتری ئیشیان دەکرد. هونەرمەندان پسپۆربوون لەو پیشەو سەنعەتانەدا کەوا ئەو بەرهەمانەیان بەرهەم دەهێنا کە لەجیهانی ناوچەی دەریای ناوەڕاستدا خواستی زۆری لەسەربوو. جوانترین بەرهەمی ئەو هونەرمەندانە بریتیبوو لەو مەزهەریانەی رووکاری دەرەوەیان بەشێوەی جوان دەڕازێنرایەوە.

بازرگانان ئەو مەزهەری، شەرابو رۆنی زەیتوونەیان بەپاپۆڕ دەگەیاندە بەندەرەکانی ناوچەی دەریای رەش سوریا، میسرو ناوچەی خۆرئاوای دەریای ناوەڕاست. پاش ئەوەی ئەو بەرهەمانە دەفرۆشران، پاپۆڕەکان باردەکران لەدانەوێڵە، کۆیلە، دەزووی کەتان، کاغەزی بەردیو زۆر بەرهەمیتری ئەو ناوچانەو بەرەو ئەسینا دەگەڕانەوە.

پارەی کانزایی ئەسینایی (ئۆول) لەهەموو شوێنێك پەسەند دەکرا چونکە هەمیشە بڕی زامن کراوی زیوی تێدابووە. کۆنفیدراسیۆنی دیۆسو ئەسینا ئاشتی، لەناوچەی ئیجەدا، دەستەبەرکرد، کەشتیگەلی ئەسینا جەردەیی لەخۆرهەڵاتی ناوچەیی دەریای ناوەڕاستدا ریشەکێشو سەرکوت کرد. ئەم ئاشتییەو سەلامەتی کەشتی بازرگانەکان بەرەوی بەبازرگانییەك دا کەوای کرد بازرگانانی ئەسینا گەشەبکەن.

ئامانجی سیستەمی پەروەردەی ئەسینا گەشەپێدانی مێشكو راهێنانی جەستە بوو. ئەسیناییەکان وایان لەهەر هاووڵاتییەك چاوەڕوان دەکرد کەببینێت هەریەك لەکوڕەکانی فێری خوێندنەوە، نووسین بووەو توانایەکی پەیداکردووە کەبتوانێت ژیانێك بۆ خۆی دابین بکات. هەموو قوتابخانەکان تایبەتیبوون، دەوڵەت خەرجی خوێندنی لەئەستۆ نەدەگرت

جگە لەخەرجی خوێندنی ئەو منداڵانە نەبێت کەباوکیان لەجەنگدا کوژرابوون.

کوڕانی باوکو دایکە دەوڵەمەندەکان باشترین دەرفەتەکانی خوێندنیان دەستدەکەوت. کۆیلەکان دەیانبردن بۆ قوتابخانەو دەیانهێنایەوە و فێریان دەکردن چۆن جلوبەرگ لەبەربکەن، چۆن بەڕێکی بڕۆن، پێش نیوەڕۆیان هۆنراوەی شاعیرە گەورەکانی گریکیان دەخوێندو فێری گۆرانی وتنو ژەنینی ئامێری قیسارە دەبوون. پاش نیوەڕۆیان دەچوون بۆ گۆرەپانی ڕاهێنانو لەوێ رایان دەکرد، بازیان دەدا، زۆرانبازییان دەکردو رمو قورسییان هەڵدەدا. ئەوان (واتە قوتابییەکان) فێری مەلەکردنو یاری راوڕاوێن، تۆپ، چاوبەستنو یاری بلیە دەبوون لەپاڵ زۆر یاریتردا کەئەمڕۆ منداڵان دەیکەن. قوتابییەکان ڕێگەیان پێنەدەدرا زۆربەی کاتەکە بەیارییەک بەسەربەرن وەک هەندێک لەکوڕانی ئێمە دەیکەن چونکە ئامانجی پەروەردەیو جەستەیی گریک کەشەپێدانی گشتگیری جەستەیی بوو. پێشبڕکێ سازدەکرا هەروەک چۆن ئەمڕۆ ئێمە پێشبڕکێ سازدەکەین.

لەتەمەنی شازدە ساڵیدا هەر منداڵێک باوکی توانای دابین کردنی خەرجییەکەیی هەبووایە هونەری رەوانبێژی لای مامۆستایەک دەخوێند کەپێیان دەوت سۆفی. هونەری رەوانبێژی بەو ئامانجە دەخوێندرا منداڵەکە فێربێت چۆن وتار بدات، ئیدی ئەوە ئەرکی مامۆستاکەی بوو کەدڵنیابێت لەوەی ئەو زانستەی وەرگرتووە کەپێویستە بۆ پیاوێک لەژیانی گشتیدا بەشداری بکات. پیاوانی ئەسینا گفتوگۆی زۆریان دەکرد لەو بارەیەوە کەچی خوێندنو پەروەردەیەکی شایستەو گونجاو پێک دەهێنێت بۆ کوڕەکانیان. لەیادی هەژدەمین ساڵرۆژی لەدایک بوونیدا هەموو کوڕێک لەتۆمارەکانی ئەو دەیمەی تیایدا دەژیا وەک هاوولاتییەک ناونووس دەکرا. هەر کوڕێک باوکی دارابووایە زرێپۆشی ئاسنینی بۆ دەکڕی و ئەویش لەپەرستگایەکدا سوێندی ئەسینایی دەخوارد:

هەرگیز ئەم چەکە پیرۆزانە سەرشۆڕناکەم، هەرگیز هەڤاڵەکەم لەڕیزی سوپادا، هەر کەسێک بێت، بەجێناهێڵم بەرگری دەکەم لەشتە ئاینیو ئینسانییەکان، بەتەنیا بم یان لەگەڵ کۆمەڵدا. لەوەش زیاتر ولاتەکەم کەمتر نادەمە دەست ئەوەی داهاتوو، بەڵکو مەزنترو زیاتر لەوەی کەوەرم گرتووە. گوێڕایەڵی ئەو دادوەرانە دەبم کەلەکاتێکەوە بۆ کاتێکی دیکە حوکم دەکەنو هەروەها گوێڕایەڵ دەبم بۆ یاسا دارێژراوەکان یان هەر یاسایەک کەگەل بیخاتە کار بەگوێرەی بەرژوەندی گشتی. ئەگەر هەر کەسێک هەوڵبدات بۆ تێکشکاندنی یاخود پێشێل کردنی یاساکان من ڕێگەی پێنادەم بەڵکو یاساکان دەپارێزم بەتەنیا بم یان لەگەڵ کۆمەڵدا بێت. ڕێز دەگرم لەئاینی باووباپیرم. شایەتەکان خواوەندەکانی ئەسینان.

پاش ئەوە ئەو (واتە ئەو لاوەی کەسوێندی دەخوارد) ماوەیەکی دوو ساڵی لەراهێنانی سەربازییدا بەسەردەبرد بۆئەوەی ئامادە بکرێت تالەسوپای ئەسینادا خزمەت بکات.

مەڵبەندی چالاکییەکانی ژنانی چینی باڵای ئەسینا ماڵەوە بوو. دایکانی چینی باڵا ئەرکی فێرکردنی کچەکانیان لەئەستۆدابوو. دایکان کچەکانیان فێری خوێندنەوەو نووسین، چنین، دروومان کردن، چێشت لێنان، بەڕێوەبردنی ناوماڵ و ڕێنماییکردنو بەڕێوەبردنی خزمەتکارو کارەکەرانی ناوماڵ، دەکرد. واباوبوو باوکو دایک هەموو ئامادەکارییەکی شووکردنی کچەکەیان دەکرد لەسەر بناغەی توانای دارایی ئەو کەسەی هەڵدەبژێردراو بەشێوەیەکی گشتی پیاوێک کەزۆر لەکچەکە گەورەتربوو. زۆرجار ئەوان (واتە باوکو دایک) پێویستی یان بەیارمەتی (ڕێکخەر) دەبوو. {پێدەچێت ئەم ڕێکخەرە رۆڵی دەلاڵ یان

بەریووکی ببینێت ـ وەرگێڕ} سەرەڕای ئەو نەریتە نووسراوی سەرکێلی گۆڕەکان بەو ئاراستەیەدا دەریبخەن زۆربەی ژن و مێردایەتییەکان بەختیاربوون. یەکێك لەو نووسراوانە بریتییە لە:

(ماڵئاوا، گۆڕی میلایت ـ لێرەدا باشترینی ژنان راکشاوە، کەمێردە بەسۆزەکەی خۆی، ئۆمینیەس، خۆشویست، تۆ زۆر نایاب بوویت، هەربۆیە لەپاش مەرگیشت بیرت دەکات، چونکە تۆ باشترینی خێزانەکان بوویت. ماڵئاوا، تۆیش، ئازیزترین مێرد، تەنها منداڵەکامت خۆش بوێت).

نەریتە کۆمەڵایەتییەکان، چالاکییەکانی ژنانی چینی باڵای سنودار کردبوو. ئەوان (واتە ژنان) هەرگیز ماڵەوەیان بەجێنەدەهێشت بەیاوەری ئەندامێکی نێرینەی خێزانەکە نەبووایە یان کۆیلەیەك تەنانەت کاتێك دەشچوون بۆ گەمەو فیستیڤاڵەکان. کاتێك مێرد پیاوی دەعوەت دەکرد بۆنانی ئێوارە، ژنان لەئەپارتمانی تایبەتی خۆیاندا نانیان دەخوارد. ژمارەیەکی کەمی ژنان کەکەسایەتی بەرچاویان هەبوو کاریگەریی زۆریان هەبوو لەسەر سەرکردە سیاسییەکانی ئەسینا، تەنانەت لەسەر خودی پێرێکلس ژنانی چینە نزمەکان لەکێڵگەکاندا ئیشیان دەکرد یان لەدوکانەکاندا یاخود لەکۆشکدا لەناو بازاڕ شتیان دەفرۆشت.

خانووی ئەسینایییەکان سادەبوون و بەرگ و ناوماڵیشیان ساکاربوون. هاووڵاتیانی سەربەچینە باڵاکانی ئەسینا لەخانووی بەخشت دروست کراوی بەگەچ سواغ دراو یان بەکلس سپیکراودا دەژیان کەسەربانەکانی بەقرمید دروست کرابوون. حەوشەیەکی کراوە بەڕووی ئاسماندا مەڵبەندی (سەنتەری) ژیانی خێزانەکە بوو. لەهەر چوراڵایەوە (واتە چوارلای خانووەکەوە) پانتاییەکی داپۆشراو بۆ هاتووچۆکردن تێدەپەڕی کەپێی دەوترا راڕەوو ژوورەکان بەسەریدا دەکرانەوە. ناوماڵەکان زۆر سادەبوون ـ جێگەی نووستن و (سریر)، کورسی، قەنەفە (شوێنی پاڵدانەوەو دەسکی نییە)، مێزو سندوقێکی مەحکەم (پێدەچێت ئەوکات لەجیاتی کەوانتەر بەکارهێنرابێت ـ وەرگێڕ).

بۆ دابین کردنی رووناکی لەشەقامەکاندا مەشخەڵ دەسووتێنراو لەماڵەکانیشدا چرا لامپای بەردین یان قوڕین بەکاردەهێنرا کەبە رۆن ئیشی دەکرد. لەزستاندا خەڵووزی داریان لەمقەڵی مسدا دەسووتان و بۆ ئەوەی خۆیان لەسەرما بپارێزن و ناو ماڵەکانیان گەرم بکەن. سەبارەت بەئاو دەبوایە لەکارێزەکان، بیرەکان و گەلیە گشتییەکانەوە ئاو بهێنن و بیگەیەننە ماڵەکانیان.

هەروەها بەرگ پۆشین سادەبوو. بەڕۆژ، بۆ ناو ماڵ، چ پیاو چ ژن (تونك ـ tunic) یان دەپۆشی کەبەرگێکی تایبەتی ئەوکاتەی گریکەکان بووەو دەگەیشتە سەر ئەژنۆیان و لەسەر کەلەکەیان بەپشتێنێك توند دەیان بەست. بۆ دەرەوەش عەبایەکی درێژ بەسەر تونیکەکە دادەپۆشراو بۆ پاراستنی پێشیان سەندەلیان لەپێ دەکرد.

ژیانی پیاوانی ئەسینا زۆر کۆمەڵایەتی و بەشی زۆریشی لەدەرەوەی ماڵدابوو. بۆ پیاوان ژیانی کۆمەڵایەتی لەناو بازاڕو گۆڕەپانی راهێناندا چەقی گرتبوو، بۆ ژنانیش ژیانی کۆمەڵایەتی لەحەوشەدا چەقی گرتبوو. هاووڵاتییەکەی ئەسینا هەرگیز نەیدەتوانی لەوە تێبگات بۆچی دەبێت پیاوی گۆشەگیرو تەنها ناچاربوو بکشێتەوە بەلای خوێندنەکەیدا بۆئەوەی بەقووڵی بیری لێبکاتەوە. هاووڵاتییەکی ئەسینا ماڵەکەی وا لەقەڵەم دا بوو کەجێگەیەکە بۆ نووستن و خواردن، هەروەها جێگەیەك کەتەنها لەکاتی کەشوهەوای تووش و خراپ دا تیایدا بژی.

هاووڵاتییەکی خواپێداو، پاش خواردنی نانێکی سادەی بەیانی، وا عادەت بووە

کەبەیانیانی بەبازاڕکردن، سەپەرشتی‌کردنی کاروباری ئیشەکانی، سلاوکردن لەهاوڕێکانی‌و ئەوانەی شارەزای ئیشەکانین لەناو بازاڕدا بەسەردەبرد. نزیکەی نیوەڕۆ ژەمێکی چەوری بەدڵی خۆی دەخوارد کەلەهۆڵەکەدا پێشکەشی دەکرا. پاش نانی نیوەڕۆ سەرخەوێکی دەشکاند. سەرەتای پاش نیوەڕۆی بەمەشق کردن لەیەکێك لەگۆڕەپانەکانی راهێناندا یان پیاسەکردن، یاری‌کردنی دامەیان ئاخافتن لەگەڵ هاوڕێکانی‌دا، بەسەردەبرد. دواتر لەپاش نیوەڕۆدا لەیەکێك لەگەرماوە گشتی‌یەکاندا خۆی دەشت‌و ئینجا دەگەڕایەوە بۆ ماڵەوە تانانی ئێوارە بخوات.

زوو نانی ئێوارە ئامادەو پێشکەش دەکرا. ئەگەر میوانی نێرینەی نەبوایە پیاو لەگەڵ ژن‌و منداڵەکانیدا نانی دەخوارد بەڵام ئەگەر میوانی نێرینەی هەبووایە ژن و منداڵەکان خۆیان بەجیا نانیان دەخوارد. دەعوەت کردن ناڕەسمی‌بوو، ناعادەتی نەبوو بۆ میوانێك برادەرێکی خۆی بهێنایەتەوە بۆ ئەو ماڵەی خۆیی لێدەعوەت کراوە. دوای ئەوەی نانی ئێوارە تەواو دەبوون ئاهەنگی خواردنەوە دەستی پێدەکرد، کەدیارترین سیمای ئێواران بوون دەبەیەکی پڕ لەشەراب دەهێنرایە ژوورەوە، خانە خوێ تۆزێکی لێ دەڕشت بۆ ڕێزلێنان لەخواوەندەکان و ئیدی فەرمانڕەوایەکی خواردنەوە هەڵدەبژێردرا. یەکەم ئەرکی ئەو (واتە فەرمانڕەوای خواردنەوە) ئەوەبوو سەرپەرشتی تێکەڵ کردنی ئاوو شەرابەکە بکات. دواتر پێکەکان رەوانەی دەوری دەبە شەرابەکە دەکران‌و خواردنەوەو خۆشی دەستی پێدەکرد. فلوت ژەنی کارامە، کچانی سەماکەر یان هەر کەسێکی کارامەی دیکەی بواری دڵخۆش کردن لەوانەبوو سەرقاڵ بکرایە، لەوانەبوو قیسارە بگێڕدرایە بەسەر میوانەکانداو داوا لەهەریەکێکیان بکرایە قیسارە بژەنێت، یان لەوانەبوو فەرمانڕەوای خواردنەوە باسێکی رابگەیاندایە بۆنەوەی ئاخاوتن‌و وتووێژی گشتی لەسەریکرایە، جاباسەکە جددی یان هەر بۆخۆشی بوایە، کەبگونجایە لەگەڵ ئارەزووی میوانەکاندا. هەروەها لەوانەبوو بەبڕیاردان گفتوگۆکە جددی بووایە. یەکێك لەو گفتوگۆ تۆمارکراوەکانی ئاهەنگی خواردنەوەی ئەفلاتون لەسەر خۆشەویستی بوو. کاتێك خۆشی و رابواردن تەواو دەکرا یان گفتوگۆ دەگەیشتە کۆتایی، کۆیلەکان کەمەشخەڵیان هەڵگرتبوو ماڵی گەورەکانی خۆیان رووناك دەکردەوەو رۆژەکە تەواو دەبوو. لەئاهەنگەکەی ئەفلاتون دا ئەوانەی بەشداربوون هێندە درێژەیان بەمشتومڕو گفتوگۆکانیان دا کەلەبەیانیدا هەموو میوانەکان بێجگە لەسوقرات لەژێر مێزەکەدا خەویان لێکەوتبوو.

هاووڵاتیانی دەوڵەمەند سەر بە یانە کۆمەڵایەتی‌یەکان بوون کە رۆڵێکی کاریگەریان دەبینی لەکاروباری سیاسی‌و یاسایی‌دا. پیاوانی هەژارترو نیشتەجێ بیانی‌یەکان یانەی کۆمەڵایەتی خۆیان هەبوو. دوکانەکان مەڵبەندی کۆمەڵایەتی‌یان دەنواند یان پێك دەهێنا نەك هەربۆ ئەوانەی کەئیشیان تیایاندا دەکرد بەڵکو بۆ بێکارو کڕیارەکانیش. سوقرات بەبەردەوامی ڕاهاتبوو بەدوکانی پەیکەرتاشین ئەوانی زرێپۆشی ئاسنیان دروست دەکردو دوکانی ئەوانەی زینی ئەسپیان دروست دەکرد لەبەرئەوەی لەوێ دەیتوانی هەمیشە یەکێك سەرقاڵی ئاخاوتن بکات. هەروەها دوکانی ئاسنگەران و سەرتاشان بەهەمان شێوە رۆڵی مەڵبەندی کۆمەڵایەتی‌یان دەبینی. پیاوی خاوەن زەوی‌وزار کەلەگوندێکی ئەتیکاوە دەهات بۆ ئەسینا دوکانێکی دلگیری خۆی دەکرد بەبارەگا بۆ خۆی. لەپاڵ ئەوانەدا زۆر کۆمەڵەی ئاینی هەموو چینەکانی پێکەوە کۆدەکردەوە. گۆڕەپانەکانی راهێنان‌و گەرماوەکان بەرووی هەموو هاووڵاتیانی نێرینەدا

کرابوونەوە، یەك گۆڕەپانی راهێنان کرابووەوە بۆ بیانی‌یەکان و هاوولاَتیان وە یەك.

گریکەکان باوەڕیان وابوو خواوەندەکان چاودێری هەموو چالاکی‌یەکی ژیانیان دەکەن. زۆر زەحمەتە بۆ ئێمە درك بەوە بکەین کەلتووری گریکی چەندە پشتی بەستووە بەئایدیاکانی


سۆفۆكلیس

گریکی سەبارەت یان بۆ خواوەندەکان. پێش هەموو شتێك گریکەکان لەو باوەڕەدابوون خواوەندەکان (بەنێرینەو مێ‌ینەیانەوە) لەناو هەموو هێزەکانی سروشتدا نیشتەجێن، واتە خێزان لەژێر سایەی پارێزگاری تایبەتی خواوەندیی خواوەندەکاندایە، هەروەها خواوەندەکان لەهەموو کۆبوونەوەیەکی واتە خڕبوونەوەیەکی سیاسی و کۆمەلاَیەتی‌دا ئامادەن. تەنانەت ئەوان (واتە گریکەکان) لەو باوەڕەدا بوون رۆحی پیاوە مەزنەکان، پاش مردنیان، دەبێت بەخواوەند، بۆئەوەی هەمان ئەو ئارەزوو بەرژەوەندی‌یانە بپارێزێت کەئەو پیاوە مەزنانە لەژیانیاندا خزمەتیان کردوون. وەك دەرەنجامێك باوەڕ وەهابووە کەخواوەندەکان لەهەموو شوێنێکدابن.

زیوس خواوەندی ئاسمان، باوکی خواوەندەکان و پیاوان، هێرای خێزانی، ئاپۆلۆ خواوەندی خۆر، ئەسینا خواوەندی (مێ‌یینە) حیکمەت لەنێو دوازدە خواوەندە مەزنەکەدابوون.

گریکەکان لەو باوەڕەدابوون ئەو دوازدە خواوەندە لەچیای ئۆلۆمپیادا دەژین. هەموو ئەو دوازدە خواوەندەو خواوەندەکانی دیکە لەلایەن زۆربەی گریکەکانەوە دەپەرستران. بێجگە لەو دوازدە خواوەندە گریکەکان، ژمارەیەکی زۆر خواوەندی ناوچەیی‌یان لەمەزارە ناوچەیی‌یەکاندا دەپەرست. باوەڕی گریکەکان بەو خواوەندانە وایلێکردن وابیربکەنەوە هەموو هەلسوکەوت و رەفتارێکی ژیانی رۆژانە پەیوەستە بەئاینەوە. کاتێك گریکەکان لەخواوەندێك دەپاڕانەوە بۆ کۆمەکێکی تایبەتی، سیفەتێك بەدوای ناوی خواوەندەکەدا دەهات کەسروشتی ئەو پاڕانەوەی روون دەکردەوە. کاتێك گریکەکان ئەوەیان کرد، خۆیان خواوەندێکیان دەخولقاند کەباوەڕیان وابوو ئەو کۆمەکە دەدات کەخواستوویانە، بۆ نموونە کاتێك هاوولاَتیانی ئەسینا لەئەثینا دەپاڕانەوە بۆ ئەوەی شارەکەیان بپارێزێت ئەو خواوەندە وەك ئەثینا پۆلیاس دەپەرسترا، کاتێك

لێی دەپاڕانەوە وەك پاڵپشتی هونەرمەندان وەك ئەثینا ئێرگەین - دەپەرسترا کاتێك وەك بەخشندەی تەندروستی لێی دەپاڕانەوە دەبووە ئەثینا هاریجیا و کاتێکیش وەك خواوەندی (مێینەی حیکمەت) لێی دەپاڕانەوە وەك ئەثینا پارثینوس دەپەرسترا. گریکەکان ئەثیناکانی تریشیان دەپەرست. هەریەکێك لەو خواوەندانە بۆ خۆی خواوەندێکی تایبەتی بوو بۆ ئەو کۆمەكو یارمەتی‌یە دەپەرسترا کەگریکەکان پێیان وابوو دەیبەخشێت. بەگشتی، زۆریەی خواوەندە مەزنەکانی‌تریش زیاتر بەهەمان شێوە دەپەرستران.

گریکەکان بەو شێوەیە بیریان لەخواوەندەکانیان (نێرینە یان مێینە) دەکردەوە کەپیاوو ژن بن، گەورەتر لەمردن، بەشێوەیەکی سەرسوڕهێنەر جوان بن‌و توانابن بەسەر هەموو خەسڵەتە ئینسانی‌یەکان کەگریکەکان هەیانبوو. ئەوان (گریکەکان) نەدەترسان لەخواوەندەکانیان، وەك هەندێك لەگەلانی دێرین دەترسان. بۆ ئەوەی دەریبخەن کەخواوەندەکانیان ئەو خەسڵەتە ئینسانی‌یانە یان هەبووە، گریکەکان چیرۆکیان سەبارەتیان دەوت کەئێمە پێیان دەڵێین ئەفسانە.

گریکەکان هەندێك ئایدیا ناڕوونیان سەبارەت بەژیانێکی ئایندە هەبوو. دوا وێستگەی مردووان، جیهانی خوارەوە، شوێنێکی رەشی دڵتەنگ بوو. بەهەرحاڵ، گریکەکان لەو باوەڕەدا بوون ئەوانەی فێری پرەنسیپە فردەوسی‌یەکان کرابوون سەبارەت بەنهێنی‌یەکانی (ویمیتەر) دایکە زەوی وەزعیان تۆزێك باشتربووە لەوانەی کەفێرنەکرابون، ئەوان (گریکەکان) وەك مسری‌یەکان ئیدعایان نەکردووە کەزۆر دەزانن سەبارەت بەژیانی ئایندە. گریکەکان لەو باوەڕەدانەبوون دەبوایە مەراسیمە ئاینی‌یەکان بەئەنجامدانی تەقسەکان، قوربانی‌کردن، سەماکردن، گۆرانی‌یە کۆرسەکان‌و رۆیشتن لەڕێپێوانەکان دا ئەنجام بدرێن، بەڵام بەگشتی نەڕای گشتی‌و نەیاسا داوای لەگریکی‌یەك دەکرد بڕوای بەهەرکام لەخواوەندەکان بێت یان باوەڕبکات بەوەی ئەو چیرۆکانەی لەبارەیانەوە دەوترێت راستن.

گریکەکان لەو باوەڕەدابوون خواوەندەکان رێنمایی‌و ئامۆژگاری‌یان دەکەن. ئەوان (گریکەکان) سەرنجی باڵندەکانیان دەداو بەوردی سەیری ئاژەڵەکانیان دەکرد کاتێك دەیانبردن بۆ شوێنی سەربڕین بۆ ئەوەی بکرێنە قوربانی. ئەگەر گایەك بەئاسانی خۆی سەریکەوتایە بۆ شوێنی قوربانی‌یەکە ئەوە نەشەمەیەکی باشی بوو، بەڵام ئەگەر رابکێشرایەتە سەر شوێنی قوربانی‌کردن ئەوە نەشەمەی خراپ بو.

گریکەکان لەبابلی‌یەکانەوە فێری پێشبینی‌کردن‌و لێکدانەوەو واتاکانی خەون بوون. جگەلەوە ئەوان (واتە گریکەکان) دەچوون بۆ مەزارەکان کەپێیان وابوو لەوێ خواوەندەکان راستەوخۆ لەڕێگەی سروش هێنەکانەوە قسەیان لەگەڵ دەکات. بەناوبانگترین سروش هێێن، سروش هێنەری ئاپۆلۆ بوو لەدەلفی. لەوێ کەشیشێکی مێینە دەچووە ناو چاڵێکەوەو کەپرسیار دەکرا وەڵامی دەدایەوە کەوا دەزانرا ئاپۆلۆ وەڵام دەداتەوە. لەوانەیە هەندێك لەو وەڵامانە بەچەند شێوازێك وەربگێڕین. پێش ئەوەی کرۆسیسۆس ی پادشای لیدیا جەنگ رابگەیەنێت لەدژی فارسەکان نوێنەرێکی نارد بۆلای سروش هێنەرەکە لەدەلفی تاپرسیار بکات: چی روودەدات ئەگەر من لەرووباری هالیس بپەڕمەوە؟ سروش هێنەرەکە وەڵامی دایەوە: ئەگەر تۆ لەرووباری هالیس بپەڕیتەوە ئیمپراتۆریەتێکی مەزن تێك دەشکێنیت. بەو پێیە پادشای لیدیا رووباری هالیسی بڕی‌و تێکشکێنرا. ئەو (پادشاکە) ئیمپراتۆریەتێکی تێکشکاند بەڵام بۆ بەدبەختی ئەو ئیمپراتۆیەتەکەی خۆی تێکشکاند.

گریکەکان لەپێشبڕکێ وەرزشی‌یە گەورەکان‌و فیستڤاڵە ئایینی‌یەکاندا رێزیان لەخواوەندەکانیان دەنا. ئەوانە (واتە چالاکی‌یە وەرزشی‌و هونەری‌یەکان) لەسروشتدا ئاینی‌بوون. گریکەکان لەو باوەڕەدا بوون بەو پێیەی خواوەندەکانیان خەسڵەتی ئینسانی‌یان هەبوو ئەوانیش چێژیان

لەسەیرکردنی پێشبڕکێیەکانی وەرزش، شیعر، مۆسیقا، سەماکردن و شانۆ وەردەگرت. لەفیستڤاڵێکدا خەلآت دەدرا بەدایکی باشترین منداڵ، لەیەکێکی‌تردا خەلآت دەدرا بەو پیاوەی دەیتوانی زۆرترین کات لەسەر یەك پێ بوەستێت لەشوێنێکی گریس کراوادا بۆ ڕێزلێنان لەدیۆنیسیس خواوەندی شەراب.

لەنێو ئەو فیستیڤالآنەدا پێشبڕکێ وەرزشی‌یەکان لەهەموو ئەوانی دیکە بەناوبانگتربوون. نزیکەی هەموو شارێك پێشبڕکێی وەرزشی خۆی هەبوو. چوار پێشبڕکێی وەرزشی سازدەکران بۆ هەموو شارەکان ویلایەتەکان. فیستڤاڵی ئۆلۆمپی هەر چوار ساڵ جارێك لەچیای ئۆلۆمپیا لەئێلیس ساز دەکرا بەناوبانگترین پێشبڕکێی وەرزشی بوو، پێشبڕکێیەکان بریتی‌بوون لەراکردنی مەودا دووسەد یاردەیی تاڕاکردنی مەودا سێ‌میل، زۆرانبازی، مشتە کۆڵە، هەڵدانی رم و قورس و بۆ دەوڵەمەندەکانیش پێشبڕکێی ئەسپ و عەرەبانە. پێویست بوو هەموو پێشبڕکێ کاران گریك بن و زۆر بەباشی و وریایی‌یەوە مەشقیان کردبێت. هەرچەندە خەلآتەکە تەنها چەپکە گوڵێك یان گەلآی زەیتون بوو، کە پیرۆزبوو بەلای خواوەندەوە، هەرکەسێك بیبردایەتەوە دەبووە پاڵەوانێکی نیشتمانی.

ئاینی گریك، ئاینێکی زۆر ئینسانی بوو. ئەو ئایینە وای لەگریکەکان کرد لەنێو جیهاندا هەست بەماڵی خۆیان بکەن چونکە ئەوان (واتە گریکەکان) لەو باوەڕەدابوون بوونەوەری وەك خۆیان (خواوەندەکان) هەموو هێزەکانی سروشتی کۆنترۆڵ دەکرد لەپاڵ ژیانی خێزانی، کۆمەلآیەتی و سیاسی‌دا. ئەوان (واتە گریکەکان) لەو باوەڕەدا بوون ئەو بوونەوەرانە (خواوەندەکان) دەیانتوانی لەمرۆڤ تێبگەن و مرۆڤ لێیان تێبگات. لەسۆنگەی ئەوەشەوە بوو کەنوێژەکانیان بۆ خواوەندەکانی ئاینی گریك دەکرد. نوێژی ئەسینایی‌یەکان هەر زۆر ئاسان و سادەبوو. یەکێك لەو نوێژانە بۆ خواوەندی بالآ دەکرا لەکاتی بێبارانیدا بریتی‌بوو لە: ببارێنە، ببارێنە، زیوسی ئازیز، بەسەر زەوی کێڵراروو دەشتی ئەسینایی‌یەکاندا. ئاینی گریکەکان پرەنسیپە بنچینەیی‌یەکانی حیکمەتی فێردەکردن وەك ئەو دەستەواژانەی لەسەر دیواری مەزاری ئاپۆلۆ لەدەلفی هەلکۆڵرابوون. دووان لەو دەستەواژانە بریتی‌بوون لە: (خۆت بناسە)و(زیادەڕۆیی لەهیچ شتێکدا مەکە) نموونە بالآکانی گریك بۆ ژیانی باش، جوانی، پێکەوە گونجان و راستی لەئاین و فەلسەفەوە وەرگیرابوون.

هونەری بیناسازی گریك بەرهەمی ئاین بوو. لەبەرئەوەی گریکەکان وەك پیاوو ژن بیریان یان دەیانڕوانی‌یە خواوەندەکانیان گەیشتنە ئەو دەرەنجامەی خواوەندەکان پێویستی‌یان بەخانوو هەیە تێیدا بژین. گریکەکان ئەو خانووانەیان بەشوێنی پیرۆز ناودەبرد. ئێمە پێیان دەڵێین پەرستگا. جوانترینی پەرستگاکان لەمەڕمەڕ دروست کرابوو. ژوورێکی درێژو تەسك لەنا وپەرستگاکەدا هەبوو کەپەیکەری ئەو خواوەندەی لێدادەنرا وا پەرستگاکەی بۆ دروست کرابوو. هەموو پەرستگاکان لەپێشەوە دالآنێك و هەندێکیشیان لەپشتەوەش دالآنیکیان هەبوو. سەقفی ئەو دالآنانە لەسەر چەند کۆڵەکەیەك رادەگیرێنران و لەهەر لایەکی چوارلای هەندێك پەرستگا ریزێك کۆڵەکە دروست دەکرا. کەسەقفی پەرستگاکە لار دەبووەوە چەمەلۆنێکی سێگۆشەیی، لەپێشەوەو لەپشتەوەی، پێك دەهێنا.

گریکەکان سێ‌جۆری کۆڵەکەیان پەرەپێدا. یەکیان (دۆریك ـ doric) زۆر سادەبوو، کۆڵەکەکانی دەورووبەری لەسەر یەکەمین پلەی پەرستگاکە جێگیردەکران و لوتکەی کۆڵەکەکان رووت و تەخت بوون. لەسەرووی کۆڵەکەکانەوە ریزێك بەرد هەبوون کەپێیان دەوترا ئفریز ـ frieze). ئەو (ئفریز) دەکرا بەچەند بەشێکەوە، یەکیان پێك دەهات لە سێ‌پارچە بەردی بڕاوی رێکخراو (تریگلیف ـ trigliph ) ئەوی دیکەیان کەپاڵی پێوە دەدا بریتی بوو لەمیتۆب ـ Metope ت بەو شێوەیە تریگلیف و میتۆب بەدوای



پەرستگای پارتنێون

یەکتری‌دا ریزدەکران. میتۆپ‌و پێدامێنت کەشێوە سێگۆشەیەکی سەر کۆڵەکەکان بوو پڕدەکران لەپەیکەر.

دووەمین جۆری کۆڵەکەکان پێی دەوترا یاخود بریتی‌بوو لەئایۆنیک (Ionic)و زۆر رازاوەتر بوو. هەر ریزێکی ئەم کۆڵەکانە لەسەر بناغەیەک جێگیردەکران. لوتکەی کۆڵەگەکە بەنووسین‌و هەڵکۆڵین دەرازێنرانەوەو ئیفریزی ئەمانە تەخت‌و رێك بوون. سێیەمین جۆر - کۆرنیشیان - دواتر دروست کرا کاتێك لوتکەی کۆڵەکەی ئایۆنیك گۆڕدرا بەلوتکەیەکی جوانترو رازاوەتر کەپارچەیەك مەرمەڕ بوو و بەجۆرێك زەخرەفە دەکرا کەلە گەڵای رووەکی ئاکانثوس بچێت. هەموو کۆڵەکەکانی گریك هەڵاوساوو رووکاری سەرەوەشیان تۆزێك چەماوەبوو، ئەم شێوازانەی هونەری بیناسازی تائێستاش بەکاردەهێنرێت، هەرچەندە لەزۆربەی حاڵەتدا بەشێوازی چاککراوو پەرەپێدراو بەکاردەهێنرێن. زۆربەی کۆڵەکەکانی تەلارەکانی ئەمڕۆ لەسەر مۆدێلی یەکێك لەو سێ‌جۆرە کۆڵەکەی گریك دروست دەکرێن.

کاتێك فارسەکان ئەسینایان داگیرکرد (٤٨٠ پ.ز) قەڵای ئەسیناو پەرستگاکانیان تێك‌وپێك شکاندن بەو شێوەیە پیریکلس و راوێژکارانی دەرفەتێکیان هەبوو پەرستگای نوێ دروست بکەن. لەدەروازەی چوونە نێو ناوچە پیرۆزەکەوە، کەهەموو لوتکەی ئەکرۆپۆلس - قەڵای ئەسینایە، ئەوان پیریکلس‌و راوێژکارانی، لەشێوەی دالآنێك دەروازەیەکی رەمزی چوونە دەرەوەیان بەکۆڵەکەی دۆریك دروست کرد کەناونرا پرۆپایلیا. لەلای راستی پرۆپایلیا، لەسوچێکی بەرزی ئەکرۆپۆلیس دا پەرستگایەکی بچووکی ئایۆنیکیان بۆ ئەثینا ڤیکتۆری (خواوەندی مێیینە)ی دروست کرد کەئیفریزێکی هەبوو وێنەی رووداوەکانی جەنگی لەگەڵ فارسەکان دا لەسەر هەڵکۆڵرابوو. لەسەر لوتکەی ئەکرۆپۆلیس دا پەرستگایەکی خواوەندی (ئەثینا پارثینوس)یان دروست کرد، ئەو خواوەندە بوو کەفەرمانڕەوایی ئەسینای دەکرد. پەرستگاکە دوو ژووری هەبوو: لەژوورە گەورەکەیاندا کەرووی لەخۆرهەڵات بوو پەیکەری ئەثینای تێدابوو، لەژوورە بچووکەکەدا کەرووی لەخۆرئاوا بوو خشڵ‌و زێڕی پەرستگاکەی تێدا دانرابوو.

لەهەردوو سەری کۆتایی پەرستگاکەی پارثینوس - ەوە دالآنێك هەبوو کەسەقفەکەی لەسەر شەش کۆڵەکەی دۆریك جێگیرکرابوو، ریزێك کۆڵەکە دەوری دابوو، بەو شێوەیە هەشت کۆڵەکە لەهەردوو سەری کۆتایی‌و پەرستگاکەو حەڤدە کۆڵەکەش لەهەر لایەکی‌یەوە جێگیرکرابوون.

هەموو هێڵێکی ئەم جوانترین پەرستگایە تۆزێك چەمابووەوە. میتۆپیەکانی ئەم پەرستگایە پڕکرابوون لەنەخش و هەڵکۆڵینی بەرچاو کەوێنەی شەڕە ئەفسانەیی یەکانی نێوان گریك و ئامەزۆنەکان و شەڕەکانی نێوان لاپیشس و سەنتۆرەکانی تۆمارکردبوو یاخود دەنواند. پەیکەرەکانی سەر سێگۆشەی سەرەوەی لای خۆرهەڵات وێنەو دیمەنەی لەدایك بوونی ئەثینای دەنواند لەکاتێکدا پەیکەرەکان سەر سێگۆشەی سەرەوەی لای خۆرئاوا وێنەو دیمەنی ململانێی نێوان ئەثیناو پۆلسیدیۆنی بۆ خاوەندارێتیکردنی ئەسینا دەنواندو تۆمارکردبوو.

بەسەر رووکاری ناوەوەی دیوارەکانی پەرستگاکە، بەڵام لەناو داڵانە پاکژکراوەکەدا، ئیفریزێکی درێژی جێگیرکراو هەبوو کەوێنەو دیمەنی رێپێوانێکی ئەسینایی یەکانی، بۆ رێزلێنانی ئەثینای خواوەند، دەنواندو تۆمارکردبوو. هەرگیز هیچ پەرستگایەکی تر لەرووی جوانیو گونجانی خۆیەوە لەپارثینون - پەرستگای پارثینوس - زیاتر نەبووە.

لەکاتی جەنگی پیۆپۆنیسیان دا ئەسینایی یەکان پەرستگایەکی دیکەیان (ئیریکثیوم) لەئەکرۆپۆلیس دروست کرد. ئەم پەرستگایە کۆڵەکەکانی ئایۆنیك بوون. پەرستگای ئیرکثیوم بەوە جیا دەکرێتەوە کەکۆڵەکەکانی مەقسەڵەنو سەقفەکەی لەسەر کۆڵەکە جێگیرنەکراوە بەڵکو لەسەر پەیکەری جەستەی کچۆڵە جێگیرکراوە. پەرستگاکانی ئەکرۆپۆلیس مەزنترین دەسکەوتو بەرهەمی ئەندازیارانی بیناساز، پەیکەرتاش، بەناو هونەرمەندانی ئەسینایین.

ئەو پەیکەرانەی کەلەلایەن گریکەکانەوە داتاشراون بەڵگەی بەرزی نموونەی گریکەکانە بۆ ژیانێکی باش. ئەو نموونانە جوان، گونجاوو راستو دروست بن. وەك پەیکەرەکان بەکاردەهێنران بۆ پۆرترێتکردنی خواوەندەکانو رازاندنەوەی پەرستگاکان، ئەوا ئەو نموونانەی گریکیان وێنا دەکرد. پەیکەر تاشەکانی سەرەتای گریك زۆر شارەزای گونجانو تەنسیقی جەستەی مرۆڤ نەبوونو لەداتاشیندا هێندە کارامە نەبوون. ئەو پەیکەرانەی ئەوان دروستیان دەکرد سادەو ناکامڵ بوون.

هەرچەندە پەیکەر تاشەکانی گریك لەپەیکەر تاشە میسری یەکانەوە فێری پەیکەر تاشین بوون، بەڵام دوو خاڵی ئیجابی هەبوو کەلای میسری یەکان نەبوون. یەکیان دابین کردنی بڕی زۆر یبەردی مەڕمەڕ بوو کەداتاشینی ئاسانتربوو لەبەردە رەقەکانی میسر. ئەوی تریان مۆدیلی زیندوو بوو، وەرزشکاران کەبەشداری پێشبڕکێ وەرزشی یەکانو کچانی لاو کەبەشداری رێپێوانە ئاینی یەکانیان دەکرد. بەڵام پێبەپێو هێدی هێدی پەیکەرتاشانی گریك زۆر شت فێربوون سەبارەت بەگونجاندنو تەنسیقی فۆرمی جەستەی مرۆڤو کارامەیی یان پەیداکرد لەداتاشینی بەردی مەڕمەڕدا.

سێ بەناوبانگترین پەیکەرتاشی گریك بریتیبوون لە: مایرۆن، فیدیاسو پراکسیتیس. مایرۆن پەیکەری ئەو وەرزشکارەی داتاشی کەقورس فڕێ دەدات، ئەم پەیکەرە لەهەموو پەیکەرەکانی دیکەی وەرزشکاران لەژیانەوە نزیکتر بوو واتە زیندووتر بوو. فیدیاس لەکاتێك دا سەرپەرشتی پەیکەرەکانی دەکرد لەپارثینون بۆ خۆشی پەیکەری ئەثینا پارثینوسی دروست کرد. هەروەها ئەو پەیکەرەی زیوسی لە ئۆڵۆمپیا دروست کرد، ئەم پەیکەرانەی ئەثیناو زیوس لەتەختە دروست کرانو بەزێڕ داپۆشران، تەختەکە بۆ گۆشتی جەستەو زێڕەکەش بۆ بەرگی. ئەو پەیکەرانە هێندە جوان بوون کەفیدیاس لە چاوی گریکەکاندا لەخواوەندەکان گەورەتر سەیر دەکرا.

پراکسیتیس، مەزنترین وەستای چەکوشی داتاشینی پەیکەر، پەیکەری ژمارەیەك خواوەندی دروست کرد بەناوبانگترینیان پەیکەری هێرمیس - ە - لە ئۆلۆمپیا.

شاعیرانی گریك هۆنراوەیان نووسیوە تا ئەمڕۆش دەخوێندرێتەوەو لێکۆڵینەوەی لەسەر دەکرێت. گریکەکانی زوو چیرۆکیان سەبارەت بەخواوەندو پاڵەوانەکانیان دەوت.

ئەو شیعرانە پێیان دەوترێت داستان. ئەو داستانانە دیار نەماون بەڵام چیرۆکەکان هێشتا زیندوون. هۆمەر مەزنترین شاعیرانی گریک لەنووسینی داستاندا، هەردوو داستانی ئەلیادەو ئۆدیسەی نووسی. باوەڕ وایە لەنزیکەی ٨٥٠ پ.ز دا ژیاوە. ئەلیاد ناوی خۆی لەئلیۆم وەرگرتووە کەناوی گریکی خشلّ- ە ئەم داستانە وەسفی رووداوەکانی پەنجاویەك رۆژە لەدەساڵی گەمارۆی (ترۆی - TROY) دەکات. داستانی ئۆدیسە تایبەتە بەسەرکێشییەکانی ئۆدیسۆس (یولیسیس) لەکاتی گەڕانەوەیدا بۆ وڵات لەجەنگی ترۆیان دا. ئەم شیعرانە مەزنترین داستانەکانن. یەکێك لەبەناوبانگترین برگەکانی داستانی ئەلیادە پاڕانەوەی هێکتۆر ترۆیان بۆ کوڕەکەی‌و ساتی ماڵئاواییکردنی لەخێزانەکەی پێش ئەوەی سەرقاڵی جەنگێکی کوشندە بێت لەگەڵ ئاکیلیس دا کەقۆزترین و ئازاترین جەنگاوەرانی ئەفسانەیی گریك بوو.

وەبەخێرایی هیکتۆری باڵا دەست خودەکەی لەسەر تەوێڵی لابردو لەسەر زەوی داینا دەدرەوشایەوە لەسەر زەوی، کوڕە ئازیزەکەی ماچ کردو بەخۆشییەوە بەرزی کردەوە بەو شێوەیە لەزیوس‌و هەموو خواوەندەکانی ئاسمان پاڕایەوە:

ئۆزیوس‌و هەموو خواوەندەکان ئەوە ببەخشن بەکوڕەکەم تالە نێو ترۆیاندا وەك دیارو بەرچاوبێت، و جوامێرانە لەئلیۆم دا فەرمانڕەوایی بکات، بەڵکو ئەوان بڵێن ئەم پیاوە مەزنترە لەباوکی مەزنی! کاتێك پێشوازی دەکەن کەلەگۆڕەپانی جەنگ دەگەڕێتەوە دەسکەوتی خوێناوی دوژمنی سەربڕاو دەهێنێتەوە کەبەو شێوەیە دایکی لەدڵەوە شادمان دەبێت.

بەوشێوەیە دەدوا، بۆ ئامێزی هاوسەرە ئازیزەکەی ئەو منداڵەکەی نارد، ئەو لەئامێزی بۆن خۆشیدا منداڵەکەی پێشوازی کرد، دەگریا کەئەو خەندەی دەکرد. سەرکردە راوەستا، و جووڵا، لەگەڵ بەزەییدا، نێوچەوانی بەدەستەکانی سری‌و وتی:

بەو شێوەیە غەم مەخۆ، یەك خۆشەویستی من. هیچ پیاوێکی زیندوو ناتوانێت من پەنهان بکات پێش وادەی خۆم، هیچ پیاوێکی داکەوتو لەدامێنی ژن ترسنۆك یان ئازا، ناتوانێت خۆی لەقەدەری بدزێتەوە.

بەڵام تۆ بڕۆرەوە ماڵەوە، لەوێ سەرپەرشتی کرێکارەکانت ئیشووکارەکانت، شوێنی خۆت بکە، فەرمان بدە بەکارەکەرەکانت ئیشەکان خێرابکەن. غەمی جەنگ بڵاوە بۆ هەموو پیاوانی لەدایك بووی ترۆی، لەهەمووان زیاتر بۆمن.

نزیکەی ٧٥٠ پ.ز هەیسیۆد کارەکان‌و رۆژانی نووسی، جۆرێکە لەرۆژنامە بۆ جووتیاران‌و دەریاوانان، لەشێوەی قەسیدەدا. ئامۆژگاری و قسە بەنرخەکانی بۆ جووتیاران، دەکرێ ئەمڕۆش دووبارە بکرێنەوە:

دوو جەنجەڕ ئامادەبکەو ئیشیان لەسەربکە لەماڵەوە، یەکیان پارچە پارچە بێت، ئەویتریان پێکەوە بەستراوبێت. زۆر باشتر وایە وابکەیت، بۆ ئەوەی ئەگەر یەکیانت شکاند، تۆ دەتوانیت گاکان لەوی دیکەیان بەستی. پێگەی گوڵ لەهەموو شتێك ئازادترن لەکرم، تەختەی نێوانیان داربەڕوو بێت. دووگا ئامادەبکە، گای تەمەن نۆساڵ، لەبەر ئەوەی هێشتا وزەیان بەکارنەبراوە، ئەوان باشترینن بۆ کارکردن. ئەوان لەکێڵگەدا شەڕناکەن‌و جەنجەڕەکە ناشکێنن‌و ئینجا ئیشەکە بەناتەواوی جێبهێڵن. لێگەڕێ چالاکێکی چل ساڵە دوایان بکەوێت، لەگەڵ چوار دەستەو پریاسکەو هەشت پارچە بۆنانی ئێوارەی، ئەوەی ئامادەی ئیشەکەی ئەو دەبێت‌و لەکێڵگەیەکی راستدا لێدەخوڕێت‌و تەمەن تێدەپەڕێنێت بۆ گەیشتنەوە بەهاوەڵەکانی، بەڵام مێشکی لای ئیشەکەی دەبێت.

لەقەسیدەیەکی تردا هەیسیۆس لێکدانەوەیەك سەبارەت بەئەسڵی جیهان‌و لەدایك بوونی خواوەندەکان دەخاتەڕوو.

ئەو چالاکییە کۆمەڵایەتی، ئابووری‌و سیاسییە چڕانەی شان بەشانی گەورەبوونی شارەکان، پیشەسازی‌و ژیانی چالاکی ئیش بازرگانی کەدەرەنجامی فراوان بوونی

کۆلۆنیالی‌بوو، لەپاڵ سەرهەڵدانی بازرگانی‌و پیشەسازیدا یارمەتی دەبستەبەرکردنی ئەو هاندەرو ئاواتانەی‌دا کەشێوازی نوێی شیعری خولقاند. ئەو شێوە نوێیانەی شیعرو سەرەتای پەخشان لەسەر پارچە کاغەزی بەردین دەنووسران کەلەمیسرەوە دەهێنران‌و لەنووسینیشیاندا ئەو ئەلفو بێیەیان بەکار دەهێنا کەگریکەکان لەئەلفو بێی فینیقی‌یەوە دروستیان کردبوو بۆ خۆیان. ئەلفوبێی فینیقی تەنها لەکۆنسنانتەکان پێك هاتبوو، گریکەکان بزوێنیان بۆ زیادکردبوو. هەندێك شاعیر مردوویان بۆ سوپاکان نووسی بۆ ئەوەی بیڵێن لەکاتێك دەڕۆیشتن بۆ گۆڕەپانی جەنگ، شاعیرانی تریش کۆراڵیان نووسی بوو بۆگۆرانی بێژان لەڕێپێوانە ئایینی‌یەکاندا بۆ ڕێزلێنان لەخواوەندەکان بیڵێن.

لەجۆرەکانی دیکەی شیعردا شاعیران گۆرانی‌یان بەباڵای شارەکانیان، سەرکردەکانیان، وەرزشکارە سەرکەوتووەکان، خۆشەویستی، شەراب‌و سروشتدا هەڵدەگوت. لەبەرئەوەی ئەم قەسیدانە دەنووسران تابەیاوەری‌یان لەگەڵ قیسارەدا وەك گۆرانی بیبێژرێن پێیان دەوترا لیریك. نووسەری هەندێك لەلیریکە جوان‌و شیرینەکان - سافۆ - یە کەلەنزیکەی ٧٠٠ پ.ز دا ژیاوە ئێمە ئەم برگەیە لەیەکێك لەقەسیدەکانی ئەم خانمە شاعیرە وەردەگرین:

پیرۆزە وەك خواوەندی ئەمر ئەوە،
ئەو لاوانەی تەنها سەیری تۆ دەکەن‌و
دەتبینن‌و دەتبیستن لەهەمان ئەو کاتانەدا
بەنەرمی دەدوێیت‌و بەشیرینی بزەدەکەی.

بەناوبانگترین شاعیرانی لیریك (پینداری ثیبیس) بوو کە مەزنترین وەستاو مامۆستای ڕێگای کۆراڵ بوو. زۆر قەسیدەی لەستایش کردنی سەرکەوتووانی فیستڤاڵە وەرزشی‌یەکان نووسیوە. بۆ ڕێزلێنانی جێگەیەکی تایبەتی بۆ ئەو، لەپەرستگای ئاپۆلۆ لەدەلفی، گیرابوو.

دراما شێوەی سەرەکی ئەدەب بوو لەسەردەمی مەزنی ئەسینادا. شانۆکاران تراژیدی‌و کۆمیدی‌یان نووسی کەلەفیستڤاڵە ئاینی‌یەکاندا نمایش دەکران بۆ ڕێزلێنان لەدیۆنیسیس خواوەندی شەراب‌و بەهار. لەهەر فیستڤاڵێکدا شانۆکاران پێشبڕکێیان دەکرد بۆ وەرگرتنی خەڵاتێك. لەسەردەمەکانی زوودا کۆرسەکان لەپێشبڕکێ ساڵانەکاندا تەراتیلیان دەوت‌و سەمایان دەکرد. دواتر دایەلۆگی درامی پەرەی سەند بۆ شانۆگەری راستەقینە کەلەشێوەی شیعردا دەنووسراو هەمیشە کۆرس بەشداری دەکرد لەشانۆگەرییەکەدا. ئەم شانۆگەرییانە لەلایەن بیست هەزار کەسێکەوە دەبینران کاتێك نمایش دەکران لەسەر شانۆی دینۆسیس لەلێژایی باشووری ئاکرۆپۆلیس. ئەکتەرەکان‌و سەماکاران لەسەر زەوی‌یەکی تەخت نمایشیان دەکرد، ئۆرکسترایەکی بازنەیی، یان شوێنێکی سەماکردن، کەلەناوەراستی‌دا شوێنی قوربانیدانی (مذبح)ی دینۆسیس هەبوو. دیمەنی پێشەوەی پەرستگایەك دەبووە باکگراوند لەکاتێکدا بینەران لەقەدپاڵی گردەکەدا دادەنیشتن‌و سەیری ئەکتەرو سەماکەرانیان دەکرد. لەریزی پێشەوە کەشیش‌و کەسایەتی‌یە گرنگەکانی ئەسینا دادەنیشتن. کورسی بەردین لەشێوەی نیمچە بازنەیەکدا پەرەسەندنێکی دواتربوو. لەبەر ئەوەی ئەکتەرەکان ماسکیان دەپۆشی نەدەتوانرا گوزارشتی رووخسارەکان ببینرێت‌و نەریتی قورسیش جوولەی خێرای مەحاڵ کردبوو. ئاخاوتنەکان درێژبوون‌و نواندنی باش بریتی بوو لەباشترین وتنەوەی رستەکانی ناو دراماکە.

بیرۆکەی زۆرینەی تراژیدیاکان باسی لەخواوەندەکان، پاڵەوانەکان‌و کەسایەتی‌یە مەزنەکان دەکرد کەسەرقاڵی ململانێی توندوتیژبوون‌و بەتەواوی دەکەوتنە ژێر کاریگەری و زیانیان پێ‌دەگەیشت. شاعیرانی تراژیدی ئەو بیرۆکانەیان بەکاردەهێنا بۆ گفتوگۆکردن لەسەر گرفتە کۆمەڵایەتی‌و ئەخلاقی‌یەکانی ئەو سەردەمەی خۆیان.

ئەسخیلۆس (٥٢٥ - ٤٥٦ پ.ز) کەلەجەنگەکانی ماراثون‌و سالامیس دا بەشداری کرد، ژمارەیەکی زۆر تراژیدیای نووسی، تەنها حەوتیان پارێزراون. ئەسخیلۆس ئیلهامی

لەسەرکەوتنی مەزنی گریکەکان لەسالامیس ساڵی ٤٨٠ پ.ز وەرگرت تادرامای فارسەکان بنووسێت. لەو درامایەدا ئەسخیلۆس وێنەیەکی کاریگەری ئەو جەنگە دەریاییە مەزنەی کێشاوە. ئەو (واتە ئەسخیلۆس) وای پیشان داوە خواوەندەکان بەشکست سزای زیرێکس ـ یان داوە لەسەر لەخۆباییبوونی. لەدرامای سنوورەکانی پرۆمیثوس‌دا، پرۆمیثوس ـ زەبەلاح ـ یاسای زیوسی پێشێل کرد بەوەی ئاگری‌دا بەمرۆڤ یان پیاوەکانو لەبەرئەو کردەوەی زیوس بەشێوەیەکی ناعادیلانە سزای‌دا. لەسێ درامای دیکەدا ئەسخیلۆس باسی چیرۆك‌و چارەنووسی ئاگامیمۆن، کەسەرکردەیەکی گریك بوو لەجەنگی ترۆیان (تەروادە)،و خێزانەکەی دەکات. شانۆگەرییەکانی ئەسخیلۆس لەبونیاددا سادەبوون بەڵام ئەو وشانەی ئەو بەکاری هێنان‌و ئەو ئایدیانەی ئەو گوزارشتی لێکردن کاریگەرییەکی مەزنیان هەبوو لەسەر بینەرانی گریك.

سۆفۆکلیس (٤٩٦ ـ ٤٠٦ پ.ز) نیشتمان پەروەرێکی راستەقینەی ئەسینایی بوو کەلەسەردەمی پێریکلس دا ژیا. ئەو (سۆفۆکلیس) لەهەموو شاعیرانی دیکەی تراژیدی بەتواناتر بوو لەبونیادو دارشتنی شانۆگەریدا. لێکۆڵینەوەیەکی سەبارەت بەتراژیدی نووسی کە نەپارێزراوە. تەنها حەوت لەشانۆگەرییەکانی گەیشتۆتە دەستی ئێمە.

باوەری هەبوو بەدیموکراسی ئەسینا. لەو باوەرەدا بوو لەژێر سایەی حوکمی خواوەندەکاندا، هاووڵاتییەکانی دیموکراسییەك دەتوانن باڵاترین ئامانجەکان ـ کەلەتوانای مرۆڤ دا بێت ـ بەدەست بهێنن. یەکێك لەشانۆگەرییەکانی ئەنتیگۆن‌و چیرۆکی کچێکە کەناچار دەبێت لەنێوان شکاندنی یاسایەکی خواوەندو یاسایەکی ثیبس‌دا یەکێکیان هەڵدەبژێرێت. لەکۆرسێکی بەناوبانگدا سۆفۆکلیس ـ لەئەنتیگۆن دا ـ رێزو ئیعجابی خۆی بەرامبەر دەسکەوتەکانی مرۆڤ بەم وشانە گوزارشت دەکات:

لەنێو هەموو شتەکاندا هیچ کامیان بەشێوەیەکی جوان لەمرۆڤ بەهێزترنین. ئەو دەتوانێت بەدەریای زستانیدا تێپەرێت، ساڵ لەگەڵ ساڵ بەجەنجەرەکەی هێزی بزێوی زەوی دەستەمۆ دەکات، بەتەمەنترین خواوەندە نەمرەکان. ئەو بۆ دەسکەوتی خۆی باڵندە هەڵنیشتووەکانی هێلانەی داڵ‌و ماسییە سك پرەکان دەگرێت، و بەزیرەگی خۆی‌و درندە کێوییەکانی ماڵی کردووە، ئەسپی یاڵ درێژو



گای ماندوو نەناس. زەمان هی خۆیەتی، شنەی بای بەرو مێشکی دروست کردنی شاریش، فێربووە خۆی لەسەرماو بارانی بەخوڕ داڵدە بدات، ئامرازی چارەسەرکردنی هەموو نەخۆشییەکی هەیە، تەنها مردن نەبێت. تەنانەت بۆ نەخۆشییە یاخییە بێ هیواکانیش چارەسەری هەیە، و بەتوانا بێ سنوورەکانی بەردەوام دەجووڵێت، هەندێك جار بەرەو خراپە، بەڵام پاشان بەرەو باشە.

ئۆدیپ پاشا بریتییە لەچیرۆکی گرێکێك بێ پێزانین تاوانێکی ترسناك دەکات کەسەرنجام بەسەریدا دەشکێتەوە، لەرۆژانی مەزنیدا کاتێك کەپادشای ثیبس بوو. خەسڵەتە تراژیدی، زمانە پاراوەکەی، دایەلۆگە زیندووەکەی، پلۆتە بێهاوتاکەی و کۆرسە گەرموو گوڕەکەی پێکەوە وای لێدەکەن شانۆگەرییەکەی تەواوو کامڵ بێت.

ئورویپایدیس (٤٨٠ ـ ٤٠٦ پ.ن) کەبەرچاوی خۆی ترس و تۆقینەکانی جەنگی پیلۆپۆنیسیانی بینی، وتەبێژی هەژاران، بێفیزو چەوساوەکان بوو. ئەو (واتە ئورویپایدیس) بەناوبانگترین شاعیرانی تراژیدی بوو لەقۆناغی دواتری مێژووی گریك داو ژمارەیەکی زۆری شانۆگەرییەکانی ئەمرۆش بەرهەم دەهێنرێن. شانۆگەری ژنانی ترۆیییان (تەروادە) لەگۆشەنیگای تەروادەییە داگیرکراوو تێکشکێنراوەکانەوە چیرۆکی ئازارو ئەشکەنجەی ئەو ژنە تەروادەییانە دەگێڕێتەوە کەلەلایەن گریکەکانەوە لەتەروادە بەدیل گیران. شانۆگەری ئەلسێستس چیرۆکی پادشایەك دەگێڕێتەوە کەقەدەری بوو بمرێت بەڵام ئەگەر بیتوانیایە کەسێك بدۆزێتەوە بۆی، یان لەجیاتی ئەو، بمرێت ژیانی رزگار دەکرا. ئەلسێستس ی خێزانی قایل دەبێت لەجیاتی ئەو بمرێت. مردن هات بۆ ژنەکە، بەڵام هیراکلس ی پاڵەوان رزگاری دەکات و دەیگێڕێتەوە.

بەهێزترینیان لەزمان و لەئایدیادا، شانۆگەری میدیایە کەوێنەیەکی زیندووی رق و دوژمنایەتی ژنێکی ئەفسانەیی وێنا دەکات لەگەڵ ئەو تۆڵەی لەمێردەکەی دەکاتەوە کەپێشتر تووشی ئازارو ئەشکەنجەی کردووە.

کۆمیدی کاریکاتێرو گاڵتەجاڕی کردووە. ئەریستۆفانیس هەرە بەناوبانگترین نووسەری کۆمیدیا گاڵتەی بەکۆمەڵەکان، دەستەی سوێندخۆرەکان و سەرکردەکانی ئەسینایییەکان کردووە. لەشانۆگەری هەورەکاندا بەهەڵە سوکراتی فەیلەسوف بەچەواشەکردنی لاوانی ئەسینا تاوانبار ـ دەکات. لەشانۆگەری بۆقەکاندا گاڵتەجاڕی و سوکایەتی بەبۆچوون و هۆنراوەکانی ئورپایدیس دەکات، بەبەراوردکردنیان لەگەڵ بۆچوون و هۆنراوەکانی ئەسخیلۆس دا. ژمارەیەك لەشانۆگەرییەکانی پاڕانەوەی، بەتاڵ لەسۆزی تێدایە بۆ بەرقەرارکردنی ئاشتی لەنێوان شارەکانی گریك دا کەسەرقاڵی جەنگی پیلۆپۆنیسیان بوون.

لەشانۆگەری لیسیستراتادا ئەریستۆفانیس لەسەر زاری لیستراتای پاڵەوانی، کەشانۆگەرییەکەی بەناوەوە ناوناوە لەکاتی دووانیدا سپارتانی و ئەسینایییەکان ئەم وشانە دەڵێت: ئێستاش، هاوڕێیانی ئازیز، من دەخوازم سەرزەنشتی ئێوە بکەم هەردوولاتان

کەئێوە، هەمووتان لەیەك خوێنن، هەموو بران

پەرتەوازەبوون

خودی هەمان شوێنی قوربانی لەهەمان سندوقەوە

لەپیلانی، پیتۆ، وئۆلۆمپیان ئای

زۆر زۆریتریش کەزۆر درێژن ناوەکانیان بێنم

کەئێوە، هێلینییەکان ـ لەکاتێکدا دوژمنە چەکدارە بەربەرییەکان چاویان تێبڕیون ـ شەڕ دەکەن و هێلین تێك دەشکێنن!

لەخەونی ئەریستۆفانیس دا بەئاشتییەوە شارە شەڕکەرەکان ئاشت بوونەتەوە لەگەڵ یەکتریداو لەئارامی و پێکەنیندا بەخۆشی دەژین.

هەندێك لەشانۆگەرییە تراژیدی و کۆمیدییەکان کەلەلایەن شاعیرانی تراژیدی و کۆمیدیاوە نووسران لەسەردەمەکانی دواتردا نمایش کران. دەقی ئەم شانۆگەرییانە پارێزراون، لەوانەیە لەو سکریپتانەوە وەرگیرابن کەلەلایەن ئەکتەرەکانەوە بەکارهێنراون شانۆگەرییەکانی تر هەموو تیاچوون و فەوتان.

هێرۆدۆتس (٤٨٥ ـ ٤٢٥ پ.ن) باوکی مێژوو بوو. ئەو مێژووی جەنگەکانی فارسی نووسی بۆئەوەی یادەوەری قوربانی‌یە زۆر و مەزنەکانی هێلینی‌و بەربەری‌یەکان بپارێزێت. ئەو وەسفێکی دوورو درێژ ئیمپراتۆریەتی فارسی تێهەڵکێشی مێژووەکەی کردووە. ئەو یەکێك بوو لەباشترین چیرۆك بێژەکانی هەموو سەردەمەکان. یەکێك لە بەناوبانگرتین چیرۆکەکانی باسی سەردانێکی سۆلۆن دەکات، کەیاسا ناسێکی ئەسینایی‌یە، بۆ دادگای کۆریۆسیس پادشای لیدیا. لەم چیرۆکەدا هێرۆدۆش دیدی خۆی بۆ هاوولاتی باش دادەرێژێت.

سۆلۆن ئامادەکاری گەشتەکانی‌کرد، لەو چوارچێوەیەدا کەتیایدا چوو بۆ میسر بۆ دیوانی ئاماسیس، هەروەها هات بەسەردانێکی کریۆسس لەساردیس. کریۆسیس وەك میوانی خۆی پێشوازی لیٚ کرد، لەکۆشکی پادشایەتیدا نیشتەجیٚی کرد. لەسیٚیەم یان چوارەم رۆژی دوایدا، ئەو فەرمانی‌دا بەخزمەتکارەکانی گەنجینەکانی پیشانی سۆلۆن بدەن، و هەموو مەزنی‌و خۆشگوزەرانی‌یانی پیشان بدەن.

کاتێك هەموویانی بینی، و ئەوەندەی کات رێگەی پیٚدا، پشکنینی. کریۆسیس ئەم پرسیارەی ئاراستەی‌کرد: ئامۆی ئەسینا، ئێمە زۆمان بیستووە سەبارەت بەحەکیمی تۆو سەفەرەکانی تۆ بەزۆر ولاتدا، لەسۆنگەی خۆشەویستی زانین‌و ئارەزووی بینینی جیهانەوە. من بەو شێوەیە پێم خۆشەو حەزدەکەم لەتۆ بپرسم، کیٚ، لەنێو هەموو پیاواندا کەتۆ بینیوتن، تۆ دایدەنێیت بەدڵخۆشترین پیاو؟. ئەمەی پرسی چونکە لەو باوەڕەدا بوو خۆی دڵخۆشترینی زیندووەکان بێت: بەلاٚم سۆلۆن بەبیٚ هیچ لەروودامان‌و موجامەلەیەك وەلامی دایەوە، بەگوێرەی هەست‌و سۆزەکانی خۆی، گەورەم سەبارەت بەئەسینا بۆمان بدویٚ، پڕە لەشتی سەرسوڕهێن وەك بیستبووی، کریۆسیس داوای‌کرد بەتوندی، و کویٚ لەهەموو شوێنێك بەدڵخۆشتر دادەنێیت. کەئەوی‌تر لەوەلامی‌دا وتی: پێش هەموو شتێك، چونکە ولاتەکەی لەرۆژانی ئەودا گەشەی دەکرد، خۆیشی کوڕی هەبوو جوان‌و چاکیش بوون،و ژیابوو تاببینێت هەریەکێکیان منداڵی دەبێت، و ئەو منداڵانەش هەموو گەورە دەبن، لەوەش زیاتر، چونکە پاش ژیانێك کەخەڵك بەوشێوەیە سەیری دەکەن بەخۆشی بەسەر برابێت، کۆتایی‌یەکەی زیاد لەپێویست شکۆداربوو. لەجەنگێك دا لەنێوان ئەسینایی‌یەکان‌و دراوسێکانیاندا لەئلیۆلیس ئەو هات بەدەنگ پیاوانی ولاتەکەیەوە، رووبەڕووی دوژمن بووەوەو، لەگۆڕەپاندا زۆر جوامێرانە مرد. ئەسینایی‌یەکان رێپێوانێکی گشتی بەخاکسپاردنیان پیٚبەخشی لەو شوێنەی لیٚی کەوت، ئەوپەڕی رێزلێنان رێزیان لێنا.

ئەم چیرۆکە تارادەیەکی زۆر تیشك دەخاتە سەر نموونەی هاوولاتێتی لەسەردەمی پێریکڵیس دا.

ثیودیریس یەکەمین مێژوونووس بوو بەرێبازی زانستی بنووسێت. ئەو باوەڕی وابوو مێژووی خۆی دووبارە دەکاتەوە هەربۆیەشە بابەتێکی بەسوودە... ئەو بەنیازبوو مێژووەکەی ببێتە کتێبی تێکستی ژەنەراڵ‌و سیاسەتمەداران. بەوریایی‌یەوە سەرچاوەکانی دەپشکنی‌و هەوڵی دەدا ئەوە بڵێت کەرووی‌داوە. لەمەدا جیاواز بوو لەهیرۆدۆتس کەوتوویەتی: من پابەندم بەگەیاندنی ئەوەی وتراوە، هەرچەندە پابەندنیم بەوەی باوەڕ بەهەمووی بکەم. ثیودیرس وەستای شێوازی ئەدەبی بوو. راپۆرتەکەی سەبارەت بەوتارێکی پیریکلیس کەلەکۆتایی ساڵی یەکەمی جەنگی پۆلۆپۆنیسیان ئاراستەی بەشدارانی مەراسیمێکی بەخاکسپاردنی ئەوانەکرا کەلەو جەنگەدا کوژرابوون، وێنەیەکی پرشنگداری دیموکراسی ئەسینا پیشان دەدات:

شێوە حکومەتی ئێمە ناچێتە پێشبڕکیٚو رکەبەری‌یەوە لەگەلٚ دامەزراوەکانی ئەوانی ترەوە. ئێمە لاسایی دراوسێکانمان ناکەینەوە، بەلاٚم نموونەیەکە بۆ ئەوان. ئەوە راستە ئێمە پێمان دەوترێت دیموکراسی‌یەك، لەبەرئەوە ئیدارە لەدەستی زۆردایە نەك لەدەستی کەم دابێت. بەلاٚم لەکاتێك یاسا عەدالەتی یەکسان بۆ

هەموو وەك یەك زامن دەكات لەناكۆكی یە تایبەتی یەكانیان دا، ئیدعای باشترو باشترین دانی پێدانراوە، كاتێكیش هاوولاتی یەك بەهەر شێوازێك دیارو بەرچاوبێت، لەخزمەتە گشتی یەكاندا پەسەندتر كراوە یان هەلاواردراوە لەوانی تر، نەك وەك مەسەلەی ئیمتیاز، بەلكو وەك پاداشتێكی بەهرەمەندی، هەروەك هەژاری نەنگی و كۆسپ نی یە، بەلام مرۆڤ دەتوانێت سوود بەولاتەكەی بگەیەنێت هەرچەندە هەلومەرجیشی دژواربێت..

وتاردان بەری دیموكراسی گریك بوو. وتاردان پەرەیسەند لەنەریتی دووان و وتاردان لەیاری یەكانداو وەك پێداویستی یەكی وتاردان لەكۆمەلەو دادگاكاندا. وەك گریكەكان وتاری زۆریاندا مێشكی پڕ بیریان بردوونی بەرەو ئەوەی بپرسن چ خەسلەتێك وا لەوتار دەكات زۆر كاریگەر بێت. بۆ دابین كردنی ئەم پێداویستی یەی گریكەكان، ئیسۆكراتیس، ئەسینایی یەكی سەدەی چوارەم، خوێندنگەیەكی دامەزراندو تیایدا خەلكی فێری هونەری نووسین و خوێندنەوەی وتار (رەوانبێژی) دەكرد. ئەو پرەنسیپانەی ئەو دایرشتن بۆ رێكخستنی وتارێك هێشتا لەخوێندنگەكانی ئێمەدا دەوترێنەوە. مەزنترین وتاربێژانی گریك و دیموستینیس بوو، دوا پالەوانی دیموكراسی گریك كەفیلیپێكیسی لەدژی فیلیپی ماسیدۆن گەیاند. وتارەكەی سەبارەت بەتابع وادانراوە، لەو كاتەوە تائێستا، شاكاری ئەدەبی و وتاربێژی بێت لەبەر زمانەكەی، تانەی توندوتیژی و گفتوگۆ كاریگەرەكەی..

گریكەكان هەولیان دا گەردون شیبكەنەوەو لێكیبدەنەوە. بەوشەی فەلسەفە لەوشەیەكی گریكی یەوە وەرگێراوە كەواتای خۆشەویستی حیكمەت دەگەیەنێت. گریكەكان لەو باوەڕەدابوون فەلسەفە لێكۆلینەوە لەگەردوون و هەولدان بۆ شیكردنەوەو لێكدانەوەی ئەسلی و ستراكچەرو واتاكانی، لەخۆدەگرێت یاخود دەگرێتەوە. مرۆڤ لەسەردەمەكانی پێشووتردا هەلاتن و ئاوابوونی خۆر، بوومەلەرزە، هەورە بروسكەو تریشقەو دیاردە سروشتی یەكانی دیكەی بەدانە پال خواوەندەكان لێكی داونەتەوە. میسری و بابلی یەكان زۆر فێربووبوون سەبارەت بەئاسمان و زەوی بەلام زانیاری یەكەیان تەنها بۆ مەبەستە عەمەلی و ئاینی یەكان بەكاردەهێنا.

بیریارانی گریكی یەكەم كەسانێك بوون كەباوەڕە كۆنەكان سەبارەت بەخواوەندەكان وەلابنێن و پرسیاربكەن و هەول بدەن پرسیار بنچینەیی یەكان لەبارەی گەردوونەوە. وەلام بدەنەوە.

هێندەی ئێمە بزانین یەكەمینی ئەو فەیلەسووفانە (عاشقانی حیكمەت) یان عەودالانی دوای سروشت ثالیسی میلتیاس بوو كەلەنزیكەی ٦٠٠ پ.ز دا باشترین ئیشی خۆی كرد. ثالیس ئەو پرسیارەكەی لەخۆی كرد: گەردوون لەچی پێكهاتووە؟ وەلامیشی دایەوە (ئاو) ثالیس لەبەروەلامەكەی رێزی لێنەنرا بەلكو لەبەرئەوەی یەكەم كەس بوو ئەو پرسیارە بكات و هەول بدات وەلامی بداتەوە. وتراوە ثالیس لەمیسر زانیاری سەبارەت بەئەندازەو ئەستێرەناسی بەدەست هێناوەو هەولی داوە ئەم زانستانە لەگریك بناسێنێت و بلاویكاتەوە. چیرۆكێك، كەلەوانەیە راست بێت، وای دەگێڕێتەوە ثالیس پێشبینی خۆرگیرانی كردووە كە لە ٥٨٥ پ.ز دا رووی داوە. ئاناكسیماندەر (٦٠٠ ـ ٥٤٧ پ.ز) خوێندكاری ثالیس ئەستێرەناسی، ئەندازەو بایۆلۆژی خوێندوەو لێی كۆلیوەتەوە. نەخشەیەكی كێشا كەیەكەم نەخشەبوو لەجیهانی خۆرئاوادا كێشرا. ئەو یەكەمین سەعاتی خۆریی دروست كرد، پرەنسیپەكەی لەبابلی یەكانەوە فێربوو، هەروەها گریكەكانی فێركرد چۆن كاتی پێ بزانن و بەكاری بهێنن.

فیثاگۆرس، كەیەكێكە لەبەناوبانگترین فەیلەسوفەكانی گریك، لەنزیكەی ٥٨٢ پ.ز دا لەدوورگەی سامووس لەخۆرهەلاتی ئیجە لەدایك بووە. وەك پیاوێكی لاو مالی بەجێ هێشت و دەوترێت گەشتی زۆری كردووەو لەمیسر خوێندویەتی. سەرەنجام لەكۆرتۆن نیشتەجێ بوو كەشارێكی گریكی بوو لەباشووری ئیتالیا. لەوێ قوتابخانەیەكی فەلسەفەی دامەزراند. ئەم

قوتابخانەیە تەرخان کرابوو بۆ لێکۆڵینەوەی گەردوون و مرۆڤ. ئەو (واتە فیثاگۆرس) هەموو مرۆڤی دابەش کردبوو بەسەر –سێ پۆل دا- عاشقانی خۆشی، عاشقانی سامان و شەرەف و عاشقانی حیکمەت (فەیلەسووفەکان).

دەوترێت ئەو (واتە فیثاگۆرس) ئەو وشە گریکی یانەی داڕشتووە یان داهێناوە کەوشەکانی فەلسەفەو فەیلەسوفیان لێپێك هێنراوە. بەهەرحاڵ ئەوان بەخێرایی سەرقاڵی سیاسەت بوون و لەکۆرتۆتن دەرپەڕێنران بۆ شارە گریکی یەکانی تر لەئیتاڵیا.

فیثاگۆرس مێشکێکی درەوشاوەو کەسایەتی یەکی کاریگەری هەبوو. کاریگەریی مەزنی هەبووە لەسەر گریکەکانی سەردەمی خۆی. دەوترێت ئەو سەلماندی رووبەری راستەهێڵی سێگۆشەیەکی راست یەکسانە بەبڕی رووبەرەکانی دوولاکەی تری سێگۆشەکە. ئەو یان شوێن کەوتووانی وتیان خۆر، مانگ، زەوی، و ئەستێرەکان هەموویان بەدەوری ئاگرێکی ناوەندی خڕبوونەتەوە واتە خۆر رووناکی یەکەی لەئاگرە ناوەندی یەکە رادەکێشێت و رەوانەی دەکات بۆ زەوی. ئەو لەو باوەڕەدابوو زەوی تەخت نی یە وەك زۆربەی گریکی یەکان پێیان وابوو بەڵکو خڕە.

ئەمپیدۆکلس (٤٩٠ ـ ٤٣٥ پ.ز) ئەو تیۆرەی پێشکەش کرد یان پەرەپێدا کەماددە لەچوار توخم پێك هاتووە: خاك، هەوا، ئاگرو ئاو. فەیلەسووفەکانی تر ئەم تیۆرەیان قبووڵ کرد بەڵام دیموکرەتیس (٤٦٠ ـ ٣٧٠ پ.ز) هاو زەمان و هاوشاری تراس قایل نەبوو بەو تیۆرە. ئەو وتی ماددە پێکهاتووە لەگەردیلەی زۆر بچووك کەجیاوازبوون لەیەکتری لەقەبارە، شێوە، کێش و لەشێوەی تردا. ئەو وتی ئەو گەردیلانە نەبینراون و قابیلی شکاندن نین. ئەو ئەم گەردیلانەی ناونا ئەتۆم. ئەو بەو شێوەیە وانەی دەوتەوە کەلەسەرەتادا ئەم ئەتۆمانە لەوەزعی سکون دا بوون بەڵام بەڕێکەوت پێکەوەیەکیان گرت بۆ ئەوەی گاز، شلەو رەقی پێك بهێنن. تیۆرەکەی دیموکرەتیس پێشەکی یان رچەشکێنی تیۆری ئەتۆمی داڵتۆن بوو کە بنچینەی کیمیای مۆدێرنە. تیۆرەکەی دیموکرەتیس لەلایەن زۆربەی فەیلەسووفە گریکەکانەوە قبووڵ نەکرا و ئایدیای چوار توخمی پێکهێنەر وەك خۆی مایەوە تادۆزینەوەکان رێگەیان خۆش کرد بۆ دامەزراندن یاخود گەڵاڵەکردنی تیۆری مۆدێرنی ئەتۆمی.

عەودالێکی گریکی تری سروشت هایپۆکرەتیس بوو (٤٦٠ ـ ٣٧٧ پ.ز). ئەو لەدوورگەی کۆس لەدایك بوو. پێش ئەو کاتە زانستی پزیشکی بەشێوەیەکی زۆر لەژێر کاریگەریی جادوودا بوو. زۆربەی مرۆڤەکان پێیان وابوو رۆحە شەڕەنگێزەکان یان تووڕەبوونی خواوەندەکان دەبنە هۆی نەخۆشی. بۆ چارەسەکردن ئەوان دەچوون بۆلای کەشیشەکان لەپەرستگاکاندا. زۆر کەشیش مەراسیمی ئاینییان ئەنجام داو دەرمانیان سازکردو چارەسەریان وەسف کرد بۆ نەخۆشان وەك ئەوەی لەلایەن خواوەندەکانەوە فەرمان کرابێت بەبەکارهێنانیان . ئەم کەشیش و پیاوانی تریش لەرێی ئەزموونەوە زانیاری بەرچاویان کۆکردەوە سەبارەت بە دەرمانەکان و چارەسەری نەخۆشی یەکان. میسری و بابلی یەکان هەردوولایان زۆر شت فێربوون سەبارەت بەزاستی پزیشکی. پێش سەردەمی هایپۆکرەتیس پزیشکە گریکی یەکان لەوانەوە فێربوون. کەچی هێشتا بەکارهێنانی جادوو لەچارەسەرکردنی نەخۆشی دا زۆر بڵاوبوو. زۆربەی گریکەکان دەچوون بۆ مەزاری خواوەندەکان، بەتایبەتی مەزاری ئاپۆلۆو ئاسکلیپیەس، کەئەوکاتە بوویووە خواوەندی سەرەکی چارەسەرکردن لای گریکەکان.

هایپۆکرەتیس پێی دەوترێت باوکی زانستی پزیشکی چونکە هەموو جادوویەك و تیۆرەکانی پێشووی بەلاوەناو بناغەی تیۆرەکانی خۆی لەسەر تێبینی کردن و ئەزموون داڕشت. ئەو کوڕی کەشیشێکی ئاسکلیپیەس بوو لەمەزاری خواوەندا لەدوورگەی کۆس. کەم زانراوە سەبارەت بەژیانی. دەوترێت لەمیسر خوێندویەتی، وەك پزیشك ئیشی کردووەو بەتوانای لەدەست نیشان کردی نەخۆشی دا

ناسراوه. لەنووسینەکانی‌دا، (سەبارەت بەپەتاکان) هەروەها (سەبارەت بەرژێم لەنەخۆشی‌یە سەختەکان دا)یشەوە ئەو تەئکیدی کردووەوە نەخۆشی‌یەکان هۆکاری سروشتی‌یان هەیەو دەبێت چارەسەری سروشتی‌یان هەبێت یان بکرێت. ئەو تێبینی کاریگەری کەش‌و هەواو وەرزەکانی کرد لەسەر تەندروستی.

هەرچەندە زۆر لە تیۆرەکانی دواتر رەت کرانەوە پاش ئەوەی تاقیکردنەوەکان سەلماندیان هەڵەن، بەوانە وتنەوەکانی بناغەیەکی دڵنیای دانا کەزانستی پزیشکی مۆدێرنی لەسەری جێگیرە، تائێستاش برێکی زۆر نووسینی پزیشکی ئەوو شوێن کەوتوانی لەبەردەستدان.

سۆفی‌یەکان رێنمایی لاوە گریکی‌یەکانیان دەکرد، لەگریک‌و لەسەدەی پێنجەمی پێش زایین دا خوێندنگە ئامادەیی‌یەکان، کۆلیژەکان‌و کتێبی چاپکراو نەزانراوبوون. ئەو خوێندنەی کەلاوان لە مۆسیقا، خوێندنەوەو نووسینەکاندا وەریان دەگرت لەخوێندنگە تایبەتی‌یەکاندا بەس نەبوون بۆ هاوولاتی دیموکراسی‌یەك. بۆ دابین کردنی پێویستی بەخوێندن، چینێکی پیاوان کەپێیان دەوترا سۆفی رێنمایی‌یان لەسیاسەت، لەهونەری نووسین، رێکخستن‌و وتاردان دا پێشکەشی ئەو لاوانە دەکرد کەهاتبوون گوێیان بۆ بگرن. یەکێك لەو سۆفیانە، پرۆتاگۆراس، دەستی کرد بەدیراسەکردنی رێزمان. ئەو یەکەم کەس بوو رەگەز –نێر، مێ، بێ لایەن بەکار بهێنێت. سۆفییەکی تر، گۆرجیاس، وتی: ئێمە بۆ جەنگی ژیان دوو بەهامان پێویستە، ئازایەتی‌و حیکمەت، ئازایەتی بۆ ئەوەی رووبەرووی مەترسی ببینەوەو حیکمەتیش بۆئەوەی بەسەر ئەو مەترسی‌یەدا زاڵ بین. سۆفی‌یەکان ئیدعایان دەکرد بەوانە وتنەوەکەیان مرۆڤ بکەن بەهاوولاتی‌یەکی باشتر. ئەوان قوتابی‌یەکانیان لەسەر راهێنانە بنچینەیی‌یەکان رادەهێنا کەلەو باوەڕەدا بوون بەهۆیەوە قوتابی‌یەکان سەرکەوتوودەبن لەژیاندا!. ئەوان ئاینی گریکەکانیان قبووڵ نەکردو ئەو بیرۆکەیان رەت کردەوە کەراست هەمیشە راستەو هەڵەش هەمیشە هەڵەیە. لەشوێنی ئەو بیرۆکەیەدا ئەوان ئەو بیرۆکەیان قبووڵ کرد کەهەر تاکێك خۆی بوو (پێوەری هەموو شتەکانە). بەدەستەواژەیەکی تر ئەوان لەو باوەڕەدا بوون مرۆڤ چی بەباشتر زانی بۆ خۆی ئەو راست بوو بۆ ئەو.

سوقرات (٤٦٩ ـ ٣٩٩ پ.ن) مەزنترین کەسایەتی رووناکبیری سەدەی پێنجەمی ئەسینابوو. هەرچەندە پارەی کەم هەبوو، ئەو بەشی زۆری کاتەکەی بەئیش کردن نابەڵکو بەسەردانی بازاڕ و دوکانەکان لەئەسینا بەسەردەبردو لەوێ پرسیاری دەکردو بەمەبەستی گەڕان لەسەر وەڵامەکان دەدوا. ئەو بڕوای وابوو گونجاوترین لێکۆڵینەوە بۆ مرۆڤایەتی، مرۆڤەو بەو پێیە هەوڵی‌دا شت بدۆزێتەوە سەبارەت بەمرۆڤ بۆ ئەوەی مرۆڤەکان باشتر بکات. یەکەمین شت کەئەو دۆزی‌یەوە ئەوەبوو کەنزیکەی هەمو مرۆڤێك لەو باوەڕەدابوون ئەو شتانەیان دەزانی کەنەیان دەزانی . یەکێك لەدەرەنجامەکانی ئەوەبوو کەدان نان بەنەزانی‌دا سەرەتایە بۆ زانین. ئەو دوژمنێکی ورد بیرنەکردنەوەو ورد قسە نەکردن بوو.

میتۆدی سوقرات بۆ پرسیارو وەڵام بۆ دۆزینەوەی راستی پێی دەوترێت دیالێکتیك. ئەو هەوڵی‌دا واتای راستی، دادوەری، ئازایەتی، جوانی، گوێڕایەڵی‌و شتەکانی تر بدۆزێتەوە. ئەو بڕوای بەخواوەندەکانی گریگ‌و کەرامەتی کرێکار هەبوو. دوو ئەسینایی بەهەڵە تاوانباریان کرد بەوەی نکوولی لەخواوەندەکان کردووەو لاوانی ئەسینای پیس (چەواشە) کردووە. بەرگری کردنەکەی لەدادگادا خراوەتە نێو پۆزشەکەی ئەفلاتوونەوە. پاش ئەوەی دادگایی و ئیدانە کرابوو و فەرمانی مردنی درا دەرفەتی راکردنی پێ‌بەخشرا بەڵام رەتی کردەوە چونکە بڕوای هەبوو بەمل کەچ کردن بۆ یاساکانی ئەسینا لەکاتێکدا لەزیندان دا بوو پێش ئەوەی شەرابی شەوکەران هەڵقوڕێنێت، لەگەڵ هاوڕێ‌و قوتابی‌یەکانی‌دا، سەبارەت بەنەمری گفتوگۆی دەکرد. گفتوگۆی سەر جێگەی مەرگی سەبارەت

بەنەمری خراوەتە ناو کتێبی (فایدو-)ی ئەفلاتوونەوە.

ئەفلاتوون ئایدیای (شار- دەوڵەت)ی کامڵی پەرەپێدا. دوانزە ساڵ پاش مەرگی سوقرات، ئەفلاتوونی موریدی (٤٢٨ - ٣٤٧ پ.ز) کەئەرستۆکراتیك بوو، لەباخێکی گشتی ئەسینادا قوتابخانەیەکی دروست کرد پێی دەوترا ئەکادیمیا. لەوێ بەیاوەری قوتابیان و هاورێیان وانەی لەسەر هەموو بابەتێکی زانراو دەوتەوەو لێکۆڵینەوەی دەکرد. لەوانە وتنەوەو نوسینیدا ئەفلاتوون میتۆدی سوقراتی لەپرسیار و وەڵام دا خستەکار. قوتابخانەکەی ئەفلاتوون ماوەی ٨٠٠ ساڵ بەردەوام بوو تائەو کاتەی جۆشینیانی ئیمپراتۆری رۆمانی رووخاندی کەبۆ خۆی مەسیحی بوو هەوڵی دەدا لەئیمپراتۆریەتەکەیدا هەر تەقەو بتپەرستی ریشەکێش بکات و بسرێتەوە. ئەفلاتوون تەنها قوتابی و بیریارێکی مەزن نەبوو بەڵکو هونەرمەندێکی ئەدەبی خاوەن تواناو کارامەبوو. نووسینەکانی لەشێوەی دایەلۆگدان و تیایاندا سوقرات رۆڵی پێشەنگ دەبینێ. لەبەرئەوەی نووسینەکانی دایەلۆگن هەمیشە زەحمەتە تێبگەیت ئەفلاتوون گەیشتە چ دەرەنجامێك.

لەدایەلۆگێکی بەناوبانگدا کەپێی دەوترێت (کۆمار) ئەفلاتوون تێڕوانینی خۆی سەبارەت بەدادوەری دارشت. لەچوارچێوەی ئەم دایەلۆگەدا ئەفلاتوون تێڕوانینی خۆی بۆ دەوڵەتی کامڵ پێشکەش کردوە. ئەو وتی شارێکی - دەوڵەتێکی (ویلایەتێکی) پێنج هەزار کەسی دەتوانێت باشترین شێوەی حکومەتی هەبێت، هێندە گەورە دەبێت بەپلەی (الاکتفاء الذاتی) بگات بەڵام هێندەش بچووك دەبێت کەهەمووان بەشداری چالاکییەکانی بکەن، لەبەرئەوەی عەقڵ و حیکمەت تەنها بناغەی تەندروستە بۆ راهێنان، ئەو وتی پێویستە عاقڵ و حەکیمان مەشقیان پێبکرێت فەرمانڕەوایی بکەن و رێسا دروست بکەن بۆ رێنوێنی هەموو ئەوانیتر.

چینێکی جەنگاوەر لەوەرزشکاران، دەبێت، بەرگری لەشارەکە بکەن لەکاتێکدا خەڵکەکەیتر کەبەشێوەیەکی نسبی ناحەکیمن پێویستە لەکێڵگەو دوکانەکاندا ئیش بکەن. تێڕوانینی ئەفلاتوون بۆ شاری - دەوڵەتی (ویلایەتی) کامڵ لەوانەیە یاخود دەکرێ کورت بکرێتەوە بۆ دوو پێشنیاری سادە، روون و بەڵگە نەویست کەخۆیان بەڵگەی خۆیان دەبن، ئەوە شارێکە تیایدا هەموو هاووڵاتییەك لەپێناوی بەرژەوەندی شارەکەیدا هەر شتێکی زۆر باش لەباریدا بێت بەو پێیەی سروشت توانای داوەتێ، دەیکات و هەمیشە دڵخۆشیش دەبێت بەئەنجامدانی ئەوکارەو هەمیشەیش بێئەوەی لەگەڵ هاووڵاتییەکانیدا یەکانگیربێتەوە. لەشارە کامڵەکەدا، حکومەت راهێنراوە یان پێك هێنراوە و کاردەکات تەنها بۆ مەبەستی پارێزگاری کردن لەهاووڵاتێتییەکی لەوجۆرەو پاراستنی شارەکە لەپەلامارو داگیرکاری دەرەکی و دووبەرەکی یان تەفرەقەی ناوخۆیی.

ئەرستۆتالیس یەکەم مرۆڤ بوو کەمیتۆدی زانستی بەکارهێنا. ئەریستۆتالیس (٣٨٤ - ٣٢٢ پ.ز) قوتابی ئەفلاتوون و مامۆستای تایبەتی ئەلیکساندەر (ئەسکەندەر)ی لاو، مامۆستای هەموو زانستەکانی رۆژگاری خۆی بوو. لەقوتابخانەکەیدا کەلەباخچەیەك دا بوو - ناوی لیسیۆم بوو - لە ئەسینا زۆر جۆری گرفتەکانی لەگەڵ قوتابییەکانیدا دەخستە بەر گفتوگۆ کاتێك هەموویان لەرێڕەوەکان دا لێی کۆدەبوونەوە.

لەوانەو کتێبەکانیدا، ئەریستۆتالیس بناغەی میتۆدی تەندروستی خوێندنی دانا، لەو میتۆدانەدا ئێمە سێ هەنگاویان دەناسین: ١- هەنگاوی یەکەم بریتیبوو لەخوێندنی ئەو زانیارییانەی پێشتر بەدەست هێنراون و بۆ ئەو مەبەستە ئەرستۆ ئەو کتێبانەی کۆکردەوە کەلەلایەن ئەوانەی پێش خۆیەوە نووسرابوون، یەکەم کتێبخانەی گریکی دامەزراند.

٢- هەنگاوی دووەم بریتیبوو لەتێبینی کردن و خوێندن. ئەو لەگەڵ قوتابییەکانیدا سەرنجی رووەك، ئاژەڵ، جەستە ئاسمانییەکان و مرۆڤیان دەدا. بۆ ئەوەی لە هەڵوێستی و رەفتاری مرۆڤ،

لەژیانی سیاسیدا، تێبگەن، مێژووی دەستوری ١٥٨ دەوڵەتی گریکیان نووسیەوەو لێی کۆڵینەوە. ٣- دوا هەنگاو، لەو راستییانەوەی کۆکرانەوەو دیراسەکران، هەوڵی دەدا بگاتە دەرەنجامی گشتی، میتۆدەکانی ئەرستۆتالیس بۆ خوێندن بەشێوەیەکی بنچینەیین هەمان ئەو میتۆدانەن ئەمڕۆ لەخوێندندا بەکاردێن.

لێکۆڵینەوەی ئەرستۆ لەگەردوون گەیاندیە ئەو ئەنجامەی کەئەو تیۆرە قبوول بکات کەهەموو شتەکان لەچوار توخم پێك دێن: خاك، هەوا، ئاگرو ئاو. ئەو وتی پێویستە چوار پرسیار سەبارەت بەهەموو کەرەستەیەکی گەردوون بکرێن و وەڵام بدرێنەوە. کێ دروستی کرد؟ لەچی دروست کرا؟ لەچ شێوەیەك دا دروست کرا؟ بۆچی دروست کرا؟. ئەرستۆ لێکۆڵینەوەیەکی لەسەر هەموو بوارەکانی زانست ئامادەکرد، هەرچەندە نووسینەکانی سەبارەت بەزانستی فیزیایی کەم بایەخ بوون، نووسینەکانی لەسەر شتە زیندووەکان بەتایبەتی لەسەر ئاژەڵان تا ئەمڕۆش دیراسە دەکرێن. وەسفکردنی بۆ شێوەکان و خووەکانی ئاژەڵان کارێکی نایابە بەڵام زانیاری سەبارەت بەفیسیۆلۆژی هەژاربوو. کتێبەکەی لەسەر رووەك لەناوچوو.

لەنووسینە سیاسییەکانیدا ئەرستۆ خۆی واپیشان دا کەخاوەن باوەڕێکی بەهێزە بەشاری - دەوڵەتی گریك، بەڵام لەگەڵ ئەفلاتوون دا لەو باوەڕەدابوون بۆ ئەوەی بەرژەوەندی هەموان مسۆگەر بکرێت، پێویستە دەوڵەت بەکۆمەڵە یاسایەك رێکبخرێت کەلەلایەن هاوڵاتیانی حەکیمەوە دادەنرێن. ئەو هەموو حکومەتەکانی بەسێ گروپ پۆلێن کرد: شاهەنشاهی، ئەریستۆکراتی (حکومەت لەلایەن باشترینەوە) و کۆمۆن وێڵیش (حکومەتی دەستوری). ئەو وتی شانشین دەبێتە مەملەکەتی ستەمکار لەکاتێك دا پادشا بەدوای بەرژەوەندی خۆیدا نەك دەوڵەت دا دەکەوێت، هەروەها ئەرستۆکراتی دەبێتە فەرمانڕەوایی کەمینە لەکاتێك دا لە بەرژەوەندی چینێك حوکم دەکات، هەروەها کۆمۆن وێڵیش دەبێت بەدیموکراسی لەکاتێك دا تەنها دوای بەرژەوەندی زۆرینە دەکەوێت و کەمینە سەرکوت دەکات.

بەدرێژایی ژیانی ئەرستۆتالیس زۆر کتێبی نووسی لەسەر ژمارەیەکی فرەو هەمەجۆری بابەتەکان، سیاسەت، شیعر، رەوشت، فەلسەفەو زانستەکان، بەرهەمەکانی بناغەی خوێندن بوون لەزانکۆکانی سەدەکانی ناوەڕاست دا و تەنانەت ئەمڕۆش بەرهەمەکانی ئەرستۆ کار لەخوێندنمان دەکەن لەزۆر بواری فێربوون دا. پاش مردنی، قوتابییەکانی دریژەیان بەئیشەکەیدا، کۆکردنەوەی کتێب لەسەر بابەتی هەمەجۆر.

## پوختەی ئەم بەشە

ئەسینابییەکان ئایدیای دیموکراسییان پەرەپێدا. ئەوان خستیانە بواری پیادەکردنەوە لەشار - دەوڵەتێك (ویلایەتێك)دا کەتیایدا هاووڵاتیان لێپرسراوانی خۆیان هەڵدەبژاردو پاش گفتوگۆی تێرو تەسەل لەکۆمەڵەدا یاساکانیان پەسەنددەکرد.

بەدابین کردنی مووچە بۆئەوانەی پۆستەکانی کارکردنی گشتییان وەردەگرت دەرفەتیان بۆ هەموو مرۆڤێك، نەك هەر دەوڵەمەند، رەخساند خزمەتی ئەسینابکات.

ئایدیای دیموکراسی ئەسینابییەکان رێگەی بۆ ئەو ئایدیایە خۆش کرد کەدەبێت ناکۆکی نێوان هاووڵاتییەکان لەلایەن هاووڵاتیەکانیانەوە چارەسەربکرێت. ئەم ئایدیایەش دامەزراندنی دەستەی سوێندخۆرەکانی لێکەوتەوە کەهەر لایەنێکی ناکۆك دەیتوانی لەبەردەمیدا ئیفادەو شایەتی خۆی بدات و کێشەکەی روون بکاتەوە. ئەوانەی سکالایان دەکرد وەك سوقرات بەرگری لەخۆی کرد. بەزۆرینەی دەنگ حوکمێك گەلاڵە دەکرا.

ئەسینابییەکان سەرقاڵی زۆر پیشەبوون. زۆربەیان جووتیاربوون، هەندێکیان بازرگان

بــــوون و هەندێکیشــــــیان هونەرمــــەندبوون. هاوولاّتیان و بیانی یەکان لەزۆر بازرگانی دا ئیشیان دەکرد، زۆرجار شان بەشانی یەکتری، زۆربەی ئیشەکان لەلایەن کۆیلەکانەوە ئەنجام دەدران کەئەوانیش لەبەرامبەر خراپ مامەڵەکردنی دا پارێزراوبوون و زۆجاریش ئازادی یەکی بەرچاویان پێ رەوا دەبینرا. بازرگانان گەشتی دەریایی یان دەکرد بۆ بەندەرە دوورەکان بۆ ئەوەی رۆن و شەراب و بەرهەمی دوکانەکانی ئەسینا بفرۆشن و دانەوێڵەو ئەو شتانەی تر بهێنن کەبازاڕیان هەبوو. بازرگانانی ولاّتانی‌تر دەهاتن بۆ ئەسینا تاشمەکەکانیان بفرۆشن و بەرهەمی ئەسینایی بکڕن بۆ ماوەیەکی کورت ئەسینا مەڵبەندی ئابووری جیهانی خۆرئاوا بوو.

ئەسینایی یەکان کوڕەکانیان فێری خوێندن دەکرد هێندەی ئامرازەکانیان رێگەیان پێ‌بداتێ کەسانی پشت بەخۆبەستووبن و وەك هاوولاّتی بەشداری بکەن لەحکومەتدا. دایکان کچەکانیان فێردەکرد بۆ ئەوەی بزانن چاودێری ناومالّ بکەن. چالاکی ژنان زیاتر لەنێو چوار دیواری مالّ دا قەتیس بوو. ژیانی ئەسینایی یەکان زۆر کۆمەلاّیەتی و بەشی زۆریشی لەدەرەوە بوو.

گریکەکان زۆر خواوەندیان (نێرینەو مێینە) دەپەرست کەزۆر دڵسۆزانە پەیوەستی ژیانی رۆژانەی خۆیان و چالاکی یەکانی هەموو رۆژێکیان کردبوون. لەو باوەڕەدابوون کەئەو خواوەندانە شێوەی مرۆڤیان هەبوو و بەو شێوەیە پەیکەریان بۆ دروست دەکردن وەك پەیکەریان بۆ خۆیان دروست دەکرد لەو باوەڕەدا بوون ئەو خواوەندانە پێویستی یان بەمالّ هەیە تیایدا بژین بۆیە پەرستگایان بۆ دروست کردن. لەبنیاتنانی پەرستاکان دا. ئەسینایی یەکان شێوازی نوێیان لەبیناسازی دا پەرەپێدا کەتائێستاش دیراسە دەکرێ و بەکاردەهێنرێت.

نووسەرانی گریك شیعرو پەخشانیان نووسی. شاعیرانی داستان، لیریك و شانۆگەری شیعری یان نووسی. زۆر داستان و شیعری لیریکی جوان و شانۆگەری شیعری مەزن گەیشتۆتە دەستی ئێمە. هەندێك لەو درامایانە ئەمڕۆ بەرهەم دەهێنرێن. نووسەرانی پەخشان مێژوو، وتار و وتاری فەلسەفی یان نووسی. یەکەمین فەیلەسووفەکانی گریك لەسروشتی گەردوون کۆڵینەوە. زۆربیان زانیاری زانستی یان پێشبینی کردو بەدەست هێنا. فەیلەسووفەکانی دواتر سروشتی گەردوون، شوێنی مرۆڤ لەسروشتداو سروشتی ژیانی باش ـ کەدەبوایە وەك ئەفلاتوون لەفایدرۆس دا نووسی لەجوانی، گونجان و راستی دا بدۆزرێتەوە ـ دیراسەکرد.

پەراوێزەکان

١ـ دەیم: یەکەیەکی ئیداری دابەشکردنی ئەنتیکای دێرینە لەولاّتی گریکەکان دا.

٢ـ ئەم بابەتە بەشی پێنجەمە لەکتێبی
From the history of mankind from early times to the present day. new york - 1954

# جاڕی گەردونیی مافی مرۆڤ،

## بانگەوازێکی گەردونییە یاخود بەرهەمێکی خۆرئاواییە؟

■ نووسینی: مەریوان وریا قانیع

● و: گۆران بابا عەلی

پەنجا ساڵ لەمەوبەر هەشت دیپلۆمات لە پاریس پێکەوە کۆبوونەوە بۆ نووسینی ئەو دەقەی پاشان ناوی لێنرا "جاڕی گەردونیی مافی مرۆڤ". ئەو هەشت دیپلۆماتە لەوڵاتو کیشوەرو کولتووری جیاوازەوە هاتبوون. خەڵکی ئوستراڵیا، چین، فەرەنسا، شیللی، بەریتانیا، لوبنان و وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا بوون. ئەو هەشت کەسە بەدرێژایی دووساڵ خەریك بوون تا ئەو سی ٣٠ بەندەی بانگەوازەکەیان داڕشت کە سێ (٣) لاپەڕەیەك دەبێت.

بەپێکهاتەی گروپی دیپلۆماتەکاندا دیارە کە هەر لەسەرەتاوە ویستراوە رێگا لەوەبگیرێت بانگەوازەکە ببێتە ترادیسیۆنێکی تایبەتیی کولتووری یان ئایینی پێکهاتەی گروپەکە ئەو هەوڵدانەی ئەوکاتەی کۆمەڵگای نێونەتەوەیی پیشان دەدات بۆ زامنکردنی بەجیهانی بوونی دەقەکەو روانین لەسەرووی سنورەکانەوە؛ دیدێك کەسنوورەکان تێپەڕێنێت.

خوێندنەوەیەکی باشی بانگەوازەکە نیشانی ئەدات کە نووسەرانی دەقەکە ئاگاداری ئەوەبوون کە شانسو توانای پراکتیزەکردنی مافە نووسراوەکانی ناو بانگەوازەکە شانسو توانایەکی کەم بوو. هەربۆیەش دەقەکەیان وەك بەرنامەیەکی مۆراڵیو ئێتیکی داڕشتووە، بەرنامەیەك کە مرۆڤایەتی لەهەموو کاتێکدا و لە هەر وڵاتێکدا هەوڵدات بگەڕێتەوە سەری. بەڵام




لەگەڵ ئەو هەموو هەوڵانەشدا بۆ دارشتنی دەقەکە وەك دۆکیومەنتێکی جیهانی و سنووربەزێن، کەچی هێشتا هەر رەخنەی لێگیراوەو دژایەتی کراوەو بەبەرهەمی کەلتوورێکی دیاریکراو دانراوە.

یەکەمین رەتکردنەوەی دەقەکە لەکاتی یەکەمین پێشکەشکردنیدا بووە لە ساڵی ١٩٤٨دا. هەشت وڵاتی ئەندامی ئەوکاتەی نەتەوە یەکگرتووەکان خۆیان لەدەنگدان کێشاوەتەوە. ئەو وڵاتانەش بریتیبوون لە سعودیەو ئەفریقای باشوور و وڵاتانی بلۆکی سۆشیالیستی.

وڵاتە سۆشیالیستەکان کە هیچ جۆرە ئازادییەکی بڵاوکردنەوەو ئازادیی سیاسیی و مافە سەرەتاییەکانی تری هاووڵاتیانیان نەدەناسی، بانگەوازەکەیان رەتدکردەوە، بەو بەهانایەی کە گوایە بەرنامەیەکی بۆرژوازیانەیەو جگە لەهەوڵدانێك بۆ پاراستنی ئاسایشی سیستمی سەرمایەداری" هیچیتر نییە.

سعودیە، کە نەیدەویست زیان لەدەسەڵاتی نوخبە ئایینییەکەی بکەوێت، بانگەوازەکەی بە بەهانەی ئایینیی و کولتوورییەوە رەتکردەوە. سعودیەکان پێیان وابوو کە بانگەوازەکە لەگەڵ ئیسلام و ئەو دونیایەی ئیسلام پێشنیاری دەکات نەدەگونجا.

هەروەها ئەفریقای باشوور کەتازە سیستمی ئاپارتهایدی، رەگەزپەرستی، دامێنابوو، نەیتوانی خۆی لەبانگەوازەکەدا بدۆزێتەوە.

ئەو بەهانەیەی لەهەرسێ حاڵەتەکەدا هاوبەشە بۆ رەتکردنەوەی بانگەوازەکە، ئەوەبوو کە گوایا ئەم بانگەوازە کاراکتەرێکی جیهانیی نییەو راستەوخۆ دەقێکە پابەندی چین، کولتوور، ئایین یان رەگەزێکی دیاریکراوە. لێرەوە ئەم

دەقە ناتوانێت خۆی وا نیشاندات کەدەقێکی گەردونییەو لەسەراسەری جیهاندا دەچێت.

ئێستاش، پەنجا ساڵ دوای دەرچونی ئەم بانگەوازە، هێشتا ئەوجۆرە نارەزاییو بەرهەڵستیانە هەر بەهێزن، بەڵام بەجۆرێکیتر لەزاراوەسازیو لەچوارچێوەیەکی تیۆریی جیاوازدا پێشکەشدەکرێن. رەخنە لەجاڕی گەردونیی مافی مرۆڤ، وەك "کیونێنمان Kunnenman" دەڵێت، دەتوانرێت بەگشتی بکرێت بەسێبەشەوە:

١- رەخنەی کولتووریی
٢- رەخنەی تیورەی رێژە گەرایی
٣- رەخنەی پۆست مۆدێرنیزم.

من لەم ووتارەدا لەدوو جۆرە رەخنەی یەکەمو دووەم دەدوێم. جۆری سێیەم، واتە رەخنەی پۆست مۆدێرنیزم، وازی لێدێنم، چونکە بەرای من ئەم رەخنەیە هیچ شتێکی جەوهەری بۆ ئەو دوو گروپە رەخنەیەی تر زیاد ناکاتو لەزۆریەی کاتدا تەنها دووبارەکردنەوەی رەخنەکانی دیکەیە.

رەخنەی کولتووریو رێژەیی لەبانگەوازەکەی مافی مرۆڤ، لەوێوە دەستپێدەکات کە گوایا هەر گروپێك پاشخانی کولتووریی خۆی هەیەو ئەو کەلتوورە ژیانی ئەو گروپە دەستنیشاندەکات. بۆ نموونە ئەوەی بۆ "کولتووری رۆژئاوایی" دەلوێتو دەگونجێت، رەنگە بۆ کولتوورەکانی دیکە نەگونجێت. ئەم رەخنەیە بانگەوازەکە لەسەر بنەمای ئەوەوە رەتدەکاتەوە کە گوایا ئەم بانگەوازە لەگەڵ پاشخانە کولتوورییە جیاوازەکاندا یەکناگرێتەوە. گوایا بانگەوازەکە دژ بەترادیسیۆن، بیروبۆچوونو هەموو ئەو بەهایانەیە کە سەر بەکولتووری رۆژئاوایی نیین. هەم لە رۆژئاواو هەم لەدەرەوەی رۆژئاوادا رەخنەی کولتووریی لەجاڕی گەردونیی مافی مرۆڤ گیراوە. لەدەرەوەی رۆژئاوا بەهانەی کولتووری بەتایبەتی لەلایەن دەسەڵاتدارانو ئەو رۆشنبیرانەوە گیراوە کە لە خزمەتی دەسەڵاتداراندان. ئەم دەسەڵاتدارانە بەناوی کاراکتەری "خۆیی"و"تایبەتی" کولتوورو ترادیسیۆنی خۆیانەوە دژایەتی بانگەوازەکە دەکەن. بۆ نموونە پارتی بەعس لەعێراقدا بەناوی کاراکتەری تایبەتیو دەگمەنی نەتەوەی عەرەبەوە، نەك هەر تەنها بانگەوازەکەی مافی مرۆڤ، بەڵکو زۆر لایەنی تری دیموکراسیانەی ئەندێشەی مۆدێرنەی رەتکردۆتەوە. لەهیچ شوێنێکیتر لەجیهانی عەرەبیدا وەك عێراق وا جەخت لە کولتووری خۆییو تایبەتی عەرەب نەکراوە. پارتی بەعس سنوورێکی زۆر ئاشکرای لەنێوان عێراقو دونیای دەرەوەدا کێشاوە، کە لەکۆتاییدا بۆتە هۆی ئەوەی دونیای دەرەوە وەك دوژمنێکی گەورە وێنا بکات. ئەم جەمسەرگەراییە پەرگیرە لەسەر عێراقیەکان دەساڵ جەنگو ملیۆنەها قوربانی کەوت. رەتکردنەوەی کەلتووری ئەم دەسەڵاتدارانە بۆ بەیاننامەکە لەکاتێکدایە کە خۆیان بەو چەکە کۆمەڵکوژانە پرچەك دەکەن کە بەرهەمی خۆرئاوانو لەخۆرئاواوە هێنراون. لەکاتێکدا کەتێروانینو بۆچوونی دەسەڵاتدارانی عێراق بەرامبەر رۆژئاوا تێروانینێکی خراپ بوو، کەچی هەمان ئەو دەسەڵاتدارانە خۆیان لەبەغداد شتومەكو کاڵاکانی رۆژئاوایان بەکاردەهێناو تا ئێستاش بەکاری دێننو لەپشووەکانیشیاندا دەچوون بۆ کەنار دەریاکانی رۆژئاوا.

جگە لەمانەش لەبازاڕی رەشدا لەعێراق بەبەرچاوی دەسەڵاتدارانەوە فلیمە سێکسیە رۆژئاواییەکانو گۆڤارە سێکسیەکانی وەك "Play Boy" دەفرۆشرانو بڵاودەکرانەوە، بەڵام سێ لاپەرەی جاڕێ گەردونیی مافی مرۆڤ قەدەغەبوون.

بەڵام ئەوە هەر تەنها دەسەڵاتداران و رۆشنبیرەکانیان نیین لەرۆژهەڵات کە ئەم بانگەوازە وەك بەرهەمی کولتوور و ترادیسیۆنی رۆژئاوایی سەیردەکەن. بەڵکو زۆر لەرۆشنبیرانی رۆژئاواییش هەمان دید دووبارە دەکەنەوە کاتێك بانگەوازەکە وەك بەرهەمێکی یەهودی ـ مەسیحی سەیر دەکەن. تازەترین دەقێك کە لەم ماوەیەدا خوێندومەتەوەو بەم تێڕوانینەوە نووسراوە، وتارێك بوو لەرۆژنامەی "Trouw" ی ٢٨ ـ ١١ ـ ١٩٩٨دا بوو (١). نووسەر لەم ووتارەدا پەیوەندیەکی راستەوخۆ لەنێوان بانگەوازەکەو دە ئامۆژگاریەکەی یەهودیەتدا دەخاتەڕوو. ئەمجۆرە دیدە پێی وایە، وە زۆرجار بەناشکرایی، کە کولتوورەکانی دیکە کەمتر شارستانین و کولتووری رۆژئاوایی تەنها کولتووری مرۆڤدۆستانەیە. لەپێشچاوی من ئەم جۆرە دیدە هیچی زیاتر نییە لەو دیدە یۆنانیە دێرینەی کە جیهانی دەکرد بەدوو بەشەوە: لەلایەك یۆنانییەکان و لەلایەکی تریشەوە هەموو ئەوانەی یۆنانی نەبوون، بەربەریەکان.

ئەو پرسیارەی دەبێت لێرەدا بپرسێت ئەوەیە کە ئایا بەپێی ئەم بیروبۆچوونە، ئەو جیاوازییە کولتوورییە گرنگانە چین لەنێوان رۆژئاواو بەشەکانی تری جیهاندا؟ پێش ئەوەی وەڵامی ئەم پرسیارە بدەمەوە پێویستە تێبینییەك دەربارەی زاراوەی "کولتوور" بەوشێوەیەی لەم پرسیارەدا بەکاردێت، بخەمە بەرچاو. لەم جۆرە دیدەدا زاراوەی کولتوور وەك شتێکی نەگۆڕ سەیردەکرێت، وەك ئامێری کۆپیکردن کە مرۆڤانێك بەرهەم دەهێنێت لەهەموو روویەکەوە لەیەکدەچن. کەلتوور لەم دیدەدا نەگۆڕێکە کە جەوهەرێکی جێگیری هەیەو دەستنیشانی ئەوەدەکات کە ئینسان چیەو چۆنەو بەچ شێوەیەك هەڵسوکەت دەکات.

ئەم دیدە کولتوورییە، کە دیدێکی کەلتورالیستیە، جیاوازییەك لەنێوان رۆژئاواو بەشەکانی تری جیهاندا پێشنیار دەکات کەلادان لێی مەحاڵە. گوایا ئەم جیاوازییەش لەو جیابوونەوەیەدا دەردەکەوێت کە تاك و گروپ لەیەکدی جیادەکاتەوە. لێرەدا واپێشنیار دەکرێت کە گوایا "کولتووری رۆژئاوایی"و لەگەڵیشیدا جاڕی گەردونیی مافی مرۆڤ لەسەر بنەمای تاکەکەسەوە بیناکراوە، لەکاتێکدا "کولتووری رۆژهەڵاتی" لەسەر بنچینەی گروپ و بەرژەوەندیی گروپ بیناکراوە.

بۆئەوەی ئەم بۆچوونە بخەمە ژێر پرسیارەوە، جارێکیدی دەگەڕێمەوە سەر نموونەی عێراق، چونکە من لە عێراقەوە هاتووم و بەشێکی زۆری ژیانم لەعێراقدا بردۆتەسەر. پارتی بەعس لەعێراق بەبەهانە کولتوورییەکان هەموو جۆرە بیرکردنەوەیەکی دیموکراتیانە رەتدەکاتەوە. بەڵگەو بەهانەکانی بەعسیش بۆ ئەم رەتکردنەوەیە ئەوەیە کەئەوان هەرچی زیاتر جەخت لەگروپ و قازانجەکانی گروپ دەکەن. بەڵام هەر کەسێك زانیارییەکی سەرەتایی دەربارەی عێراق هەبێت، دەزانێت کە وولاتێکی فرەجیاوازییەو هیچ گروپێکیش لەعێراقدا ئەو مافە سەرەتاییانەی نییە کە لە کۆمەڵگایەکی تەندروستدا گروپەکان دەبێت هەیانبێت. بەپێچەوانەوە ئەو گروپانەی رۆژێك لەرۆژان خەونیان بەلایەنی کەمی ئۆتۆنۆمییەوە بینیوە، هەموو جۆرە مافێکیان لێزەوتکراوەو بەشێوەیەکی سیستەماتیك قرکراون. لەعێراقدا هەم مافەکانی تاك و هەم مافەکانی کۆمەڵ بەهامەنشێوە پێشێل کراون و بەبەردەوامیش دەکرێن.

جگە لەمانەش، مەحاڵە بتوانرێت مافە تاکە کەسییەکان و مافە هاوبەشەکانی گروپەکان لەیەك جیابکرێنەوە. من هیچ نموونەیەکم بۆ نادۆزرێتەوە تیایدا ئەوە نیشانبدات کە مافەکانی گروپ زامن کرابێت، بێئەوەی پێشوەخت مافەکانی تاکە کەس پارێزرابێت. لەهەر کوێ مافە تاکە

کەسییەکان پێشێل بکرێن، ئەوا مافە هاویەشەکانیش بە ئەندازەیەکی گەورە پێشێل دەکرێن. لەهەر شوێنێکیش مافی گروپەکان پێشێل کرابێت مافی تاکەکانیش پێشێل کراوە. جیاکردنەوەی مافە تاکە کەسییەکان و مافە هاویەشەکان هەمیشە بەهانەیەکی بێمانایە بۆئەوەی زۆر بەئاسانی ئازادیی تاکە کەسی لەهاوولاتییان زەوتبکرێت.

هیچ کاتێکیش ئەوەندەی ئێستا گروپ لەکۆمەلگا رۆژئاواییەکاندا ئامادە نەبووە، ئێستا لەو ولاتانەدا گروپ بۆ هەموو جۆرە چالاکیەک و هەلسوکەوتێکی ئینسانی هەیە لەهەمانکاتدا کە تاکگەراییش لەوپەڕی گەشەو ئامادەگی خۆیدایە. لەدەرەوەی رۆژئاواشدا، بۆ نمونە لەعێراقدا، چەندە تاک و تاکگەرایی غائیبە بەهەمان ئەندازەش گروپی جیاواز غائیبن.

شتێک نییە ناوی مافی مرۆڤی رۆژئاوایی و مافی مرۆڤی رۆژهەلاتی بێت، یەک ماف هەیە ئەویش تەنها مافی مرۆڤە و هیچیدی. گرنگترین پەیامی جاڕی گەردونیی مافی مرۆڤ، وەک "Femando Savater" لە کتێبەکەیدا "کۆمەلگایەکی باش" دەلێت، بریتیە لە: "مافە گەردونییەکانی مرۆڤ پێشنیاری ئەوە دەکەن کە مرۆڤەکان مافەکانی یەکدی دەسەلمێنن سەرەڕای جیاوازی نێوان گروپەکانیان: مافەکانی مرۆڤ ئەوە پێشنیار دەکەن کە گرنگترین شتێک ئەوەیە کە تاکێکی ئینسانی بێت نەک کەسێک سەر بە رەگەز، نەتەوە یان کولتوورێکی تایبەت".

مافەکانی هاوولاتییان و مافە سیاسییەکان بەشێوەیەکی باش لەبانگەوازەکەدا دارێژراون. زۆر رێکخراو و دامودەزگا هەن چاودێری لەئامادەیی راستەقینەی ئەم مافانەیان پێشێلکردن و ئەتککردنیان دەکەن، وەک سازمانی لێبووردنی نێو نەتەوەیی "Amnesty International". بەلام لە راستیدا مافە کۆمەلایەتی و ئابوورییەکان زۆر باش دانەڕێژراون. رەخنەکانی جیهانی سێ لەم خالە رەوایە. بۆ نموونە سەگێک لە هۆلەندا ژیانێکی باشتری هەیە لەئەندازیارێک لەسۆدان. وەک قەشەی هۆلەندی بەناوبانگ "Muskens" دەلێت: "هەژارکردنی نەخشە بۆکێشراو کەمتر تونوتیژ نییە لەسەرکوتکردنی سیاسی".

هەنووکەیی بوونی ئەم دۆکیومەنتە مێژووییە، لەئێستادا زۆر زۆرترە لە هەنووکەیی بوونی ئایدۆلۆجیاکانیتر. جاڕی گەردونی مافەکانی مرۆڤ سەرەڕای هەموو سەختییەکان بەڕێوەیە بۆئەوەی ببێتە بەرنامەیەکی مۆرالیی گەردونی کە ئامانجی پاراستنی بەهاو کەرامەتی هەر مرۆڤێکە(٢).

پەراوێز:

(١) Trouw یەکێک لە رۆژنامە سەرەکییەکانی هۆلەندایە. کاک مەریوان خۆی بۆ ماوەیەک لەم رۆژنامەیە کاریکردووە و ئێستاش وەک ژۆرنالیستێکی سەربەخۆ ووتاریان بۆ دەنووسێت، کە زیاتری بابەتەکانی دەربارەی کوردستان و عێراق و ناوچەی رۆژهەلاتی ناوەڕاستە.

(٢) مەریوان وریا قانیع ئەم وتارەی بۆ یەکەمجار وەک موحازەرەیەک لە ٧ - ١٢ - ١٩٩٨ دا لە هۆلی "Vrijhof" لە زانکۆی "توێنتە" لە هۆلەندا پێشکەش کردووە. ئەم موحازەرەیە یەکێک بووە لەو زنجیرە موحازەرانەی بە بۆنەی تێپەڕبوونی پەنجا سال بەسەر نووسینی "جاڕێ گەردونیی مافی مرۆڤ" - دا لە هۆلەندا پێشکەشکراون. پاشان ئەم موحازەرەیە لەگۆڤاری "Inter Disciplinair"ی کۆلێژی ئیدارەی زانکۆی "توێنتە"دا ژمارە ١، سالی دەیەم، بەرواری شوباتی ١٩٩٩ بلاوکراوەتەوە.

# لەئەدەبی گەلانەوە

- لەشیعری هاوچەرخی فنلەندییەوە
- چەند دەقێکی ئۆسکار وایڵد
- پشیلەی ژێر باران (ئێرنست هەمەنگوای)



# لە شیعری هاوچەرخی فینلەندییەوە

• و: شێرزاد حەسەن

ئەمجارەیان مەبەستمانە شاعیرێکی هاوچەرخی (فینلەندا) بە خوێنەران بناسێنین، کە دەکرێ بڵێین ناو وەهەوای شیعرەکانی ئەوەندە بەئێمە ئاشنا نەبێ، شاعیرێك کە هەنووکە ئەندامی پەرلەمانە، پیانۆژەنە، پزیشکی دەروونە، رۆماننووسە، سەرنوسەری یەکێك لە گۆڤارە هەرە بەربڵاو و پێشەنگەکان بوو، جگە لەوەش کە تا ئێستا وەزیری کەلتووری فینلەندییە.

ئەو شاعیرە بەڕواڵەت هێمنو لەناخدا قەڵەباڵغ ـە (کلاس ئەندرسن)ە. ئەم زاتە بە چەندین گەمەی جوانی هونەرو ئەدەبەوە سەرقاڵە.سەرەتای هەوڵەکانی بڵاوکردنەوەی دەگەڕێتەوە بۆ ساڵانی (١٩٦٢). لەوساوە تا ئێستا حەڤدە دیوانە شیعرو سێ رۆمانی بڵاوکردۆتەوە. شیعرەکانی خاڵی نین لە هێزو وزەی شاراوە کە لە وێنەو خوازەکاندا دەتەقێتەوە، دەکرێ بڵێین فەرهەنگی شیعری (ئەندرسن) ناخوازێ پاك و خاوێن بێ، فەرهەنگێکی تێکەڵە، وێنەو خوازە زۆر تێکەڵەکانی لەدونیای دەرەوەو سروشت قەرز دەکات، لە زانستە سروشتیو کۆمەڵایەتییەکان، هەندێ جار روو لە رووتەڵکاری (abstract) دەکاتو هەندێ جاریش بەتەواوی بۆنی خاك و خۆڵی لێدێو بەرجەستەیە، تێکەڵە لە ریتمی (جان) و داڕشتەی قسە زۆر بازاڕییەکان، دەربڕینی هاکەزایی کەسانی زۆر رەشۆکی، تا دەگا بە شۆڕبوونەوەو هەڵهێنجانی مانا رۆحییەکان، شیعری ئەم زاتە چنینێکە لە خەیاڵو ئەزموونی سادەی ژیانی رۆژانە، هەندێ جار، لە شیعرەکانیدا هەست بەو سەرمایە دەکەین کە مرۆڤێك هەستی پێ دەکات ئەو

وەختەی لەناو بەفردا رەق دەبێتەوە، ئەم باس لە رەقبوونەوەی مرۆڤ و پاساری دەکا، تەنیایی کەسەکان‌و پەیکەرەکان بەیەک دەچوێنێ، باس لە بەشەختەبوونی رۆح‌و جەستە دەکا، لە شیعرەکانی ئەودا گوێت لەو گریانە خنکاوە نابێ، نەک لەبەرئەوەی کەسە تەنیاو ماندووەکان ناگرین، بەڵکو فرمێسکەکان لەسەر رووەتەکان بەستوویانەو نایەنە خوارێ، خەمی تەنیایی و دونیای پڕ لە بەستەڵەک کردوونی بە پەیکەر.

بایەخی (ئەندرسن) بە خەڵک‌و کۆمەڵگا بایەخێکی یەکجار گەورەو مرۆڤ دۆستانەیە، هەر لە سەرەتای تەمەنی خۆیەوە واهاتووە تا بکرێ مەزنتر و قووڵتر بۆتەوە، هەر ئەو خەمی خەڵکەش بوو وای کرد ببێ بەئەندامێکی کارامەی پەرلەمان و لەولاوەش هەربۆ دڵخۆشیی لە بۆنەکاندا مۆسیقا بژەنێ و سەما بکات، ئەم پیاوێکی خاوەن پەیامەو رەوان ناسەو لەولاوە بەریتمی (جاز) دەنووسێ.

یەکەم دیوانە شیعری (ئەندرسن) هەمان ساڵ (١٩٦٢) بڵاوبۆوە کە تیایدا بوو بە پزیشک. بوو بە یەکێك لە پێشەنگەکانی تازە کردنەوەی شیعری فینلەند – سویدی. یەکێك بوو لە ئەندامە چالاکەکانی ئەو بزاڤەی کە شیعریان لە ستەمی رۆحی شوانکارەیی رزگار کرد، بانگەشەیان بۆئەوە کرد کە دەبێ شیعر چیتر دوورەپەرێز نەوەستێ، دەبێ خۆ لە کێشە کۆمەڵایەتی‌و رامیارییەکان هەڵقورتێنێ، واز لەو نەغمە زۆر زاڵەی (لیر کییەت – غنائیەت) بێنێ، بەتەنها هونەرسازی‌و جوانکاری نەکات بە ئامانج، بەڵکو لەبری ئەوە رووبکاتە کۆمەڵگاو جیهانی دەرەوە، دەکرێ بابەتەکانی شیعر جیهانی شوانکارەیی یان شارستانی بێ، هەر بەهەمان ئەندازەو زەخم، دەکرێ فەرهەنگی شیعر پڕ بێ لە مانا باڵاکان، تێکەڵ، لەولاوەش باپڕبێ لە وشەو دەستەواژەی وا کە بەرلەو قۆناغە شیعر بەپیسی زانیوە.

(ئەندرسن) ئاراستەی شیعری (فینلەند – سویدی) گۆڕی، یەکێك لە خاسیەتە گرنگەکانی ئەوەبوو کە روو لە واقیع و دیمەنی ژیانی رۆژانەبوو. جگە لەوەش کە ئەم سەربەستی دا بە شیعر کە بۆخۆی ببێ بە پاڵاوگە، لای ئەم چۆن دوو مادەی کیمیاوی تێکەڵ دەبن‌و رەگەزێکی دیکە بەرهەم دێنن، دەکرێ وشەکان هاوکووفی رەگەزە کیمیاوییەکان بن. لای (ئەندرسن) تێکەڵکردنێکی سەیر لەنێوان ئەوەی زانستی‌یەو ئەوەی کەکۆمەڵایەتی: هەیە، دەکرێ شیعر شوێنی بەیەکگەیشتنی هەموو شتە دژ بەیەکەکان بێ، دەکرێ جێ‌ژوانیش بێ:

**بەدیدەنییەك دەست پێ دەکات**
**دیدەنی‌یەکە گرنگ نی‌یە – ئەو دووکەسەی**
**کە بەیەك دەگەن**
**کە تۆ دەستەکانت کراوەن**
**منیش باوەشت بۆدەکەمەوە**

لە کۆی نوسینەکانی (کلاس ئەندرسن) دا جۆرە روانینێکی رەخنەگرانە بەدی دەکەین، رەخنەیەك کە ئاراستەی کۆمەڵگا کراوە، ئەو لەجوانی‌یەکانی – دەوڵەتی خۆشگوزەرانی – تێدەگات، لەهەمان کاتیشدا باسی مەترسی‌یەکان‌و تەڵەزگەکانی ئەو جۆرە کۆمەڵگایەش دەکات، شیعرەکانی پڕن لە تەوس‌و پلار، قسە لەسەر هەڵوەشانەوەو لێکترازان دەکات، هەندێ جار شیعرەکانی بار دەکات بە پەندو حیکمەت، هەندێ جاریش فانتازییەکی واقیعی. (ئەندرسن) قسە بۆ هەمووان دەکات، بەسەر دەریاکاندا هەڵدەفرێ‌و دەگاتە ئێمە، دەکرێ خەڵکی سەر بە کەلتووری جیا چێژی لێ‌وەربگرن، جا ئەو چ زۆر زاتیانە بەنێو خەمی خۆیدا شۆڕبێتەوە، چ خۆ لە خەمە رامیاری‌یەکان تێوەبگلێنێ، چ وەك پزیشك بروانێتە دونیا، یان وەکو باوك/ کوڕ/ عیشقباز/ سیاسەتخوان)

هاونیشتمانیەك... هەر كامەیان بێ، ئەم بە رۆحی پیاوێكی شار نشین دەنگ هەڵدەبڕێ، لە هەموو حاڵەتەكانیشدا بەدوای وێنەی خۆیدا دەگەڕێ لەنێو ئەو خەڵكەدا، لە وێنەی خەڵكیش دەنێو وێنەی خۆیدا.

(ئەندرسن) سەر بە نەوەیەكە هەر لە منداڵییەوە تاڵاوەكانی جەنگی دووەمی جیهانی چەشتووە، رۆژانی بۆمبابارانی لەیادە، خۆ شاردنەوە لەژێر زەمینەكان، بینینی مەرگی هەرزان، بەفیرۆدانی وزەو تواناو هێزی مادیو رۆحی كەسەكان، ئەم لە یادیماوە ئەو رۆژانەی لە شەڕە گەورەكاندا – فینلەند – بوو بە پێخوستی نێوان جەنگاوەران.

(ئەندرسن) لەو جۆرە شاعیرانەشە كە ئەوەندەی دژ بە دیاردە دزێوەكانی كۆمەڵ رەخنەی هەیە، بە هەمان ئەندازەش قسە لەسەر خۆی دەكا، هەندێ جار رەشبینانە دەدوێو هەندێ جاریش بەوپەڕی مەزاقەوە هێرش دەكات. گرنگ ئەوەیە كە بزانین (ئەندرسن) بڕوای بە بێدەنگی نییە، ئەم دواجار تەقاندنەوەی هەستو نەستەكان بە پێویست دەزانێ، بۆ دەربڕینیش بڕوای وایە كە ئەوپەڕی سەربەستی دەمانگەیەنێ بە كەماڵی شیعرو ژیان.

### وەك ئەوەی هیچ رووی نەدابێ

لەدەرەوە.. لە باخچەی ئەم نەخۆشخانەیەدا
چی زەردو سوور: درەوشاوە هەن..
من كۆیان دەكەمەوە
دەیانخەمە نێو گلێنەم و دەیانبەمەوە ماڵێ
ئەوسا دەبینین چۆن دیوارەكانی نێو ژوورەكانم
رەنگی رۆناهی هەڵدەمژن
زۆر نزیك ...هۆ لەوێدا..لەژوورێكی لاتەریك و داخراودا
كە كەسێك شێتانە سەر بە دیوارەكان دا دەدا
دەنێو خەونی منیشدا پاسەوانێك، خوێندەوار..
دەرگا لەسەر خۆی كلیل دەدا
هەموو ئەوانەی كە لێرە كەوتوون
لەو بڕوایەدان كە ئەم زستانە ناژین
من ئینجانەیەكی پڕ لە گیاوو گوڵی وشكەوەبووی
خۆمیان پیشان دەدەم
كەلەو ئینجانەداكۆمەڵێ‌بوونەوەرێ‌زۆرچكۆلەم چاندوون
یەكێك وا زەن دەكا
كە ئەم بوونەوەرانە چاوەڕێی بارانن
ئەوان هەر هەموو دەچنەوە سەر ئەو كارانەی
كە دەیانكرد
هەروەك بڵێی هیچ رووی نەدابێ..!

### (ئەو شارەی كە پێی دەوترێ هێلسنكی)

من بەناو شاری (هێلسنكی)دا دەگەڕێم ...
بەنێو خەڵكیدا .. بەنێو پەیكەرەكانیدا
بەنێو سەگەكانیان .. بەنێو تەنیایی ئەواندا
لەناو هەموویاندا من بۆ خۆم دەگەڕێم..
بۆ خودی خۆم..!
من دەركی دەكەم ... دەركی تەنیایی ئەوان
كە هەندێ جار چۆن سەردەكاو دەبێ بە گریان
گریانێك تاڕادەی داڕزان
هاوارو نركەو دادو فیغان
من دەبینم كە چۆن تەنیایی سەردەكا
ئەو كاتەی شار قەڵەباڵغتر دەبێ
خانووە كۆنەكانیش لەپشت پەردە دادراوەكانەوە
بەدیقەتەوە لێكدی رادەمێنین
ئەو خانووە كۆنانەی ون دەبن
ئەو وەختەی تازەكان رووەو ئاسمانێكی تاریك
بڵند دەبن
تا بێ بەرزو بەرزتر...
تابێ پڕو قەڵەباڵغتر..
من لەم شارەداكەسانێك دەبینم..كەسانێكی بێ ناسنامە
بێ هوودە بەو ناوەدا دەسووڕێنەوە..
دەڕوانن بێ‌ئەوەی هیچ ببینن

هەندێ جار یەکێك لەو حەشاماتە..
لەبەردەمما قوت دەبێتەوە و دەپرسێ:
ئەرێ من کێم؟
هی کێم..؟
بۆ کوێ مل بنێم..؟
بەخەندەیەك لێوەکانم لێکدی دەترازێن..
خەندەیەکی دۆستانە
ڕێی بیمارستانێکی نیشان دەدەم..
سیخناخ لە خەڵکی
لەوێدا ناونووسی دەکەن و ژمارەیەکی پێ دەبەخشن
ژمارەیەك بۆتەنیایی
کارتێکیش..
کە تیایدا نووسراوە ئەم کێیە
بۆ کوێ بچێ
نووسراوە کە هیچ باوەڕێکی نییە
هیچ کەسێك
جگە لەم شارە گەورەیە..
سەر بە هیچ کەسێك نییە
ئەو شارەی کەنازانێ ئەمی تیا دەژی
ئەو شارەی گوێ بە تەنیایی ئەم نادات
بەڵکو ڕێی ئەجزاخانەو..
ڕێی بیمارستانی نیشان دەدا
یان گۆڕێك لە دەرەوەی هەرێمی هەر هەموو دۆستان
من یەکێکم دێتەوە یاد..
کەسێك کە ویستی خۆ بەئاوداداو ...
بە مەلە خۆ لە کۆت و بەندی ئەم شارە...
ئازاد کا
کەسێکی تر وەك حۆل و گێژ گەڕیدە بوو
بەرلەوەی لەسەر جادەکان بکەوێ..
بەرلەوەی بخنکێ و سەرئاو کەوێ
من کەسێکم دێتەوە یاد
کە سواری شەمەندەفەر بوو ڕووەو ماڵ
وەلێ کە گەیشتە ئەوێ..
هیچ ماڵ و هێلانەیەك لەوناوە نەبوو
دەمەو ئێواران بەدەم پیاسەوە هەر هەموویان دەبینم

ئەو وەختەی شێتانە ڕێ دەکەن..
لەبەردەم جامخانەی کۆگایەکەوە بۆ کۆگایەکی تر
هەروەك پیشەی سۆزانییەکان
لەولاوەش یاساوڵەکانی شەو مۆرانە بەتوڕەوە دەکەن
لە بیمارستانەکان تووشیان دەبم
کە بە قاوش و ڕاڕەوەکاندا دەخولێنەوە
بەدوای ناوی خۆیان و بەروارەکاندا دەگەڕێن
ڕوومەتی ئەوانم دێتەوە یاد
بەقووڵداچوو هەروەك ئەو دۆڵە بەرتەسكو
وشك و فرمێسك لێ بڕاوانە
شارەکە پێی دەوترێ هیلنسکی
لەوێدا کەسانێك دەبینی تەنیاتر لە پەیکەرەکان
کەسانێك بێ ناوو ناسنامە
لەو شارەی کە خانووە کۆنەکان لێکدی رادەمێنن
لەو شارەی خانووە تازەکان ڕووەو ئاسمانێکی تاریك
هەڵدەکێشن
لەو شارەی کە خەڵکەکەی لە سەگەکان تەنیاترن
ڕووەو قووڵایی شەو
ئەو وەختەی پیادەڕۆکان لەژێر کڵاوە ئاسنینەکان
خەوە تۆتکە دەیانباتەوە
ئەو وەختەی شار دەبێ بە هی کۆترەکان
من دەیانبینم
یەکە یەکە
بەدزییەوەو لەسەر شۆستەی بەندەرەکان
ڕووەو دەریا
وەکو سیخوڕ مل دەنێن
لە باخچەکان دزە نیگای سیخوڕانە دەگۆڕنەوەو..
ڕووەو ئاسمانێکی لێڵ و تاریك
سەرهەڵدەبڕن.

## ( سەربەستی )

"سەربەستی هیچ ناگەیەنێ
گەر سەربەستی ئەوانی ترت پێشێل کرد"
سەربەستی شیعر بۆ هەمیشە

ئازادبوونە لە پێویستی
بەمانا زۆر سادەکەی
فەرمانڕەوایی کۆیلەیە
بەسەر ئاغادا
سەگ بەسەر خاوەنەکەیدا
هەژار بەسەر دەوڵەمەندا
کوژراو بەسەر بکوژدا
شیعر جۆرێکە لەدرۆ
شیعر خۆ بەدوور دەگرێ لە واقیع
ساختە بەسەر سریالیەتدا..
زاڵ دەکا.
شیعر هەرگیز ناخورێ
بۆئەو کەسانەش نی‌یە کە کەم دەستن
بەڵکو بۆئەوانەیە کە داوایان
وا بەجۆرێکی تر
شیعر درۆ دەرناخات
بەڵکو هەر بۆخۆی درۆیەکەو
هیچی تر
کە شاران و گوندەکان دەسووتێن
ئەو وەختەی مەرمزەکانیش گردەگرن
شاعیرەکان مۆمەکانیان دادەگیرسێنن‌و
دەنووسن: (سەربەستی لەدڵما گڕ دەگرێ)
بەڵام خۆ دڵێکی گڕگرتوو
بۆنی سووتانی لێ‌نایەت
بەهەرحاڵ.. گوندە سووتاوەکانیش
بەچەشنی خەڵکی سووتاو
هەر هەمان بۆنیان لێ‌دێ.

( لە هێلسنکی )

لە هێلسنکی‌دا خانووەکان ئەوەندە جوان نین
باخچەکانیش ئەوەندە سەوز و گەشاوەنین
هەواشی لە شارە گەورەکانی تر پاکتر نابێ
خەڵکەکەی بەختەوەرتر نین لەخەڵکی شوێنانی تر
هێلسنکی شارێکە بێ رووخسار
خەندەیەک کە لە بێ رووخسارێک دەبارێ
خەندەیەکە بە رووی دەریا
شارێکە بەتەنها پشتی لەئێمە
هەندێجار خەیاڵت بۆ زەردی خەندەیەک دەچێ
بزەیەک لە پشت ملەوە
چرپەیەک لەژێر لێوەوە
تۆش نائومێدانە بەدەوریدا دێیت‌و دەچی
بەڵکو ئەو خوایە چاوانی ببینی
دەم‌و لێوی
پاشان دەبینی شار خۆی کۆدەکاتەوە
زۆر توند خۆ لەتەم‌و مژەوە دەپێچێ
تۆ دەکرێ هێلسنکی - ت خۆش بوێ
لەبەر بەئاسایی بوونی
لەبەر بێ رووخسارو بێ ئاکاری
لەبەر کەمتەرخەمی‌و بێ‌باکی
لەمەڕ ئەو کەسانەی یەک تەختە لەسەر شەقامەکان
کەوتوون
هەر لەوێنشدا لاڵ‌و پاڵ مردوون..!

( دۆخەکان )

(١)
کە پێدەکەنیت رووت چەندە گەشاوەیە
کە دەدوێی رۆحت چەندە زیندووە
چەندە ترسنۆکە عیشقی تۆ ئەو وەختەی..
لەگەڵما دەخەویت

(٤)
ئەوان ئێمەیان هەلاهەلا نەکرد
تۆش بەتەنیا نیت
کە دوو تەنیا لەو ناوە هەبن
تەنیاترینیان چیتر ناژی

(٦)
لەودیو وشەکانمانەوە واقعێک هەیە وەک مەیتخانە
ئەوەی رق دەیکا، ئەستەمە بەخشندەیی بیسەلمێنێ
چی روو دەدا لە دەرەوەی دونیای وشەکان

دەیگەڕێنینەوە بۆ زمان
بەتەنها شیعرە کە دەتوانێ شتەکان زیندوو کاتەوە
(٧)
نزیکی ئادیارە
ئەوەی وا لەودیو چاوەکانت
هەرگیزاو هەرگیز نایبینیت
(٨)
یەکێك باڵندەکان دەردەکا
بەفری نواباریو هاوار دەکا
دەستەکانم وان لەناو دەستەکانت
(١٢)
ئاسانە کەسێك شێت بکەی
هەموو شتێکی لێ زەوت بکەی
ئەوسا سەیرکە .. چەندە بەسەیری رەفتار دەکا
(١٨)
وشەکانت جوان هەڵبژێرە
ئەوکاتەی وەسفی شتێك
بۆ ژنێکی نابینا دەکەی
بزانە چەندە جوانە رووخساری
ئەورەختەی گوێ لەتۆ دەگرێ
(١٩)
وردەکار بە لە قسەکانت
ئەو کاتەی دەتەوێ لە ژنێکی کەڕ بگەیەنیت
کە چەندە هێمنە ئەو وەختەی لەگریان..
ژیر دەبێتەوە

## ( هاونشینانی ژوور )

یەکەمیان بوو بە ئامێرێکی پاك
دووەمیان بە منداڵێکی چکۆلە
سێیەمیان لە تەنیاییدا
وازی لە سێکسی خۆی هێنا
گریانی چوارەمیان نەیهێشت ئەو سێ کەسە بخەون.

پێنجەمیان بەر تیشکی ئەتۆمی کەوت
شەشەمیان: گەدەی پڕ بوو لە مشك
حەوتەمیان: لەسەر کۆمۆنیزم لە سێدارە درا
گریەو زاری هەشتەمین..
نەیهێشت ئەو حەوت کەسەی تر بخەون
نۆیەمیان: سەلماندی کە خەڵکی بێ گوناە دەکوژرێن
دەیەمیان: پێشبینی کۆتایی دونیای راگەیاند
یانزەیەمیان: دوور لە بەزمیی منداڵەکەی خۆی خنکاند
فرمێسکەکانی دوانزەمیان:
نەیهێشت ئەو یانزە کەسەی تر..
بخەون

یەکێکیان بوو بە (شت). یەکێکیان گۆڕا بە منداڵ
یەکێکیان تیشکی ئەتۆمی وێرانی کرد
یەکێك وردو زیرەكو بیرتیژ
ئەوەی تریان کە بۆنی کارەساتی دەکرد..
کە پێش بێ
ئەوەی کە منداڵەکەی خۆی خنکاندو..
دووری دەبینی
هەموو ئەوانەش کە نوقمی فرمێسك بوونو..
نەیان هێشت هاوڕێکانیان سەرخەوێك..
بشکێنن.

## ( نائومێدی )

پیاوێك لەوپەڕی نائومێدیدا
وای بەخەیاڵدا هات:
باشترین شت ئەوەیە کە لەنێو نزیکترین زەریادا
خۆ هەڵواسم
بە چ زەحمەتێکەوە بە گوریسێکدا سەرکەوت..
رووەو ناو زەریا
لەوێدا دورگەی (ئەتلانتس)[١] ی دۆزییەوە
پیاوێکی تر لەوپەڕی بێ ئومێدیدا
وای بۆ چووبوو
باشترین شت ئەوەی کە بە نزیکترین درەختەوە
خۆ بخنکێنم

له چڵەپۆپەدا شادی دەستگیر بوو
بە شەونمو بە باران تینوێتی خۆی خنکاند
پیاوی سێ یەمین لەوپەڕی بێهوودەییدا..
وا هات بەخەیاڵیدا:
باشترین شت ئەوەیە کە حەبێکی خەو بخەمە نێو
تەوێڵمەوە
کەچی بوو بە مانگێکی جوان
هاودەمی شەوی هەر هەموو بێداران

**( بۆ کەسێکی نوێ )**

هێی..! ئەو شتەی وا لەبەردەمتا..
دەی .. ئەو هەر هەموو دونیایە
ئەو ژنەی هۆ لەوێ.. کە روخسارو..
سینەی هەیە: دایکتە
منێك، کە سینەو مەمکەکانم بەکەڵکی هیچ نایەن:
باوکتم
ئەوەی وا لەوێ غاردەدا: براتە
ئەو وا هەست دەکا کە تۆ شتێکی سەیرو سەمەرەی
(هی ئەوەی خەڵکی بخەیتە سەر خەنین)
کەواتە تۆ سەر بەخێزانێکی ئەتۆمی
پڕ بە پێویست خۆراکت دەست دەکەوێ
چەندە بکرێ لە ئامێزت دەگرین
ئێسقانی شکاوت.. برینەکانت بۆ دەپێچینەوە
لایەلایەت بۆ دەکەین تاخەو دەتباتەوە
چی چیرۆکی کۆن هەیە بۆتی دەگێڕینەوە
هەر بەڕاستی تێکت دەدەین
پاشانیش کە گەورە دەبیت
لێت دەپرسین: ئاخۆ بیرت دێتەوە
کە ئێمە چەندمان خۆش ویستی.

**باڵندە**

سەبارەت بە باڵندەکان کەم دەزانین
چونکە هەمیشە لەترسی ئێمە هەڵدەفڕن
بۆ مەلێکی مردووش..
زۆر زەحمەتە بوێرێت بیخەیتە نێو هەردوو لەپت
بەرلەوەی بکەویتە ناو نزیکترین قوژتەوە
لە هەموو شوێنێکیدا.. دوای ئەوە..
وا زەن دەکەی لە هەموو شوێنێکدا
ئەو مەلە مردووە دەبینی
هەتا لەنێو هاوڕێکانتا
هاوڕێکانت لەناو هەورەکاندا
لەناو هەورەکانیشدا وا زەن دەکەی
ئەو مەلە مردووە دەبینی کە وا لەنێو هەردوو
دەستەکانت
هەروەك بڵێی زیندووبێ
هەروەك بڵێی تازە لە هێلکە ترووکابێ

**وشە**

ئەوانەی لە مندا دەبن بە وشە
پاشماوەی ئەو شتانەن کە لە یاد چوونەتەوە
غەریقی زەردەپەڕی دەمەوئێوارە
لە ژوورەکەی ئەودیودا
من لەشێوەی لێوەکانت ورد دەبمەوە

**ڤیگاری**

وای لە نائومێدی.. چ گەورەیە
بەتەنها وشەیەکە.. وەلێ بەداخەوە نازانم
چۆن لەو ڤیگارییە رزگارم بێ
پەردەی دڵم بەرنادات
وزەو هێزی خۆی لە من وەردەگرێ
لە من دەخوات
ئەوەی لە مندا وێران نەبووە: ئەو نەیبات
دەڵێ: ئەوەی کە خەمی نەبێ
خاوەنی هیچ نییە
کەسێك بێخەم بێ.. چی بوێ دەیکا..
لەگەڵ کێ بێ دەیکا
کەسێك بێ قەهر بێ .. هیچی نییە بزری کا
قەتیش خاوەنی هیچ نەبووە

لەودا نە ئازار هەیە.. نە ئاسوودەگی.. نە تەبایی
شیعر بەتەنها لەناو خەمدا دەپرسکێ
بەخشندەیی.. قووڵی بیرکردنەوە.. تێڕوانین
بوونی فەزایەك لە خۆشنوودی
هەر هەمووی زادەی خەمن

## بۆ یادگاری

ژنە سووتا .. ژنە لەوێداو لەژێر جلە سووتاوەکانیدا..
سووتا
بێ شەرم .. دوور لە نائومێدی .. دوور لە هیوا..
سووتا.. سووتا
دەمو ددانەکانی بەسەر یەکدیدا قرساند
وەك نوێژێك .. پاڕانەوەیەکی ژێر لێو سووتا
سووتا لەو شوێنەی دووکەڵی چاوەکانی
لە گۆڕەکانەوە هەستا
لەبەرگری‌دا سووتا .. بە برینەکانەوە سووتا
وەك شتێکی فەرامۆشکراو سووتا..
بە نهێنی و لەغزەکانەوە سووتا
وەك سێبەری باڵندەکان دەنێو قژی خۆیدا سووتا
نا ڕۆشن وەك پەڕاوێکی پیرۆزو کۆن
کە بۆ خودا نووسرابێ
سووتا...
لەدەریا هاتە دەرەوەو سووتا
ئەو بۆ یادگاری بوو کە سووتا
بۆ چاکبوونەوەی بێ دەنگی
بۆ فرمێسکەکان.. بۆ دڵدانەوە ..
بۆ سەرلەنوێ زیندوو بوونەوە
سووتا
بۆ پەرجوویەك .. بۆ دایك .. بۆ باوك سووتا
ئەو بۆ ئاوریشمینی بەردین سووتا
ئەو بۆ ساردی گڕی ئێمە بوو کە سووتا

## ڕێ

ڕێگایەك هەیە.. بەرلەتۆ..
کەس پێ‌ی‌دا نەڕۆیشتووە
لەوەدایە ئەو ڕێگەیە..
ڕێ‌ی تۆ بێ
گەر دۆزیتەوە .. دەبێ بە هی تۆ
خۆی هیچ ڕێگایەکی وا بوونی نی‌یە
وەلێ دەبێ ئەو کاتەی بەسەریدا دەڕۆی
دواجار کە دەگەیت.. لە دواپێچدا..
ڕێ ون دەبێ‌و نامێنێ
کەس نازانێ تۆ چۆن گەشتیتە ئێرە
بەر لە هەمووانیش خۆت سەرسامی..
چی تۆی گەیاندە ئێرە.

..........

هەرچیەکمان لەدەست دەرچێ
مەرج نی‌یە هەرگیز بزری بکەین
ئەو کەسەی کە خۆشمان ویست
هەمیشە بیری دەکەین
قەت ئەو کەسە بزر ناکەین..
کە خۆشمان ویست
ئەوکەسەی کە خۆشمان ویست
بۆ هەمیشە خۆشمان دەوێ.

( ...... )

وەك کەنارەکان
بۆ قسەکردن خۆ رادێنین
ئەوکاتەی دەممان پڕن لە بەرد
هەر هەمووی ورتە ورتێکە
لە وەختی خۆرئاوابووندا.

( ؟ )

من بەتەنیام..
لەگەڵ ئەو جادەیەی بەسەریدا غل دەبمەوە
شەقام هەناسە دەدا .. ئەو وەختەی پێستی منیش..
هەناسە دەدا

لەنێو سینەمدا مۆسیقایەك هەڵدەستێ
پارچەیەکی تازەی (شوبێرت)
ئاسمان بەسەرشاردا دەگری..
لە منو لە شەقامدا لافاوێك سەردەکا
هەنووکە من نیم رێ دەکەم
بەڵکو شەقامەو بەدەم ئاوەوە رێ دەکا
لە من رادەکا
من رادەکەم.. لە دەرگایەکەوە دەچمە ژوورێ
لەو شوێنەی کەسێك میزی کردە جۆگەلە
جارێکیان لێرەبوو من وەستام، سەرەتای ژیان بوو
ئەو ژیانەی لەدەست من رایکرد
ئەوسا هەموو دۆزینەوەیەك کەللەمی دەتاساند
وای لە خۆشی بەهەشتیانەو..
سۆزی بەدەر لە عەقڵ
هەموو شتێکم لەیادە..
تەمەنم پانزە بوو کە لە دەفتەرەکەما نووسیم:
(ژیان هیچە..!)
(تابلۆی پڕو پووچە)
هەنووکە چاکتر دەزانم: ژیان شەرابێکە سەرخۆشکەر
لە ماڵێکی کۆنینەدا پیرەدایك سکاڵادەکا:
هەمووئەوکەسانەی دەبوو (ئەو) یان لەیادبێ
رۆیشتن و بزربوون
بەڵام هەر دوای ساتێك ..
گلەیی و سکاڵاکەی لەیاد چوو
من قەت کاتی ئەوەم نەبووە لە باوکم بپرسم:
ئەرێ ئێمە بەدرێژایی ژیان پەلە بووین
قەت نەمانتوانی گوێ لە یەکدی بگرین..
قەت نەمانتوانی..!

[1] ئەتلانتس: دورگەیەکی خەیاڵی یە لە ئۆقیانووسی ئەتڵەسی. رۆژئاوای چیای – تارق – گوایە کاتی خۆی ئەو دورگەیە لەوێدا نوقم بووە.

سەرچاوە:

WHAT BECAME WORDS
Claes Andersson
Sun & Moon PRESS
Los Angeles
1996
Translated from the Finland – Swedish
By Rika Lesser

# چەند دەقێکی ئۆسکار وایڵد

• و: کەریم عومەر

۱. هونەرمەند

ئێوارەیەکیان ئارەزووی دروست کردنی پەیکەرێك بەخەیاڵیدا هات، پەیکەری "ئەو خۆشی‌یەی کە ساتێك دەخایەنێت". چووە ناو دنیاوە تاوەکو بەدوای برۆنزدا بگەڕێت، چونکە تەنها لەڕێی برۆنزەوە دەیتوانی بیربکاتەوە...

بەڵام هەموو برۆنزی سەراپای جیهان دیار نەما. لە هیچ شوێنێکی دنیادا برۆنز نەمابوو جگە لە برۆنزی پەیکەری " ئەو (غەمەی تا ئەبەد دەخایەنێت.)

ئێستا ئەو پەیکەرەی هەبوو کە بەدەستەکانی خۆی دروست کرابوون‌و لەسەر گۆڕی شتێك داینابوو کە لەژیانیدا خۆشی ویست بوو. لەسەر گۆڕی ئەو شتە مردوەی کە لە هەر شتێکی تر زیاتر خۆشی ویست بوو، ئەم پەیکەرەی دانا کە بەدەستەکانی خۆی دروستی کردبوو، بەڵکو ببێتە نیشانەی خۆشەویستی مرۆڤ کە نامرێت‌و ڕەمزی غەمی مرۆڤ کە تا ئەبەد دەخایەنێت.

جگە لە برۆنزی ئەم پەیکەرە برۆنزی تر نەبوو. ئەو پەیکەرەی هەڵگرت کە خۆی دروستی کردبوو کردییە فڕنێکی گەورەو دایە بەر ئاگرەکەی...

لەبرۆنزی پەیکەری " ئەو غەمەی تا ئەبەد دەخایەنێت" پەیکەری ئەو خۆشی‌یەی دروست کرد، "ئەو خۆشی‌یەی کە ساتێك دەخایەنێت"

۲. چاکە کار

کات شەو بوو.. ئەو بەتەنیا بوو. لەدوورەوە دیوارەکانی شارێکی بازنەیی بینی‌و ڕووەو شارەکە ڕۆیشت.. کاتێك نزیك بووەوە گوێی لەدەنگی جێ پێکانی خۆشی‌و نەغمەی بەرزی چەند عودێك بوو کە لە ناو شارەکەوە دەهات. لە دەروازەکەیداو یەکێك لە دەرگاوانەکان دەرگاکەی لێ‌کردەوە.. چاوی کەوت بە خانویەکی لە مەڕمەڕ دروست کراو کە چەند پایەیەکی قەشەنگی لە مەڕمەڕ دروست کراوی لە بەردەمدا بوو. پایەکان تاجە گوڵینەیان پێوە هەڵواسرابوو. لە ناوەوەو لە

دەرەوەی خانوەکە مەشخەڵی لەداری ئورز دوورست کراوی لێبوو.. چووە ناو خانوەکە.

کاتێك بەلای هۆڵی (چالسیدۆنی)(١) یەکەو هۆڵی (یەشب)(٢)ەکەدا تێپەڕیو گەیشتە هۆڵی نان خواردنە گەورەکە، کەسێکی بینی لەسەر قەنەفەیەك پاڵ کەوتبوو، گوڵێکی سووری تاج ئاسای لەسەر سەری دانابوو، لێوەکانیشی بەشەراب سووربون.

چووە پشتی‌یەوە دەستیدا لەشانی‌و پێ‌ی وت:

"بۆچی ئاوا دەژیت؟"

کوڕە لاوەکەش ئاوڕی‌دایەوەو ناسی‌یەوە. وەلامی دایەوە، ووتی:

" بەلام من رۆژێك لە رۆژان تووشی (جزامی)(٣) بووم‌و تۆ چاکت کردمەوە. ئەی بەچ شێوەیەکی تر بژیم؟".

لە خانوەکە چووە دەرەوەو دیسان چووە سەر شەقامەکە... پاش کەمێك کەسێکی بینی کە روخساری‌و جلەکانی بۆیە کردبوو، کەوشەکانی بە مرواری رازابوونەوە. لەپشت ئافرەتەکەوە کوڕێکی لاو کە عەبایەکی دوو رەنگی پۆشی بوو هات‌و راوچی ئاسا بەئەسپای نزیك بووە.. ئێستا روخساری ئافرەتەکە وەك روخساری قەشەنگی پەیکەرێك وابوو، چاوەکانی کوڕەکەش شەهوەتی‌یان لێ‌دەباری... بە پرتاو دوای لاوەکە کەوت‌و دەستی‌دا لەدەستی‌و پێ‌ی وت:

"رێگەیەکی تر نی‌یە پیایدا بڕۆیت رێگەی گوناهکردن نەبێت؟".

ئافرەتەکە رووی وەرگێڕاو ناسی‌یەوەو پێکەنی‌و پێ‌ی وت:

" بەلام تۆ لە گوناهەکانم خۆش بوویت‌و ئەم رێگەیەش رێگەیەکی خۆشە".. لە شارەکە چووە دەرێ.. کە لە شارەکە چووە دەرێ کوڕێکی لاوی بینی کە لە لا رێگەیەك دانیشت بوو دەگریا...

رووەو لاوەکە رۆیشت و دەستی‌دا لە تاڵە درێژەکانی قژی‌و پێ‌ی وت:

بۆچی دەگریت؟"

لاوەکەش سەری بەرزکردەوەو ناسی‌یەوەو وەلامی دایەوە:

"بەلام من رۆژێك لە رۆژان مردم‌و تۆ زیندووت کردمەوە. ئەی جگە لە گریان چی دی بکەم؟"

### ٣. مورید

کە نەرسیس مرد گۆمی خۆشی‌یەکانی لە کوپی ئاوە شیرینەکانەوە گۆڕا بۆ کوپی فرمێسکە سوێرەکان. (ئۆریدەکان)(٤) بەگریانەوە لە دارستانەکەوە هاتن بەڵکو بتوانن گۆرانی بۆ گۆمەکە بڵێن‌و سەبوری بدەنەوە...

کە بینی‌یان گۆمەکە لەکوپی ئاوە شیرینەکانەوە گۆڕاوە بۆ کوپی فرمێسکە سوێرەکان، قژە سەوزەکەیان کردەوەو بۆگۆمەکە گریان‌و وتی‌یان:

"پێمان سەیر نی‌یە کە بەو شێوەیە دڵتەنگی بۆ مردنی نەرسیس.. چەند جوان بوو!"

گۆمەکە ووتی: "بەلام ئایا نەرسیس جوان بوو؟"

ئۆریدەکان وەلامی یان دایەوە:

"دەبێت کێ لەتۆ باشتر بزانێت. ئەو بەلای ئێمەدا گوزەری کردبوو بەلام وێڵ بوو بەدوای تۆدا. لە کەنارەکەتدا رادەکشاو سەیری دەکردی‌و لە ئاوێنەی ئاوەکەتدا خۆی دەبینی‌یەوە"

گۆمەکەش وەلامی دایەوە:

"بەلام من نەرسیسم خۆش دەویست چونکە کە لە کەنارەکەمدا رادەکشاو سەیری دەکردم لە ئاوێنەی چاوەکانیدا هەمیشە جوانی خۆمم دەدیی‌یەوە"

### ٤. مامۆستا

کە تاریکی باڵی بەسەر زەویدا کێشا، (جۆزیفی ئەریماسیا) کە مەشخەڵێکی

لە(سنەویەر) دروست کراوی داگیرساندبوو لــە گردەکەوە بەرەو دۆڵەکە ملی‌نا چونکە لە ماڵــەوە کارێکی بۆ پێش هاتبوو.

کاتێکیش لەسەر بەردە ستێکانی

(دۆڵـــی دیسۆلەیشـــن ـ Valley of - Desolation) بــەجۆکدا هات، کوڕە لاوێکی رووت‌و قوتی بینــی کــە دەگریا بــەخۆو بــەقژێکی رەنگ هەنگوینی. لەشی چــون گوڵـی سپی بــەڵام هەر هەموو ئازای بەدڕك زامدار کردبوو.

خۆڵەمێشیش تاجی سەر سەری بوو. جۆزیــف کە خاوەنی دارایی‌و سامانێکی یەکجار زۆر بــوو بەو کوڕە چاو پڕ فرمێسکە رووتەی وت:

"پێــم ســەیر نی‌یــە کــە غەمەکــەت هێنــدە گەورەیە، بەدڵنیایی‌یەوە مەسیح پیــاوێکی داد پەروەر بوو"

کوڕە لاوەکەش وەڵامی دایەوە:

"من بــۆ ئــەو نــاگریم بــەڵکو بــۆ خــۆم دەگریم منیش ئاوم گۆڕی بۆ شەراب، گەرو گولیشم چاك کردۆتــەوەو بینــایم بەخشــیوەتە کوێــر. بەســەر دەریاکاندا رۆیشتوم. لە لەشی گۆڕستان نشینان شەیتانەکانم وەدەرنا. لە بیاباندا کە خواردنی لێ نی‌یە نانی برسی‌ییەکانم داوە. مردوی ناو گــۆڕە تــەنگو تارەکانم زیندوو کردۆتــەوە. بەفــەرمانی من‌و لەبەردەم خەڵکێکی زۆردا دار هەنجیرێکی زڕ وشکی کرد.

هــەر هــەموو ئــەو شــتانەی کــە ئــەو پیــاوە کردبوونــی منیش کردوومــن، لەگــەڵ ئــەوەش دا لەخاچیان نەدام"

**٥. دادگای قیامەت**

خامۆشی‌یەك بــاڵی کێشابوو بەســەر دادگــای قیامــەت داو پیاوەکــە بــەرووتی هاتــە بــەردەمی یەزدان، یــەزدانیش کتێبــی ژیاننامــەی پیاوەکــەی کردەوەو پێی وت:

"ژیانی تــۆ پــڕ لەشــەڕو گونــاهبووە. دڵ رەق بوویــت بەرامبــەر ئەوانـــەی لـــە تەنگانـــەدا پێویســـتی‌یان بەیارمـــەتی تۆبـــووە. دڵ رەق‌و بێبــەزەیی بوویت لەگــەڵ ئەوانــەی بــێ دەرەتــان بوون. هەزاران هاواریان بــۆ دەهێنــای کــەچی تــۆ گوێت لــێ نەدەگرتن. گوێکانت لە ئاستی هــاواری بونــەوەرە بــەد بەختــەکانمدا داخرابــوو، مــیراتی بێباوکەکانت دەبــرد بــۆ خــۆت‌و رێویت دەنــاردە رەزی دراوسێکانتەوە. نــانی منداڵانــت دەبــردو دەتدا بەسەگەکان تــا بیخــۆن. ســەرکز دەژیــان‌و درودیان بۆمن دەنارد، تۆ ناچارت دەکردن دەنێو رێو بانەکاندا وێڵ بــن. لەســەر ئــەو خاکــەی تــۆم لــێ دروست کرد خوێنــی کەســە بــێ گوناهــەکانت رشت"..

پیاوەکەش‌و وەڵامی دایەوەو وتی:

"تەنانەت ئەگەر واشم کردبێت"

دیســان خــودا کتێبــی ژیاننامـــەی پیاوەکــەی کردەوەو پێی وت:

"ژیــانت پڕبــووە لــە گونــاهو شــەڕ. ئــەو جوانی‌یەی پیشانم داویت تۆ بــەدوایدا گــەڕاویت و ئەو خێوەی شاردومەتەوە، تــۆ بــەلایدا گــوزەرت کـــردووە... دیوارەکـــانی ژوورەکـــەت بـــەتابلۆ رازاندبــۆوە. لــەناو پێخــەفی پــڕ لــە بەدکاریتــەوە لەسەر نەوای بلوێرەکــان وە ئاگاهــاتویت. حــەوت قوربانگەت بۆ ئەو گوناهانە دروست کــرد کــە مــن رێــم پــێدابوون. لــەو شــتەت خــوارد کــە نــەدەبوو بخورێت‌و قوماشی پۆشــاکەکەت بەســێ نیشــانەی شوورەیی چنرابوو. بتــەکانت نەلــە ئــاڵتون‌و نەلــە زیو بــوون تــاوەکو بەرگــە بگرن بــەڵکو لەگۆشت بــوون کــە دەمرێــت. بۆنــت دەپژاند بەقژیانــەوەو هــەنارت دەخســتە چنگیانــەوە. پێیــەکانیانت بەزەعفەران رەنگ دەکردو فەرشت لەبەر پێیــاندا رادەخست. پێڵوەکانیــانت بــە(ئــەنتیمونی)(٧) رەنگ دەکردو جەستەشیان بە کەتیرەی درەختی مێــو ســواغ دەدا. لەبـــەردەمی‌یاندا خـــۆت

لە(سنەویەر) دروست کراوی داگیرساندبوو لە گردەکەوە بەرەو دۆڵەکە ملی‌نا چونکە لە ماڵەوە کارێکی بۆ پێش هاتبوو.

کاتێکیش لەسەر بەردە ستێکانی (دۆڵی دیسۆلەیشن ـ Valley of - Desolation) بەچۆکدا هات، کوڕە لاوێکی رووت‌و قوتی بینی کە دەگریا بەخۆو بەقژێکی رەنگ هەنگوینی. لەشی چون گوڵی سپی بەلام هەر هەموو ئازای بەدڕك زامدار کردبوو.

خۆڵەمێشیش تاجی سەر سەری بوو. جۆزیف کە خاوەنی دارایی‌و سامانێکی یەکجار زۆر بوو بەو کوڕە چاو پڕ فرمێسکە رووتەی وت:

"پێم سەیر نی‌یە کە غەمەکەت هێندە گەورەیە، بەدڵنیایی‌یەوە مەسیح پیاوێکی داد پەروەر بوو"

کوڕە لاوەکەش وەلامی دایەوە:

"من بۆ ئەو ناگریم بەلکو بۆ خۆم دەگریم منیش ئاوم گۆڕی بۆ شەراب، گەڕو گولیشم چاك کردۆتەوەو بینایم بەخشیوەتە کوێر. بەسەر دەریاکاندا رۆیشتوم. لە لەشی گۆڕستان نشینان شەیتانەکانم وەدەرنا. لە بیاباندا کە خواردنی لێ نی‌یە نانی برسی‌ییەکانم داوە. مردوی ناو گۆڕە تەنگو تارەکانم زیندوو کردۆتەوە. بەفەرمانی من‌و لەبەردەم خەڵکێکی زۆردا دار هەنجیرێکی زڕ وشکی کرد.

هەر هەموو ئەو شتانەی کە ئەو پیاوە کردبوونی منیش کردوومن، لەگەڵ ئەوەش دا لەخاچیان نەدام"

### ٥. دادگای قیامەت

خامۆشی‌یەك باڵی کێشابوو بەسەر دادگای قیامەت داو پیاوەکە بەرووتی هاتە بەردەمی یەزدان، یەزدانیش کتێبی ژیاننامەی پیاوەکەی کردەوەو پێی وت:

"ژیانی تۆ پڕ لەشەڕو گوناهبووە. دڵ رەق بوویت بەرامبەر ئەوانەی لە تەنگانەدا پێویستی‌یان بەیارمەتی تۆبووە. دڵ رەق‌و بێبەزەیی بوویت لەگەڵ ئەوانەی بێ دەرەتان بوون. هەژاران هاواریان بۆ دەهێنای کەچی تۆ گوێت لێ نەدەگرتن. گوێکانت لە ئاستی هاواری بونەوەرە بەد بەختەکانمدا داخرابوو، میراتی بێباوکەکانت دەبرد بۆ خۆت‌و رێویت دەنارده رەزی دراوسێکانتەوە. نانی منداڵانت دەبردو دەتدا بەسەگەکان تا بیخۆن. سەرکز دەژیان‌و درودیان بۆمن دەنارد، تۆ ناچارت دەکردن دەنێو رێ‌و بانەکاندا وێڵ بن. لەسەر ئەو خاکەی تۆم لێ دروست کرد خوێنی کەسە بێ گوناهەکانت رشت"..

پیاوەکەش‌و وەلامی دایەوەو وتی:

"ئەنانەت ئەگەر واشم کردبێت"

دیسان خودا کتێبی ژیاننامەی پیاوەکەی کردەوەو پێی وت:

"ژیانت پڕبووە لە گوناهو شەڕ. ئەو جوانی‌یەی پیشانم داویت تۆ بەدوایدا گەڕاویت و ئەو خێرەی شاردومەتەوە، تۆ بەلایدا گوزەرت کردووە... دیوارەکانی ژوورەکەت بەتابلۆ رازاندبۆوە. لەناو پێخەفی پڕ لە بەدکاریتەوە لەسەر نەوای بلوێرەکان وە ئاگاهاتویت. حەوت قوربانگەت بۆ ئەو گوناهانە دروست کرد کە من رێم پێدابوون. لەو شتەت خوارد کە نەدەبوو بخورێت‌و قوماشی پۆشاکەکەت بەسێ نیشانەی شوورەیی چنرابوو. بتەکانت نەلە ئاڵتون‌و نەلە زیو بوون تاوەکو بەرگە بگرن بەڵکو لەگۆشت بوون کە دەمرێت. بۆنت دەپژاند بەقژیانەوەو هەنارت دەخستە چنگیانەوە. پێیەکانیانت بەزەعفەران رەنگ دەکردو فەرشت لەبەر پێیاندا رادەخست. پێڵوەکانیانت بە(ئەنتیمونی)(٧) رەنگ دەکردو جەستەشیان بە کەتیرەی درەختی مێو سواغ دەدا. لەبەردەمی‌یاندا خۆت

# پشیلەی بەر باران

■ ئێرنست هەمەنگوای

● و: بەکر عوسمان

هەمەنگوای لەساڵی (١٨٩٩) دا لەیەکێ لەگەڕەکەکانی شیکاگۆ چاوی بەژیان هەڵهێناوە، باوکی دکتۆرێکی ناودارو بەڕێزبووە. لەجەنگی جیهانی یەکەمدا وەك شۆفێری فریاکەوتن لەئیتاڵیا بەخۆبەخش کاریکرد، بەڵام هەرزوو بریندارکراو هەر لەوێش تیمارکرا. لەپاش جەنگ گەڕایەوە بۆ ئەمریکاو لەساڵی (١٩٢١)دا ژنی هێناوە.

دواتر وەك رۆژنامەنوسێك لە ئەورووپا کاریکردو، لەوێ چاوی کەوتوە بەژمارەیەکی زۆر لەنوسەرە گەورەکانی جیهان، لەمیانی ئەواندا نوسەری بەناوبانگ.. جیمس جۆیمس.. و.. ئیزراپاوەند.. ی شاعیر. یەکەمین شیعرەکانو کورتە چیرۆکەکانی لەساڵی (١٩٢٣)دا بڵاوکراونەتەوە. لەساڵی (١٩٥٤)دا خەڵاتی نۆبڵی بۆ ئەدەب بەخشراوە. هەمەنگوای هەر لەکاتی ژیانی خۆیا ناوو شۆرەتی پەیداکردووە، بەتایبەتی بۆ ئەو شێوە نوسینەی کە بەراستوڕەوانی ناوبانگی پەیداکردبوو. زۆر لەنوسەران ویستیان لەسەر ئەم شێوازە بڕۆن، بەڵام سەرکەوتنی ئەوتۆیان وەدەست نەهێنا. شێوازێکی توندوتۆڵی ئەمریکی پەیڕەوکرد، کە ئارەزووەکانی ـ (هوایات)، وەك شەڕەگا، راوو شکارو راوەماسی لەدەریای قوڵو بەریندا تێیدا رەنگیان داوەتەوە کە ئەمانە هەر هەموویان بوونە بابەتی زۆر لەرۆمانەکانی. "پشیلەی بەریاران" یەکێکە لەکورتە چیرۆکەکانی، بەڕوخسار سادەو رەوانە لەبیرۆکەیدا. بەڵام لەراستیدا لەپشتی ئەو روکەشە واقعیی‌یەدا سامانێك لەتەمومژو رەمزیەتو ووردەکاری مانایی هەیە کە خوێنەر بەبلیمەتی خۆی پەی پێدەبا. شتێکی سەیریش نی‌یە گەر بڵێین کە هەر ئەم کورتە چیرۆکە رەخنەیەکی دژەبەیەکی لەلای رەخنەگرە ئەدەبیەکانو ئەکادمیەکانەوە ووروژان.



هەر تەنها دوو ئەمریکی هەبوو کەلەئوتێلەکەدا مابوونەوە. نامۆبوون بەهەموو ئەو کەسانەی بەسەر قادرمەکانا لەهاتوچونیانا بۆژوورەکەیان بەلایانا رەت ئەبوون. ژوورەکەیان لەنهۆمی دووەم بەرەو روی دەریابوو. هەروەها روشی کردبووە باخی گشتیو پەیکەری جەنگ لەباخی گشتیدا درەختی گوێزی هندی گەورەو سەکۆی سەوزباوی تیابوو. لەرۆژانی خۆشیانا هەمیشە هونەرمەندێکی لێبوو بەخۆی سێپاکەیەوە. هونەرمەندان زۆر کەیفیان دەهات بەودارگوێزە هندیانەو رەنگەکراوەکەی ئەو ئوتێلانەی روویان کردبووە باخەکان و دەریا. ئیتالیەکان لەوپەڕی دنیاوە دەهاتن تا چاوێ بەپەیکەرەکەی جەنگ دا بگێڕین، پەیکەرەکە لەبرۆنز دروست کرابوو، لەبەربارانەکە بریقەی ئەدایەوە لەوکاتەدا شەستەو رەهێڵەی دەکرد. بارانەکە بەدارگوێزە هندیەکانا دەهاتە خوارێ. رێگاوبانە چەورپێژەکان گۆماویان تیاهەڵنیشتبوو ئاوی دەریاکەش لەگەڵ بارانەکە هەڵئەساو ئینجا بەدامێنی کەنارەکەوە ئەشکایەوەو سەرلەنوێ ریزی ئەبەستەوە لەوکاتەدا گۆرەپانی لای پەیکەری جەنگەکە چۆڵو چ ئوتومبیلێکی لێنەبوو.

لەولای گۆرەپانەکەشەوە، لەناو دەرگای قاوەخانەکەدا، شاگردێ وەستابوو سەیری گۆرەپانە چۆڵەکەی دەکرد. خانمە ئەمریکیەکە لەنێو پەنجەرەکەدا وەستابوو سەیری دەرەوەی دەکرد. هەرێك لەژێر پەنجەرەکەی ئەمانەوە لەدەرەوە پشیلەیەك لەژێر یەکێ لەمێزە سەوزە ئاولێداچۆڕاوەکانا خۆی گرمۆڵە کردبوو. پشیلەکە ئەیویست پترخۆی بچوکتر بکاتەوە، تا ئەو دڵۆپە بارانانەی بەمێزەکەدا دەهاتنەخوارێ تەڕی نەکات. خانمە ئەمریکیەکە بەهاوسەرەکەی وت: ـ "هەرئێستا ئەچمەخوارێو ئەو پشیلەیە دێنم"

هاوسەرەکەشی لەسەر پێخەفەکەیەوە ووتی.. "نامن ئەچم."

خانمەکە ووتی: ـ "نەخێر هەر خۆم ئەچم. ئەوەتا ئەو پشیلە بەستەزمانە لەژێر مێزەکەدا خۆی گرمۆڵەکردوە تا تەڕنەبێ" هاوسەرەکەی لێیراکشابوو و، سەریخستبووە سەر دوو سەرینو دەستی کردەوە بەخوێندنەوەو وتی:" وریابە تەڕنەبی." خانمەکە رۆیشتەخوارێ، کاتێ

بەلای نوسینگەکەدا، رابورد ئوتێلچیەکە هەڵسایە سەرپێ‌و دەستەونەزەر سەری رێزی بۆ دانەوان. مێزەکەی لەوپەری نوسینگەکەوە بوو. کابرایەکی کەڵەگەتی بەساڵاچووبوو. خانمەکە بەزمانی ئیتالی وتی: ـ "چاك ئەبارێ".

کابرای ئوتێلچی چوو بەدڵیا. کابراش لەوەڵامدا وتی: ـ "بەڵێ، بەڵێ قوربان راستەکەی رۆژێکی تۆف‌و بارانە."

لەوسەری ژوورە تاریکەکەوە لەودیو مێزەکەیەوە راوەستا. خانمە ئەمریکیەکە ئەم کابرایەی چوو بەدڵا.

ئەو شێوە ئێجگار سەنگینەی ئەم کابرایەی چوو بەدڵا کە چۆن بەدەم هەر سکاڵانامەیەکەوە دەچوو. بەویقاریی ئەم کابرایەی بەدڵ بوو. شێوەی خزمەتکردن‌و بەرێکردنی ئەم کابرایەی چووبەدڵا. هەروەها هەستکردنی ئەم کابرایە وەك ئوتێلچییەك.. دەموچاوە تێك سمراوو بەتەمەنەکەی‌و هەردوو دەستە زلەکانی بەدڵ بوو. هەرلەو خەیاڵی خۆشەویستیەدا بوو کە خانمە ئەمریکیەکە دەرگاکەی کردەوەو سەیرێکی دەرەوەی کرد. شەستەو رەهێڵەی دەکرد. کابرایەك کە کاپێکی لاستیکی لەبەردابوو لەگۆرەپانە چۆڵەکەوە بەرەو قاوە خانەکە پەرییەوە. ئەبێ پشیلەکەش هەر تۆزێ بەولاوە لای دەستە راست بووبێت.

ئەشێ بیتوانیایە بەژێر گوێسوانەکەدا برۆیشتایە. هەر کە لەناو دەرگاکەدا راوەستا یەکێ لەپشتەوە چەترەکەی بۆ هەڵگرد. کە ئاوڕی دایەوە بینی ئەوە کیژە کارەکەرەکەیە کە ژوورەکەیان بۆ پاك دەکاتەوە.

بەدەم زەردەخەنەوە بەزمانی ئیتالی ووتی: ـ "با تەڕ نەبیت." بێگومان دیاربوو کە ئوتێلچیەکە ئەو چەترەی بۆ ناردبوو. بەرێگا چەوڕێژەکەدا کەوتەرێ‌و کارەکەرەکەش چەترەکەی بۆ گرتبوو تا گەیشتە ئاستی پەنجەرەی ژوورەکەیان. مێزەکە لەوێدابوو، بارانەکەش رەنگە سەوزەکەی جوان شتبووەوە. بەلام پشیلەکەی لێنەمابوو. لەپڕێکا دیارنەمابوو. کارەکەرەکە سەری هەڵبڕی‌و سەیرێکیکردو وتی: "ئەرێ خانم هیچت لێوون بووە؟" کیژە ئەمریکیەکە ووتی: "پشیلەیەك ئالێرەدا بوو" "پشیلە"؟ کیژە ئەمریکیەکە ووتی: "بەڵێ، پشیلەیەك". کارەکەرەکەش بەدەم پێکەنینەوە وتی: "پشیلە؟ پشیلەو لەم بەر بارانە؟" کیژە ئەمریکیەکە وتی: "بەڵێ، لەو ژێر مێزەدابوو. ئینجا زۆر حەزم دەکرد بیگرم. زۆرم حەز لەپشیلەیە". کارەکەرەکە رووی گرژبوو کە ئەو بەئینگلیزی کەوتە دوان.

کارەکەرەکە وتی: "خانم وەرە بابرۆینەوە ژوورەوە ئەگینا تەڕ ئەبی."

کیژە ئەمریکیەکەش وتی: ـ "وابزانم راستەکەی." بەرێگا" چەوەکەدا گەڕانەوەو بەناو دەرگاکەدا رەت بوون. کارەکەرەکە لەدەرەوە راوەستا تا چەترەکە دابخات. کە کیژە ئەمریکیەکە بەلای ئۆفیسەکەدا رەت بوو کابری ئوتێلچی لەشوێن خۆیەوە سەری‌رێزی بۆدانەواند. کیژەکە لەناخیا هەستی بە شتێکی زۆرو توندوتۆڵ کرد. کابرای ئوتێلچی وای لێکرد خۆی زۆر بەبچوك بزانێ‌و بەلام لەهەمان کاتیشا خۆی زۆر بەزل بزانێ. بۆ ساتەوەختێ هەستی بەرۆح زلیەکی کاتی کرد. بەسەر پلیکانەکاندا سەرکەوت‌و دەرگای ژوورەکەی کردەوەو جورج هێشتا هەر لەسەر پێخەفەکە بوو خەریکی خوێندنەوە بوو. جورج کتێبەکەی داناو لێی پرسی: "ئەرێ پشیلەکەت هێنا؟"

ئەمیش لەوەڵاما وتی: "لەوێ نەمابوو." دەستی لەخوێندنەوەکە هەڵگرت‌و وتی: ئەرێ تۆ بڵێی بۆ کوێ چووبێ.. خانمەکە لەسەر پێخەفەکە دانیشت وتی: زۆر زۆرم حەز لەو پشیلەیە بوو. خۆیشم نازانم بۆ هێندەم حەزلێ

بوو. حەزم لەو پشیلە بەستەزمانە بوو. من هیچ خۆشی لەوەدا نابینم پشیلەیەکی بەستەزمانی ئاوا لەویەر بارانە بێ. جورج دەستی کردبووەوە بەخوێندنەوە ئەویش دانەویەوەو لەبەردەم ئاوێنەی تەوالێتەکەدا لێی دانیشت. بەئاوێنە دەستیەکە سەیرێکی خۆی کرد، ووردبووەوە لەم لای، ئینجا لاکەیتری دەموچاوی، سەیرێکی پشتی سەری خۆیکرد، ئینجا گەردنو ملی. سەیرێکی ئەملاو لای خۆیکرد و "ووتی وابزانم چاکتر وایە قژم درێژبکەمەوە". جورج سەری هەڵبڕیو سەیرێکی پشتی ملی ژنەکەی کرد کە چەشنی پشتەملی کوڕ خشتو رێك بوو.

جورج وتی: "من حەزنەکەم قژت هەر ئاوابێ."

ئەویش وتی: من حەزم لێی نییەو لێی بێزاربووم. بێزارم لەوەی لەکوڕیچم..

جورج شوێن گۆڕکێی کرد لەسەر پێخەفەکەو هەر لەو ساتەوەی ژنەکەی کەوتبووە دوان ئەم چاوی لێنەبڕی بوو. جورج وتی: "گیانەکەم تۆ ئاوا زۆر زۆر جوانی."

ئاوێنەکەی لەسەر مێزی تەوالێتەکە داناو بەرەو پەنجەرەکە رۆیشتو سەیرێکی دەرەوەی کرد. دنیا خەریك بوو تاریك دائەهات، "حەزنەکەم قژم لەپشتەوە توندو تۆڵ بگرمو بەدەستی خۆم گرێیەکی گەورەی لێبدەم. حەز ئەکەم پشیلەیەکی جوانیشم هەبێو لەسەر باوەشم دایبنێمو کەدەستم هێنا بەسەریا ئەویش لەخۆشیا بمیاوێنێ." جورج لەسەر پێخەفەکەیەوە ووتی" ئێ؟"

"حەزنەکەم لەسەر مێز دانیشمو بەکەوچکی زیوینی خۆم نان بخۆم و سەرمێزیش بەمۆم رازابێتەوە. حەزم لەبەهارەو حەزنەکەم لەبەر ئاوێنە قژم شانەبکەمو حەزم لەپشیلەیەو لەجلویەرگی نوێیە."

جورج وتی: ئای توخوا ئەگەر بێدەنگ نەبی، برۆ شتێ بهێنەو بیخوێنەرەوە. جورج دەستی کردەوە بەخوێندنەوە. ژنەکەی لەپەنجەرەکەوە سەیرێکی دەرەوەی کرد. ئێستا دنیا تەواو تاریك داهاتبوو. باران بەخوڕەم بەسەر دارگوێزە هندیەکانا ئەهاتە خوارێ. ژنەکە وتی: "بەهەرحاڵ، من هەر پشیلەم ئەوێ. هەر ئێستاش پشیلەم ئەوێ. گەر قژی خاوو درێژم نەبێو هیچ خێرو خۆشیەکم نەبێ. خۆنەبێ پشیلەیەکم هەبێ" جۆرج خۆی لێکەڕکردبوو گوێی لێنەدەگرت. سەرقاڵی خوێندنەوە بوو. ژنەکەی لە پەنجەرەکەوە سەیری ئەو تروسکە روناکیەی دەکرد کە لە گۆڕەپانەکەوە دەهات. لەوکاتەدا یەکێ لەدەرگایدا. جۆرج سەری لەکتێبەکەی هەڵبڕی ووتی: "بەڵێ فەرموو." کارەکەرەکە لەنێو دەرگاکەدا راوەستابوو. پشیلەیەکی گورەی توند نوساندبوو بەخۆیەوەو پشیلەکەش خۆی ئەهێناو ئەبردو خۆی ئەدا بەلەشی ئەوەوە. کارەکەرەکە ووتی: "ببورە، ئوتێلچیەکە داوای لێکردم ئەم پشیلەیە بۆ خانم بهێنم.)

سەرچاوە:

More Modern Short Stories
Selected and edited by: Peter J W Taylor
Oxford University Press
First Published 1981

# ڕێگای درێژی ڕیجیس دۆبریە

● و. بڕوا علاء الدين

{لەگیڤاراوە (کەدۆبریە پەیوەندیەکی بەتینی لەگەڵدا هەبوو) تامیتران؟ لەجیهانی سێهەمەوە بۆ فەرمانبەرێکی گشتی پایەبەرز؟ لەچەپڕەوییەوە بۆ دیموکراسیەتی کۆمەڵایەتی؟ ئەمانەن قۆناغە لێکدڕەکانی دۆبریە لەڕووکەشدا. بەڵام پاش بڵاوکردنەوەی کتێبەکەی (ڕەخنەگرتن لەعەقڵی سیاسی) لەدەزگای گالیمار، ڕاوێژکاری تازەی سەرەك کۆماری فەرەنسی (مەبەست لە دۆبریە خۆیەتی) وێڕای کە بەڕاشکاوی بڵێت دۆبریە کێیەو بیر لەچیدەکاتەوە. ئەم چاوپێکەوتنەش (جان پول ئەنتوفن) لەنوسینگەکەی خۆی، لەئەلیزیە لەگەڵیدا سازی کردوە}.

دۆبریە: ئەوەی بەلای منەوە سەرەکی‌یە، ئەوەیە کەبزانن چۆن جیاوازی بکەین لەنێوان ئەوەی بەردەوام دەبێتو، ئەوەی بەسەردەچێت. بۆ نمونە کتێب ئەتوانێت لەگەڵ تێپەڕبوونی چەندین سەردەمی جیاوازیشدا بمێنێتەوە، بەڵام شتەکانی‌تر..

{لەبەر پلەوپایەی (ئەو جێگەیەی لێی دانیشتووین) ئەستەمەگەر (شتەکانی‌تر) لەبەرچاو نەگرین: لەژێر وێنەکەی سەرۆکەوە کە لەپشت ئەو مێزەی بە گەلای ئەکانتیا ڕازێنرابووەوە، هەڵواسرابوو، لەوکاتەشدا کە ئوتومبیلە (لیمۆزین)ەکانی وەزارەت بەگۆڕەپانی ئەلیزیەدا هاتوچۆیان دەکرد، دۆبریە وەك گەنجێك دەهاتە پێش چاو کە پەشۆکانێکی ئاڵۆز بەدەموچاویەوە دیاربوو. سمێڵی کە ئەوسا لەسەر مۆدێلی نیتشەوی ئەیهێشتەوە، ئێستا بەجۆرێکیتر ڕێکخرابوو. گرێی بۆینباخەکەشی چاککردبوو.

لەهەموو شوێنەکانی (ئەو جێگەیەشدا) دۆسیەو ئـامێری تەلـەفونو بلیتـی باڵیۆزخانـە جۆراوجۆرەکـانو فەرمانبـەر بەجلوبـەرگی رەسمیەوە دەبینران}

دۆبریـە: ئەگـەر ویسـتت وەك مـن لـەکاری سیاسی بکۆڵیتەوە، خراپ نیە گەر لەژیانی رۆژانە نزیك بیتەوە. ئەوە ئەزمونێکە، هەڵەیە رۆشنبیر پشت گوێی بخات.

{لەوکاتـەدا بـەخۆم وت: دۆبریەکامیانـە؟ ئایا هاوڕێی (فیدل کاسترۆ)یە، هاوڕێی ئەلێندیە، یا ئەو رۆماننوسەیە کە خانمانی خەلاتی (فیمینیا)ی ئافرەتـان پـێی سەرسـامن؟ ئایـا ئـەو زیندانـە کامیربەیە کە لە (بولیڤیا) دەستگیرکرابوو، یا ئەو چەپـە مەترسیدارەیە کـە ئەمریکیـەکان باسـی دەکەن، وە یا ئەو (راوێژکار)ە تازەیـەی سـەرەك کۆماری فەرەنسایە، کە بـەیانی چوارشـەممە لـەو کۆشکەدا پێشوازی لێکردم، کە هـەموو رۆژێـك ژیانی تـازەی خۆی تیـا بەسـەر دەبات. بەهـەر حـاڵ، ئەوانـەی بـەر لەبیسـت سـاڵ مالرۆیـان ناسـیوە، پێـش ئـەوەی بچێتـە نێـو نـاوەندە رەسمیەکانـەوە، ئـەزانن کە لـەبواری لەبەریـەك گرتنەوەدا (تناسخ) هیچ شتێك مەحاڵ نیە.

لـە سیبراوە بۆ بۆلیڤیـاو بۆ خـەیاڵی شـیعر. ئەوانەی ئەو شـوێنانە نـازانن لەبەرئـەوەی تیـایدا نەماونەتەوە، توشی لۆمەی ئەو کەسانە دەبن کە لێـوەی هاتونەتـەوە. ریجیـس دۆبریـە، "ئـەو پیاوەی کەس ئارەزووی ناکات*" ئەو ا(بۆرژوازیە بچووکەی لەنێوان دوو ئاگرو چوار دیواردایـە)**، بـوو بەفەرمانبـەرێکی پایەبـەرز لـەناو حکومـەتی فەرەنسیدا. ئایا هەروا بەسادەیی ئەوەمان لەیاد بچێت کە مرۆڤەکان بەقەد جیاوازییان لـەوانیتر، لەخۆیان ئەگۆڕێن، هەروەك فەیلەسوفانی ئەخلاق ئەیانگووت؟}

دۆبریە: هەمیشە باوەڕم وابـووە کـە رۆشـنبیر تەنها ئیشی ئەوەنیە بیروڕا بەرهەم بهێنێ، بـەلکو پێویسـتە راکـانی بکۆڕێـت بـۆ چالاکیـەکی پراکتیکی، کە لەگەڵ واقیعدا تێکەڵاوبێت.

نوفیل ئوبسرفاتور: باشە ئەمە ئەوەدەگەیەنێ کە لە (١٠)ی ئایارەوە، بـەلای تـۆوە هیـچ شـتێك نەگۆڕاوە؟

دۆبریە: ئەوەی کە گۆڕاوە، یائەوەی کـە منـی گۆڕیـوە، ئەوەیـە کـە فـێربووم زیـاتر خـاکیی (متواضـع) بم. لەوکاتـەوە هـەندێ ئاسـۆی تـرم دۆزیـەوە کەپێشـتر نـەمبینیبوو. بـۆ نمونـە وەك وتەزایـەکی عـەقلانی ئـەم زانـی دەوڵـەت چیـیە؟ بـەلام ئیشـکردنی رۆژانـە لەدەوڵـەتدا، هـەرگیز نەمدەزانی چییە. گەر باسی خاکی بوونیشم کـرد مەبەستم ئەوەیە کـە زۆرجـار ئێمـەی رۆشـنبیران پێمان وایە کە هەر خۆمـان دەتوانـین راستیەکان ببینینو دەریان بـهێنین. بـەلام لەبەشـی نادیـاری دەوڵـەتدا، یـان ئـەو بەڕێوەبەرایەتیـەی نـاونراوە گشـتی - کـەواش نیـە - بـۆم دەرکـەوتووە کـە کەسانێك هـەن هـەرگیز تەلـەفزیۆن پیشـانیان نـاداتو ناویـان نیـە. بـەلام لەڕاسـتیدا ئەوانـە خاوەنی کۆمەڵێ ئـەزمونی کـاملو پێگەیشـتوون، کە لەوەو پێش بەخەیاڵمدا نەدەهات وابن. دڵنیات ئەکەم لەوەی کە ئەو فەرمانبەرە گەورانە شایەنی ستایشن.

ن..أ: ئایا کتێبەکەت (رەخنەگرتن لـە عـەقڵی سیاسـی) هیـچ کـام لـەم ئەزمونـە تازانـەی پێوەدیارە کە باست کردن؟

دۆبریـە: باوەڕناکـەم، چونکـە ئـەوە کتێبـی تیوریستە نەوەك رۆشنبیر.

ن..أ: مەبەستت لەوە چییە؟

دۆبریـە: مەبەسـتم لـەوە کـە تیوریسـت بەپێچەوانەی رۆشنبیرەوە، ئەو کەسەیە کە هـەق دەڵێت، بێئـەوەی بایـەخ بەڕەنگدانـەوەی ئـەو

راستیە بدات لەسەر ژیانی خۆیو ژیانی ئەوانیتر. تیوریست ئەندازیارە یا دەروون شیکارە. هەرگیز ناکرێت بەرپەرسیار لەهەموو حاڵەتەکان دابنرێت.

بەو بۆنەیەشەوە، وە بۆ ئەوەی پێش نارەزاییەکانت بکەوم، من تەحەمولی دژواریی ئەو دابرانە دەکەم، کە ئەکرێت لەنێوان کارەکەمدا وەك تیوریستێكو، چالاکیم وەك رۆشنبیرێك رووبدات. لەنێوان ئەو دووانەشدا جیاوازیەکی شاراوە هەیە، هێندەی جیاوازی نێوان کتێبێك دەربارەی جیومیتەری (زانستی ئەندازیاری) و هێلکاری (تصمیم) ئەندازیارێك کە نەخشەی شوێنێك دەکێشێت.

{بەو بۆنەیەوە (رەخنەگرتن لەعەقڵی سیاسی)، ئەو کتێبە جیومیتەریەیە کە ٤٦٨ لاپەرەیەو، پێویستە خوێنەر لەناکامی (دیالەکتیك)و(شیکردنەوە)یەکەوە کە سازش ناکەن، هێواش هێواش ناوەرۆکەکەی بخوێنێتەوە. بەلام پرۆژەکەی بریتیە لەوەلامدانەوەی ئەم پرسیارە: (بۆچی خەلکی لەوەتەی کۆمەڵ کۆمەڵ دەژین، لەرێرەوی عەقڵ لادەدەن؟).

ئەوەی کە نووسەر لەو رەخنەیەدا مەبەستیەتی گەرانەوەیە بۆ سەرچاوە، گەرانەوەیە بۆ باسکردنی ئەو هەلومەرجە تەمومژاویانەی ئەگەری وڕێنەی کۆگەلی (الهزیان الجمعي) دەیهێننە ئاراوە. دۆبریە بیەوێو نەیەوێ وەك (بیریارێکی کانتی) ئەم روونکردنەوەیە دەنوسێ: سیاسەت بۆ ماوەیەکی درێژ مەسەلەی سیاسی لێ شاردمەوە. ئەمە بەو مانایە نا کە شەمەندەفەرێك شەمەندەفەرێکی تر دەشارێتەوە، بەلکو بەو مانایەی کە هەموو شەمەندەفەرێك ئەو هێلە دادەپۆشێت کە پێیدا دەروات. دووریی زۆر هەن.. خێرایی زۆر هەن، بەلام یەك هێلی ئاسنین، یان یەك لەرێگای ئاسنین هەیە.

پاشان لەشوێنێکی دیکەدا دەڵێت: {لەئاکامی لێکۆڵینەوە درێژەکەیەوە، دەیەوێت (ئەستی سیاسی - اللاوعي السياسي - لای مرۆڤایەتی) روون بکاتەوە}.

ن..أ: هەر لەسەرەتای لاپەرەکانی کتێبەکەتدا ئەوە دەخوێنینەوە،کە (ئەوەی دەیەوێت کارێکی دیاریکراوبکات، ئەو کەسە نیە کەتیوریزەی مەرجە گشتیەکانی ئەوکارە دەکات). هەروەك لەشوێنێکی دیکەدا دەیخوێنینەوە (پێویستە بەشەیداییەوە ئەو دوو فاقیەمان خۆش بووێت، وەك ئەوەی چەکێکی نهێنی بێت) بۆ؟

دۆبریە: ئەوەراستە. بەلام (چەکی نهێنی) بەمانای ئەوە نایەت کە پاشەکشێ لەو حوکمانە بکەین، یان دژیان بوەستینەوە. بەلکو مەبەست لەو چەکە سیحریە ئەوەیە کە زۆرجار هەڵبژاردنی ئازادانەی خەڵك ناکرێت بەشێوەیەکی عەقلانی تەفسیربکرێت.

ن..أ: کەواتە رۆشنبیر دەتوانێ لەو بوارە سیاسیەدا چی کەشف بکات، کەهێشتا تیوریست نایزانێت؟

دۆبریە: ئەوەی کەمەبەستە کەشفکردن نیە بەلکو لێ‌پێچینەوەیە (تحقيق) ئەوەشی کەتا ئێستا لێیم پێچاوەتەوە، ئەوەیە کەپێش هەموو شتێك دەسەلات بەرێوەبەرایەتی کردنی بێدەسەلاتانە.

ن..أ: ئەم جۆرە لێکدژیە، لەنەفرین لێکردنی دەوڵەمەند لەسامانو، رقی خاوەن بروانامە لەبروانامە دەچێت.

دۆبریە: هەڵەیە ! کاتێك ئەڵێم دەسەلات بریتیە لەبەرێوەبەرایەتیکردنی بێدەسەلاتی، لەراستیدا ئەوە باشترین وەسفە بۆی. ئەوە سیستەمێکە (نسق) لەچەندەها شێوەی

بێدەسەڵاتی نیسبی، کاتێك ئەم جۆرە بێدەسەڵاتیانە لەگەڵ یەکتردا هاوسەنگی دروست دەکەن ئەنجامەکەی بەرەو بڕیار دەچێت. ئەوسا تەنها بەگومانەوە دەمڕوانییە میتولۆژیای ئەو دەسەڵاتەی هەموو شتێك دەزانێ‌و ڕەهایە، بەڵام ئێستا بەتەواوەتی بۆم دەرکەوتووە کە هەر دۆریە. بێگومان ئەوە شتێکی ڕاست نییە کە بێدەسەڵاتی خەڵکیتر، بەبێدەسەڵاتی خۆم دەپێوم. من لە (١٠)ی ئایارەوە هیچ دەسەڵاتێکم نەبووە. هەمیشەش سەرم دەسوڕمێ کەببینم دەسەڵاتم پێ‌ببەخشرێت. لێرە لەئەلیزیە تەنها یەك کەس نەبێت کە ئەویش سەرۆکە، کەسی دیکە دەسەڵاتی ڕاستەقینەی نییە، لەم بارەیەشەوە لەوە زیاتر نالێم.

{لەوەوپێش پێی ووتبوم با (تەنها دەربارەی کتێبەکەم قسەبکەین)، بەڵام شتەکانیتر، بەدڵنیاییەوە پەیوەستن بەکەمێ دەمپاراستنەوە. بەڵام من حەزم ئەکرد بزانم کە لەو پێنج هەفتەیەی ڕابردوودا لەئەنگۆلا چی ڕوویداوە، وە ئەمویست بزانم کەچوو بۆ نەتەوە یەکگرتووەکان چی ووتەو چیکردووە، یا لەکۆشکی سپی کە لە کۆتاییەکانی ئەیلولدا، دیك ئەلن سەرۆکی ئەنجومەنی ئاسایشی نێو نەتەوەیی پێشوازی لێکردبوو. وەك چۆن حەزم ئەکرد بزانم ڕای چیەو چی ئەزانێ دەربارەی هەڵوێستی فەرەنسی‌و مەکسیکیەکان لەئاست سلفادۆر، وە دەربارەی کوبیەکان لەئەفەریقاو، دیداری شیسون‌و عەرەفات چی دەزانێ، کە لەوانەیە ئەوە زۆر زیاتر سوودمەندتر بێت وەك لەوەی بەسەر لوتکەکانی ئەو کتێبی (ڕەخنە)یەدا بەرز بفڕین، کە ئەگاتە گریگۆریوسی حەوتەم‌و ئیمپراتۆر قوستەنتین. بەڵام دۆبریە بەو شێوەیە بیرناکاتەوە: تەنها چوار مانگە لەئەلیزیەیە، بەڵام نزیکەی ١٠ساڵە خەریکی نووسینی ئەو کتێبەیە. بەلای ئەوەوە هیچ بوارێك نەبوو یێك نەبوو لەپێناو پاساوهێنانەوە بۆ تیورەکەی دەربارەی کاری سیاسی، دەسەڵاتێك بداتە خۆی‌و لەو شوێنگەیەوە بیهێنێت، کە لەناو ئامێری دەوڵەتدا داگیرکردووە. لەبەرئەوە دەیەوێت وای لەخەڵك بگەیەنێت، کە مەرج نییە (ڕاوێژکاری سەرۆك) لەو فەیلەسوفە بچێت کە ئەشێت کەسێکی وەکو دۆبریە بێت. خۆیشی گومانی لەمەنیە: چونکە وەك چۆن چەمکەکان چارەسەر دەکرێن، ناکرێت دۆسیەکانی بەڕێوەبەرایەتی دەوڵەتیش وا چارەسەربکرێن}.

ن..أ: کاتێ فرانسومیتران بۆ سەرۆکایەتی هەڵبژرێدراو، لەماوەی سەرۆکایەتیەکەیدا هەستا بەدەستنیشانکردنی سێ‌پێشڕەو لەناودارە کۆچکردووەکان. کام لەوانە پاڵەوانی تۆبوون، بەتایبەتی لەوکاتەدا؟

دۆبریە: من لەوکاتەدا وەك هەموو فەرەنسیەکان هەستم بەکەمی ئەکرد. کاتێك میتران هەولی‌دا مێژوویەکی لەیادکراو بگەڕێنێتەوە، یارمەتی داین لەبەدەستهێنانەوەی خودی خۆماندا. بایەخی پاڵەوانەکان لەخودی خۆیاندا پەنهان نییە، بەڵکو لەو بوارەدایە کە بۆ بەردەوامبوون دەیخەنە بەردەستمان. لەگەڵ (جیسکار)دا شوناسی نەتەوەییمان بەرەو وێرانی دەچوو. لەبەرئەوە دەمێکە گەیشتوومەتە ئەوەی ڕێز لەکەللەڕەقی‌و، دان بەخۆداگرتن‌و، توانای پاڵەوانەکان بەسەر ئەوەدا کە بەتەنها کاریکەن، بگرم‌و هیچیتر. من حەزدەکەم بیابان ببڕم وەك چۆن کەدیگۆڵ‌و میتران کردیان. ئەوەشی لەواندا خۆشم دەوێ ئەوەیە پیاوانە بۆ ماوەیەکی دووردرێژ لای ئەو کەسانەی ئێستا ئەمریان دەکەن، بێزراوبوون. بەڵام ملکەچ بوون بۆ دیگۆڵ دەگەڕایەوە بۆ جۆرێك لەبەگەورەگرتنی سۆفیانە، لەکاتێکدا ئەمەکداری بۆ میتران لەهەستکردن بەڕێزگرتنەوە هاتووە، کە من ئەمەیانم پێ‌باشترە.

ن.. أ: پابەندبوونی سیاسی تۆ لەهەستەوەیە نەك لەبیروباوەڕەوە. لەوەدەچێ حەماسەتی شاعیریانە ـ یاخود (ڕێز) ـ بتکاتە خاوەنی بیروڕاو متمانەت پێببەخشێ، وەك لەبیرکدرنەوەی عەقڵانی،

دۆبریە: خۆی شتەکان هەر بەو شێوەیەن، جا ئەوە سەبارەت بەمن بێت، یاخود سەبارەت بەکۆمەڵگە بەشێوەیەکی گشتی. بۆ نمونە نێو نەتەوەیی بوون زیاتری بەخشیە مارکسیەکان، وەك لەوەی بەخوێندنەوەی (سەرمایە) دەستگیریان بوو. لەم رووەشەوە، ئێمە لەناسینی هەڵچونە دەروونیەکانمان ـ (خۆشەویستی، بوغز، شەیدایی) ـ کە بنچینەی بڕواکانمان ، زۆر دواکەوتوین، من وەك تیوریستێك، لەسەرم نییە راستیەکی زاڵ بەسەر راستیەکاندا بخەمە بەردەست. بەڵکو تەنها ئەوەم لەسەرە شیبکەمەوە بۆچی بیروبڕوایەك هەیە ـ کۆگەلی یان تاکی ـ بەراستیەك کە رەنگە لەلایەنی لۆجیکیەوە باوەڕپێکردنی گران بێت. پێویستە سنورێك بۆ هەڵوێستی ئەو قازیە دابنێین کە لەسەر بالکۆنەکانی مێژووەوە، بەرەکەت و نەفرەتەکانی دەبەشێتەوە.

من پێچەوانەی ئەوە دەڵێم: هیتلەر، ستالین، خومەینی، هەموویان هەن. ناشتوانین رەتیان بکەینەوە لەبەرئەوەی کەسی سەرپاوەن و خۆیان بەمێژوودا هەڵواسیوە، با ساکاریی سەردەمی رۆشنگەری بخەینەلاوە کەپێیان وابوو عەقڵ دەتوانێت شەڕ بنەبڕبکات. ئەوەندەش بەسە کەیەسوعی و رۆحە شەڕانگێزەکان دوور بخەینەوە تا کۆمەڵگایەکی یەکسان و عاقڵ لەدایك بێت. نا، مەسەلەکە زۆر لەمە ئاڵۆزترە. پێویستیشە بپرسین: بۆچی دەبێ مرۆڤەکان بەکۆمەڵ بژین، ئەوەش نەك بەهۆی بیرۆکەیەکی روون و تایبەتمەندەوە، بەڵکو لەپێناوی قوربانی دان بەکەمترین بەشی عەقڵانی لەناو سروشتی خۆیاندا بەو مانایەش سیاسەت بەلۆجیکەوە گرێ نادرێت، هێندەی ئەوەی لەرووی پراکتیکەوە پەیوەستە بە هەڵچوونەوە. هێزی هەر بیروباوەڕێکیش بەپلەی یەکەم لەوەوە دێت کەچەندە شاعیریەت و حەماسیەتی تیایە.

ن..أ: کاتێ بایەخدان لەسەر درۆکاریگەرەکان چڕ دەکرێتەوە، ئەوەك راستی، ئەمەیە کە بەرەو ناوجەرگەی درێویمان دەبات.

دۆبریە: دەلیلەکانی درێۆیی لەگەڵ هەموو چالاکیەك و پرۆژەیەکی مەعریفەدا هەن. من لەکتێبەکەمدا جگە لەتەنها پرەنسیپێك پشتم بەهیچیتر نەبەستوە کە ئەویش ئەوەیە: باواز لەبیرۆکەی خێروشەڕ بهێنین، تا تێبگەین لەوەی کە بە راستی لەناو گروپدا چی روودەدات، کاتی کە دەسەڵات کاریگەری دەبێ. کاتێ ئەمەوێ باسی دەسەڵات بکەم، لەنرخاندنی ئەو دەسەڵاتە دووردەکەومەوەو، هەوڵ دەدەم بەرامبەر سروشتی دەسەڵات وارەفتاریکەم کەپزیشکێك بەرامبەر برینێك دەیکات. بەڵام گەر ئەوەم قبوڵکرد کە خەڵکی گشتی دەیڵێن ـ سیاسەت مرۆڤ شێت و درندەو پڕ مەترسی دەکات ـ یەکسەر دەڵێم: هیچ شتێك بەبێ هۆ روونادات. کەواتە هۆی ئەو نەزانیە بێ کۆتاییە چییە؟ تەنها ئەوەندە دەڵێم کە ئەم سەردەمەی ئێستامان لەهەموو سەردەمەکانی تر درندەترە، بەڵام وەکو ورێنەش هیچی لەوانی تر کەمترنیە: سان ـ برتلومیو، کولاك و جەنگە ئاینیەکان کۆتاییان نایەت. بەڵام گەر درندەیی نەریتەکانمان کۆن بێت، باتەنها ئەم پرسیارە رەخنەییە بکەین کەشایەنی کردنە: بۆچی دەبێ خەڵکی سەرلەخۆیان بشێوێنن؟ لەگەڵ ئەوەشدا کەهەموو ئەمە لەمێژوویەکی پڕ لەژاوەژاوو خرۆشان دەچێت، ئەزەلیەتی ئەم خرۆشان و ژاوەژاوە لەکوێوە هاتووە؟

ن..أ: بەبڕوای تۆ ئایا ناکرێت چاوەڕێی ئەگەری دروستبوونی کۆمەڵگەیەکی لەسەرخۆو عاقڵ بکەین؟ تەنانەت ئەگەری دروستبوونی سەردەمێکی ئاڵتونیی بەشێوەیەك لەشێوەکان؟

دۆبریە: گروپ مانای بەدبەختی (تعاسە). ئەوەشی کە کۆگەلی‌یە بریتیە لەتوندوتیژی. هەرگیزیش لەم گێژاوە دەرناچین. بەمانایەکی‌تر، هەموو ئەو پرۆژانەی هەوڵی رێکخستنێکی زاتی کۆمەڵگە دەدەن. وەك رەتکردنەوەی سەنتەرەکانی دەسەڵات - یان هەوڵی بەڕێوەبەرایەتیەکی زاتی دەدەن، لەمیتافیزیکیای ئەو چەمکانە دەچن کە لەمێژوودا تەنها وەك چەمك هەن. ئەوانە زیاتر لەنوشتەی ئەفسوناوی دەچن، کە بەرگی رەخنەگرتنیان پۆشیوە لەو پاشەڕۆژە رووناکەی (مارکس) پێی وابوو دێتەدی. بەڵام ئەمیش پەیمانی پاشەڕۆژێکی رووناکمان پێ‌دەدات، وەکو دنیا نمونەییەکەی (کاستوریادیس). ئەم سروودانە جگە لەنوشتە زیاترنین‌و نەمبیستووە لەواقیعدا بەدی‌بێن. لەوەشەوە ئەوە دروست ئەبێ کە مرۆڤ ناتوانێ لەناو کۆمەڵگەدا بیر لەبێ دەسەڵاتیی خۆی بکاتەوە. پاشان رەوشت وەك گوتارێك ئەبێتە مایەی دڵ تێکەڵاتنم.

ن..أ: ئایا باشترنیە مرۆڤ وا هەست بکات کەپێویستە ستایشی خێرو نەفرەتی شەڕبکرێت؟

دۆبریە: ئەمەڕێ لەوەناگرێ کە رەوشت بەکردار دەست پێدەکاو کۆتایی دێت، نەوەك بەقسە.

{کاتێ ریجیس دۆبریە سوپای تارماییەکانی بانگ دەکات، بەلەزەتێکەوە خۆی دەداتە دەست مەیلەکۆنەکەی: بەووشەیەك یان پێکەنینێکی گاڵتەجاڕانە هەموو رووداوە مێژووییەکانی‌تر پشتگوێ دەخات، جگە لەو رووداوانەی مارەییەکەیان خوێن‌و قارەمانێتی‌یە. تەنها لەو ساتانەشدا مرۆڤ هەست بەبچووکی‌و لاوازیی خۆی دەکات لەبەردەم مەزنی شەهیدبوونی بەرجەستەکراودا. ئەی چی بکەین؟ ئەوانەی وەکو دۆبریە بەدبەختیی هەموو جیهانیان خستۆتە سەرشانی خۆیان، هەرگیز حەقیقەتی بەدبەختیەکەیان دەرناخەن. وا دەردەکەوێت کە پێمان بڵێن.. دۆبریە پێمان بڵێت: بەبێ خاچ رزگاربوون نیەو، بێ کوشتار فیداکاری نیە. زۆر پرسیارم لەخۆم ئەکرد دەربارەی راستیی کەم وێنەیی دۆبریە: بۆمدەرکەوت کە ئەو بێ‌وێنەییە دەگەڕێتەوە بۆ مەیلە مەسیحیەکەی ئەو بۆ (ئەشکەنجەو قوربانی دان)}.

دۆبریە: ئەوە قوربانی دانە کەشتێك پیرۆزدەکات. بۆئەوەی لەسیاسەتیش تێ‌بگەین، ئەتوانین بێ‌سڵەمینەوە ببینە لاهوتی. لەم بارەیەشەوە بیرۆکەی سەرەکی لە (رەخنەگرتن لەعەقڵی سیاسی)دا ئەوەیە کە لەناویەك مێژوودا، دوو مێژوو هەیە، ئەوەی کەتا ئەمڕۆ توانیومانە بەشێوەیەکی دروست، بیکەین، لێکدانەوەی پەیوەندی مرۆڤە بەسروشتەوە. بەڵام مێژووەکەی تر، واتە مێژووی پەیوەندی مرۆڤ بەمرۆڤەوە، وەك گرێ کوێرەیەك ماوەتەوە. مێژووی یەکەم پەرەسەندووە، بەڵام مێژووی دووەم لەشوێنی خۆیدایەو بەهیچ شێوەیەك ناجوڵێت. ئەوەش مانای ئەوەیە کەمێژووی کۆیلەکردنی مرۆڤ لەلایەن براکەیەوە، زەمەنێکە لەبازنەیەکی داخراودا دەسوڕێتەوە. بەم مانایەش بەدبەختیی گروپ شتێکی نەگۆڕە وەك زۆر نەگۆڕی‌تر، سیاسەتیش ئەبێتە زانستی بەڕێوەبەرایەتی‌کردنی. لەم بوارەشدا چەمکی (پێشکەوتن) ئەبێتە چەمکێکی خەیاڵی: کەسێك نیە لەسیاسیەکانی ئەمڕۆی ئێمە بتوانێ بڵێ لەدیموسێنی (سەدەی چوارەمی پ.ز)، یان لەسیاسیە ئاشوریەکان لێهاتووتر یابەتواناترم، کە سێ‌هەزار ساڵ بەر لەمڕۆ ژیاون؟. زەمەنی سیاسەت پەیوەستە بەئێستایەکی ئەبەدیەوە.

ن..أ: کە باسی (ئێستای ئەبەدی) بکەین، وەك ئەوە وایە باسی (سروشتی مرۆڤایەتی) بکەین. بەڵام ئەمڕۆ بەدەگمەن کەسێك هەیە بگەڕێتەوە بۆ ئەو چەمکانە.

دۆبریە: هەرگیز. ئەمڕۆ مۆدەی گەڕانەوە بۆ سروشت هەیە. پێویست ناکات لە تێکەوتنێك رابکەین، تاجارێکی‌تر تێ‌بکەوین. تەنها لەمێژووەوەو هیچی‌تر بۆ تەنها سروشت‌و هیچی‌تر. بەم پێیەو پاش ئەوەی لوکریس‌و سبینوزاو رواقیەکانم خوێندوە، پێم وایە کە(سیستەمی شتەکان) بوونی هەیە.

ن..أ: ئەوەی باست کرد شتێکی چاوەڕوان نەکراوە.. ئێمە تا ئەم کتێبەی دوایش واماندەزانی هەر مارکسییت.

دۆبریە: ئەمە مانای چی؟ من ئەو کاتەی فەیلەسوفم مارکسی نیم. کە بایەخ بەوێنەکێشان یان مردن ئەدەم، ئەوا مارکسیزم ناتوانێت لەوبارەیەوە، هیچ سوودێکم پێ‌بگەیەنێت. بەڵام لەبەرامبەر ئەوەشدا، گەر پێویست بکات پرۆسەی زێدەبایی (فائض القیمة) لەفەرەنسا، لەساڵەکانی ١٨٨٠دا شی‌بکەمەوە، یان ململانێ لەسەر دەسەڵات لەئەرژەنتین شی‌بکەمەوە، بەدڵنیاییەوە من ئەوکاتە مارکسیانە کاردەکەم. کەواتە ئێمە ئیقلیدین کاتی وێنەی سێگۆشەیەك دەکێشین، وە هەموومان مارکسین کە بەشیکردنەوەیەکی سیاسی ناوخۆیی هەڵدەستین. بەڵام دەربارەی تێڕوانین لەجیهان، لەئاکامی ئەو شیکردنەوە ناوخۆییەوە، من لەلاینگرەکانی نیم..

{ئەم قسانەی دۆبریە هەموو ئەوکەسانە سەرسام دەکات، کە تائێستاش دروشمە لینینی - کاسترۆییەکانی دۆبریەیان لەبیرماوە. ئەو زەمانە رۆی کەلای دۆبریە رەوانبێژیە ئەکادیمیەکەی (جامعي) و شێوەکانی (شۆڕش لەشۆڕشدا) و ریتمی گرم‌و هوڕی هێرشەکان تێکەڵاوی یەکتری دەبوون. کاتی رۆنەچینە ناوکتێبەکەیەوە (رەخنەگرتن لەعەقڵی سیاسی)، کە لەزنجیرەی (مکتبە الافکار) لەگالیمار دەرچوو ـ وە هەر



بەهۆی ئەوەشەوە دۆبریە چووە ریزی میرلوپونتی‌و کویری‌و فۆکۆو سارتەرەوە ـ ئەبینین کە شێوازی تێکۆشانەکەی زیاتر پتەوبووە. وەجگە لەئاوازێکی گەنجانەی مارکس‌و گاڵتەجاڕییەکەی، هیچ شتێك لەمارکسیزمی تیانەماوە. لەئێستابەدواوە دۆبریە وای لێ‌هاتووە.. کەهێندەی ناوی (قەدیس پۆلس) دەهێنێ، هێندە باسی (لینین) ناکات. وەزیاتر بایەخ بەماوەی یەکەمی باوکەکانی کەنیسەو مێژووی هونەر دەدات، وەك لەو دەرامەتانەی لەزەوی‌و زار دەست دەکەون‌و دێنە گیرفانەوە. کۆبوونەوەکانی نیقیا چوونەتە جێی کۆنفرانسەکانی گوتاوپال. چیتر دۆبریە بڕیاری داوە دژی هەڵوستێتەکانی پێشووی خۆی بیربکاتەوە.}

دۆبریە: بەڵێ. ماوەیەکی دوورودرێژ خەریکی نووسینی ئەو کتێبە بووم ـ هەر لەوماوەیەشدا کتێبی ترم بلاوەکردەوە. ئومێدیشم وایە کە ئەوە کارێکی فیکری بێت ئەوەک کتێبی بیروڕاکانم. گەردەلوولێك نەبێت لەناو فنجانێکدا، بەڵکو لەدایکبوونێکی ئازاربەخش بێت لەسەرتاپێی کۆن. هەڵوێستێکی ئەخلاقی لێکدژ پاڵی پێوەنام بلاوکردنەوەی ئەو کتێبە دوابخەم، بەتایبەتی کاتێ لەو ساڵانەی دواییدا هاوار لەدژی مارکسیزم بەرزبۆوە.

ن.أ: ئایا ئەمە مانای ئەوەیە کە ریجیس دۆبریە رێگەی بەخۆی ئەدا واز لەمارکسیزم بهێنێ، وەك چۆن هەموو ئەوانەیتر لەهەمان کاتدا وایانکرد؟

دۆبریە: نەمئەویست لەگەڵ گورگەکاندا بلورێنم. بەتایبەتی چونکە لورەلورەکەیان پەیوەست بوو بەستراتیژیەتێکی سیاسیەوە، نەوەك ئیرادەی زانین. لەوکاتەدا کە ئەو هەمووە هەڵگەڕانەوەو لایاندا، ئەمتوانی چیبکەم جگە لەوەی بێدەنگ بم و چاوەڕوان بم؟

یاجیدی بێ: مارکسیزم خۆی سەپاندبوو بەسەر ناوەندی رۆشنبیراندا تا ساڵی ۱۹۷۰. لەپاشان ئەمە هەڵگەڕایەوە. وای لێهات کە شەرعیەتی بیروڕاو ئاراستەکان بەپێی رادەی دووریان لەمارکسیزمەوە دەپێورا. خۆ تورڕدانە ناو ئەو شەپۆلەوە ئاسان بوو. پاشان من نەمئەویست ببمە (فەیلەسوفێکی تازە)، تەنها ئەوەندە زۆر ئازارم بەو کلێشانەوە چەشت کە لەو کاتەدا بەدوای خۆمدا رامدەکێشان.

وەك چۆن لەهەڵوێستی بەرگریکردن لەجیهانی سێهەمدا ئازارم چەشت، کاتێ لایەنگریم کرد. پێویست بوو بەردەوام نارەزایی دەربڕم، وە بەردەوام پەلەبکەم ـ ئەوە ئەو یاسایە بوو، کە ئەو نێوەندەی منی تیابووم بەسەرما سەپاندبووی ـ ئالێرەوە زیندان بوو بەباشیەکی گەورە بۆمن.

ن.أ: بەتایبەتی لەم رووەوە، ئایا تۆ لەزینداندا زیاتر ئازادبوویت، یان پاش ئەوەی لێی هاتیتەدەرێ؟

دۆبریە: بەراستی زیندان دوا شوێنە کە دواجار ئەکرێت تیایدا بە بێدەنگی بیربکەیتەوە. لەزینداندا کاتی ئەوامان هەیە بۆ کاویژکردن ـ مانگاکانی نیتشە بێتە وەیادت ـ کاتیشمان هەیە بۆئەوەی دووهەعیدەمان هەبێ. بەهەرحاڵ، بەنرخترە لە بە ئازادی مژینی شیلەی ناو گوڵی بیروڕاکان. سەرباری ئەوەش دەڵێم لەزینداندا ئەتوانین خۆمان بەپێی خۆمان دەست نیشان بکەین، نەوەك بەپێی ئەوانیتر. کە زیندانی بێت ناچێت بۆ شانۆ ـ جگە لە وەڕسی و تورەییش هیچیتر نیە. رۆژێك لەرۆژان (مەدحێك لەزیندان) دا ئەنووسم، بەڵام ئەتوانم بەدڵنیاییەوە بڵێم کە یەکێك لەهۆکانی پوکانەوەی چەپ لەفەرەنسا، ئەوەیە کە بۆ چل ساڵ دەچێت چەپەکانی فەرەنسا نەچوونەتە زیندانەوە.

باشە تۆ تێبینی ئەوەت کردووە، ئەوەی کە بیری لەسۆشیالیزم کردۆتەوە لەقاوشەوە هاتووە: لە(بلانکێ) وە بۆ (گرامشی)، (روزالوکسمبورگ) و (کاوتسکی)، ئەوەش بەبێ ئەوەی ئەوەمان لەبیربچێ کە (کورون)و(مودلرسکی) دواهەمینی ئەو کەسانەن کە سوودیان لەپاشی زیندان وەرگرت، لەو رووەوە کە پیاو لەگەڵ خۆیدا بەوردی و زۆری بیربکاتەوە بیربکاتەوە. زۆرن ئەوانەی گەر وازت لێهێنان بەشەقامەکاندا دەسوڕێنەوە، لەرۆژێکدا پێنج چاوپێکەوتن دەکەن، لەکۆبوونەوەیەکەوە دەچن بۆ کۆبوونەوەیەکیتر، تۆ بەخراپیان دەزانی. شێوەی چالاکی سیاسی، لەکۆمەڵگە لیبراڵیە تازەکاندا ئەتوانێ زۆر گەمژە بەرهەم بهێنێ.

کەواتە من زۆر پابەندم بەو گەنجینەیەوە کە لەزیندان کۆمکردۆتەوە. ئومێدەواریشم کەرۆژێك لەرۆژان فرسەت هەبێت بۆئەوەی سەرلەنوێ ئەو گەنجینەیە کۆبکەمەوە.

ن...أ: مەبەستت لەوەیە کە لەزیندانی (کامیری)دا گرنگیی مێژووی ئایینەکانت بۆ دەرکەوت؟

دۆبریە: لەڕووی زەمەنییەوە، ئارەزووی من لەمێژووی ئایینەکان دەگەڕێتەوە بۆ سەرقاڵ بوونم بەوێنەکێشانەوە. هەموو شتێکم دەربارەی فەرمایشتی ئایینی بیرچۆتەوە، بەڵام هەموو ئەو مۆزەخانانەم لەبیرە کە منداڵ بووم و سەردانم کردوون. بتەوێ و نەتەوێ وێنەکێشان مەسیحیەتە، مەگەر دەهلیزەکان بەزەخرەفەو وێنە نەکێشرابوون؟ سیمابۆ، جیۆتۆ، بەتایبەتی تنتوریە. هەر ئەمەشە سەرسامیی، چونکە مەسیحیەکان لەوکاتەدا لەدژی بت پەرستەکان و ئەو کەسانە تێدەکۆشان، کەوێنەکانی ئیمپراتۆریان دەپەرست. سەرباری ئەوەش دەڵێم، ئێمەی مەسیحیەکان پشتاوپشت قەرزاریی شتێکی ناوازەی مێژووین، کە ئەویش ئەو بیرۆکەی بەرجەستە (تجسد) بوونەیە، کە بەڕای من هەرچی تازەگەری و هێزمانە لەو بیرۆکەیەوە هاتووە.

ن..أ: بەچ ڕێگەیەك

دۆبریە: مەسیحیەت نەك هەر ڕێمان ئەدات، بەڵکو پێویستیش دەکات لەسەرمان کە لە پشت جەستەوە بەدوای وشەدا بگەڕێین. ئەوەش خۆی لەخۆیدا تازەگەریەکی سەرەکیە. دەربارەی ئەم بابەتە (ئەلسکەندەر کویین) بیرۆکەیەکی گرنگی هەیە کە ئەڵێت: نهێنی بەرجەستەبوون بواری لەبەردەم ئەگەری لێکۆڵینەوە زانستیەکاندا کردۆتەوە. بەو مانایەی کە ئەوە کەشفی لۆجیکێکی دیاریکراوە بۆ دیاردەکان و، کەشفکردنی هۆیەك لەڕووی ئایینیەوە، بۆ کەوتنەخوارەوەی تەنە ڕەقەکان لەوکاتەدا، کە بەهۆی ئەم بیرۆکەیەوە نەئەتوانرا بڵێین تێکشکاندنی پیرۆزیەکانە.

وە هەروەها ئەڵێم ئیرادەی ئێمە لەپێکەوە بەندبوونی سیاسیدا - واتە هەڵسوکەوتی ڕۆژانەمان شان بداتە سەر چەمکێك بۆ جیهان، وە مانایەك بدەینە کۆمەڵگەی سیاسی مرۆگەلی - بەرئەنجامی نهێنی بیرۆکەی بەرجەستەبوونە.

مەسیحیەتی سەرەتایی، دەربارەی ناسینی تیۆرەکان وەسیلەیەکی جوانی بۆ جێهێشتوین. سەرباری ئەوەش مورشیدی زیندانەکە واتە (زیندانی کامیری) ژیاننامەی گریگواری حەوتەمی پێشکەشکردم بیخوێنمەوە، کە ئەوەش وای لێکردم لەسەردەم تێبگەم. بەڵێ، لەکامیری بیرم لە(کانوسا) دەکردەوە.

ن..أ: لەمەدا کەتۆ دەڵێیت، هەندێك (زیادەڕەوی تیایە) ، کە هیچ پەیوەندییەك نیە لەنێوان ژیانی پێشووی خۆت و ئەمانەی ئێستا باست کردن؟

دۆبریە: نەخێر، من لەشیوعیەت (واتە ئایدیوکراتیەت) تێنەگەیشتم، تا لەوە تێ نەگەیشتم کەچی ڕویداوە لەکانوسا. ئەگەر نەمانتوانی ئەوە شیبکەینەوە، کە لە تێکەڵەی تیوکراتی نێوان دەسەڵاتی زەمەنی و دەسەڵاتی ڕۆحیدا چی بەرهەم دێت، مەحاڵە خۆمان بناسین لەم جوگرافیا هاوچەرخەدا. مەحاڵە تێبگەین لەوەی کە چۆن و بۆچی باوەڕبوون بەوەی ڕاستی ڕەها لای خۆمانە، ئەمانگەیەنێتە ئەوەی دەست بدەینە ئاگرو ئاسن لەیەکتر بەهەر چوار لای جیهاندا.

ن.أ: کەواتە بە باوەڕی تۆ هەریەك مێژوو، پاپایەتی قەیسەری بیزەنتی و، ئۆتوکراتیزمی

قەیسەری رووسیو، ئایدیوکراتیزمی شیوعی پێکەوە کۆدەکاتەوە...

دۆبریە: بەڵکو یەك هێل، کە ئەگەڕێتەوە بۆ (قوستەنتین)، کاتێ بۆ یەکەمجار بانگەشەی بۆ باوەڕی بەرجەستەبوون کرد. لەئەنجامدا، مەسیحیەت لەسەر ئەو باوەڕە رای‌هێناوین کە خودا جگە لەیەك کوڕ کەسی تری نیە. بەم مانایەش، من پێم وایە کە خۆرئاوا زیاتر لەخۆرهەڵات پەلەی کردە لەوەی خۆی لەدەست توتالیتاریزم - وەشێوە دڕندەکانی - رزگارکرد. حەزم ئەکرد مەسیحیەکان بەگشتی - وە کاثولیك بەتایبەتی - یادەوەریەکی نەختێك بەهێزتریان هەبووایە. دەبا پێش ئەوەی نمونەمان دەربارەی لێبوردن بۆ بهێننەوە، لەبەر دەرگا بەکەنیسەکراوەکانی ماڵی خۆیانەوە دەست پێبکەن: بیر لەگریگواری حەوتەم بکەنەوە.

ن.أ: مێژوو نووسەکان، ئەوانەی بەدوورودرێژی مامەڵە لەگەڵ رووداوەکاندا دەکەنو لێ‌دەکۆڵنەوە، قەد رێگە بەوە نادەن کە تۆ ئەیڵێیت گۆڕان هەر ئەوەندە بووە، لەپاپایەکی سەدەی ناوەڕاستەوە پەرەی سەندووە بۆ سکرتێری حیزب. ئەم جۆرە پەرەسەندنە زۆر خێرایە.. یان هەر شتێکی دروستکراوە، کە لە واقیعدا واش نەبووە.

دۆبریە: ئەم قسانە درۆن. کاتێ زانایەکی بایۆلۆژی توێکاریی پێکهاتەی خانەی ئاژەڵێك دەکات، هەرگیز جیهان لەئاژەڵەکە دوورناخاتەوە، لۆجیکی سەرەکی بوونەوەری زیندوو ناڵێت فیلو مرۆڤو بولبول تێکەڵاوبکە. کەواتە مێژوویەك هەیە بۆ ئایینەکان، بەڵام کاری ئایینی مێژوی نیە: ئەمەیە کە مێژووی ئایینەکان پێمانی دەڵێت.

ن.أ: ئایا لەئەفسانە گەورە بابلیەکانەوە تا ئێستا، هیچ شتێك لەبیروبۆچوون یان نەریتەکانماندا نەگۆڕاوە؟

دۆبریە: بۆچی پەیکەرەکانی فیدیاس کارمان تێ‌دەکەن، بۆچی تا ئەمڕۆش شکسپیر لەگەڵماندا ئەدوێت؟ شێوەی بەرهەمهێنانی کۆیلایەتی تەواو هاتۆتە ناو ژیانمەوە، وەك گۆڕان لەنێودالیزمەوە بۆ سەرمایەداری. بەوەش هێشتا ئەو کارانە بەلای ئێمەوە هەر هاوچەرخن. پێویستە (چینێکی پڕ لەهەڵچوون) لەمرۆڤدا بمێنێتەوە، سەربارى ئاڵوگۆڕیەکانی مێژووەکەشی - ئەی کەواتە هەندێجار لەکوێوە چۆڵیی یان بەستن لە زەمەندا روودەدات؟

ن.أ: ئایا نزیکیی نێوان دیاردەی ئایینیو دیاردەی ئیستاتیکی پاڵی پێوەناویت بۆ ئەوەی بیر لەو شتانە بکەیتەوە، کە لەمێژووی مرۆڤدا (نا زەمانی) ن؟

دۆبریە: بەهەرحاڵ، لەکتێبەکەمدا لەو خاڵەوە دەستم پێ‌کردووە، بۆئەوەی لەچەند شتێك تێ‌بگەم: - گروپ، دەسەڵات، دەمارگیی..

ن.أ: با بگەڕێینەوە بۆئەوەی پێشتر، لەمەسیحیەتدا نهێنی بەرجەستەبوون هەیە، کەواتە نێوەندی گەیەنەر (وسیگ). وەك چۆن لەبواری ئاییندا دەردەکەوێت، لەبواری سیاسیشدا هەیە.

دۆبریە: گروپ ناتوانێ لەوێنەی نێوەندی گەیەنەر دەربازبێ، چونکە بەشوناسو بەردەوامی خۆی قەرزارباریەتی. هەموو شتێك ئالێرەدا پەنهانە، منیش بۆئەوەی ئەوە بسەلمێنم، جەختم کردۆتە سەر ئەم لایەنە.

ن.أ: ئایا ئەوەیە گەوهەری کارەکەی تۆ؟

دۆبریە: تەواوخۆیەتی. شتێك هەیە کە ناتوانێت خۆمانی لێ‌لابدەین، ئەویش ئەوەیە کە گروپ ناتوانێ دەرکی شوناسی خۆی بکات، ئەگەر یەکێك نەبێت نوێنەرایەتی بکاتو

لەبەرامبەر گروپێکی تردا، نیعمەتی هەستکردن بەخۆیی پێنەبەخشن - کە بەم مانایەش ئەو نێوەندە گەیەنەرە بەزەرورەت ئەبێتە (کاریزمی) - هەر ئەو نێوەندە گەیەنەرەشی لەناو گروپدا زامنی هاو ئاهەنگی دەکات، لای من ئەگەرچی لەگەڵ گۆڕانی بونیادی دەسەڵاتیشدا ناگۆڕێت.

ن.أ: کەواتە وێنەی نێوەندی گەیەنەر هەر لەکۆنەوە وەکو ئەگەرێکی ئەخته بەستووی زەمەنی سیاسی هاتووە، یان بابڵێین وەکو سەرهەڵبەندانی زەمەنێکی کۆن هەرماوەتەوەو، سەردەم بەسەردەم ئەگەڕێت. وەکو چۆن لە (ئەگۆرا) هەبووە، ئاواش لە (گۆڕەپانی سوور)دا بەردەوام بووە. کە ئەویش خۆی لەشێوەی پەرستنی تاکە کەسێکدا دەبینێتەوە، کە دەربازبوون لێی مەحاڵە، لەهەموو سەردەمێکدا.

نۆبریە: پێویستە شتەکان زل نەکەین: هەموو ماوەیەکی مێژوویی بەپێی پێویستی خۆی پەرستنی جۆراجۆر پێکدەهێنێ، تەواو وەک ئەو کەسەی لە منداڵیەوە تا گەورە دەبێت و ئەبێتە کەسێکی ئاسایی، ئەوەی بەسەریدا سەپاوە تەحەکوم بەئەفرەتی ئۆبێیەوە بکات. گەر لەسەرەتاوە بزانین شتێک هەیە لەناوەوەماندا کوشتنی باوانو بوون بەهاوسەری دایک دەخوازێت، باشترە لەوەی کە لەرێگادا کەشفی بکەین. هەر بەو شێوەیەش، ناسینی نائاگایی سیاسی لەو ئەفرەتەمان رزگار ناکات، کە تێیدا پەنهانە، بەڵکو رێگەمان دەدات تەحەکومی پێوەبکەین. وەک چۆن زانینی یاسای کێشکردنی زەوی نابێتە هۆی رێگرتن لە کەوتنە خوارەوەی سێوێک. بەڵام لانی کەم ئەوە تێدەگەین کە لەپەنجەرەیەکی بەرزەوە خۆمان فڕێدایە خوارەوە، چی چاوەڕێمان دەکات.

ن.أ: بەڵام بە چ مەنتیقێک ئەتوانیت بڕیار لەوە بدەیت کە ئەم شتەیان جێگیرەو ئەو شتەیان ناجێگیرە؟

نۆبریە: بەناوی ئەوەوەی لەمێژووەوە فێری‌بووم. بەپێی لەمێژوودا دیارە کە هەر کۆمەڵگەیەک باوەڕێکی پتەوی نەبێت، دەمرێت. کاری ئایینی، پاشان کاری سیاسی نەخۆشیی گروپە، بەڵام چاکبونەوە لەو نەخۆشیە، مردنی گروپە.

ن.أ: ئەی بۆچی پێویستە لە گروپدا ئیمان بەشتێک هەبێت؟ نەختێک پێش ئێستا ئەو پرسیارەم کرد، وەڵامت نەدامەوە..

نۆبریە: ئەرکی ئەم ئیمانە کارێکی ئەخلاقی نیە، بەڵکو پێویستیەکی لۆجیکیە. لەوەشەوە سەری هەڵداوە کەناوی دەنێم: کامڵ نەبوونی گروپ.

ن.أ: ئەمە پێویستی بەنەختێک روونکردنەوە هەیە..

نۆبریە: لەبارەی چەمکی (کامڵ نەبوون) ەوە ناتوانم‌هیچ شتێک بکەم جگە لەوەی تیۆرەکەی گۆدل (Godel) لەبواری لۆجیکیدا بێنمو بیسەپێنم بەسەر بواری سیاسیدا. ئەم تیۆرەیە پێی وایە کە (هیچ سیستەمێک ناتوانێت راستی خۆی بینا بکات، بەبێ ئەوەی پەنابباتە بەر رەگەزێکی‌تر کەلەدەرەوەی خۆی بێت). بەمانایەکی تر، هیچ سیستەمێک ناتوانێ خۆی خۆی بسەلمێنێت. ئەمە ئەو رۆشناییەیە کە دەمەوێ بیخەمە سەر سیستەمی کۆمەڵایەتی: مادامەکی ئەو سیستەمە سروشتێکی هەیە، دەبێ بپرسین ئەو رەگەزە دەرەکیە چییە، کەرێگە بەبیناکردنی حەقیقەتی ئەو سیستەمە ئەدات؟! وێنەی (نێوەندی گەیەنەر) یان سەرداری کاریزمی لێرەوە دێت.

ن.أ: ئایا ئەمە وا دەگەیەنێت کەبوونی نا عەقڵانیەت لەناو گروپدا، کارێکی عەقڵانیە؟

دۆبریه: ئەوە راڤەکردنێکی سروشتیه بۆ ئەو شتانەی لەسەرو سروشتەوەن لەناو کۆمەڵدا. بەڵام بۆ مرۆڤێکی مادی وەکو من، ئەوە ئەنجامێکە ناکرێت پشتگوێ بخرێت. ئەوە مەسەلەیەکە رێگە خۆش دەکات بۆ رەتکردنەوەی پاشەکشێکردن لەبەردەم نادیاردا، وەرەتکردنەوەی گەوجێتی (هۆمی)یە (Monsieur Homais) یەکێك لەکەسایەتیەکانی بەلزاك لەرۆمانی (مدام بۆڤاری)دا کەپێی وایە، ئایین جگە لەمناڵێی گەوجانەی مرۆڤ هیچیدی نیە. ئەکرێت یەسوعیەکان‌و تەنانەت خواش رەت بکەینەوە، بەڵام دیسانەوە لەپەنجەرەوە دێنەوە ژورێ: بۆ نمونەش ئەمە پێی دەوترێ (سۆشیالیزمی راستەقینە).

ن.أ: کەواتە کاری (نێوەندی گەیەنەر) زامن کردنی پەرژینێکە بۆ گروپ، کاتێ کەشتێك لەبالایی (تعالی) پێشکەش دەکات. بەڵام ئەوە چ بالاییەکە؟

دۆبریه: لێرەدا سیاسەت ئەتوانێت رۆڵی خۆی ببینێت، بەوەی کە ناوەرۆکێکی ئەزمونگەرانە بداتە ئەم وتەزا بالاییە: ئایەتوڵڵا، سکرتێری گشتی، سەرەك کۆمار، سەرداری سەربەخۆی فەرەنسا.. سیاسەت ئەتوانێت ئەمانە هەڵبژێرێت. بالایی ئەتوانێت لەبەرجەستەبوونی سۆڤیانەدا، لەئەفسانەی سۆشیالیزمدا، وەك چۆن دەتوانێ لەهەڵبژاردنی گشتیشدا دەربکەوێت. بەڵام ئەبێت (نێوەندی گەیەنەر) نمایشی شتێکیتر بکات جگە لەخۆی: پرۆلیتاریا، مافی مرۆڤ، خوا.. تا دوایی ئەوەش ئازادی سیاسیە کە بەهەڵبژاردنی یەکێك لەو ناونیشانانە هەڵدەستێ. بۆ نمونە من ناونیشانی میترانم پێباشترە لەبریجنیف یا ریگان.

ن.أ: لەمەوە ئەوە بەرهەم دێت کەهەر پیاوێکی سیاسی لەپێشکەشکردنی بەها بالاکاندا بەرژەوەندی هەیە.

دۆبریە: لەمەوە ئەوە بەرهەم دێت کە لەسیاسەتدا بەرژەوەندی لەمردندا هەیە. لەمردندا سیستەمەکە کونێکی تێدەبێت‌و بۆ دنیایەکی ترمان دەگێڕێتەوە، کە دنیای ئەودیو سروشتە (میتافیزیکیا)، کە لەوێدا بەرزبوونەوە بۆ بەها بالاکان هەیە. هەر ئەمەشە هۆی ئەوەی کە لەژیانی سیاسیدا مەراسیمی (بەخاك سپاردن) بارودۆخێکی شلۆق دەهێنێتە ئاراوە، هەموو ئەو خەڵکانەی لەبەخاك سپاردنی تەرمەکەدا بەشداری دەکەن، سەرەرای خەم‌و پەژارەیان، دڵخۆشن بەوەی وا هەست دەکەن کە بەهۆی مردووەکەوە گروپێك پێکدەهێنن. هەموو کۆمەڵگەیەك بەوە دەست پێدەکات کە کۆمەڵگەی هاورێکانی مردوویەکن. چونکە هەموو کۆمەڵگەیەك پێویستی بەوەیە باوەڕ بەبالاییەك بکات کە دروستی بکات‌و پەرژینی بکات.

ن.أ: ئەگەر راستی ئەم رایەمان قبولٚ کرد، ئایا پێویستە چ جۆرە بڕوایەك لەجیهاندا هەبێت بۆئەوەی کارەکان بەباشی بڕۆن بەڕێوە؟

دۆبریە: شتەکان بەباشی ناچن بەڕێوە، چونکە چیدی لەکۆمەڵگەکانماندا بڕوای کارا بەرهەم ناهێنین. لەئەنجامیشدا بڕوا تیرۆریستەکان نەشونما دەکەن - وەك حاڵەتی کۆتاییەکانی ئیمپراتۆریەتی رۆمانی - بێئەوەی بۆ هەمیشە پەیوەستیەك دروست بکەن.

ماوەیەکی دوورو درێژ بڕوام وابوو کە مارکسیزم ئەو وەهمە گەورەیەیە، کە ئەتوانین کۆمەڵگەی هاوچەرخی لەسەر بنیابکەین. بەڵام پێویستە ئەمڕۆ دان بەوەدا بنێم کە مارکسیزم لەزۆرشتدا ووردو دروست نەبوو. بۆ نمونە بەدڵنیایەوە ئەتوانم بڵێم مارکسیزم لەلایەنی لێکدانەوەیەوە بۆ ئایین زۆر هەژارە.

ن.أ: ئەوسا دەتگووت قەدیس‌و پێغەمبەرەکانی ئەم زەمەنە ناویان گیڤاراو،

روزالوکسمبورگو، تروتسکی یان پۆلیتزەرە (Politzer)..

دۆبریە: راستە شیوعیەت لەماوەیەکدا پیتێکی ئەفسانەیی گەورەی هەبوو. تا ئێستاش لای بەشێکی گەورەی جیهانی سێهەم ئەو بەپیتیەی هەیە. لەوبارەیەشەوە ئەفگانستانو پۆلۆنیا، لەو رووەوە کە پەیوەستە بەبابەتی پیرۆزییە کۆمەڵایەتیەکانەوە، سەردەمێکی تازەیان دەست پێکردووە. بەرامبەر ئەم مەسەلەیە، کۆمەڵگە دیموکراتیەکانمان گوزارشت لەلاوازییەکی سۆزداری مەترسیدار دەکەن. ئەو کورت بوونەوەیە لەقوربانیداندا رێخۆشکەرە بۆ دوودڵ بوون لەپاشەڕۆژی ئەو کۆمەڵگایانە. بەڵام کاتێ کوڕانی بلوم (Blum) ئەتوانن رووبەڕووی کوڕانی لینین بالکونیتو ریجیمیتو (Quinto Regimiento) ببنەوە ئەوەی تامردن بەرگری لە زانکۆی مەدریدکرد ـ ئەوکات دەتوانین هەڵبژاردنی جیهانی دروست بکەین؟

ن.أ: ئایا بەڕای تۆ ئەمە وادەگەیەنێت کە بەهای هەر بیرۆکەیەك پەیوەستە بەژمارەی ئەو کەسانەوە، کە لەپێناویا خۆیان بۆ مردن ئامادە دەکەن؟

دۆبریە: بۆ بەها لۆجیکیەکەی نا، بەڵام لەڕووی راکێشانو جدیەتە سیاسیەکەیەوە، بەڵێ. ئەوەش مانای ئەوەیە کە بیروڕاکان لەمێژووی پراکسیسکردندا کەمتر کێشیان هەیە لەوێنەو ئەفسانەکان. بەڵام ئەمە ئەوە ناگەیەنێت کە لەبواری ئەفسانەدا لۆجیك نییە. ناکرێت مرۆڤی چەپڕەو مەرگ بپەرستێت، ئەو مەرگەی سیمای جیهان دەگۆڕێت. چونکە هوتافی چەپڕەو بریتیە لە (بابژی ژیان) ـ بەڵام هەموو جۆرێکی ژیان نا.

میلان ئەسدرای (Milan Asdray) هاواری دەکرد: (بژی مەرگ). بەڵام تێکۆشەری ئیسپانی لاپاسیوناریا (La Pasionaria) پێچەوانەی ئەوەی دەگووت: (مردن بەپێوە، باشترە لەژیان بەسەرشۆڕی). کەواتە ئەوەی یارمەتی مرۆڤ یان کۆمەڵگەی ملکەچ ئەدات بۆئەوەی رۆژێك لەرۆژان هەستێتەوە سەرپێ، سیستەمێك نیە لەبیروڕای لۆجیکی، بەڵکو پێم وایە ورووژاندنی هەستی حەماسەت خوڵقێنیانە.

ن.أ: کەواتە ئەبێت لەگەڵ ئەوەدا تەبابیت کە دووان لەو سێ پاڵەوانە دامەزرێنەرەی بەفەرمایشتیان سەردەمی تازە کرایەوە، شەهیدن.

دۆبریە: پەرستنی باو باپیرە کۆنەکان فاکتەری پەیوەندییە لەژیاندا، ئەوەك پەرستنی قوربانیەکی خەمۆکاوی. بەر لەئێستا نووسیومە کە: یادەوەری شۆڕشگێڕانەیە ـ ئەوەش بێئەوەی بزانم ئەو دەستەواژەیە سەرکەوتو دەبێتو رۆژێك لەسەر شەقامەکان بەرجەستە دەبێت ئاهەنگەکانی پانچیون (Pancheon) لای ئێمە کە تۆش ئاماژەی پێدەدەیت، وای نیشان دەدات کەفەرەنسا بەوەی فرانسومیترانی کردۆتە سەرۆك، سەرلەنوێ هەستاوەتەوە، چونکە نایەوێت وەك نەتەوەیەك بمرێت. ئەم نیشتمانە، نیشتمانی منە، نیشتمانی تۆیە، نیشتمانی هەموومانە. ئەزانیت ئەوە مانای چی؟ مانای ئەتوانین بەسەربەرزیەوە یەك جار لەژیانماندا بڵێین ـ بڵێم: (فەرەنسا نیشتمانی منە...). ئەوەندە بەسە کە ئەو شانازیەمان بەدەست هێنابێتەوە، تا هەموو ئەو شتانەی پێکەوە دەیکەین، شتێکی مەزن بێت.

(پەراوێزەکان)

*ناونیشانی رۆمانێکی دۆبریەیە (اللامرغوب فیه).

** ناونیشانی کتێبێکی دۆبریەیە (مذکرات بورجوازی صغیر بین نارین وأربعة جدران).

سەرچاوە

گۆڤاری (الفکر العربي المعاصر)

مقابلة مع دوبریه، ترجمة: د.أدونیس عکرة

ژمارە: ١٦، تشرینی یەکەم/ تشرینی دووەمی ١٩٨١

# هونەر

■ رەنگدانەوەی هونەری بودیزم لەهونەری کریستیانیدا



# رەنگدانەوەی هونەری بودیزم لەهونەری کریستیانیدا

• ئا: دارا حەمە سەعی





بودا سالی ٥٦٣ پ.ز لەدایک بووە، هەموو ژیانی لەناو ئێشەکانیگەلدا بەسەر بردووە. بودی ئاینێکی زۆر بەربلاوەو پتر لە (٢) ملیار کەس لەسەر زەمین پەیڕەوی دەکەن، کارێکی زۆری کردۆتە سەر هونەری سەرتاپا جیهان، کە ئایینەکانی ڕۆژئاواشی گرتۆتەوە لە (جو- کریستیانی- موسلمان). لەوێنەکانی (أ،ب،ج،د) گەر سەرنج بدەی لەو وێنانەی مەسیح و مریەم و قەشەکان بەڕوونی ئاگاداری بودا لەسەریان ئاشکرایە، بەتایبەتی لەجوولەی دەستیاندا.



(١) شای خواکان، نیگاری سەر کوتاڵ، سەدەی ١٧–١٨ز
مۆزەخانەی نیشتمانیی هونەری خۆرهەڵاتیی لەرۆما. تێبینیەکان لەروونکردنەوەی بودیزمدا، چ بوداو بوداکانو چ بودیزاتڤاکان، لێکدەدەن، کە ئەوانیش دەبنەوە بەیەك بودا، هەریەکە لەو خوایەتییانە بەشێوەیەکی تایبەت نیشاندراون. بەدەستوورێکی یاسایی ورد کە هونەرمەند بەهیچ شێوەیەك ناتوانێ لێیان دەرچێ، تەنانەت لەهەڵبژاردنی رەنگەکانیشدا.



(٢) بودا (بەشێك)
سەدەی شەشەم. لەماتورای کەلکەتا. لەمۆزەخانەی هیندیی. لەسەرخۆیی دەموچاوەکانی بودادا، هێمنییو هاوگونجاویی هونەریی کلاسیکی هیندیی تیایاندا رەنگ دەداتەوە.



(٣) بودا مایتریا.
هونەری یابانی سەردەمی ئاسوکا ٥٢٢–٧١٠ز. نارا کوکوجی، پەیکەرێکی دارینە، بەڵگەیە بۆ بڵاوبوونەوەی بودیزم هەتا یابان.



(٤) بودیساتڤا.
هونەری چینیی
سەردەمی وی
٣٨٦-٥٤٩ز.
مۆزەخانەی لوڤ
لەپاریس. لەناو چیندا
کاریگەریی هونەری
هیندیی رەنگدەداتەوە.



(٥) بودا.
بەچوارمشقی
سەدەی
هەشتەم و
نۆیەم.
لەجاوا.



(٦) بودا. لەتێڕاماندا.
ساڵی ٥٠١ز سەردەمی
(شەش دیناستیا).
مۆزەخانەی هونەری
خۆرهەڵاتیی لەرۆما.
دەمو چاوی بودا
هێمنو ئارامە،
کەوتۆتە چەقی
چەپکێکی بەرزی
بادەمیین. گرێکی
کڵپەداری بەتیشك
لەژوور سەرێتی،
هێمای ژیریی بودا
نیشاندەدات،
کە جیهان
رۆشندەکاتەوە.





(٧) سیانەی بودا شاکیامونیی، لەگەڵ دوو بودیزاتڤا، ٦٢٣ز. کۆتایی سەدەی شەشەم لەکۆریاوە گەیشتۆتە یابان. بودیزم کاریگەرە لەبەرفراوانی هونەرێك، کە بەئاشکرا مۆرکی چینی بەسەرەوەیە. ئەم سیانییە برۆنزییانە لەسەرچاوە نەژادو کۆنەکانی هونەری چینین.



(٨) پەیکەری بودای گەورە. تۆدایچیی، نارا، دایبوستو، یان بودای گەورە. پەیکەرێکی برۆنزییە پێنج سەد تەن برۆنزی خواردووە. بۆ داڕشتنی. ١٧ مەتر بەرزە. لەڕێژە گەورەکانی دنیایە.



(٩) پەیکەری زەبەلاحی بودا ئەمیتابا. کاماکورا، فوتوکوین.
لەناوەڕاستی سەدەی سیانزە بەبرۆنز داڕێژراوە. لەچەقی پەرستگایەکدا بووە، شەپۆلی دەریا تەپاندوویەتیو ئەم پەیکەرە بەڕووتی ماوەتەوە.
بەرزیەکەی ١٣م. شێوە ریالیستەکەی لەهونەری کاماکورا دەچێت.







سەرچاوە: لە ئینسکلۆپیدیای تومینێللی ئیتاڵییەوە.

# کتێبی ژمارە

■ شانۆنامەی

(تاوانی کوشتنێک لەکڵێساکەدا)



تی ئێس ئیلیەت

شانۆنامەی

# تاوانی کوشتنێك لەکڵێسەکەدا

■ تۆماس ستێرنس ئێلیەت

● و: عەتا قەرەداخی

بەشی یەکەم

کارەکتەرەکان: کۆرسی ئافرەتانی کانتربێری، تۆماس بێکێتی سەرۆکی قەشەکان، سێ قەشەی کڵێسە، چوار فریودەرو پەیامبەرێك.

دیمەنی یەکەم لەهۆڵی سەرۆکی قەشەکان، رۆژی دووی کانوونی یەکەمی ساڵی ۱۱۷۰ روودەدات.

کۆرس: بالێرەدا نزیك کەنیسە رابووەستین، با چاوەڕوان بکەین

داخۆ مەترسی راپێچمان ئەکات؟ داخۆ هەست کردن بەدڵنیایی

بەرەو کڵێسە هەنگاومان پێ هەڵئەهێنێ؟

چی مەترسییەك چاوەڕێمان ئەکات.

ئێمەی هەژار، ئافرەتانی هەژاری کانتربێری؟

لەگەڵ چ بەدبەختی‌یەکدا ئەژین؟ ئێمە هیچ مەترسی‌یەکمان لەرێدانی‌یە

لەکڵێسەدا دڵنیایی بوونی نییە، هەندێ جار کە هەستی کارێ

قولاپی چاوەکانمان لەسەرنجێ دەئاڵێنێ، بەرەو کڵێسە هەنگاومان پێ‌هەڵئەهێنێ، ئێمەش ناچاری ئەوە ئەبین بۆ لەروودا وەستان، دان بەخۆدا بگرین.

لەوکاتەوە تشرینی رووناك بۆتە تشرینی دزێو

لەوکاتەوە سێوان ئەوەرن‌و بەسەریەکا کەڵەکەئەبن‌و زەوی



بەرگی قاوەیی مەرگی لە ئاوی بۆگەن و لیتە پۆشیووە،
ساڵی نوێ چاوەڕوانە، هەناسە ئەدات،
چاوەڕێیە، لەتاریکیدا چرپەئەکات،
کرێکار پێڵاوی قوڕاوی ئەتەکێنێ و دەستی بە ئاگر ئەدات
ساڵی نوێ چاوەڕێیە، چارەنووس لە هاتندایە
کێ دەستی بۆ ئاگر درێژکردووەو لەجەژنا یادی قەدیسانی کردۆتەوە.
یادی شەهیدان و ئەو قەدیسانەی کردۆتەوە چاوەڕێ ئەکەن؟
کێ دەستی بۆ ئاگر درێژ ئەکاو نکوڵی لە گەورەی خۆی ئەکا؟
کێ خۆی بە ئاگر ئەداو نکوڵی لە گەورەی خۆی ئەکا
حەوت ساڵان بەسەر کۆتایی هاویندا تێپەڕیووە
لەوکاتەوە سەرۆکی قەشەکان بەجێی هێشتووین حەوت ساڵە. ئەو سەرۆکێکی بۆ خەڵك دڵسۆز بوو، خۆ ئەگەر ئێستا بشکەڕێتەوە، حاڵ هیچ لەوە چاکتر نابێ
کە پاشاو بارۆنان فەرمان بڕانن.
ئێمە ئازاری هەمە چەشنمان چەشتووە
بەڵام لەگەڵ ئارەزووماندا بەجێ‌ئەهێڵرێین
ئەگەر هاتوو تەنهاش جێ‌هێڵراین.. ئاوا ئاسوودە ئەبین
هەوڵ ئەدەین کاروباری ماڵمان ڕێك بخەین
بازرگان بەترس و شەرمەوە هەوڵ ئەدات کەمێ سامان بەدەست بێنێ
کرێکاریش لەسەر پارچە زەویەکەی ئەو ئەچەمێتەوە ڕەنگی زەوی بەبەر ئەبڕێ
وەك ڕابردوویەکی تێ‌بینی نەکراو،
ئێستا پەشێویی وەرزە هێورەکان ئەمترسێنێ
زستان دێت و لەدەریاوە مردن دێنێ
بەهاری وێرانکەر لەدەرگامان ئەدات
ڕەگو گوللە چاوو گوێچکەمان ئەخۆن
هاوینی شووم شوێنی شەپۆلی هەڵچوومان گڕئەدات
هەژاران چاوەڕوانی تشرینێ بۆگەنی تر ئەکەن
بۆچی هاوین پرسەی
گڕەی پایزو تەم تومانی زستان دێنێ؟
لەقرچە قرچی هاوین دا چی بکەین
جگە لەوەی لەباخی وشك و بێ‌بەردا چاوەڕوانی تشرینێ تر بکەین؟
ئەخۆشی هێرشمان بۆ دێنێ، چاوەڕوانین، چاوەڕوانین.
شەهیدو قەدیسان چاوەڕوانی ئەوکەسانەن
شەهید ئەکرێن و ئەبنە قەدیس
چارەنووس لەلەپی دەستی یەزداندا چاوەڕێیە، وێنەی نادیار ئەکێشێ.
من ئەو شتانەم لەبەر تیشکی ڕۆژدا بینیووە.
چارە لەبەری دەستی خوادا چاوەڕوان دەکات، نەك لەدەستی ئەوکەسانەدا

ئەخشەو پێشبینی هێندێ چاکەو خراپە
دەکەن‌و
لەبەری دەستیاندا ئەو هیوایانەیان هەلگرتووە
کە کات دەیان گۆڕێت.
وەرە ئەی کانونی ئاسودە، کێ دەتبینێ؟ کێ
دەتپارێزێ؟
داخۆ جارێکی دی ئەوەی مەردووم بەرپسوایی
لەدایك دەبێ؟
ئێمەی هەژاران ناتوانین هیچ ئەنجام بدەین.
جگە لەچاودێری‌و لە چاوەڕوانی.
(قەشەکان ئەچنە دەرەوە)
قەشەی یەکەم: حەوت سالان بەسەر کۆتایی
هاویندا تێپەڕیووە حەوت ساڵە سەرۆکی قەشە
ئێمەی جێ‌هێشتووە.
قەشەی دووەم: دەبێ گەورەمان پاپاو
سەرۆك قەشەکان چیان لەتوانابێ؟
دەرهەق بە پاشای مەگروون‌و پاشای
فەرەنسا
کاتێ کە ئەوان فێڵیان رێکخستووە، یەکیان
گرتووە
پێکەوە کۆبوونەتەوە، کۆبوونەوەیان پەسەند
کردووە، کۆبوونەوەیان رەت کردۆتەوە.
کۆبوونەوەی ناکۆتاو دوایی نەهاتوو
لەهەرلایەکی ولاتی فەرەنسا؟
قەشەی سێیەم: لە حوکمرانی ئەم دنیایەدا
شتێ نابینم قایلم بکات جگە لە زەبروزەنگ، جگە
لە دووڕوویی، جگە لە خراپەی جار لەدوای جار
پاشا حوکم بکات یان بارۆنەکان
بەهێز بەهێزی مامەلە دەکرێ‌و، لاواز
بەخۆزگەیەوە هەردووك یەك یاسای بەدەست
هێنانی هێزو پاراستنیان هەیە
مرۆی جێگیریش دژ بە چاوچنۆکی‌و ئارەزووی
پیسی خەلکان دەجەنگێ
لاوازیش گیانی خۆی دەکێشێ.
قەشەی یەکەم: داخۆ ئەم شتانە کۆتاییان
نایە

هەتا ئەو دەمەی کەوا هەژاران، لەبەردەرگادا
هاوڕێ‌و پاپایان یاد دەچێتەوە
یادییان نامێنێ هاوڕێیەکیان بووە؟
(پەیامبەر خۆ ئەکات بە ژووردا)
پەیامبەر: پاسەوانانی یەزدان، چاودێرانی
کەنیسە
هاتووم هەر ئێستا ئاگادارتان بکەم
سەرۆك قەشەمان لە ئینگلیزستانە لەنزیك
شارە
بەهەڵەداوان کەمێ لەپێش ئەو رەوانە
کراوم تا پێتان بڵێم کە بەپێی توانا بۆ
پێشوازی ئەو خۆئامادەکەن.
قەشەی یەکەم: چییە، دوور خستنەوە
کۆتایی پێ‌هات
سەرۆك قەشەکان گەیشت بە پاشا؟
داخۆ کامە ئاشتبوونەوەیە کە لەنێوانی دوو
مەزنە پیاوا.. رووی داوە؟
قەشەی سێیەم: داخۆ کام ئاشتی لەنێوان
دەزگاو چەکوشدا بەدی دێت؟
قەشەی دووەم: دەپێمان بڵێ
ناکۆکییەکانی سەردەمی ئەوسا کۆتایی
پێ‌دێت
دیواری هەستی لەخۆبایی بوون کە ئەوسا
لێکی پەرت ئەکردن، ئێستا دائەڕمێت؟
داخۆ ئێستاکە شەڕ یان ئاشتییە؟
قەشەی یەکەم: داخۆ بەبڕوایەکی تەواو
رەهاوە، یان، تەنیا بەدڵنیابوون
لەتوانای رۆما، دەسەلاتدارێتی‌و بڕوای
حەقیقی‌و خۆشویستنی خەلك ئەگەڕێتەوە؟
پەیامبەر: ئێوە حەقتانە کە گوزارشتی
گومانێك بکەن
ئەو بەهەستێکی خۆگەورەزانی‌و بەخەفەتەوە
دێتە پێشەوەو بیروبۆچوونی لەگومان دەرئەکا.
لەودیو سنووری گومان کردنەوە، خەلکی
دلنیا ئەکا

ئەو خەڵکانەی کە لە دیمەنێکی شێلگیرانەدا
پێشوازی ئەکەن
لەسەر رێگا هەموو ریز ئەبن و کڵاوەکانیان
بەرزئەکەنەوە
رێگاش بەگەڵاو گوڵی دواکەوتووی وەرز
دائەپۆشن.
شەقامەکانی شار ئەوەندەی خەڵك رژاونەتە
سەر، نزیکە بخنکێن
من وای بۆ ئەچم کە ئەسپەکەی ئەو کلکی
بچڕێ
تەنها یەك تاڵ موو بەس بێ ببێتە یادگاریێ
بەنرخ
ئەو ئێستا لەگەڵ جەنابی پاپاو پاشای
فەڕەنسادایە
لەراستیشدا کەیف خۆش و خەنییە، لە وڵاتی
خۆیا میوانداریان بکا
بەڵام بەگوێرەی پاشای خۆمان باسێکی ترە.
قەشەی یەکەم: بەڵام ئەی دیسان شەڕە یان
ئاشتییە؟
پەیامبەر: ئاشتییە، بەڵام ماچی ئاشتبوونەوە
نییە
گەر رای منت ئەوێ بۆ ئەم مەسەلە یان لێم
ئەپرسی
ئەوا بە رای من سەرۆك قەشەکان پیاوێکە
هەردەم دوور لە واهیمە
هەرگیز لەداوای ناگەرێتەوە. گەر رای منت
ئەوێ، من وای بۆ ئەچم کە ئەم ئاشتییە
نەلە کۆتایی، نە لە سەرەتا، لە هیچیان
ناچێت، ئەوەش ئاشکرایە، ئەوکاتەی سەرۆك
جیابووە لە پاشا، بە پاشای گووت:
گەورەم من چەشنی کەسێ جێت دێڵم
کە جارێکی دی لەم ژیانەدا نایبینمەوە
ئەمەش شتێکە کەوا دەربارەی بەتەواوی
دڵنیات ئەکەم
گەلێك را هەبوون کە مەبەستی بوون

بەڵام هیچ کەسێ وای بۆنەئەچوو کە
دوژمنێکی وا ئاسوودە بێت.
(ئەچێتە دەرەوە)
قەشەی یەکەم: لە چارەنووسی سەرۆك
ئەترسم، بۆکەنیسە ترس دام ئەگرێ
ئەوەش ئەزانم لەخۆبایی بوون، سەرچاوەکەی
پێشەوەچوونێکی لەناکاوە
ئازارو ئەشکەنجەیە تاڵ، رەگی پێدائەکوتێ
سەرۆکم بینی وەك سەرۆك قازییان پاشا
فریووی دابوو
دەست و پێوەندان بەمامەڵەی ناچیزەیان
هەڵیان ئەداو ئەشیان ترساند
ریسوا بوو.. ریسوا ئەکرا، تاك و تەنها بوو
ئەو خۆی لەکۆڕی ئەوان ناهاوێ و هەردەم
لەگوماندایە
گیانی مەزنێتی هەمیشە لەسەر چاکە
وەستاوە لە هەڵوێستیا هەستی مەزنێتی مکووم و
بەهێزە ئەو لەو هێزەی دەسەڵاتی دنیا ئەیدا
بێزارە، تەنها بۆ یەزدان کڕنوش ئەبات.
لەوانەیە پاشا لەهەمووکەسێ بەهێزتربووبێ،
یاخود لاوازتر
بەڵام ئەی (تۆماس) شتەکان لای تۆ لەیەکتر
جودان.
قەشەی دووەم: ئەوا سەرۆکمان گەڕاوە
دواوە، جارێکی تریش
ئەوا ئازادی سەری هێناوە. ئێمە ساتێ زۆر
چاوەڕوانمان کرد، لە کانوونەوە بۆ کانوونی پڕ لە
جەور
سەرۆك قەشەکان ئەبێتە سەرۆکمان، ترس و
دوودڵی بەجێمان دێڵن
ئەو پێمان ئەڵێ کەوا چی بکەین، شوێنی
گونجاوی خۆمان ئەداتێ و رێنومامان ئەکا
ئێستا سەرۆکمان وا لەگەڵ پاپاو
فەڕەنسا.

ئێستا ئەتوانین لەسەر تاشەبەرد شانی لێدادەین
ئەتوانین هەست بە جێگیربوونی جێپێمان بکەین.
بەرامبەر هێرشی ئەو شەپۆلانەی کەوا بەردەوام
لەگەڵ تەوژمو هێزی بارۆنو خاوەن زەوییان دێن
ئێستا بەردی خوا لەژێر پێمانە
دەبا پێشوازی سەرۆك قەشەكان لەدڵەوە بكەین.
گەورەمان.. سەرۆك ئەگەڕێتەوە.. كەواتە دەبا هەموو خەنی بین.
ئەڵێم خەنی بین، بەڕوویەكی گەش لەپێشوازیدا خۆمان بنوێنین
من خۆم خزمەتچی سەرۆكی قەشەم، دەبا بەگەرمی پێشوازی بكەین.
قەشەی سێیەم: با میلی كاتژمێر بۆ چاك یان خراپ بسوڕێتەوە
ئەو میلەی كەوا حەوت ساڵی رێكە بێ كەڵكو بێسوود وشك وەستاوە.
با میلی كاتژمێر بۆ چاك یان خراپ بسوڕێتەوە
ئەی ئەوە كێیە ئاگای لە داوی خێرو شەڕیشە؟
هەتا ئاشەكان لەكار ئەوەستن
دەرگاكان لەرووی شەقام دائەخرێن
كچانی مۆسیقاژەنیش بەملكەچی دێن.
كۆرس: ئێرە شارێكی نەمر نییە، ئێرە جێیە نییە هەتا هەتایە بمێنێتەوە
نەخۆشە وەك با، بەچەشنی زەمەن
هیوای قازانجی تیارەچاونـاكرێ مەترسیش هەردەم وا لەرێدایە.

ئای ئەم زەمەنە چەند دواكەوتووە، دواكەوتوو، دواكەوتوو، دواكەوتوو لەگەڵ رۆتینی ساڵا.
بەدفەساڵ بایە، تاڵیش دەریایە، ئاسمان سامناكە، سامناكە، سامناكە، سامناك
ئۆە تۆماس بگەڕێرەوە، سەرۆكی قەشە بگەڕێرەوە
بۆ فەڕەنسا بگەڕێرەوە بەهێمنیو بێ دواكەوتن بگەڕێرەوە، بەهێمنیو هێوری جێمان بهێڵە
تۆ بە خۆشی دێیت، خۆشی دەهێنیت، كەچی هاتنت بۆ كانتربێری مەرگ ئەهێنێ
مەرگەساتێكە بۆهەموو وڵات، بۆخۆت، بۆ جیهان
ئاوات ناخوازین هیچ شتێ رووبدات.
حەوت ساڵان ئێمە بە ئاسایش ژیاین
بوارمان نەدا ببینە جێگای هیچ سەرنجدانێك
((ئەژینو ناژین))
ئاسوودەبوونو جەور بەردەوام بوون
برسێتیو ناچیزەیتی لە ئارادابوون
ناعەدالەتی ئاشكرادیار بوو
بەڵام هێشتاكە ئێمە هەر ئەژیاین.
ئەژینو ناژین
هێندێ جار ئەبوو بەقاتیو قڕی
هێندێ جار درووێنە گەلێ بەپیت بوو.
ساڵێ دێ كەوا ساڵی بارانە
ساڵێ دێ ساڵی قاتیو قڕانە
ساڵێ سێو زۆرە، كەچی ساڵێ دی قۆخ هەر پێناگا
بەڵام هێشتاكە ئێمە هەر ژیاوین.
(ئەژینو ناژین)
میواندارێمان بەرێ خستووە، گوێشمان لەدەنگی جەماوەر بووە
بیرەو شەرابمان دروست كردووە

بۆسەرمای زستان دارو تەختەمان کۆکردۆتەوە

لەگوێ ئاگردا، لەنێو قوژبنی شەقامەکاندا قسەمان کردووە

لەوێ بەدەنگی بەرزیش دواوین.

(ئەژین و ناژین)

مەرگو لەدایك بوون و شایمان دیوە

کاری خراپەش، گەلێکمان هەبووە

جارێ زەریبە هەڵی تەکاندووین

بەڵام هێشتاکە هەر ئاخاوتووین و هەر پێکەنیووین

دەستەیەك زۆری کوڕی کیژەکان بەشێوەیە سەیر لەبەرچاو ونبوون

هێندێ تریشیان (زۆر) بێ توانابوون.

ئێمە هەمووما ترسی تایبەتی خۆمان هەبووە

خەمی تایبەتی خۆمان هەبووە، ترسی نهێنی خۆمان هەبووە

بەڵام ئێستاکە ترسێکی گەورە دێت بەسەرمانا، ترسی یەك کەس نییە، ترسی هەموانە

ترسێ لە چەشنی لەدایك بوون و مردنە

کاتێ لەشوێنی دووەمدا ژیان و مردن بە جووت ئەبینین..

ئێمە ئەترسین لەوساتەی کەوا لێی حاڵی نابین

پرکێشی ناکەین بەرەورووی بینەوە،

کەسێکیش نییە کە لێی تێ بگات

دڵمان لە سینگمان ئەچنەدەرێ، مێشکمان چەشنی پیازی پاکراو بێ پێست ئەمێنێ

خۆشمان ون ئەبین.. ون ئەبین

دواییش ترسێکە هیچ کەس تێێ ناگا

ئۆه تۆماس، ئەی سەرۆکی قەشە، ئۆه تۆماس گەورەی هەموومان

بڕۆ، بڕۆ، بەجێمان بێڵە، لەم بارە هیچ و بێ حاڵەماندا، جێمان بیهێڵە

هیچ داوا مەکە بەرامبەر چارەی وڵات بووەستین

بەرامبەر چارەی سەرۆك ئەسقەفان، بۆ چارەنووسی هەر هەموو جیهان.

سەرۆکی قەشە بۆخۆت دڵنیاو دڵ پڕبڕوابە

بۆچارەنووست، لەژێر سێبەرا هێور دانیشە

داخۆ ئەزانی کەوا چی ئەڵێی ئاخۆ ئەزانی ئەمە یانی چی؟

کە گەلێ بچووك کەوتە نێو داوی چارەنووسەوە

گەلێکی بچووك کەوا لەنێوان شتی بچووکدا ژین ئەگوزەرێنێ.

دەمارگیری وا کار لەمێشکی ئەکا

بەرامبەر چارەی وڵاتەکەی و سەرۆکی قەشەو هەموو جیهانیش بووەستێتەوە.

ئۆه تۆماس سەرۆك قەشەکان جێمان بهێڵە.

جێمان بهێڵە، بایەقوش بەجێبهێڵە، بەرەو فەرەنسا کەشتی برانە.

تۆماس، سەرۆکی قەشە، لە فەرەنساش بێت هەر سەرۆکمانە.

ئەی تۆماسی سەرۆکی قەشە چارۆکەی سپی

لەنێو ئاسمانی خۆڵەمێشی و دەریای تفتدا

بەرز بکەرەوەو دەسا بیڕانە

جێمان بهێڵە، جێمان بهێڵە بڕۆ فەرەنسا.

قەشەی دووەم: چ شێوازێکە لەم باری ناڵەبارەدا ئێوە پێی ئەدوێن!

ئێوە ژنانی گەمژەو کەودەن و زۆر فرەوڕێسن

داخۆ نازانن سەرۆکی مەزن لەم نزیکانە تەشریف ئەهێنێ؟

لەنێو شەقامان، حەشامەتی زۆر ئەشێ دڵخۆش و خەنی خۆدەرخەن.

ئێوەش وەك بۆقی سەر چڵەپۆپەی دار هەر ئەقیڕێنن

خۆ بۆق هیچ نەبێ ئەکوڵێنرێت و گۆشتەکەی ئەخورێ.
گەرچی ئەشترسن لەتێگەشتنی ترسنۆکیتان
هیچ نەبێ کەمێ بوارم بدەن، تا سەرو سیمای پڕ لە هیواتان بەچاو ببینم
ئێوەش پێشوازی زۆر گەرمو گوڕی سەرۆکمان بکەن.
(تۆماس دێتە ژوورەوە)
تۆماس: ئێستا ئاشتییە، لێیان بگەڕێن با ئاسوودەبن
ئەوان گەلێك لەوەی ئەیزانن باشتر ئەدوێن،
ئەوەش شتێکە ئێوە تێی ناگەن
ئێوە بزانن یاخود نەزانن ئەوان ئازارو ئەرك ئەکێشن
ئەوان بزانن یاخود نەزانن کارکردن هەردەم ئازار چەشتنە
ئازار چەشتنیش دیسان هەرکارە، کاریگێڕ دووچاری ئازار نابێت و
هێمنیش هەروا بەئەنجام نایەت
بەلام هەردووکیان لەکاری بێ بڕوانەوەو هێوری هەتاهەتایی چوستو چەسپاون
هەتا بتوانن خەلکی رازی کەن، ئەگەر ویستیشیان
ئەوا پێویستە کە خەلکی سەرجەم ئازار بچێژن
بە ویستی ئەوان ئەبێ نموونەش بمێنێتەوە...
نموونەی کارو ئازار چێشتن
ئەشێ میللی کاتژمێر بسوڕێتەوە، یان هەتا ئەبەد وشك بوەستێ،
قەشەی دووەم: تۆ گەورەم، ببورە لێم،
نەمبینی کەوا تەشریف بهێنی
چەنەی ژنانی گەمژەو بێ مێشك بێزاری کردین.
گەورەم لێمان ببورە، دەبوا پێشوازیت گەرمتر بوایە

ئەگەر پێش ئێستا بۆ تەشریف هاتنت ئامادە بووینا.
بەلام سەرۆکی مەزن ئەزانێ کەوا حەوت سالی چاوەڕێ کردن
حەوت سالی رەبەق هەر پاڕانەوە، حەوت سالی بەرەلایی
لەحەوت رۆژانی ئامادەبوونی کانتربێری زیاتر
دلمانی بۆ پێشوازیتان خستە سەرباری هەژان
هەرچۆن بێ، من کلپەی ئاگر لە ژوورەکانتا بەجێ ئەهێلم
هەتا وەیشوومە لە دیسەمبەری ئینگلتەرەدا بڕەوێتەوە
ئێستاکەش سەرۆك کەشێکی نوێی تر دەهێنێتە گۆڕ
ئەشێ ژوورەکان بدۆزێتەوە، کاتێ بەڕێکی بەجێت هێشتوون
تۆماس: منیش هەوڵ ئەدەم بەوشێوە رێگەی کە ئەیان بینم بەجێیان بێلم
سوپاسی زۆرو بێپایانیشم بۆ چاودێری بەخشندەیتان
ئەوەش شتێکی کەمە، حەوانەوە یەکەمی نێو کانتربێری
لە بەرامبەریا، هەڕەشەی دوژمنی تینوو دەورمان ئەدات
قەشە هەلگەڕاوەکان، لە یۆرك، لەندەن، لە سالسبۆری دژی پەیامی ئێمە ئەوەستن.
سیخوڕیان لەسەر رۆخی دەریاکان بلاوکردۆتەوە
ناردونیان بۆ بینینی من، هێندێ بە رقی توندو تیژەوە مامەلەیان لەگەلدا کردم
بە مەزنی یەزدان ئاگام لە تینی ناخی دلیانە
بۆیە نامەکانم لە رۆژێ ترا رەوانە ئەکەم
گەیشتنی ئەو شتێکی جوان بوو، بۆ ساندویچو برۆك و وارینی و (شەریفی) کینت و
ئەوانەی کەوا سوێندیان خواردبوو سەرم ببڕن

بێجگە لە (جۆن) ی عەمیدی سالسبۆری کە لە ناوی پاشا ئەترساو، لەناپاکێتی ئەسڵەمیەوە

وەهای لێکردن دەستیان رابگرن، لەبەرئەو هۆیە ئێمە بێزار نین.

قەشەی یەکەم: ئەی داخۆ ئەوان دوای تۆ ئەکەون؟

تۆماس: واشەی سك برسی بۆ کاتێکی کەم بەرزئەبێتەوەو ئەسووڕێتەوە

پاشان بەدەوران دێتە خوارەوە، چاوەڕێی بەلگەو بینینو.. هەل ئەکا

ئەشێ کۆتایی شتێکی سادە، تەقینەوەیە، بەزەیی خوابێت

ئەمە لە ساتێکدا کەوا یەکەمین گەوهەری کارمان بێتە تارمایی

مل ملانێ بێ لەگەڵ تارماییا.

دابڕان گەلێك لە کۆتایی بەگرێو گۆڵ ترە، هەموو شتەکان لەڕێی رووداندان.. چاوەڕوان بکەن!

(فریودەری یەکەم دێتە ژوورەوە)

فریودەری یەکەم: گەورەم ئەبینی کە من چاوەڕێی بانگەواز ناکەم

هاتووم بۆ ئێرەو چی تووندو تیژیە پشت گوێم خستووە

بەهیوای ئەوەی شکۆمەندێتی ئەم رۆژگارەیەت، لێبووردنێ بۆسەرکێشێتی سووكو بێنرخم بدۆزیتەوە.

یادی رۆژانی جوانی رابردوو.. بکەیتەوە.

داخۆ جەنابت دژی هاوڕێیە لاوازی ئەوسات ئەوەستیت؟

تۆمی پیرەمێرد، تۆمی بەختەوەر، بێکێتی لەندەن، ئەبێ جەنابتان ئەو ئێوارەی بیربچێتەوە لەسەر کەنار بووین؟

کاتێ کە منو پاشاو جەنابت هاوڕێی یەکتر بووین

ئەی ئێستا گەورەم ئەبێ تۆ یادی چی بکەیتەوە؟

خۆشوویستنی پاشا؟ ئەشێ بتوانین بڵێین کە هاوین کۆتایی پێ دێ

یان ساتی خۆشی قەت تێ ناپەڕێ؟

شمشاڵ ژەندن لە سەوزەگیادا، کەمانچەلێدان لە سنگی هۆڵا

زەردەخەنەو گوڵی سێو ئەکەونە سەر ئاو

گۆرانی چڕینی هەتا نیووەشەو، چرپەی نێو ژووان

گڕی ئاگرێ کە وەرزی زستان تەنگەتاو ئەکا

تاریکی ئەڕەوێتەوە، بەکاریگەری هۆشو حیکمەتو شەراب!

ئەمرۆ تۆو پاشا بوونەوە هاوڕێ، ئەشێ قەشەو کەسانی تریش خەنی ببنەوە

خۆشیو رابواردن پێویستیان نییە بەڕێکردنی پڕ لە مەترسی.

تۆماس: تۆ دەربارەی ئەو وەرزانە ئەدوێی کەوا رابووردن

یادم دێنەوە ئەوانە ناشێ لەیاد بکرێن.

فریودەری یەکەم: لەوەرزی نوێدا

بەها رلە گەرمەی زستانا دێتو بەفری سەر چڵان

ئەشێ هەڵپێچێ وەك گوڵاڵەی جوان، سەهۆڵ بەدرێژی جۆگا تیشکی خۆر بشکێنێتەوە

خۆشەویستی ئامێزی باخ ئەشێ ئاسوودەیی بەقەد قەوارەی بێزاری بژێنێتەوە.

تۆماس: دەربارەی سبەی شتێ وانازانین

بێجگە لەوەی لەنەوەیەکەوە بۆ ئەوەی دوای خۆی ئەمێنێتەوە

جار لەدوای جار ئەمەش دیسان دێتەوە

مرۆڤ شتێ کەم، لەئەزموونی خەڵکی فێر ئەبێ

بەلام لە ژیانی مرۆیەك خۆیدا ئەزموون جارێ تر ناگەڕێتەوە

چیا بپڕەو کێشانەکانیش هەڵگێڕەوە
تەنها هەر گەمژە لەسەر گەمژەیی خۆی بەردەوامەو
ئەشێ وا زەن کەن توانای ئەوەی هەیە زەمەن بەوویستی خۆی ئاڕاستەکان.
فریودەری یەکەم: گەورەم نیشانەی وەك چاوداگرتن شتێکی جوانە
مرۆڤ گەلێجار شتێکی خۆش ئەوێو رەتیەکاتەوە.
ئەو سەردەمانەی پڕ لەخۆشی بوون ئەگەڕێنەوە.
منیش ئەمەتام لەخزمەت تۆدام.
تۆماس: لەم بۆچوونەوە، سەرنج مەدەنە رەفتار کردنتان، ئێوە دڵنیابوون
ئێستاکەش بیرتان لەلای (تەویە) بێو لەدوای گەورەتان هەنگاو هەڵهێنن.
فریودەری یەکەم: بەم خێراییە نا
گەر زۆر بەخێرا هەنگاوت هەڵنا، ئەشێ خەڵکی تر خێراتر برۆن
قەشەی رابەرتان لە سنوور بەدەر بەخۆی ئەنازێ
باشترین ئاژەڵ ئەوەنی‌یە کەوا بەرز ئەزەرێنێ
ئەم شێوازی هەڵس‌وکەوتەیە، شێوازی پاشای گەورەمان نی‌یە
لەگەڵ ئەوانەی تاوانیان کردووە نەئەبوو هێندە دڵ رەق بوویتایە
ئەمە لەکاتێکدا هەمووش هاورێت بوون
پیاوێ دڵفراوانبە
پیاوی ئاسایی ئەژی هەتاکو ژەمێ بەچێژتر.. بخوات
گوێ لە ئامۆژگاری هاورێت بگرەو جێمان بهێڵە با بەتەنهابین
ئەوسا دیمانەی سەرکەوتن ئەکولێو هەتا سەرئێسقان ئەتوێنێتەوە.

تۆماس: تۆ بیست ساڵی رێك دوای زەمەن کەوتوویت.
فرویدەری یەکەم: ئێستا جێت دێڵم بۆ چارەنووست
جێت دێڵم بۆ ئەو ئاسوودەبوونەی کە لە پێناویا ئەشێ رەنجێکی زۆرت کێشابێ.
ماڵئاوا گەورەم من چاوەڕوانی (بانگەوان) ناکەم
هەروەك چۆن هاتم هەرئاواش ئەڕۆم، چی زەبرو زەنگە لەیادی ئەکەم
بەهیوای ئەوەی کە شکۆمەندبیت.
لێبوردن بۆ سەرکێشی سووك‌و بێ‌نرخم بدۆزێتەوە
گەورەم ئەگەر تۆ لەنوێژەکانتا یادم کەیتەوە
ئەوا منیش یادی ماچی ژێر پلیکانەکان گشت ئەکەمەوە.
تۆماس: ئەی ئەندێشەی دەمی بەهاران، بێ گێرمەو کێشە بەتەنها برۆ
کەسێ وابیری کردەوە کە رەشەبا فیکە ئەکێشێ
ئەوە کە ناشێ رواندن.. سەرگەرم کردنە
نەشیاو.. ئەو شتەیە ئارەزووی ناکرێ
ئەوەی کە دنیای مردو بەئاگادێنێ هەر وڕێنەیە
گەر هاتوو ئالەم ساتەوەختەدا هۆش بەرکەماڵ نەبوو.
(تەفرەدەری دووەم دێتە ژوورەوە)
تەفرەدەری دووەم:
گەورەم پێ ئەچێ لەیادت کردبم، یادت ئەخەمەوە
کاتێ لە (کلاریندۆن) لە (نورسامتپۆن) بەخزمەتی جەنابتان گەیشتم
دواجاریش لە (مۆنتیگال)، لە (ماین) هەروەکو ئەوەی بێتەوە یادم

با وای دانەنێین کەوا ئەوانە لەبیرەوەرییە زۆر خۆشەکانن

هەردەم تـای تـرازوو بەرامبـەر یـەکن، ئەوانە یادگاری سەردەمانی زوون

بیرەوەرە گرنگـەکانن، بیرەوەری سـەردەمی سەرۆك قازیان

بڕوانـە ئێسـتا چـۆن پاشماوەیـان نـوێ ئەبێتەوە، تۆ کە مامۆستای لە رامیاریدا

هـەموو خـەڵك تێکڕا پـەیمانیان داوە، ئـەبێ جارێ دی ئەو پێشەوایی دەوڵەتمان بکا.

تۆماس: مەبەستت چییە؟

تەفرەدەری دووەم: کورسی فەرمانی سـەرۆك قازییان کەلـێی کشایتەوە

لـەکاتێکدا کـە سەرۆك قەشەبوویت، هەڵەیـە گەورەبوو لەلایەن تۆوە.

بـەڵام ئێستاش ئەشێ جـاری دی بەدەست بێتەوە.

گـەورەم بیربکـەوە هـێزی بەدەست هێنراو ئەشـێ بگـۆڕێ بـۆ شـکۆمەندی ژیـان هـەر بەردەوامەو سامانێکی هەتاهەتاییە

گۆڕی ئامێزی کەنیسەو پەیکەری مەڕمەڕی‌و دەسەڵات کردن بەسەر خـەڵکیدا بەڵگـەی شێتی نییە.

تۆماس: بۆ پیاوانی ئایین چ خۆشییەکە؟

تەفرەدەری دووەم: دڵتەنگی

بۆئەوانەیـە کـەوا تەنـها سـەرگەرمی کـاری خوایانەیان بوون

ئەشێ ئەوانە ئەوکەسـانەبن کـەوا سـامانی زۆروزەبەندیان بەدەست هێنابێ

ڕێی پڕ لـە فێـڵ‌و تەڵەکـەبازییان پێشـبین کردبێ؟

هێز لە ئارایەو، پیرۆزیش ئەوەتا وا لەڕێدایە.

تۆماس: کەواتە ئەوە کێیە؟

تەفرەدەری دووەم:

سەرۆك قازییان، شاو سەرۆك قازییان

پاشا فـەرمان ئـەکات‌و سـەرۆك قازییان بـێ زیادو بێکەم فەرمانەکەی ئەو بەجێ ئەهێنێ

ئـەم رسـتەیە لـە قوتابخانـە ناگوترێتـەوە. پەیامی گەورە، پاراستنی هەژارەکانە.

داخـۆ بنیـادەم لـەژێر دەسـەڵاتی عەرشـی یەزداندا، ئەتوانێ شتێ ئەنجام بدا

ئەوانـەی کـەوا وەك دڕندەبـوون... ئێسـتاکە پشتی یاسا ئەگرن

بۆبەرژەوەندی زەمینەیە چاك فەرمان ئەکەن.

هـەرچی شت هەیـە بـە ئـەنجامدانی عـەدل‌و یەکسانی بێ گرفت ئەبێ

تـا ئـەو سـنوورەی وا عەدالـەت لـە زەوی‌و ئاسمان بەدیار ئەکەون.

تۆماس: ئەمە یانی چی؟

تەفرەدەری دووەم: هێزی راستەقینە

بەنرخێ، دیار وەدی‌ئەهێنرێ

هـێزی رۆحـی تـۆش وەك دۆزەخێکـە لەسـەر زەویدا

هێز بۆ ئەو کەسەی کەوا ئەزانێ بەکاری بێنـێ لەبەردەستدایە.

تۆماس: باشە چ کەسێ ئەو هێزەی هەیە؟

تەفرەدەری دووەم: ئەوکەسەی کە دێت

تۆماس: لەکام مانگدا دێت؟

تەفرەدەر: دوورترین مانگ لەسەرەتادا.

تۆمـاس: باشـە ئـەی ئێمـە چـی پێشـکەش بکەین؟

تەفرەدەر: هێزی (کەهنوتی) بۆ داوا ئەکەین.

تۆماس: بۆ چ پێشکەشی کەین؟

تەفرەدەری دووەم: لەپێناو هێزو شکۆمەندیا.

تۆماس: نا!

تەفرەدەری دووەم: بـەڵێ یان ئارایـەتی تێك ئەشکێنرێ

پاشای بێ وڵات لەکانتربێری ئەبێتە خزمەتچی پاپای بێدەسەڵات.

پیرە (ئاسك) یش سەگ دەورەیان داوە.

تۆماس: نا!

تەفرەدەری دووەم: بەڵێ پێویستە پیاوان و دێران لەو دیووی سنور جەنگ هەڵگیرسێنن

ئەو جەنگەش هاوڕێی چوستو چالاکی ناو وڵاتی ئەوێ.

سیاسەتی تایبەت سوودی گشتییە

هێشتاکە دەبێ کە شکۆمەندی بەرگی قەشەنگی بپۆشێ.

تۆماس: تۆ قەشەکان لەیاد خۆت ئەکەی

ئەوانەی من پەرتو بڵاوم کردونەتەوە.

تەفرەدەری دووەم: رقی برسێتی، ناشێ مل ملانێی بەرژەوەندی تایبەتی بکات.

تۆماس: تۆ (بارۆنەکان) لەیاد ئەکەیت

ئەوانەی کەوا دەسەڵاتی بێسەرەوبەریان لەسەر ئاستێکی پووچ و بێنرخە.

تەفرەدەری دووەم: دژی بارۆنان، داخۆ باوەڕی پاشا هەمان باوەڕی جوتیارو سەرۆک قازییانە؟

تۆماس: نەخێر، داخۆ من ئەوەم کەوا کلیلی بەهەشتو دۆزەخ لەدەستمدایەو

بەتاکی تەنها لە ئینگلتەرا ناوم ئەهێنرێ؟

ئاخۆ ئەو کەسەم.. بەپێی فەرمانی پاپا، هەڵدەچێو پاشان پشوو ئەدا؟

پاشان لای ئەداتەوە بەلای بێ هێزەکانا؟

خۆی جێگیر ئەکا هەتا دواڕۆژی ڕەش بکولێتەوەو

فەرمان بداتە پاشایان لەگەڵ خزمەنچیان پێکەوە کارنەکەن

لەدەرگای والای دەزگاکەی منەوە. نەخێر! لێرەوە برۆ.

تەفرەدەر: پاشان جێت دێڵم بۆ چارەنووست

تاوانەکان وەك رۆژ ئاشکران، دروشمی (دالی) پاشا ئەشارنەوە.

تۆماس: هێزی دنیایی بۆ بنیادنانی جیهانێکی چاك

بۆ راگرتنی رژێمێك وەك ئەو رژێمەی دنیا داینراوە، ئەوانەی کەوا بەرژێمی دنیا بڕوایان هەیە بۆ فەرمانی خوا مل نەوی ناکەن

ئەوانە لە لوتکەی نەزیننداان، بەڵام بێ سەروبەری پێوەندیان ئەکات

وشکیان ئەکاتەوە، دەردێ کوشندە لەنێوانیاندا تەشەنە ئەکات

ئەوەی پیرۆزە رسوای ئەکەن، هێزیش ئەوەتا لەدەستی پاشا دایە

منیش ئەو ساتەی کەوا پاشا بووم، هێزی هەبوو، ژیری هەبوو

بەڵام ئەوکارەی بۆتاکە جارێ پیرۆزی بەبەرێراوە، ئێستا بێواتایەو هیچ ناگەیەنێ.

(تەفرەدەری سێیەم دێتە ژوورەوە)

تەفرەدەری سێیەم: من میوانێکی چاوەڕوان نەکراوم.

تۆماس: من چاوەڕوانی هاتنتم ئەکرد.

تەفرەدەری سێیەم: بەڵام بەم شێوەیەنا، یان لەپێناوی ئەم مەبەستەی ئێستاکەدا نا،

تۆماس: مەبەستەکە جێی سەرسوورمان نییە.

تەفرەدەری سێیەم: زۆر چاکە گەورەم.

من نەمشەخۆرم، نە سیاسەت بازم، نە لە کارکەوتووم، نەفێڵبازێکی بەردەم دیوانم

نە لە ئەوەدا پسپۆریم هەیە کە لەدەستو پێی نێوان دیوان بم

من کیژو سەگو ئەسپ ئەناسم

ئەشزانم کە چۆن کارم بخەمە ژێر دەسەڵاتی

ئەو سەرۆکەیەی کەوا مێشکی لە ئیشوکارا چاك دەخاتەکار

ئێمە پیاوانی گەورەی وڵاتین، ئەزانین کەوا وڵات چی ئەوێ

چونکە وڵات وڵاتی خۆمانەو ئێمەش گرنگی بە وڵات ئەدەین

ئێمـە بڕبـڕەی پشـتی ئـەم گەلـەین، ئـەو مشەخۆرو پیلان گێڕانە نین

لەدەوری پاشا پیلان ساز ئەدەن

لـەتوندوتیژیم ئـەبێ ببورن مـن ئینگلـیزێکی راستی بێ درۆم.

تۆماس: ئەی پیاوی راستگۆ دەبەردەوام بە.

ئەفرەدەری سێیەم: مەبەستت دیارە

پـەیرەوکردنی هاوڕێیـەتی لەسـەرخۆمان ناوەستێ

بەڵکو پابەندی بارو زروفە، بارو زروفیش شتێ ئاشکرانین

ئەشێ هاوڕێی درۆو نادروست ببێتە هاوڕێی راست و حەقیقی

بـەڵام هاوڕێیـەتی راستو حـەقیقی بۆتاکـە جارێ کە لەناو بچێ ناگەڕێتەوە

ئەشـێ دوژمنایـەتی زۆر بـەخێرایی ببێتـە یەککگرتن.

ئـەو دوژمنایەتیـەی کـە هیـچ بـواری بـۆ هاوڕێیەتی نەهێشتۆتەوە ئەشێ بـەزوویی دیاری نەمێنێ.

تۆماس: تۆ ئەی هاونیشتمانی

مەبەستی خۆت وەك هەر پیاوێکی دەربارەی پاشا بە پەردەیەکی رەش دائەپۆشی.

ئەفرەدەری سێیەم: ئەمە راستییە سەرەتاییە!

تۆ هیوات نییە لەگەڵ (شا) هێنری ئاشت ببیتەوە

بۆ حەشاردانی رووی دڵنیایی

تۆ هەردەم لە رووی تەنهاییەوە سەرنج دەدەیت، ئەوەش هەڵەیە.

تۆماس: تۆ هێنری، تۆ پاشام!

ئـەفرەدەری سـێیەم: ئەشـێ بەشـێکی زۆری هاوڕێیان لەهەمان حاڵەتدا بژین.

پاشای ئینگلیزیش زۆر بەهێز نییە

پاشای فەڕەنساش سەرقاڵی دەستی کێشـەی (تانجۆیە)

منداڵی برسـی لەهـەرچواردەوریا چـاوەڕوان ئەکەن

ئێمـە ژیانمـان بـۆ ئینگلیزسـتانە، ئێمـە لەجەرگەی ئەم خاکەیەداین

گەورەم منو تۆ هەردووك (نۆرماندین).

ئینگلیزستانیش ئەو دەڤەرەیە کە بۆ فەرمانی رژێمی نۆرماندی مل نەوی ئەکا

رێی (ئەننجیڤین) بدەن با خۆی تێك بشکێنێ

لە (ئانجۆ) جـەنگ هەڵگیرسێنێ ئـەو هـەرگیز لەوە تێ ناگات

ئێمە باڕۆنانی ولاتی ئینگلیزین، ئێمە گەلین.

تۆماسی: ئەمە بەرەو کوێمان ئەبات؟

ئـەفرەدەری سێیەم: بـەرەو یەکێتیـیـە زۆر سەرکەوتوانە. بۆ بەرژەوەندیە زۆر زیرەکانە.

تۆماس: ئەی تۆ چیت هەیە، کاتـێ لـەجیاتی باڕۆنمان ئەدوێی.

ئەفرەدەری سێیەم: لەپێناوی پارتی بەهێزی وادا

کـە تیشکی چاوی بەسـەر ناڕاستـەی تـۆدا ئەگێڕی

هەتا پرسیاری لەجۆری پرسیاری سـەرۆك لـە تۆ بپرسێ

بـەگوێرەی ئێمـەش خۆ شوویستنی کەنیسـە ئەبێ سوودێك بێ.

پیرۆزبایی (پاپا) لەجەنگی رزگاریا. پاڵپشتی گەلێك مەزنە

تـۆ گـەورەم، گـەر لـەپێناوی ئینگلـیزو رۆمـا خۆت لەگەڵمابی ئـەوا سوپامان لەیەکـەم جـاردا دەست ئەوەشێنێ

دەسـەڵاتی زۆر زەبروزەنـگ کـە دەسـەڵاتی بەسـەر رژێمـی قەشەو پاشـاو باڕۆنـا سـەرجەم کردووە، هەڵئەتەکێنێ.

تۆماس: هەوڵی من تەنها هەر لەپێناوی ئەمەدا بووە.

تەفرەدەری سێیەم: تۆ هەوڵت داوە هەتاکو ئەوە بەئەنجام بگات.

بەڵام هەرکاتێ (کات) تێ پەڕیوو لەیاد ئەکرێ ئێمەش چاوەڕێی بەرزبوونەوەی ڕێکخستنی نوێین.

تۆماس: ئەگەر سەرۆکی قەشە بڕوا بە پاشا نەکا، چۆن بڕوا بەوانەی کەوا هەوڵ ئەدەن تەختی پاشا تێك بدەن؟

تەفرەدەری سێیەم: پاشایان جگە لەهێزی خۆیان ڕێگای کەس نادەن

خەڵكو کەنیسە مافی خۆیانە دژی فەرمانی تەخت هەڵبسن.

تۆماس: ئەگەر سەرۆکی قەشە بڕوا بە تەخت نەکات

ئەو مافی هەیە تەنها بڕوای بەیەزدان هەبێت.

من تەنها جارێك بەچەشنی پاشا فەرمانم کردووە

پیاوانی وەك تۆ خەنیو دڵخۆش بوون کە لەبەردەرگام وشك راوەستن

من تەنها لەسەر کورسی فەرمانم بەم شێوە نەبووم

بەڵکو لەبەرەی خوێن ڕشتنیشا ملم بەچەندین ئەوی کردووە.

داخۆ ئەوکەسە نەبووم کە بەچەشنی باز فەرمانم بەسەر نێچیرا کردووە

ئێستاکەش لەنێو گەلەگورگدا، شێوەی گورگم وەرنەگرتووە

لەسەر ناپاکی لەمەوپێشت هەر بەردەوام بە منیش کەسێکم نیە بڵێ ناپاکم لەپاشا کردووە.

تەفرەدەری سێیەم: بەڵام گەورەم، لەبەردەرگای تۆ من راناوەستم

هیواداریشم پێش بەهارێ تر، پاشا ڕێزی خۆی بۆ دڵسۆزیتان ئاشکرا بکا.

تۆماس لەو بۆچوونەی کەمێ پێش ئێستات بکێشرە دواوە چونکە هەوڵێکی زۆر بێ ئەنجامی هەرەس هێناوی هێنریبە

(سامسۆن) هەرگیز لە (غەزە) بەدەست تر نی‌یە خۆ ئەگەر شتێکم شکاند

ئەوا پێویستە بەرلەهەمووشتێ خۆم تێك بشکێنم.

(تەفرەدەری چوارەم دێتە ژوورەوە)

تەفرەدەری چوارەم: تۆماس، تۆ زۆر چاك ئەکەی

توانات هەرگیز لەق نابێ مادەم منیش لەتەکتام، کەواتە تۆ بەتەنیا نیت.

تۆماس: تۆ کێی؟ وەك ئاگاداریم، میوان سێکەس بوون نەوەکو چوار کەس.

تەفەردەری چوارەم: هیچ سەرسام مەبە بەوەی کە سێ دی پێشوازی بکەیت

داخۆ پێشتر پێشبینی هاتنی منت کردبوو؟

من خۆم هەموو دەم ئەکەومە پێشی پێشبینیەوە.

تۆماس: تۆ کێیت؟

تەفرەدەری چوارەم: کە تۆ نەمناسیت هیچ پێویست ناکات بەناوهێنانم

کاتێ کە هاتووم دیارە ئەمناسیت.

تۆ من ئەناسیت، بەڵام هێشتاکە رووت نەبینیووم

چونکە تا ئێستا کاتو شوێن مەودای یەکتر بینینی رێك نەخستووە.

تۆماس: پێم بڵێ ئێستا هاتوویت چی بڵێیت؟

تەفرەدەری چوارەم: دەشێ لەدواییا بڵێم بۆ هاتووم

هیچو پووچانی سەردەمی پێشوو بوونە داوەوە

لەرێگا لادان لاوازێتی‌یە، بەگوێرەی پاشا رقی رەشی ئەو کۆتایی نایەت.

تۆش چاك ئەزانیت كە پاشا دووجار بڕوا بەو كەسە ناكات كە هاوڕێی بووە

قەرد بە وریایی بەكار ئەهێنرێ، تۆش وەكو ئەوەی كە قەرداریاری بێ خزمەتی بكە

چاوەڕوانیش بە تەڵە بتەقێ

ئەو ساتەیە تۆ خزمەتی خۆتت لەپێناوی تێكشكاندنو روخاندا پێشكەش كردووە.

ئەوە بەگوێرەی بارۆنەكانیش، ئیرەیی بردن بە سادە پیاوان لە رقی رەشی پاشا سەخت ترە.

پاشا سیاسەتی گشتیان هەیە، بەڵام بارۆنان سوودی تایبەتیو ئیرەیی كردنیان دەسەڵاتی شەیتان هەرەس پێ دێنێ

بارۆن هەریەكە دژی ئەویانە، بەڵام پاشایان پێویستە كەوا دوژمنی گەورە تەفروتوونا كەن.

تۆماس: مەبەستت چییە؟

تەفرەدەری چوارەم: بەرەو پێش بڕۆ هەتا ئەگەیتە خاڵی كۆتایی

هەرچی رێگایە لەبەردەمتا قفڵ دراون جگە لەو رێگای بۆت دانراوە،

بەڵام، خۆشنوودی چییە، حوكمی پاشایی، یان بێ پاشای

پڕ لە فێڵو تەڵەكەی نهێنییە شاراوەكانە كە هەوڵ ئەدات

دەسەڵاتی تەواو بكاتە سەر هێزی رۆحیا؟

حوكمی پڕهەڵە بەسەر مرۆڤدا ئەو ساتە درا ئامادەم تێكشاكاو

كلیلی دۆزەخو بەهەشت كەوتنە دەستی تۆ، هێز بۆ خۆپاراستنو ئاسوودەبوونە

توندیكە.. تۆماس، بەڵام توندیكە پاشاو قەشەلە لەژێر پاژنەی پێڵاوی تۆدان

پاشا، قەراڵ، قەشە، بارۆن، پاشا. ئەمە فەرمانی پڕ لە گومانی سوپای تێكشكاو و جەنگو تاعوونو راپەڕینیشە.

پیلانی تازەو پەیمانی دۆڕاو، لەیەك كاتژمێردا سەرۆك، خزمەتكار.. ئەخولقێنن

بەڵێ ئەمەیە رێگای فەرمانو سوڵتەی دنیایی

پاشای پێشوو لەسەرەمەرگا ئەوە ئەزانێ ئەكوڕ، نە ئیمپراتۆر بەكەڵكی نایەن، ددانی كلۆری خۆی ئەكرۆژێ. تۆش كوریس بگرە

رەشەبایە، تۆماس، رەشەبایە شریتی ئەمری ژیانو مەرگ بەرزبكەرەوە، بەو هێزە بیگرە، توونْد بیگرە.

تۆماس: داخۆ لەم خاكەدا دەسەڵات هەیە؟

تەفرەدەری چوارەم: هەیە، بەڵام بۆیەك كەس هەیە.

تۆماس: ئەمە شتێكە من لێی تێناگەم.

تەفرەدەری چوارەم: كاری من نییە كە تێت بگەیەنم

ئەوە چۆن ئەبێ؟ تۆماس من هاتووم هەرئەوەت پێ بڵێم كەوا ئەیزانی.

تۆماس: ئەشێ ئەمە چەندێ بكێشێ؟

تەفرەدەری چوارەم: ئەوەی ئەیزانی چاك بیپارێزە

هیچ لێم مەپرسەو بیربكەرەوە، تۆماس، بیربكەرەوە

لەشكۆمەندی دوای مەرگ كە پاشا ئەمرێو پاشایەتر دێت

پاشایە تریش رژێمێ ترە، كاتێ، كە پاشای نوێ دێ

ئەوەی پێشی ئەو یاد ئەچێتەوە، قەددیسو شەهید لەناخی گۆڕا فەرمانیان ئەكەن

بیربكەوە تۆماس، بیر لە دوژمنی ترسناك بكەوە.

لە (كفر) كردندا چنگە كرێ ئەكەن، لەسێبەریشا زەنەقیان ئەچێ.

بیربكەرەوە لەو حاجییانەی بەتاكە ریزێ لێی رەواستاون.

لەبەردەم قوربانی دانی وەكو ئەڵماسی پرشنگ پەخش كەردا ئەوە دوای ئەوە لە نوێژكردندا ئەچەمێنەوە

به نیعمەتی خوا بیر لە موعجیزە بکەرەوە،
بیر لە دوژمنەکانت لە شوێنانی تر بکەرەوە.
تۆماس: بیرم لەم شتانە گشت کردۆتەوە.
تەفرەدەری چوارەم: لەبەرئەوەیە منیش پێت ئەڵێم.
بیرو باوەڕت زۆر مکووم ترە لەوەی کە پاشا ناچارت بکا
تۆ هێندێ جاریش لەنوێژەکانتا بۆچوونت هەیە
هەندێ جاریش دەرهەق رێبازی فریشتەکانیش لەدوو دڵیدایت
هەروەها لەنێوان خەوتنو بەئاگایشدا، بەیانیانی زوو کاتێ باڵندە گۆرانی ئەچڕن، بە پەشیمانی بیر ئەکەیتەو
شتێ نامێنێ کە بەردەوام بێ، جگە لە سووڕانی میلی (زەمەن)
هێلانە ئەڕمێو باڵندە ئەگرین، نێچیر ئەبرێو، ئالتوونیش بەفیڕۆئەڕوا
زێڕیش ئەبێتە خشڵی خانمانی شۆخ، جێگای پیرۆز تێك ئەشكێنرێ
عەمبارەکانی ئەچێتە دەستی مشەخۆرانو سوزانیەوە
کاتێ موعجیزە ڕائەوەستێت، دڵسۆزەکانیش بەجێت ئەهێڵن
خەڵکی هەوڵ ئەدەن کە لەبیرت کەن لەوەش خراپتر ئەوەیە پیاوان هەر بەو رقەوە واز ناهێنن لێت
بەڵکو هەوڵ ئەدەن ناوو شۆرەتت بێننە خوارو بەنەفرەتت کەن ئەشگەڕێن بەدوای کەمو کورپیتا هەتاکو بەلگەی مێژوویت بدۆزنەوە
هێندێ خەڵکی تریش ئاشکرای ئەکەن، لەلای ئەم پیاوە شتێ نەبووە نهێنی بووبێ
کە ئەو بەدرێژی قۆناغی مێژوو رۆڵی گەلێك چاکی بینیووە.
تۆماس: بەڵام، ئەبێ چی بکرێ؟
چی ماوە کەوا ئەنجام بدرێ؟ داخۆ (تاجی) هەتا هەتایی نییە لەسەر بنرێ؟
تەفرەدەری چوارەم: بەڵێ تۆماس، بەڵێ .. دیسان تۆش بیرت لەوە کردۆتەوە
دەبێ چ شتێ لەگەڵ شکۆمەندی قەدیسەکاندا بەراورد بکرێ
کە بۆ هەمیشە لەبەردیوانی یەزدانا ئەژین؟
کام شکۆمەندی لەسەر رووی زەوی، شکۆمەندی قەراڵ یاخود هی پاشا
کام، بەخۆنازینی ئەم سەر زەمینە ئەگەر بەراورد بکرێ
لەگەڵ نیعمەتی بەرزی ئاسمانا کورت نامێنێ؟
بگەڕێ بەدوای رێی شەهید بوونو لەسەر رووی زەمین سادەو ساکاربە.
هەتا لەودنیا بەرزو باڵا بیت
دوور بۆ خواری خۆت سەرنج بدە تۆماس
کاتێ کە کەنداو تەواو جێگیرە.
ئەوانەی ئەوسا ئازارییان داویت، ئێستا لە جەوری ئەبەدیا ئەژین.
دوای کفر کردن.. جلەوی سۆزتان بگرن.
تۆماس: تۆ کێیت کە یاری بە ویستم ئەکەی؟
کەسانێکی دی بەحەزو ویستی دنیاییەوە بەرلەتۆ هاتن
هێزو خۆشییان بۆ بەهایەکی ئاشکرا پێ بوو.
ئێستاکە تۆ چی پێشکەش ئەکەیت؟ چی داوا ئەکەیت؟
تەفرەدەری چوارەم: ئەوەی ئەتەوێ پێشکەشی ئەکەم
داخۆ بینینی ئا لەم جۆرەیە لەو ئاستەدایە ئەمری تۆمار کات؟
تۆماس: کەسانێکی تر کاڵای راستیان پێشکەش کردووە
کاڵای حەقیقی، بەڵام بێ نرخ

تۆش تەنها خەونێ پێشکەش ئەکەی ڕێگای (فەنا) بوون ئاشکرا ئەکات.

فریودەری چوارەم: تۆش تەنها خەونت پێوە بینیوون.

تۆماس: داخۆ لەمەودای ڕۆحی ماندووما، ڕێگایەك نی‌یە بەرەو هەڵەی خۆ بەزل زانین ڕێ نەگرێتەبەر؟

من چاك ئەزانم ئەم سەرمەست بوونە خامۆشی ئێستاو ئازاری سبەی ئاشکرائەکات.

داخۆ تاوانی هەست بەگەورەیی، بەتاوانی تر لەناو ئەبرێت؟

داخۆ ئەتوانم بەبێ ماندووبوون کارێ ئەنجام دەم، ئازار، بچێژم؟

تەفرەدەری چوارەم: تۆ بزانی یان نەزانی، چی ئەکەی یان چۆن ئازار ئەچێژی

تۆ بزانی یان نەزانی ئەو کارەیە ئێش‌و ژانە، ئازار چەشتنیش کارە.. نەمرۆی چالاك ئازار ئەچێژێ نەئەوەی کەوا بینی درێژە هیچ کارێ ئەکا

بەڵام ئەم دووانە لەکاری هەتاهەتایی‌و لەخامۆشی ئەبەدیدا هاوپەیمانن

هەمیشە پابەندن بەوەی کە ئەیانەوێت، دیارە نموونە ئەمێنێتەوە

میللی زەمەنیش ئەسووڕێتەوە تا بۆ ئەبەدی ئارام ئەگرن.

کۆرس: ئاسایش نی‌یە لەماڵدا، ئاسایش نییە لەنێو شەقامدا

گوێم لەدەنگی پەشێوی قاچ لەعەرد دانە

هەواش بەهێزەو گەردەلول ئەکا، ئاسمان هەورو تاریکە

زەوی پاڵ ئەنێ بەقاچمانەوە، ئەم بۆنە ناخۆشە چی‌یە، چی‌یە ئەم تەمتوومانە؟

ئەم تیشکە سەوزە تیژڕەوە چی‌یە لەکلوی هەورەوە دائەبەزێتە سەرداری وشکەڵ؟

زەمین هەست ئەکا بەسەرهەڵدانی زیندووبوونەوە لەنێو دۆزەخا

ئەم شەونمە شێدارە چی‌یە لەبەری دەستما کۆئەبێتەوە؟

تەفرەدەری چوارەم: ژیانی مەردووم فێڵ‌و بێ ئومێدی‌یە

سەرجەم شتەکان هەموویان ساختەن، ساختەین یان بێ ئومێدین

عەرەبانەی کاترین‌و پشیلەی خامۆش ئەو خەلاتانەی لە ئاهەنگی منداڵا ئەدرێن

ئەوخەلاتەی بە باشترین وتاری ئینگلیزییە ئەدرێ

نمرەی قوتابی‌و ویسامی پیاوانی دەوڵەت

ئەو شتانەن ڕاستی کەمیان تێدایە، مرۆڤیش لەدرۆیەکەوە بۆ درۆیەکی تر هەنگاو هەڵدێنێ

ئەم بنیادەمە چەندە مەگروونە، نابینایەو، سوورە... لەسەر خۆکوشتن.

لەفێڵێکەوە بۆ فێڵێکی دی هەنگاو هەڵدێنێ

لە شکۆمەندیەکەوە بۆ شکۆمەندیە تر، هەتاکو ئەگا بەدواخەیاڵی

لەسەرسام بوونیا بەمەزنی خۆی، خۆی لێ ون ئەبێ هەتا ئەبێتە دوژمنی کۆمەڵ‌و دوژمنی خۆیشی.

قەشەی سێیەم: ئۆ.. گەورەم، تۆماس دژی شەپۆلی هەڵچوو مەجەنگێ

ئەبەرەو ڕووی با، نە لە زریانا گەمی مەڕانە

ناشێ، چاوەڕوان بکەین هەتاکو زەریا هێوربێتەوە

لە دەمی شەودا چاوەڕوان ئەکەین کە ڕۆژ بێتەوە

بۆ ئەو کاتەی کەوا کاروانچی ڕێگای کاروانی بدۆزێتەوە، تاگەمیەوانیش پشت لە ڕۆژ بکا؟

(کۆرس‌و قەشەو تەفرەدەرەکان یەك بەدوای یەکدا)

كۆرس: ئەوە بایەقووشە کەوا ئەخوێنێ، یان هێمایەکە لەنێو دارانا؟

قەشە: ئەوە کێلوونە کەوا پەنجەرەی چەسپ کردووە، ئەی داخۆ دەرگا کلۆم دراوە؟

ئەفرەدەری چوارەم: ئەوە بارانە کەوا ئەکێشێ بەپەنجەرەدا

ئەی ئەوە بایە شانشانێن لەگەڵ دەرگاکە ئەکا؟

کۆرس: ئەشێ لەمۆڵدا گڵۆپ داگیرسێ، لەژووریشەوە مۆم گرپدرێ؟

قەشە: داخۆ ئێشکچی نزیکی دیوار هاتوچۆ دەکات؟

ئەفەردەری چوارەم: داخۆ سەگی زل نزیک دەروازە ئەسووڕێتەوە؟

کۆرس: مەرگ، سەد دەستی هەیەو، بەهەزار ڕێشدا ڕێگای خۆی ئەکا.

قەشە: بەشێوەیەک دێ خەڵک بیبینێ، بەڵام وا ئەڕوات کە ئەبینرێ، کە نە ببیسترێ.

ئەفرەدەر: دێتو بەچرپە خۆی ئەکاتە گوێدا، یان زۆر بەتووندی لەکەللە ئەدات.

کۆرس: شەوێ کابرایە ئەڕواو چرایە وابەدەستییەوە، کەچی ئەکەوێتە کەندەڵانێکەوە.

قەشە: ئەشێ لەڕۆژی ئاشکراو ڕوونا مرۆڤ بەپلیکانەدا سەرکەوێ. بەپەیژەیەکی شکاوا بخلیسکێتە خوار.

ئەفرەدەری چوارەم: پێ ئەچێ لەکاتی گۆشت خواردندا هەست بەسڕبوونی سمتی بکات.

کۆرس: گەورەم ئێمە دڵئاسوودەنین

هیچ ئاسوودەنین. ئێمە ئافرەتانی گەمژەنین، ئەزانین کەوا چاوەڕێی چینو چاوەڕێی چی نین.

لەبارەی ئازاردانو چەوساندنەوەوە شتێ ئەزانین

ئاگامان لەتەقینەوە، لە زەبرو زەنگ، لە هەژارێتیو لە نەخۆشیشە

لە وەرزی زستان پیر بێ ئاگرە، وەرزی هاوینیش ساوا بێ شیرە

ئیشو کاریشمان لەدەست دەرئەچن

تاوانەکانمان لەباری شانمان گرانتر ئەبن

بینیمان لاوێ خراپەی ئەکرد

کیژێ بریندار لەسەر جۆگای ئاش گیانی ئەلەرزێ

کەچی ئاوەهاش ئێمە هەر ئەژیاین، لەنێوان مەرگو ژیانا.. ئەژیاین.

ئەو شتانەی کەوا پارچە پارچە بوون یەکمان ئەخستن

دەمی ئێواران دارمان کۆ ئەکردەوە

ژێر زەمینی سادەو ساکارمان بینا ئەکرد.

بۆ خەوو خواردن، بۆ خواردنەوە، بۆ پشووگرتن.

یەزدانیش هەردەم ئاوەزو هیوای پێمان ئەبەخشی

بەڵام ئێستاکە زەبرو زەنگێ نوێ سەری تێ کردووین

کەسێ ناتوانێ دوورەپەرێزبێت، کەسێ ناتوانێ دوورکەوێتەوە

ئەم زەبرو زەنگە بەژێر پێمانا، بەرووی ئاسمانا تێکڕا ئەکشێ

لەژێر دەرگایان، لە دووکەڵ کێشان بڵاو ئەبێتەوەو گوێچکە ئەگرێت

دەمو چاوانیش هەردووک پڕ ئەکات.

خوا لەبەزیی بێ بەشمان ئەکا، جێمان ئەهێڵێ

ئەوساش ئازارو جەور، لەئازاری لەدایک بوون یاخود گیان کێشان جەرگ بڕترە.

عەرەقو پف بوونەوە لەهەوای چڕا. بۆنی خنکێنەری بێ ئومێدی ئەڕەوێننەوە

وێنەکان لەهەوای چڕدا بەرجەستە ئەبن، ئەڕەی پڵنگو شوێن پێی ورچی بەڕێیا ڕۆیشتوو

بڕینەوەی چڵی درەخت کاتێ کە مەیموون پیاشۆڕیۆتەوە

کەمتیاری هەوشار چاوەڕوانی پێکەنین‌و پێکەنین ئەکا

پیاو ماقووڵانی دۆزەخ ئامادەن دەورت ئەدەن‌و لەبەردەمتا سەرنەوی ئەکەن

لەهەوای چڕا بەم دیووەو دیوا ئەچەمێنەوە

ئۆه تۆماسی سەرۆکی قەشە، رزگارمان بکە، رزگارمان بکە

خۆیشت رزگاریکە تا بپارێزرێیت، گەر خۆت تێکشێنی ئێمەش تێك ئەشکێین.

تۆماس: ئێستاکە رێگام ئاشکراو روونە..

ەبەستیش دیارە:

بەهەڵەدا بردن (سەرگەرم کردن) دیسان جارێ دی وانایەتەوە

داخۆ (فریودان) بەرزترین پلەی ناپاکیتی‌یە

کەکارێکی چاك لەپێناوی هەڵەیەکا بکەی راپەڕینێکی سروشتی لەهەڵەیەکی ئاساییدا..

لەو رێگەیەوە ژیانمان لێوەی سەرچاوە ئەگرێ.

بەرلە سی سالان هەرچی رێگایە کەبۆ خۆشبەختی‌و بۆ پێشکەوتن‌و بۆ مەدح کردنە هەمووم پشکنین

هەستی بەختیاری، بیرکردنەوە، لەگەڵ فێربووندا، مۆسیقاو فەلسەفە، هەستی زاتخوازی

چۆلەکەیەکی رەنگ ئەرخەوانی‌یە کە لەسەر داری زەنبەق ئەخوێنێ

شارەزایی مەیدان، سەردەکردن لەیاری شەترەنج

ژوانی نێو ئامێزی باخ، گۆرانی چڕین لەگەڵ مۆسیقای ئامێری نوێدا

هەموو ئەو شتانەن کە بێ جیاوازی ئارەزوو ئەکرێن

تەماح ئەو کاتێ دێ چی تر دەرك ناکەین کەوا هەمووشتێ جێگای شیانە

تەماح بێ دەنگ دێ‌و ناشبینرێ بەچاو، تاوان لەگەڵ چاکەدا تەشەنە ئەکا

ئەو رۆژەی کەوا یاسای پاشایم لە ئینگلتەرەدا چەسپاند

لەگەڵ پاشادا بەرامبەر (تۆلۆز) جەنگم هەڵگیرساند

لە بارۆنم دا لەشوێنی خۆیان بەدوای ئەوەشدا، دژی ئەوانە دووام، وایان ئەزانی کەسێکی سووکم..

دژی خانەدان، ئەوانەی کەوا رەوشتیان بەقەد درێژی نینۆکیان ئەبێت پاشان لە (قاپی) پاشا نانم خوارد.

هەتا ببمە بەندەی خواوەند، ئەگەر چی پێشتر ئاواتی ئەوەم هەرگیز نەخواستووە.

بەندەی خواوەند زیاتر لەبارە بۆ تاوان کردن، بۆ ئازار چەشتن

لەچاو ئەو کەسەی کەوا خزمەتی پادشا ئەکات. کەسێ خزمەتێ بیرێ مەزن بکات، ئەشێ ئەو بیرەش خزمەتی بکات.

کاری دروستیش تەنها ئەوەیە: خەبات کردن لەگەڵ کەسانی سیاسی ئەشێ ئەو بیرە بکات بە سیاسەت

نەك لەڕوانگەی ئەوەی کە ئەیکەین بەڵکو لەڕوانگەی ئەوەی لەسەرین

من ئەوە ئەزانم کە مێژووی ژیانم شتێ بێ‌نرخە، خۆکوشتنێکی گەمژەیی‌و

گەلێك شێتانەو هەڵچوونی رەگەزپەرستی‌و [illegible]

ئەزانم کەوا هەموو زەمانێ مێژوو ئەنجامی سەرسووڕهێنەری لەهۆکارە زۆر لاوەکی‌یەکان وەئەنجام دێنێ

بەڵام هەرچی کاری خراپ‌و ناچیزانەیە، هەرچی تاوان‌و زەبرو زۆرە

هەرچی دەمی تیژی تەشوێیە کەمتەرخەمی بەکارهێنانە.

تۆو تۆو تۆ پێویستە کەوا سزا بدرێن، هەروەها ئێوەش

چی تر من لەگەڵ تیژی شمشێردا نەکاریێ ئەکەم، نە ئازار ئەخۆم

ئەمێستاش ئەی فریشتە چاکەکەم، نێردراوی یەزدان بۆ ئێشك گرتنم سەرکەوە بەسەر دەمی شمشێردا.

(وەستان)

بەیانی جەژنی لەدایك بوونی ساڵی ١١٧٠ سەرۆکی قەشە لەکڵێسە وتار ئەخوێنێتەوە.

شکۆمەندی بۆ ئەو یەزدانەی لەبەرزترین جێگایە، سڵاو بۆ ئاشتی پەروەرانی سەرزەمین.. ئایەتی چواردە، بەشی دووەمی ئینجیل (قەشە لۆقا)

بەناوی باوك و رۆڵەو رۆحی پیرۆزەوە.. ئامین.

جگەرگۆشە خۆشەویستەکانی یەزدان، وتاری ئەم بەیانی جەژنەم گەلێك کورت ئەبێت، تاکە هیوام ئەوەیە لەم رۆژی جەژنەدا لەقووڵایی ناختانەوە هیوای قووڵ و نهێنی مەزن بخوازن. کاتێ قەدیس ئەفەرموێ ئێمە بۆ ئازارو مەرگی گەورەمان ئامادەبووین، لەم جەژنەدا ئاهەنگ بۆ لەدایك بوونی ئەو ئەگێڕین و لەهەمان کاتیشدا دڵخۆشین بە تەشریف هێنانی بۆ رزگارکردنی خەلکی و لەپێناوی ئەو مەبەستەدا جارێکی دی خوێن و جەستەی پێشکەشی یەزدان ئەکات وەکو قوربانی و خۆبەخت کردن و قایل بوون بەهەموو تاوانەکانی دنیا. هەر شەوی رابردوو بوو ژمارەیەکی زۆری فریشتە لەبەردەم چاودێرانی (بەیتوللە حمدا) دەرکەوتن و ئەیان گووت:

شکۆمەندی بۆ یەزدان لەبەرزترین جێگاو سڵاویش بۆ ئەوانەی لەسەر رووی زەمین ئاشتی خوازن.. هەموو ساڵێ لەهەمان کاتدا ئاهەنگی جەژنی لەدایك بوونی (گەورە) مان لەگەڵ ئازارو چوارمێخەکێشانەوەیدا ئەگێڕین. خۆشەویستانم هەروەکو دیارە ئەوە بە مەبەستی رەفتارکردنە لەشێوەیەکی سەرنج راکێشدا. هەرکەسیش لەم دونیایەدا بێت ئەشێ ئازار بچێژێ و خەنیش بێت.. هەر لەبەر هەمان هۆ، ئەو ساتەش یان ئازار باڵا دەست ئەبێ بەسەر خۆشنوودیا، یان ئازار لەژێر کاریگەری ئاسوودەیدا تەرە ئەکرێ، بەم شێوەیە تەنها لەم کەشی سۆفێتی یەی مەسیحدا لەهەمان کاتدا خەمبارو خەنیش ئەبین بەکاریگەری هەمان هۆکار، ئێستاش تەنها ساتێك بیر لە واتای ئەم وشە بکەنەوە (ئاشتی)، داخۆ بەلای ئێوەوە ئاشتی کەوتۆتە بەرچەپۆکی جەنگو مەترسی ئەو جەنگە؟ داخۆ بەلای ئێوەوە دەنگی فریشتە مەڵەیە، پەیمان دان فێڵ و تەڵەکەو بێ ئومێد بوونە؟

ئێستا رابمێنن، سەرۆکمان خۆی بە چ شێوەیەك دەربارەی ئاشتی دوا.. بەدەورو پشتەکەی گووت:

ئاشتی بۆ ئێوە بەجێ دێڵم، ئاشتی ئەبەخشمە ئێوە. داخۆ ئەو مەبەستی لەو ئاشتی یە بوو ئێمە بیری لێ ئەکەینەوە..؟ ئینگلتەرا لەگەڵ دراوسێکانیدا لەئاشتیدا بێت، بارۆنەکان لەگەڵ پاشادا لە ئاشتی دا بن، خاوەن خانوو قازانجی خۆی بە ئاشتی وەربگرێ، دڵی بێگەردیش باشترین شەرابی بۆهاورێکەی لەسەر مێز هەبێ، ژنەکەشی گۆرانی بۆ منداڵەکان بچڕێ؟ ئەو پیاوانەی هیچ ئاگاداری ئەم شتانە نین. کەوتوونەتە سەرگەشتێکی دیلێتی و بێ ئومێدی بناسن و لەرێگای شەهیدبوونەوە چێژی ئازاری مەرگ بکەن. دوای ئەمە مەبەست چی یە؟ ئەگەر پرسیاری ئەوە بکەن، ئەوا یادتان ئەخاتەوە کە هەر ئەو کاتە گووتوویەتی:

(بەو شێوەی دونیا پێتان ئەبەخشێ من پێتان نابەخشم)) دوای ئەوە ئاشتی ئەبەخشێتە شاگردەکانی، بەڵام جودایە لەو ئاشتی یەی دونیا ئەیبەخشێ..

بیر لە شتێکی وەها بکەنەوە کەتاکو ئێستا بەخەیاڵتاندا نەهاتووە، ئێمە تەنیا بۆ جەژنی لەدایك بوونو کۆچی مەسیح ئاهەنگ ناگێڕین، لە ڕۆژانی داهاتوودا ئاهەنگی شەهیدبوونی یەکەم شەهید ساز ئەکەین، کە ئەویش ((ستیڤن)) ی پیرۆزە. داخۆ وەکو بزانن بەڕێکەوت بووە کە ڕۆژی یەکەم شەهید ڕۆژی دوای لەدایك بوونی مەسیحە؟ بێ چەندو چوون هەرچۆن ڕاستەوخۆ خەنیو دڵتەنگیش ئەبین بەبۆنەی لەدایك بوونو دیسان ئازار چەشتنی گەورەمان (مەسیحەوە) هەمان شێوە بەمەرگی شەهیدان خەنی ئەبینو ئازاریش ئەچێژین. خەنی ئەبین بەوەی کە گیانێکی تر چووە پاڵ ئەو گیانە پیرۆزانەی بەهەشت لەپێناوی شکۆمەندی یەزدانو ڕزگارکردنی بنیادەم دا.

خۆشەویستان ئێمە بەو جۆرە بیر لە شەهیدبوون ناکەینەوە وەکو مەسیحییەکی پیاو چاك لەبەرئەوەی مەسیحی بووە شەهید کراوەو بەو پێیەش گەلێك بۆی دڵتەنگ بین. نەخێر ئێمە وەکو مەسیحییەکی پیاو چاك بیر لەو کەسە ناکەینەوە لەبەر ئەوەی بچێتە ڕیزی قەددیسەکانەوە. لە ڕاستیدا ئەوەش مایەی دڵخۆش بوونە. بۆیە نە دڵخۆش بوونمان نە دڵ تەنگیمان وەك ئەوەنییە لەدونیادا هەن.

شەهیدبوونیمەسیحانە هەرگیز ڕێکەوت نییە، قەددیسەکانیش ڕێکەوت دروستیان ناکات. شەهیدبوونی مەسیحانە بەلایەنی کەمەوە لەتوانای کەسێکەوە دێت شایانی ئەوە بێت ببێتە قەددیس هەرچۆن کەسێك بەتواناو هەوڵو تەقەلا ئەبێتە سەرۆکی خەڵکی. شەهادەت هەموو کاتێ لەنەخشەکێشانی خودایە لەئەنجامی خۆشویستنی مرۆڤایەتیدا کە بە ئاکایان دێنێو ڕێنوێیان ئەکاتو ئەیان گێڕێتەوە سەر ڕێگای خۆی... نەخێر شەهادەت هەرگیز مرۆڤ دروستی ناکات، شەهیدی ڕاستەقینە ئەوکەسەیە کە بۆتە (ئامرازی) دەستی خواوەندو توانای خۆی لەتوانای ئەودا ونکردووەو چیتر ئارەزووی هیچ شتێ بۆخۆی ناکاو تەنانەت لەوەش دەرچووە کە ئارەزووی شکۆمەندی شەهیدبوون بکات. بەم شێوەیە چۆن لەسەر زەمین کەنیسە ئازار ئەچێژێو دڵخۆشیش ئەبێ.. بەشێوازێ کە خەڵك تێناگا، هەمان شێوە لە بەهەشتیشدا قەددیسەکان لەپلەی بەرزدان کەچی زۆر ئاسایی خۆیان نیشان ئەدەن، بەپێچەوانەی ئەوەوە ئەبینرێن کە ئێمە ئەیان بینین، بەڵام لەبەر ڕووناکی گەشانەوەی یەزداندا بوونی خۆیان درێژە پێ ئەدەن.

ئەی جگەر گۆشە خۆشەویستەکانی یەزدان ئەمڕۆ دەربارەی شەهیدانی ڕابردوو بۆتان دوام، داواتان لێ ئەکەم بەتایبەتی یادی شەهیدی کانتربێری، سەرۆکی قەشە (ئیلیفیچی) پیرۆز بکەنەوە، چونکە جێگای خۆیەتی لەجەژنی لەدایك بوونی مەسیحدا یادی ئەو ئاشتییە بکەینەوە کە لەگەڵ خۆی هێنایی، لەبەرئەوە ڕۆڵە خۆشەویستەکانم بڕوا ناکام جارێکی دی وتارتان بۆ بدەمو لەوانەشە لەم نزیکانەدا شەهیدێکی ترتان هەبێو ئەوەش دوا شەهید نەبێت. داواتان لێ ئەکەم ئەم وشانەی ئەیاندرکێنم ئەزبەریکەنو لەکاتێکی تردا بیریان لێبکەنەوە.. بەناوی باوكو ڕۆڵەی ڕۆحی پیرۆز.

ئامین

❖❖

## بەشی دووەم

کارەکتەرەکان:

سێ قەشە، کۆرسی ئافرەتانی کانتربێری، چوار سوار، سەرۆکی قەشەکان، تۆماس پێکت، دەست و پێوەند

دیمەنی یەکەم لەهۆڵی سەرۆکی قەشەو دیمەنی دووەم لە کلێسەو لە رۆژی ٢٩ ی دیسەمبەری ساڵی ١١٧٠ رووئەدات.

کۆرس: داخۆ لە باشوور باڵندە ئەخوێنێ؟
مەلی دەریا ئەگری، زریان بەرەو وشکایی ئەبات
کوا نیشانەی بەهاری ئەم ساڵ؟ جگە لەکۆچی دوایی بەساڵاچوان هیچ جووڵە نی‌یە
دەرچوون نییە، هەناسە نییە، داخۆ رۆژ دەستی بەدرێژبوون کردووە؟
رۆژی گەرمو درێژ، شەوی کورتو سارد، بەڵام تا ئێستاش هەوا خامۆشە
ئەگەر چی لەلای رۆژهەڵاتەوە زریان هەڵ ئەکات
قەلەڕەشی برسی لەنێو کێڵگەدا کەوتووە
بەڵام وریابە لەدارستاندا بایەقووش گۆرانی مەرگی بێهوودە ئەڵێتەوە
کوانێ دروشمی بەهارێکی تاڵ؟ باهۆز لەرۆژهەڵات بەریەرست کراوە.
داخۆ جەژنی لەدایك بوونی سەروەرمان، یادی گەورەمان مەسیح
هاتنی ئاشتی نی‌یە بۆسەر رووی زەمین، خۆشنوودی نی‌یە بۆهەموو مەردووم؟
ئاشتی ئەم دنیا جێگای گومانە، مادەم کە خەڵکی چاوەڕوانی ئاشتی یەزدانن
جەنگی نێو خەڵکی دنیا پیس ئەکات، مەرگی (گەورە) مان نوێ ئەکاتەوە
پێویستە دنیا لەوەرزی زستان خاوێن بێتەوە
ئەگینا دوایی بەهارێ تاڵو هاوینێ وشکو دروێنەیەکی بێ سوودمان ئەبێ

لەنێوان جەژنی لەدایك بوونو جەژنی قوربانا چ کارێ ئەکرێ؟
لەمانگی مارتا جوتیاران هەموو ئەچنە کێڵگەکان
ئەو زەوییانە ئەکێڵنەوە کە وەرزی پێشوو وەردیان بڕیبوون
باڵندەش هەمان گۆرانی ئەوسا ئەچڕنەوە
کاتێ کە گەڵای دەرخت ئەوەرێ
کاتێ کە پیران لەسەر جۆگەکان ئەتریقێنەوە
هەوا خاوێنەو بەرز ئەبێتەوە.
دەنگ لە پەنجەرا ئەزرنگێتەوە، منداڵ لەبەردەرگا یاری ئەکا
چ کارێ ئەنجام ئەدرێ،
چ هەڵەیەکە خوێندنی باڵندە دەشارێتەوە؟
درەختی سەوز هەرچی هەڵەیە سەری ئەپۆشێ
داخۆ زەوی جوان ئەشارێتەوە؟ ئێمە.. چاوەڕوان ئەکەین..
کاتیش زۆر کورتە، بەڵام مەودای چاوەڕێکردن دوورو درێژە.
(قەشەی یەکەم دێتە ژوورەوە، قەدیس ستیڤنی لەپێشەوەیە)
(ئەم دێڕانەی نێوان کەوانەکان بەگۆرانی ئەوترێن)
قەشەی یەکەم:
لەرۆژی لەدایك بوونەوە، لەرۆژی قەددیس ستیڤەوە، یەکەم شەهید
میران دانیشتوون شاهیدی درۆم بەرامبەر ئەدەن
ئەو رۆژەی کە لای سەرۆکی قەشە زۆر خۆشەویست بوو کڕنووشی بردو بەدەنگی بەرز هاواری کرد
گەورەم ئەم تاوانە مەخە ئەستۆیان، لەپاشی ئەمە میران بێ دەنگ بوون
(سروودی قەددیس ستیڤن ئەبیسترێ)

(قەشـەی دووەم دێتــە ژوورەوەو پـارێزەری قەدیس جۆنی لەپێشەوەیە)

قەشـەی دووەم: لـە رۆژی لـەدایك بوونــی قەدیس ستیڤەوە

لـەرۆژی لـەدایك بوونـی قـەددیس جۆنـەوە لەکۆبوونـەوەدا دەربـارەی (سـەرەتا) زمـانی لێ راکێشا..

دەربارەی ئەوەی بیستمان، ئـەوەی بینیمـان بەچاوی خۆمان

ئـەوەی بەدەســتمان گرتمــان، دەربــارەی زاراوەی ژیان

ئـەوەی بینوومانـە، ئـەوەی بیستوومانە لـەم کۆبوونەوەیەدا، بۆتان روون ئەکەینەوە.

(سروودی قەدیس جۆن ئەبیسترێ)

(قەشـەی سـێیەم خـۆی ئـەکات بـەژووردا، پارێزەرانی نوورانیو پیرۆز وان لەپێشیەوە)

قەشــەی ســێیەم: لەســەردەمی قــەدیس جۆنەوە، لەسەردەمی قەددیسانی پیرۆزەوە.

ئەی خوایە، ساوایانی تازە لەدایك بوو

وەکو هاژەی ئاوەکان، وەکو هەورە بروسکەو دەنگی قیسارە گۆرانیان گووت

وەکو ئەوەی ئاوازی نـوێ بچریکێنـن، خوێنـی قەددیسەکانت وەکو ئاو رۆیشت.

کەسێ نـەبوو بیـان شـارێتەوە، ئۆھ گـەورەم تۆڵەی خوێنی قەددیسان بسێنەرەوە

لە (رۆما) وە ئاوازی گریان ئەبیسترێ

ئەی خودایـە سـەدای گریـانی سـاوایانی تـازە لەدایك بووە.

(قەشەکان پێکـەوە هەڵئەسـتن، پـارێزەران لەدوایانەوەن)

قەشــەی یەکــەم: لــەرۆژی قەددیســانی پـیرۆزەوە، لـە چـوارەم رۆژی جـەژنی لـەدایك بوونەوە.

هەموو قەشەکان: هەموو ئاسـوودەین و یـادی ژی پیرۆز ئەکەینەوە.

قەشەی یەکەم: لەپێناوی خەڵکیدا، لەپێناوی خۆیدا

نوێژ بۆ پاك بوونـەوەی گوناھـەکانی ئـەکاو ژیانی خـۆی بۆ ئەوانـەی لەدوایـەوەن تـەرخان ئەکات.

قەشـەکان: بـەیادی پـیرۆزەوە هـەموو ئاسوودەین.

قەشەی یەکەم: ئەمڕۆ؟

قەشـەی دووەم: ئـەمڕۆ، ئـەمڕۆ چ رۆژێکــە وانیوەی رۆیشت؟

قەشـەی یەکـەم: ئـەمڕۆ، ئـەمڕۆ چ رۆژێکـە؟ رۆژێکی ترو تاریکایی ساڵە.

قەشـەی دووەم: ئـەمڕۆ چ رۆژێکە، شـەوێکی ترو ئاسۆیە ترە.

قەشـەی سـێیەم: ئـەوە چ رۆژێکـە، لـێ ئاگـادارین.. هیـوای ئـەخوازین یـان لــێ دەترسین؟

هەموو رۆژێ ئەو رۆژەیە ئـەبێ لێی بترسین، یان هیوای بخوازین

هەر زەمەنێ چەشنی زەمەنێکی تر ئەکێشرێ

تەنها لـەبیرەوەریو هـەڵبژاردنا ئـەڵێن رۆژێك بوو

بەڵام تەنگانەش هەردەم وا لەرێدایە

تەنانەت لەدرێژبوونەوەی شتە پیسەکانا

ئەمێستا ئەشێ ئامانجی نەمری دەرکەوێ.

(چوار سوار دێنـە ژوورەوە، پـارێزەران دیـار نامێنن)

سواری یەکەم: ئێمە خزمەنچی پاشاین.

قەشــەی یەکــەم: لێتــان بــەگومان نـین، سـەرچاوان هــاتن، داخـۆ لەشـوێنێ دوورەوە هاتوون؟

سواری یەکەم: بۆکاری پەلـە، نـەخێر دوور نییە، هـەر ئەوکارەیە لـە فەرەنساوە هێنانییـە ئێرە

دوێنێ بەسواری کەشتی راینمان

شەوی رابردوو لە ڕۆخ دابەزین
لەگەڵ جەنابی سەرۆرك قەشەکان کارمان هەیە.
سواری دووەم: کاریّ پەلەیە.
سواری سیّیەم: لەلای پاشاوە.
سواری یەکەم: پیاوەکانمان وان لەدەرەوە.
قەشەی یەکەم: ئێوە شارەزای خانەدانێتی سەرۆکی قەشەن
ئێمە ئێستاکە ئەڕۆین شیڤ بخۆین
سەرۆکی مەزن دیارە زویر ئەبێت
گەر بێت و لەپێش کارەکەتاندا
ڕێزی میوانتان پێشکەش نەکەین، تکایە بەشداری خواردنمان بکەن
با پیاوەکانیش کەمێك وریابن، نان خواردن لەپێش کارکدرندایە
داخۆ ئارەزووی گۆشت بەراز ئەکەن؟
سواری یەکەم: کار ئەکەوێتە پێشی نان خواردن
بەکەمجار گۆشتی بەراز ئەبرژێنین، ئەنجاکە ئەیخۆین.
سواری دووەم: پێویستە سەرۆك قەشە ببینین.
سواری سیّیەم: بڕۆ بەسەرۆك بڵێ
میواندارییمان هیچ پێویست نییە
خۆمان خواردنمان مسۆگەر ئەکەین.
قەشەی یەکەم: (بۆخزمەتکار) بڕۆ بەسەرۆك بڵێ.
سواری چوارەم: داخۆ هەتاکەی بەچاوەڕوانی ئەمان هێڵنەوە؟
(تۆماس خۆی ئەکات بە ژووردا)
تۆماس: (بۆ قەشەکان)
ئەوە بۆچوونمان چەندیّ ڕێك دەرچوو
ساتی پێشبین کراو ئەشیّ چاوەڕوان نەکریّ کاتیّ کە ئەگات
ئەوکاتیّ ئەگات ئێمە سەرقاڵی هێندیّ شتی پەلەین
لەسەر مێزەکەم پەڕەی ڕێکخراو ئەدۆزنەوە،
لەگەڵ بڕوانامەی ئیمزاکراودا.
(بۆ سوارەکان)
بەسەر چاوان بێن، ئەبێ ئەو کارەی بۆی هاتوون چی بیّ؟
کە ئەڵێن گوایە.. نێردراوی پاشان.
سواری یەکەم: بەدڵنیاییەوە نێردراوی پاشاین
پێویستە کەوا بەتاك و تەنیا لەگەڵت بدوێین.
تۆماس: (بۆ قەشەکان) کەواتە تەنیا جێمان بهێڵن
ئێستا پێم بڵێن مەسەلە چییە؟
سواری یەکەم: ئەمە کرۆکی مەسەلەکەیە
تۆ ئەی سەرۆکی قەشە، دژی پاشا هەستاوی
دژ بە پاشای وڵات، بەرامبەر یاسا شۆڕش ئەگێڕی
تۆ ئەو سەرۆکی قەشەیەی کەوا پاشا دایناوی
هەتا فەرمانی جیّبەجیّ بکەی.
تۆ خزمەتکارو ئامرازی دەست و هەم کەری ئەویت
چاکەی ئەوت لەخۆت بارکردووە.
هەرچی شەرەف مەندیتە هەر ئەو پێی داوی
هێزیشت لەئەو بەدەست هێناوە، ئەو کابرایەکی کوڕە بازرگانە
شەمشەمەکوێرەی ڕیزی دواوە بوو کە لە (چیپساد) چاوی هەڵهێنا.
ئەمە ئەوەیە کە بەرەو پاشا چنگەکڕیّ کرد..
بەکاریگەری پەستانی خوێن و هەستی خۆگەورەزانین
لەپیسی شاری لەندەن دەرچوون و هەروەکو ئەسپیّ بەکراسەکەتدا.. هەڵگەڕان.
فێڵباز، خۆحەشاردەر، ناپاك، سوێندی شکاندووەو ناپاکی لەگەڵ پاشاکردووە.

تۆماس: ئەمە راست نییە، من، بەرلەوکاتەی ببمە لێپرسراو
تەنانەت ئەوساش هەردەم دڵسۆزبووم بەرامبەر جەنابی پاشا.
جێگای خۆم پاراستووەو فەرمانی ئەوم بەجێهێناوە
هەرخۆم یەکەمین دڵسۆزی ئەوبووم لەسەر رووی زەمین.

سواری یەکەم: جێگای خۆت بپارێزە، تا بتپارێزێ..
پێم وایە ئەوەی کە من بۆی ئەچم وەها دەرنەچێ
پاراستنی ویستەکانت شتێکە ئەتەوێت
شان بەشانی خۆ بەگەورەزانین‌و چاوچنۆکی‌و بەدمیزاجیت.

سواری دووەم: سووربوونت لەسەر مل هوڕی‌و چاو چنۆکیت
داخۆ وامان لێناکات لەکاتی پێویستا لەخودا بۆت بپاڕێینەوە؟

سواری سێیەم: بەڵێ بۆت ئەپاڕێینەوە!
سواری یەکەم: بەڵێ نوێژت بۆ ئەکەین!
هەرسێ سوارەکە: بەڵێ لەیەزدان ئەپاڕێینەوە، بەڵکو یارمەتیت بدات!

تۆماس: بەڵام پیاوچاکان، ئێوە گوتتان کە ئیشەکەتان زۆر بەپەلەیە
بەڵام داخۆ تەنیا هەر سەرزەنشت‌و ریسواکردنە؟

سواری یەکەم: وەگو کەسانێ دڵسۆز ئەوە شێوازی سووك کردنمان بوو.
تۆماس: دڵسۆز؟ بۆ کێ؟
سواری یەکەم: بۆ پاشا!
سواری دووەم: بۆ پاشا!
سواری سێیەم: بۆ پاشا!
هەرسێ سوارەکە: یەزدان بەرقەراری کات!

تۆماس: ئێستا پاڵتۆی دڵسۆزیتان بەوریایی لەبەریکەن
هەتا پیس نەبێ‌و نەدڕێ، داخۆ شتێکتان هەیە بیدرکێنن؟

سواری یەکەم: فەرمانی پاشا... ئێستا پرکێشی درکاندنی ئەکەین؟

سواری دووەم: بەبێ دواکەوتن، بەرلەوەی پیرەرێوی دوورکەوێتەوە یان لێرەوە بڕوا.

تۆماس: چیتان هەیە بیڵێن، فەرمانی پاشا، ئەگەر فەرمانی پاشایانە بێت
ئەبێ لەبەردەم خەڵکا بگوترێ
ئەگەر شتێکتان خستە پاڵم ئەوا منیش لەبەردەم خەڵکا تێکڕای ئەو شتە پووچ ئەکەمەوە.

سواری یەکەم: نەخێر! نە ئێستاو نە لە ئێرەشدا!

(خەریکە دەست درێژی بکەنە سەری، بەڵام قەشەکان‌و دەست‌و پێوەند ئەگەڕێنەوەو بەتەواوی هێوریان ئەکەنەوە)

تۆماس: با ئێستاو هەر لەئێرەشدا!

سواری یەکەم: کردەوەی هیچی ئەوسات ناونابەم، ئاشکرا دیارن
بەڵام دوای کۆتایی هاتنی کێشەی فەرەنسا
کاتێ کەبوویتە یەکەم لێپرسراو، چۆن رێزی خۆتت نیشان دا؟
لە ئینگلتەرە تۆ هەڵهاتوویت، نە نەفی کراو بوویت، نە سەرزەنشت کراو
هەمووی دێنمەوە یادت، ئەویش بەهیوای ئاژاوەگێڕی لەقەڵەم ڕەوی هەموو فەرەنسا
تۆ تۆوی کێشەت لەدەرەوە چاند، بەویستی پاپا سەرزەنشتی پاشای فەرەنسات کرد
بیروبۆچوونی هەڵەت بۆ هەڵەبست.

سواری دووەم: سەرباری ئەمە پاشا هێشتاکە هەر لەسەرخۆیەو
پاڕانەوەی هاوڕێکانت کاری لێکردووەو

بۆبەڵێنی ئامادەگی خۆی بۆ ئاشتی نیشان داوە

چی گفتوگۆیە کۆتایی هاتووە.. تا بتگێڕێتە دواوە، وەك داوات کردووە..

سواری سێیەم: بیرەوەری سەرکێشییەکانی ڕۆژانی ئەوسات بخەرە لاوە

سامان و شەرەفمەندێتیت ئەگەڕێتەوە

سامان و شەرەف کەپێت درابوون، بەو مەبەستەبوون بەکاریان بێنی

ئێستاش جارێ دی لێت ئەپرسمەوە، چۆن ڕێزی خۆتت نیشان دا؟

سواری یەکەم: ئەوانەی تاجیان ناسەر میری لاو، لەگوماندا بوون

هەربۆیە یاسای تاج لەسەرنانیان گشت ڕەت کردەوە.

سواری دووەم: لەگەڵ بەستنەوە بە زنجیرەی نەفرەت کردن.

سواری سێیەم: لەگەڵ بەکاربردنی ئەوهۆکارانەی لە وزەتدا بوون

بۆ داپلۆسینی خزمەتچییە دڵسۆزەکانی پاشاو

هەموو ئەوانەی دوور لەچاوی چاودێری کردن کار ئەنجام ئەدەن.. کاری گەل.

سواری یەکەم: ئەمانە ڕاستین، گەر پێیان قایلیت ئەوا قسە بکە

وەلام بەرەوە بەرامبەر پاشا... ئێمەش بۆ ئەوە ڕەوانەکراوین.

تۆماس: هەرگیز ویستی من نەبووە، کە تاجی سەری کوڕی (شا) داگیرێ

بەمەبەستی سووك کردنی توانا و شەرەف مەندێتی

بۆچی پاشا ئاواتە خوازە، لەگەلەکەمم دوور بخاتەوەو لێیان بێبەش بم

فەرمانم پێبکا بەتاك و تەنیا لەکانتربیێری بمێنمەوە؟

ئەمە لەکاتێکدا لەبری تاجێ، من ئاواتی سێی بۆ ئەخوازم

بەگوێرەی قەشەکانیش، ئەوەی لەسەر ملیانە نێڵەی من نییە.

ئاگادارییان بکە. بچنە لای پاپا، ئەو بوو فەرمانی دابە سەریاندا.

سواری یەکەم: بەبۆنەی تۆوە ئەوان بوونە جێی گومان!

سواری دووەم: هەر بەهۆی تۆوە ئەم کارە وەکو خۆی لێدێتەوە!

سواری سێیەم: سۆزت بۆیان بجووڵێ!

تۆماس: من نکوڵی ناکەم، کە ئەمە بەهۆی منەوە ڕوویداوە

کەسێکی واش نیم کاتێ پاپا دەستی داگرت من خۆم شل بکەم

ئاگاداریان کە بچنە لای پاپاو بەپاڵشتی ئەو ڕقی ڕەشیان بەرامبەر من و کەنیسە ئاشکرا بکەن.

سواری یەکەم: بەلام ئەمە.. لێرە فەرمانی پاشایە

تۆو خزمەتچیانت پێویستە کەوا ئێرە جێبێڵن.

تۆماس: ئەگەر ئەوە فەرمانی پاشا بێت، ئەوا ئەبێ خۆڕاگریم

هەتا بڵێم: حەوت ساڵان تێپەڕین کەس وکارم بێمن ژیانیان گوزەراند

حەوت ساڵانی چەرمەسەری و ئێش و ئازار حەوت ساڵانی غەریبی و ژیانی دەربەدەری

لەدەرەوەی وڵات و خۆ خەڵەتاندن، حەوت ساڵان هەروا کەم نییە

من جارێکی دی ئەو حەوت ساڵەم بۆ... ناگەڕێتەوە

هەرگیز ناگەڕێتەوە... پێویستە کەوا هیچ گومان نەکەیت

گەر هاتوو دەریا شوان و مێگەلی لەیەکتر پەرت کرد.

سواری یەکەم: ئێستاکە تۆ عەدالەت‌و شکۆمەندێتی پاشا
زۆر بە سووکانە گاڵتە پێ ئەکەیت شێتی ناپەسەند
هیچ شتێ نییەلەلێدانی وەزیرەکان‌و خزمەتچیانی دەربازت بکات.
تۆماس: ئەوەمن نیم گاڵتە بە پاشا بکەم.
چونکە لە من‌و لەویش بەرزتر هەیە، (من) نا، پێکێتی (چیسایە). کەچی لەدژی بێکێت هەڵئەساون، ئەی هەر بێکێت نی‌یە کە بانگەوازی حوکم ئەکات‌و
بگرە هەر خۆیشی سەرەوەری یاسای کەنیسەو عەدالەتی ڕۆمایە.
سواری یەکەم: ئەی قەشە لە قسەکانتا سەرکێشی ئەکەیت.
سواری دووەم: قەشە، تۆ بەترسناکی چەقۆ دواویت.
سواری سێیەم: قەشە، تۆ ناپاکانەو نادڵسۆزانە قسەت کردووە.
هەرسێ سوارەکە: قەشە، ناپاک، تۆ لە زەلکاوی ناپاکیدا چەقیویت.
تۆماس: من داواکاریم ئەخەمە بەردەم دادگای ڕۆمەوە
گەر بشمکوژن.. لەگۆڕەکەم ڕاست ئەبمەوە
تاداواکاریم بخەمە بەردەم دادگای خوداوە.
(ئەچێتە دەرەوە)
سواری چوارەم: قەشە، دێر، خزمەتکار! بیگرن، بیبەستن، جووڵەی ببڕن
بەناوی پاشاوە ئەم پیاوە بەندکەن.
سواری دووەم: ئیتر قسە بەسە.
سواری چوارەم: ئێمە لەپێناوی عەدالەتی پاشادا بەشمشێرەوە هاتووین.
(ئەچنە دەرەوە)
کۆرس:
ئێمە بۆنی ئەوانەمان کردووە مردن ئەهێنن.

هەستەوەر توانی ئەوەیان هەیە پێشبینی هاتنی گێروگرفت بکەن.
ئێمە گوێمان لە سەدای شمشاڵی شەوبووە، شمشاڵ‌و دەنگی بایەقووش
شەوانە باڵی گەورەو مکوممان بینیووە مایەی پێکەنین بوون، تامی گۆشتی بۆگەنمان کردووە
دوێ شەو هەستمان بەورگ دانەوەی زەمین‌و بێ سرەوتی‌و هیچ‌و پووچی کرد.
گوێمان لە مرەمرەی ئاژەڵان بووە کە ئاوازی سەیر ئەخولقێنن
چەقەڵ‌و گوێدرێژو (جاکدو)، زیکەی مشک‌و ڕزق
نەڕەی شێرو ئاوازی مەلی سەرمەستمان گوێ لێبووە.
مەلی ڕەنگ خۆڵەمێشیمان بینیووە ئەسووڕایەوە
لەبەرتیشکی لاوازی بەیانیدا کلکی مشکان دەجولانەوە، ئەو گیاندارە نەرمۆڵانەشیم خواردووە
هێشتا زیندووبوون‌و تامی سوێری زیندووەرانی دەریایان ئەدا.
لۆبستەرو قرژاڵ‌و هێلکە شەیتانۆکە لوول پێچ ئەمێستا لە ڕیخۆڵەکانمدا ئەژین‌و گەرا دائەنێن
ڕیخۆڵەیشمان لەبەر ڕووناکی بەریەیاندا ئەخوسێتەوە
ئێمە بۆنی مەرگمان لەگوڵدا کردووە، مەرگ باخی گوڵانی گرتووە
مەرگ دەستی لەبینی لۆبیاو گوڵە بەهارەو گوڵە (ئاس) توونند کردووە.
ئێمە لەهەوارە کۆنەکاندا قەدی درەخت‌و شاخی ئاژەڵ‌و لووتی فیل‌و سمی ولاخمان بینیووە.
لەسەر ڕۆخی دەریا ڕاکشاوین‌و لەگەڵ هەناسەی

ئــــەنیمونی دەریـــــادا هەناســـــەمان داوەو
بەبۆشایی ئیسفنجدا چووینەتە خوارێ
لەسەر خاك راكشاوینو پلارمان لەكرم داوە
لەبــەر بــادا بــەرێگای كــاتیدا رۆیشـــتووینو
پەلمان لەكرم داوە
لەبەریادا بەرێگای كاتیدا رۆیشتووینو پەلمان كوتاوەو
لەگــەڵ بینینــی بــاڵندەی گچكــەدا بــەخۆدا چووینەتەوەو
هەستمان بە شافی قالۆنچەو
كاژی مارو چەرمی بزێــوی بێ هەستی فیلو باڵی سافی ماسی كردووە
بۆنـی بۆگـەنی قـاپو بۆنـی بەریەلوعـە لـەنێو بۆنەكانی ترداو
بۆنــی ســابوونی بــۆن خۆشمـــان لــەرێگای دارستان كردووە
كاتێ زەوی ئەقلیشێتەوە پریشكی دارستانی دۆزەخی ئەپریشكێ
ئێمە بینوومانە گورزە تیشك بەرەو خوارەوە لوول بــوون بە ئاراستەیەك كە ترسی مـەیمونی پێوەیە كشاونەتە خوارێ
داخۆ ئێمـە نـەمان زانیـووە، نـەمان زانیـووە ئەشێ چی بێتە گۆرێ؟
ئـا لـێرەدا، لـــە چێشــتخانەدا، لـــەرێگادا، لەگەوڕدا، لە عەمباری دانەوێڵـەی نێـو بـازێڕدا لـە دەمارەكانماندا
لە ریخۆڵەكانماندا، لـە كەلەكـەماندا، هـەروەك لە موئامەرەی خاوەن دەسەڵاتاندا
لــە كۆبوونــەوەی بــەتواناكاندا چـی لەســەر پەرەی بەخت ئەچنرێ، چی لەسەر داموو دەزگای میران ئەچنر
هەمان شت لە دەمارەكانماندا، لە مێشكماندا ئەچنرێ
لـە هـەناوی ئافرەتـانی كانـتربێرىدا نموونـەی كرمی زیندوو ئەچنرێ.

بۆنمان كردوون، بۆنی ئەوانەی مەرگ ئەهێنن، كاتێ چالاكی بەسەرچوو. ساتی ئازار چەشتن دێت.
هیچ شتێ شـیاو نىیـە جگـە لـە شـەرمی ترسنۆكانەی ئەوانەی كـەوا بـەدوا ملكەچی قـایل ئەبن.
ئێمە گـەورەمان سـەرۆك قەشـەمان پەسـەند كردووە، سەری رازی بوونمان لەقاندووە.
ئێمـــە رێمـــان شـــكاندووە، دەســـتمان بەسـەرگیراوە، تێكشـكێنراوین بـۆ جەسـتەی سروشت یەكمان گرتووە.
هــێزی (رۆحــی) ئاژەڵانـــەمان رێنومـــایی كردووین، ئـارەزووی شـەهوانی خـود جڵـەوی گرتووین
بەدوا ورتەی پڕ ئازاری مەرگی رۆحەوە لەژێر كاریگەری دوا ئارەزووی وێرانیو شەرمەزارییەوە
ئۆه سەرۆكی قەشەی مەزن، ئۆه تۆماس لێمان ببورە، لێمان بوورە، بۆمان بپارێرەوە، تا بۆت بپارێینەوە..
لەودیووی سنووری شەرم كردنمانەوە.
(تۆماس دێتە ژوورەوە)
تۆماس: ئاشتی، بەبیرو ئەندێشـەتانەوە وێڵی ئاشتی بن.
ئاشتی بۆ ئێوە هاتووەو ئەبێ پێشوازی بكەن
بەشی ئێوەیە لە شتە نەمرەكان شكۆمەندی هەتا هەتاییە
ئەمەی ئێستاكە شتێ كاتیىە، تا جارێكی دی لــەیادتان ئــەچێ. داخــۆ خۆشـیەكی ئــازاراوی لەناوكاو ئەتان جوڵێنێ
كاتـێ قــەوارەی ویستی یـەزدان بــە تــەواوی بەرجەستە ئەبێ
ئەشێ ئـەو شتانە لـەیاد بكـەنو، بـەكاری ماڵەوە خۆ خەریك بكەن
بـەڵام كاتـێ نزیـك ئـاگر دانیشـتن بیریـان لێئەكەنەوە

ئەمەن و لەیاد چوونەوە لەبیرەوەرییا زۆر پرمەزاقن.

چەشنی ئەو خەونەی ئەگێڕێتەوە. کە چۆن لەکاتی گێڕانەوەدا

سەرپا ئەگۆڕێ و وەك شتێ خەیاڵی خۆنیشان ئەدات

مرۆڤایەتی بەرگەی راستی‌یە رەهاکان ناگرێ.

(قەشەکان دێنە ژوورەوە)

قەشەکان: (یەك بەدوای یەکدا)

گەورەم پێویستە لێرە نەوەستیت، برۆ کڵێسە بەنێو (کلۆسیتمارا).

کاتی ئەوە نی‌یە بەفیرۆی بدەی، ئەوان بەچەکداری ئەگەڕێنەوە..

ئەگەڕێنەوە بۆ قەسابخانە، بۆ قەسابخانە.

تۆماس: بەدرێژی ژیانم بەپێی خۆم هاتووت، بەدرێژی ژیانم چاوەڕێم کردووە

مردن کاتێ دێت کە شایانی بم ئەوکاتەش کەوا شایانی مردنم

ئەوا چی تر ترسی تێدا نییە منیش هیچ شتم نی‌یە کە ئەنجامی دەم

جگە لە گەیاندنی پەیامەکەم.

قەشەکان: گەورەم ئەوان دێن، ئەشێ هەر ئێستا هێرش بهێنن تۆش ئەکوژرێیت

خێراکە بۆ جێی قوربانی، گەورەم خێراکە

لێرە مەوەستەو درێژە بە قسەکان بدەیت، ئەمە راست نی‌یە

گەر تۆ بکوژرێی، گەورەم، ئێمە چیمان بەسەردێ، چارەنووسمان بەکوێ ئەگات؟

تۆماس: هێوری! بێ دەنگ بن! بێتەوە یادتتان ئێوە لەکوێدان .. چی روونەدات؟

ئەوان لێرە داوای ژیانی هیچ کەسێ ناکەن تەنها من نەبێ

منیش ترسم نی‌یە، تەنها لە هاتەهاتی مەرگمدا.

قەشەکان: گەورەم بۆنوێژی شێوان! پێویستە لەنوێژ هیچ دوانەکەویت

لەدیوانی خوا نادیار نەبیت، بۆ نوێژی شێوان! بۆ کڵێسە!

تۆماس: برۆن بۆ نوێژ، لە نوێژەکانتانا یادم بکەنەوە

لەوێ (شوان) ئەدۆزنەوە، ران بەکەیفی خۆی بڵاوە ئەکات

من ترسی پیرۆزی و درەوشانەوەی ئاسمان و چرپەم هەبووە

چی تر نکوڵی ناکەم، شتەکان ئاماژەی کۆتاییەکی پرخۆشی ئەکەن.

قەشەکان: بیگرن! کۆتی بکەن! رای کێشن!

تۆماس: دەستتان بکێشنەوە!

قەشەکان: بۆ نوێژی شێوان! خێراکە.

(قەشەکان پاڵی ئەنێن، لەوکاتەدا کۆرس ئەدوێت، دیمەنەکە ئەگۆڕێت بۆ کڵێسە)

کۆرس: (لەدوورەوە (دایز ئیرا) بە ئاوازی لاتینی ئەبیسترێت)

دەستت بجووڵێنە، پێڵوو هەڵبێنە

ترسناکی‌یە، بەڵام ترسێکی زۆرتر

لەچاو ئەوەی کاتێ کە هەناو گشت ئەبێ بە ئاو.

ترسناکی‌یە، ترسێکی زۆرتر، لەپەنجە شکان

لەسەر ئێشەی یەك لای کەللەی‌سەرسەختترە

زیاتر لەکەوتنی شوێن پێ لەرێدا زیاد لە سێبەری بەردەم دەروازە

زیاتر لەهەراو زەنای قوڵی هۆڵ کارگێڕانی درزەخ وەدیار ئامێنن

مرۆڤ ئەلەرزێن و ئەبن بەتۆزی رەشەباو لەیاد ئەچنەوە

یاد ناکرێنەوە... ئەبنە رووی سپی مەرگ، خزمەتچی بێ دەنگی یەزدان

لەدوای مەرگ دادگاییە، لەدوای دادگایش بۆ شاییەکی زۆر ترسناکە

ترسناك تر لەدیمەنی دزێوی دۆزەخ
بۆشایی، دیارنەبوون، پەرت بوون لەیەزدان
مەترسی سەفەرێکی ناکریگەر بۆ ئەو خاکە
چۆڵەی، کە خاك نییە
بەڵکو تەنها بۆشاییو دیارنەبوونو چۆڵاییە
بۆئەو جێگایەی ئەوانەی مرۆڤ بوون لەوێ
چیتر ناتوانن مێشکیان وەبەرخۆیان بێننەوە
تاگومانو واهیمە دروست کەن، بەرەو خەونو
خۆ نواندن هەڵدێن.
کاتێ رۆح چی تر فریو نادرێ
نەبابەت هەیە، نەمەبەست هەیە، نە رەنگ
هەیە، نە شێوازی پەشێو هەیە
تا رۆح خەنی کات بەبینینی یەکگرتنی بێ
بەهای مەتا مەتایی هیچ لەگەڵ هیچدا
ئەوەی ناوی ئەبەین مردن نییە
ئەوەی دوای مردنیش هەرمردن نییە، ئێمە
ئەترسین، ئێمە ئەترسین، کێ دواتر ئەمان
پارێزێ، کێ بۆمان ئەپارێنەوە، ئەوکاتانەی کەوا
زۆر پێویستمانە؟
مەرگ لەسەر دارە.. رزگارکەرەکەم، رێمەدە
کارت بەفیڕۆ بڕوات
یارمەتیمان بدە قوربان لەدوا ترسماندا، ئێمە
خۆڵین، هەر بۆ خۆڵیش ئەگەڕێینەوە
بۆ رۆژی حیساب هێرش ئەکرێتە سەرمان
یارمەتیمان بدە قوربان بۆ ئەو مەرگە نزیکە.
(تۆماس و قەشەکان لە کڵێسەوە دێن)
قەشەکان: دەرگا داخەن، دەرگا داخەن،
ئەبێ دەرگا دابخرێ
ئێمە ئەپارێزرێین، ئێمە ئەپارێزرێین ئەوان
ناتوانن بێنە ژوورەوە
ئەوان بێ توانان ئێمە ئەپارێزرێین، ئێمە
ئەپارێزرێین.
تۆماس: دەرگاکان بخەنە سەر پشت دەرگا
بکرێنەوە

من نامەوێت جێی نوێژکردنو کڵێسەی
مەسیحو شوێنی پیرۆز ببنە قەڵا
کڵێسە بەرێگای خۆی، خۆی ئەپارێزێ نەك بە
چەشنی دار بەڕوو بەرد
بەردو بەڕوو ئەگەنێن، خۆیان راناگرن
بەڵام کڵێسە خۆی رائەگرێ، تەنانەت لەرووی
دوژمنانیشا دەرگا داناخات.. دەرگابکەنەوە!
قەشەکان:
گەورەم ئەوانە پیاونین، وەکو پیاو نایەن.
بەڵکو بەچەشنی ئاژەڵی دڕندە دێن
وەکو ئەو پیاوانە نایەن کە ریزی شتی پیرۆز
ئەگرنو بۆ جەستەی مەسیح سوژدە ئەبەن
بەڵکو وەکو ئاژەڵ دێن، پێویستە بەرووی
شێرو پڵنگو یەکانەو گورگا دەرگا دابخەی
ئەی چۆن دای نەخەیت.
بەرووی ئەو ئاژەڵانەی کە رۆحی پیاوانی
یاخییان تیایە
بەرووی ئەو پیاوانەی کە نەفرەتیان بۆ بوونە
ئاژەڵ لەخۆکردووە، گەورەم! گەورەم!
تۆماس: ئێوە راگوزاری بیرم لێ ئەکەنەوە،
وەکو کەنار کەتوویەك یان وەکو شێتی
بەئەنجامەوە گفتوگۆ ئەکەن، هەروەکو لەم
دنیایەدا
بۆ چەسپاندنی راستیو هەڵەیی هەر شتێك
هەوڵی تێگەیشتنی حەقیقەت بدەن
سەرەپای ژیانو چی چالاکییە کاتێ ئەنجامی
چاکەو خراپەن ئەشێ ئاشکرا بکرێن
دیارە ئەو کاتەش ئەنجامی زۆرکار تێکەڵاو
ئەبن.
چاکەو خراپەش لەدیمانەهیدا لەناو یەکترا..
ون ئەبن
تەنانەت ئەوساش هێشتاکە دەرك بەمەرگم
ناکرێ
بڕیاری مەرگم لەدەرەوەی سنووری زەمەن
ئەدرێت

گەر بێت و ئەوە ناو بنێین بڕیار.
ئەوا سەرجەم بوونی من، ڕەزامەندی خۆی نیشان ئەدات
من ژیانی خۆم ئەبەخشمە یاسای خواوەند لەسەروی یاسای بنیادەمەوە
دەرگا بکەنەوە! دەرگا والاکەن!
ئێمە نەهاتووینەتە ئێرە هەتا بەجەنگو ستراتیژیی جەنگ یان بەبەرگری سەرکەوتن تۆمارکەین
یان ڕوویەڕووی ئەو دڕندانە ببینەوە لەشێوەی مرۆڤدان.
ئێمە لەگەڵ دڕندەدا جەنگاوین و بەسەریاندا سەرکەوتووین
ئێستاش پێویستە سەرکەوتن بەئازار چەشتن بەدەست بهێنین
ئەوەش ئاسانترین سەرکەوتنە، سەرکەوتنی (خاچە).
دەرگا بکەنەوە! پێتان ڕائەگەیەنم، دەرگا والاکەن!
(دەرگا ئەکرێتەوە، سوارەکان دێنە ژوورەوەو کەمێ سەرگەرم ئەبن)
قەشەکان: ئەمە ڕێگایە، گەورەم خێراکە! بۆ سەرپلیکانە، بۆ سەربان.
بۆ کڵێسە، خێراکە، وەرە، پەلەکە!
سوارەکان: کوا بێکێتی ناپاکی بەرامبەر پاشا؟
بێکێت لەکوێیە، قەشەی مشەخۆر؟
وەرە خوارەوە (دانیاڵ) بۆ نێو لانەی شێر
وەرە خوارەوە دوای جێ پێی دڕندەکەوە.
داخۆ بەنیشانەی دڕندەیەتی خۆت نیشان ئەدەی؟
وەرە خوارەوە (دانیاڵ) بەشداری خوان بکە!
منداڵی چەقاوەسووی (چیپساید) بێکێت لەکوێیە؟

ئەی قەشەی ناپاک بێکێت لەکوێیە؟ وەرە خوارەوە (دانیاڵ) بۆ نێو لانەی شێر
وەرە خوارەوە (دانیاڵ) بەشداری خوان بکە.
تۆماس: هەرپیاوی ڕاست و ئازای وەك شێرە ترس لەناخیا گەرادانانێ...
ئەمە منم لێرە ناپاك نیم بەرامبەر پاشا
من قەشەم، مەسیحی‌یەکم، خوێنی مەسیح پاراستوومی ئامادەم بەخوێنم قوربانی بدەم
ئەمەش ئاماژەی کڵێسەیە... هەمیشە ئاماژەی خوێن
خوێن بەخوێن، ئەو بە خوێنی ژیانی پاراستووم. منیش خوێی خۆم ئەکەمە بارتەقای مەرگی ئەو
مردنیشم هەر لەپێناوی مردنی ئەودایە.
سواری یەکەم: هەموو ئەوانەی پەڕەوازت کردوون بیان گێڕەوە.
سواری دووەم: دەست لەو هێزانە بکێشەرەوە کە بەزۆر دەستت بەسەردا گرتوون.
سواری سێیەم: ئەو پارانەی دەستت بەسەراگرتوون بۆ پاشایان بگەڕێنەوە
سواری یەکەم: ئەو پەیڕەوانەی ئێستاکە لێیان پاشگەزبوویتەوە نوێیان کەرەوە.
تۆماس: لەپێناوی سەروەرمانا من ئامادەی مردنم
تا کڵێسە بەهێوری و سەرفرازی بمێنێتەوە، چۆنتان پێخۆشە وام لەگەڵ بکەن
بەلام تووناوی خودا ئازارو ڕسواکردنات لەکەس و کارم کەس نەگرێتەوە
چی کەسانی ئاسایی، یان بەرزە پیاوان نەخێر ڕێگای ئەوەتان نادەم.
سوارەکان: ناپاك! ناپاك! ناپا
تۆماس: ریگنالد جەنابت سێجار ناپاکیت:
ناپاکیت بەرامبەر بە من وەکو هاوڕێی دنیایت

ناپاکیت بەرامبەر بە من ئەمە لەکاتێکدا سەروەری ڕۆحیتم

ناپاکیت بەرامبەر یەزدان بەوەی کڵێسەکەی پیس ئەکەیت.

سواری یەکەم: قەرزارنیم بەوەی کە دڵسۆز نەبووم

ئێستاش هەرچی قەرزارم، ئەشێ بتوانم باربووی‌کەمەوە.

تۆماس: ئێستا داواکریم بۆ یەزدانی مەزن بۆ مەریەمی پاکیز بۆ قەدیسی مەزن

بۆ نێراوە پیرۆزەکانی پیتەرو پۆڵس، لەکڵێسەوە داواکریم بەرز ئەکەمەوە.

(کاتێ سوارەکان تۆماس ئەکوژن دەنگی کۆرس ئەبیسترێ)

کۆرس: هەوا خاوێن بەرەوە! ئاسمان ساماڵ بە! (با) بێ تۆزبە!

بەرد لەبەرد هەڵگرەو بیان شۆ! خاك پیسە، ئاو چڵپاوە

ئێمەو ئاژەڵەکانیشمان بەخوێن پیسن بارانی خوێن چاوانی کوێر کردووین

کوا ئینگلتەرا؟ کوا (کانت)؟ کوا کانتربێری؟

ئاه لەرابردوویەکی دوور، دوور، دوور، دووردا

لەخاکێکدا کە درەختەکانی بێ بەرن ڕێگا ئەکەین

گەر درەختەکان بشکێنینەوە خوێنیان لێ دێت

لەزەوییەکی بەردەڵانی وشکدا ڕێگا ئەکەین، گەر دەستمان بەریان کەوێ خوێنیان لێ‌دێ.

چۆن بتوانین بگەڕێینەوە بۆ وەرزە هێمن‌و هێورەکان؟ شەو لەگەڵماندا بمێنەرەوە، خۆر بوەستێنە، وەرز رابگرە

ڕێگا مەدە ڕۆژبیبێتەوە، لێ‌مەگەڕێ وەرزی بەهار بێت

داخۆ ئەتوانین جارێکی دی سەیری ڕۆژو شتە ئاساییەکانی بکەین

بینیمان هەموویان لەنێو خوێنی بەربووەوە پیس بوون؟

ئێمە ئاواتی ئەوەمان نەخواست هیچ شتێ روویدات

ئێمە دەرکمان بەرووداوی ترسێنەرو زیانی تایبەتی‌و بێزاری گشتی کردووە.

ئەژین بەڵام ژینێکی ساتی گەر زەبرو زەنگی شەو بەکاری ڕۆژانە کۆتایی بێت

ئەو زەبرو زەنگی ڕۆژ بەخەو کۆتایی پێ دێت.

بەڵام قسەی نێو بازاڕو دەستی بەگسكو

کاتی شەوی بەخۆڵەمێش پف بووەوەو لەگەڵ

کازێوەدا فڕێدانی سووتەمەنی بۆ نێو ئاگر

هەموو ئەم کارانە سنوورێکیان بۆ ئازارەکانمان داناوە

هەموو ترسێ پێناسەی خۆیی هەیە، ژیان ئەوە نی‌یە هەتا کۆتایی خەمی تیابخۆین

بەڵام ئەمە، ئەمە لە دەرەوەی سنووری ژیانە، لەدەرەوەی سنوری زەمەنە

ئەمە کاریگەری بەردەوامی هەڵەو خراپەیە.

هەر ئێمە نا، هەر ماڵ نا، هەر شار نییە کە پیسە، بەڵکو دونیا سەرجەم بۆگەنە.

هەوا خاوێن بەرەوە! ئاسمان ساماڵ بە! (با) بێ تۆزبە! بەرد لە بەرد هەڵگرەو بیان شۆ!

پێست لە باسك بگرەوە! ماسوولکە لە ئێسقان جیاکەروە! بیان شۆ!

بەرد بشۆ، ئێسقان بشۆ، مێشك بشۆ! ڕۆح پاکژ کەرەوە

هەموویان خاوێن کەرەوە، هەموویان پاکژ کەرەوە!

(دوای ئەوەی سوارەکان تۆماس ئەکوژن، بەرەو پێشەوەی تەختەی شانۆ ئەڕۆن‌و جەماوەر ئەدوێنن)

سواری یەکەم:

داواتان لێ ئەکەین بۆ چەند ساتێ ئاکاتان لێرە بێت

ئێمە ئەزانین کە لەوانەیە حوکمێکی خراپ بدەن بەسەر کارەکەماندا

ئێوە ئینگلیزن، بڕواتان بەکاری جوان هەیە

کاتێ ئەبینن چوارکەس هێرش ئەکەنە سەر تاکە کەسێ، هەرچی سۆزو بەزەییتانە لەگەڵ نێچیرەکەدا ئەبێت

من ڕێزی ئەم جۆرە هەستانە ئەگرم.

بەشداریتان ئەکەم، بەڵام لەپاڵ ئەوەدا ئەگەڕێمەوە بۆ هەستی شەرەفمەندێتیان.

ئێوە ئینگلیزن ناشێ بەبێ بیستنی هەردوو ڕووی مەسەلەکە حوکم بەسەر کەسێکدا بدەن.

ئەوەش لەگەڵ بیرویاوەڕی چەسپاوماندا لەدادگای (جیریدا) ئەچەسپێ.

من خۆم ئامادەگی ئەوەم تێدایە مەسەلەکەتان بخەمە بەردەم.

من پیاوی کردەوەم نەك پیاوی قسە.

لەبەر ئەو هۆیە شتێکی زیاتر نالێم جگە لە پێشکەش کردنی ئەو قسەکەرانەی تر

کە بە توانای هەمەجۆریان و ڕووی تێڕوانینی هەمە چەشنەوە

دەشێ بتوانن درێژەی ئەم تەنگو چەڵەمە هەرە ئاڵۆزەتان بخەنە پێش چاو.

ئێستاش پێویستە داوا لەبەتەمەنترین ئەندامیان بکەم کە ئەویش هاوسێی گوندنشینم (ویلیەم دی ترساس) ی بارۆنە.. یەکەم کەس بدوێ.

سواری سێیەم:

(ویلیەم دی ترساس)

ئەترسم بەهیچ شێوەیەك ئەو قسەکەرە خاوەن ئەزموونە نەبم کە هاوڕێی دێرینەم

(ریگناڵد فیتزئارز) بۆئەوەی بردن کە بڕوا بکەن بەڵام تاکە شتێ هەیە ئەمەوێت بیڵێم.

هەر ئێستا بێ هیچ وەستانێ ئەیدرکێنم، قسەکەش ئەمەیە!

ئەوەی ئێمە کردوومانەو ئێوە بەهەرشێوەیەك بیری لێ ئەکەنەوە.

ئێمە خۆمان هەرگیز پێی قایل نین.

(سوارانی دی گوێ بگرن! گوێ بگرن) ئێمە هیچ سوودی لەمە نابینین

بەڵکو لەبری قازانج زیانمان لێکەوت.

ئێمە چوار ئینگلیزی ئاساییین کە نیشتمانمان خستە پێش هەموو شتێکەوە

بەبڕواوە ئەڵێم کاریگەرییەکی چاکمان دروست نەکرد کە ئێستاکە هاتینە ئێرە.

ڕاستییەکەی ئەوەیە کە ئێمە زانیمان بەکارێکی جوان و گران هەستاوین.

من تەنیا دەربارەی خۆم ئەدوێم چونکە زۆرم خواردۆتەوە

لەو کەسانەش نیم کە خووم بەخواردنەوەوە گرتبێ و خۆم بۆ ئەوە ئامادەبکەم.

کاتێ دێینە سەر باسی ئەم مەسەلەیە ئەگاتە ئەوەی سەرۆکی قەشە کوشتن کارێکی نابەجێیە.

بەتایبەتی کاتی ئێوە بەزانیاری کڵێسەیەکی چاك پەروەردەبوون

خۆ ئەگەر بەتووندوتیژی دەرکەوتووین ئەبێ تێبگەین ئەوە بۆچی بووە.

من لەلای خۆمەوە گەلێك بەوە خەمبارم، ئێمە زانیمان کە ئەوە ئەرکی سەرشانمانە

هەمووش پێکەوە ئەبوا بۆ ئەنجامدانی ئامادەبین و وەکو گوتیشم تاکە (پێنسێ) چییە سوود لەوە نابینین

ئێمە بەچاکی ئەزانین کە چۆن شتەکان هەڵگێڕینەوە

شا هێزی خوا لێی رازی بێت لەپێناوی بەرژەوەندی دەوڵەتدا بوو.

نەك ئەو ڕووداوەی کە ئەوەی تیاگوت و لەدوای کێشەیەکی ترسناك بڕوات و

لەباشترین حاڵەتدا بەشی دوایی ژیانمان لەدەرەوەی نیشتمان بگوزەرێنین

تەنانەت کاتێکیش کەسانی هۆشەنگ بێن‌و ببینن کە چۆن سەرۆکی قەشەکان لادراوە

من خۆم بەتایبەتی کەلێك پێی سەرسام بووم پێویستە تێبینی ئەوەتان کردبێت کەچی دیمەنی جوان هەن

ئەو خستوونیەتە کۆتاییەوەو هیچ هەڵەیەکیشی تێدا نی‌یە

هەروەکو لەسەرەتاوە گووتم تکایە هەر هیچ نەبێت ئەو بڕوایامەان بدەنێ تابۆتانی روون بکەینەوە

ئەوەی ئەنجاممان دا بەهیچ شێوەیەك پێی قایل نین.

وای بۆ ئەچم ئەوەی ئەیڵێم پێویستە دەربارەی ئەم مەسەلە بێت.

سواری یەکەم:

لەو بڕوایەدام هەمووممان قایل بین بەوەی (ویلیەم دی تراس) دەربارەی دوا، هەروەك خاڵێکی زۆر گرنگی ئاشکراکرد، گەوهەری گفتوگۆکەش ئەمەیە:

ئێمە بەهیچ شێوەیەك دڵخۆش نین بەوکارەی کردمان، بەڵام ئەوەی پێی هەستاین خۆی بەلگەهێنانەوەی زیاتری گەرەکەو پێویستە گوێ بۆ قسەکەرەکانی تریش رابگرین، ئێستاش داوا لە (هیودی مۆرڤی) ئەکەم کە دراسەیەکی تایبەتی لە هونەری فەرمان رەوایی‌و یاسای دەستووریدا هەیە. جەنابی هیوری مۆرڤی.

سواری دووەم:

پێم خۆشە یەکەم جار بگەڕێمەوە بۆ ئەو خاڵەی کە سەرۆکمان (ریگناڵد فیتز ئارز) زۆر بەچاکی خستی‌یە روو. ئێوەش کە ئینگلیزن هەردەم سۆزو بەزیەیتان لەگەڵ قوربانی‌یەکەدایە. ئەوەش رۆحی ئینگلزانەیە بۆکاری جوان. سەرۆك قەشەی مەزن کە خاوەنی سیفاتی چاکەیەو من زۆر پێی سەرسام بووم، ئێستا قوربانی‌یە، بەڵام داخۆ بەراستی مەسەلەکە ئەوەیە؟ من قسە بۆ ئاوەزتان ئەکەم نەك سۆزتان. وەکو ئەیزانم ئێوە ئاوەزێکی جێگیری دەرك پێ کەرتان هەیەو لەو بابەتانەنین تەڵەی چەپڵەی سۆز سەرگەرمتان بکات، لەبەرئەوە داواتان لێ‌ئەکەم بە وریایی ئاگادارین! مەبەستەکانی سەرۆکی قەشە چین؟ لەوەڵامدانەوەی ئەم پرسیارانەدا کلیلەکە، پرسیارەکە ئەشارێتەوە.

مەبەستی پاشا تەواو ئاشکرایە، لەکاتی فەرمان رەوایی شا (ماتیڵ) داو هاتنە ناوەوەی (ستیڤنی) خەمباری لەسەر تەخت لابراو شانشینەکە تەواو بەش بەش بوو. شامان هەستی کرد تاکە شتێکی پێویست بۆ گەڕانەوەی فەرمان دامرکاندنەوەی هێنری راپەڕیووی میری ناوخۆیە کە ئاسایی لەپێناوی مەبەستەکانی خۆی‌و درووژاندنی‌دا کاری ئەکرد، شان بەشان لەگەڵ چاك کردنی سیستەمی بەڕێوەبردندا. لەبەرئەوە وای نیشان ئەدا کە بێکێت خۆی بۆ کاری بەڕێوەبردنی زۆر گران هەڵبژێرێ‌و – کەسێکیش نی‌یە نکڵی ئەوەبکات – کە یەکێتی لەنێوان دەزگای (قازی قازی‌یەکان) و سەرۆك قەشەکان دروست ئەکات. داخۆ بێکێت بەویستەکانی مەلیك رازی بوو، هەتاکو ئێمەش بارێکی نموونەیی دروست بکەین، لە پێکهاتنی یەکێتی نێوان بەڕێوەبردنی رۆحی‌و دونیایی لەژێر چاودێری میریی مەرکەزیدا. من (بێکێت) م لەزۆر پەیوەندی جۆراوجۆری رەسمیدا بەپاکی ناسیووە. پرکێشی ئەوە ئەکەم بڵێم هەرگیز پیاوێکی تری ئاوا لەبار بۆ پلەیەکی بەرزی خزمەتگوزاری مەدەنی ناناسم. ئەی ئەمە بۆچی روویدا؟

ئەوکاتەی (بێکێت) بەپێی ویستی شا بووە سەرۆکی قەشەکان و وازی لە سەرۆکایەتی قازییەکان هێناو بووە قەشەیەك لەپلەی قەشایەتیدا، بەهەموو هێزێکی‌و بەوپەڕی

شــانازییەوە هــەوڵی چەســپاندنی ڕەفتــاری بەرزیدا، لە ژیاندا، دەست بــەجێش ئــەوەی چەسپاند کە فەرمانی بەرزتر لەفەرمانی پاشامان هەیەو ئەویش وەکو خزمەتچی پاشا چەندین ساڵە لە تەقەلای ئەوەدایە کە ئەو فەرمان بینا بکات.. دیارە تەنیا یەزدان ئەیزانێ بۆچی ئەو دوو فەرمانە ئاوا ناتەبان.

دیارە ئێوەش لەوەدا لەتەکمدان کە دەست تێکێشانێکی لەم جۆرە لەلایەن سەرۆکی قەشەکانەوە کەسانی وەکو ئێمەمانان بێزار ئەکات، تا سنوورێکی بەربڵاو هەست بەپشتگیری ئێوە ئەکەم. لە سیماتاندا ئەیخوێنمەوە. تەنها لەسەر بنەمای ئەم پێوەدانگەشە کە ئێمە چەسپاندوومانە هەتا شتەکان لەبارێکی دروستدا دابنێینو ئێوەش بەشداری ئەوەمان ئەکەن. کەسێکیش نییە هێندەی ئێمە لە پێویست بوونی بەکارهێنانی زەبرو زەنگ بێزار بێت. بەدڵتەنگییەوە ئەڵێم لەهێندێ کاتدا زەبرو زەنگ ئەبێتە تاکە ڕێگایەك کە دادوەری کۆمەڵایەتی پێ بپارێزرێت. کاتێك دێت ئێوە حوکم بدەنە سەرسەرۆکی قەشەکانداو بەپێی پێشنیاری پەرلەمانو بەشێوەیەکی ڕەسمی وەکو ناپاکێك فەرمانی لەسێدارەدانی بدەن.. کەسێکیش لە ئەنجامی ئەو لەسێدارەدانەدا بەپیاوکوژ ناناسرێت، بەڵام ئەو کاتەیە پێوەدانگەی (کاتی لەم جۆرەی ئێستا) هیچ پێویست نییە. خۆ ئەگەر ئێستاش گەیشتوونەتە ئەو قەناعەتەی کە کاری کڵێسا ئەبێ پابەندی کاری دەوڵەت بێ ئەوا ئەوەتان وەبیربێتەوە ئەوەی لەم بوارەدا یەکەم هەنگاوی ناوە ئێمە بووین. ئێمە بووینە هۆ بۆ هێنانی ئەو شتانە بۆ دەوڵەت کە ئێوە پێی ڕازین. ئێمە لەپێناوی بەرژەوەندی ئێوەدا خزمەتمان کردو شایانی ئەوەین چاکەمان بدەنەوە، خۆ ئەگەر هەر تاوانێکیش لەمەسەلەکەدا هەبێت پێویستە تێیدا بەشداریمان بکەن.

سواریی یەکەم: (مۆرڤی) شتێکی خستە بەردەممان شایانی ئەوەیە بیری لێبکەینەوە، لەلای من وادەرئەکەوێ گرنگی هەموو ئەوەی درکاندنی لەدوو وشەدایە، بەتایبەتی بۆ ئەوانەی ئەتوانن بەدوای بەڵگەهێنانەوەکانیاندا بچن. بەهەرحاڵ قسەکەرێکی ترمان هەیە کەوای بۆ ئەچم تێڕوانینێکی تری هەبێت گوزارشتی بکات. ئەگەر کەسێك هەیەو تاکو ئێستا قەناعەتی نەهێناوە، ئەوا (ریچارد بریتۆ) کە لە خێزانێکە بەدڵسۆزێتی بۆ کەنیسە ئەناسرێتەوە.. ئەشێ بتوانێ ئەوانە قایل بکات.. ریچارد بریتۆ!

سواری چوارەم: (ریچارد بریتۆ)

ئەوانەی پێش من گەلێك دەربارەی مەسەلەکە دووان، بەڵام شتێکیان لەبارەی (ریگنالد فینتر ئارز) ی سەرۆکمانەوە نەدرکاند، منیش شتێکم نییە بیخەمە سەر خاڵە تایبەتییەکانی گفتوگۆکەیان. ئەوەی ئەیڵێم ئەشێ لەشێوەی پرسیارێکدا دابڕژرێت:

کێ سەرۆکی قەشەکانی کوشت؟ کاتێ ئێوە بەچاوی خۆتان ئەو ڕووداوە دڵتەزێنەتان بینووە، ئەشێ سەرسام بن کاتێ من بەم شێوەیە لێی ئەدوێم. بەڵام با لە زنجیرەی ڕووداوەکان وردبینەوە، بەکورتی من ناچارم دوای قسەکانی دوا قسەکەر بکەوم، کاتێ سەرۆکی قەشەکان، سەرۆك قازییان بوو لەژێر دەسەڵاتی پاشادا هیچ کەس هەوڵی یەکخستنی وڵاتو یەکگرتنیو جێگیر کردنیو دابین کردنی گەڕانەوەی ئاسایشو دادوەری نەدا لەکاتێکدا زۆر پێویستمان بوو. لەوکاتەشەوە کەبۆتە سەرۆك قەشەکان بەتەواوەتی سیاسەتی خۆیی گۆڕیوەو واخۆی نیشان ئەدات کە هیچ گوێ بەچارەنووسی وڵات نادا، ئەمەش وای لێئەکات کە بە ڕاستی ببێتە درندەی خۆپەرستی.

ئەم خۆپەرستییەش گەشەی کرد تیایدا هەتا دواجار بێ هیچ گومانێك گۆڕا بۆ شێتی. من

بەلگەی تەواوم هەیە بەرلەوەی فەرەنسا بەجێبهێڵێت بەئاشکرا پێشبینی ئەوەی کردووە کە زۆر ناژیو بەئامادەبوونی گەواهی ئەدات کە ئەشێ لە ئینگلتەرە بکوژرێت، هەرچی هۆی ئاژاوە نانەوەیە یەك لەدوای یەك لە هەڵس وکەوتیدا بەکاری هێنان.. بەشێوەیەك کە هیچ بەلگەیەك نەما جگە لەوەی کەبڕیاری مردنی دابێت ئەویش بەشەهیدبوون، هەتا لەکۆتاییشدا ئەیتوانی بەلگەمان بۆ بێنێتەوە. بەچاوی خۆیشتان بینیتان کە چۆن لە پرسیارەکانمان هەڵئەهات، کاتێکیش بەشێوەیەکی دوور لەوەی مرۆڤ دان بەخۆیدا بگرێت سەرزەنشتمان کرد، ئەیتوانی بەئاسانی هەڵبێتو خۆی لەدەستمان قوتار بکاتو بەمەش رقی پیرۆزمان بەرامبەری سارد بێتەوە. کەچی هەڵئەهات. کاتێ ئێمە رق لەناخماندا کڵپەی ئەستاند ئەو سوور بوو لەسەر ئەوەی دەرگاکان بکرێنەوە، داخۆ پێویست ئەکات شتێکی تر بڵێم؟ لەو بڕوایەدام بەهۆی ئەم راستیانەوە کە لەبەردەمتاندایە ئەتوانن بێ دوو دڵی فەرمانی کوشتنی دەربکەن، کاتێ مێشکێکی کەمتەرخەمی هەیە. ئەوەش تاکە فەرمانی چاکەیە ئەتوانن بیدەن بەسەر کەسێکدا کە لە پاڵ ئەم هەموو شتانەی باس کران پیاوێکی مەزن بوو.

سواری یەکەم:

سوپاس بۆتۆ (بریتۆ)، وازیانم لەوە زیاتر پێویست بەقسەکردن ناکات، واش پێشنیار ئەکەم کە ئێستا بەهێوری بگەرێنەوە ماڵەوە، تکایە ئاگادارین، لەکوچەی شەقامەکاندا کۆمەبنەوەو کارێکی وەهاش مەکەن خەڵکی بوروژێنێ.

(سوارەکان ئەچنە دەرەوە)

قەشەی یەکەم: ئۆ، بابە، بابە، رۆیشتی لامان، لە دەستمان چوویت چۆن بتدۆزینەوە، لە چ جێگایەکی دوور، لێمان ئەڕوانی؟ ئێستا تۆ لە ئاسمانێکێ چاوەڕێمان بکات، کێ بمانپارێزێت، کێ رێمان نیشان بدات؟

دوای کام سەفەر، لەکام ترس و لەرزدا، بەدیدارت شاد ئەبینەوە؟ کەی هێزی تۆ جێ بگرینەوە؟ کەنیسە تۆی لەدەست ئەچێت، ئەنیاین، بێزارین، غەمبارین، بت پەرستی لەسەر وێرانەکان بنیات ئەنرێ، دنیاکەیان بێ خودایە. ئەیبینم، ئەیبینم.

قەشەی سێیەم:

نا، کەنیسە لەم رووداوە بەهێزترە

سەرکەوتن لە ئازاردایە، وەکو قەڵایە

لەکاتی چەوساندنەوەدا، سەرکەوتن هێندە مەزنە مرۆڤ قوربانی بۆ ئەدات

برۆن ئەی لاوازە غەمبارەکان، ئەی ئەوانەی رۆحتان ون کردووەو لەزەیو ئاسمان جێگاتان نی یە.

برۆن بۆنەو جێیەی کە خۆر لەدەمی ئاوابووندا دوابەردی خۆڵەمێشی

بەریتانیاو دەروازەکانی (هیرۆکلیس) سوور هەڵئەگیرێ

برۆنن کەشتی نقوومی موغامەرە بەسەر کەنارە خەماویەکاندا برانن

بەو شوێنانەدا برۆن کە زنجییەکان پیاوانی (فەلە) دەست بەسەر ئەکەن

برۆن بۆ دەریا بەستووەکانی باکوور

بۆ ئەو شوێنانەی کە هەناسەی مردوو دەست سڕ ئەکا، مێشك پوچ ئەکا.

لەبیابانی رۆژدا مێرگ بدۆزنەوە.

بگەرێن لەدوای پەیمان بەستن

لەگەڵ بت پەرستانی عەرەبدا بەمەبەستی دابەشکردنی کەشە پیسەکانیان.

هەوڵ بدەن بیرچوونەوە لەسەر تەختی شەهوانیان بسرنەوە

یادچوونەوە لەسەرچاوەی نزیك دارخورمایەدا، یان ئەوەتا دانیشنو لە (ئەکوتین) دا نینۆکتان بکرتێنن، لەبازنەیەکی بچکۆلەی ئازاری کەللەسەردا

هێشتا ئێوە پاڵ ئەنێن و لەبارنەی بێ کۆتـایی بیرێکدا ئەسووڕێنەوە

هەتاکوو بەڵگـە بۆ رەوایی ئـەو کارەتـان بۆ خۆتان بهێننەوە

رۆمـانێك ئـەچنن لـــەکاتی چنینـــدا هەڵئەوەشێتەوە

لەدۆزەخی پروپاگەندەدا بۆ هەتا هەتایە رێگا ئەکەن.

ئەمـەش بیروبـاوەڕ نی‌یـە، چارەنووســتانە لەسەر زەمین

پێویســتە ئێمـەش چیتـر بیرتـان لــێ ئەکەینەوە.

قەشەی یەکەم: ئۆه گـەورەم، دەوڵـەتی نوێ شکۆمەندیمان لێ حەشار ئەدات

بەچاکێتی خۆت، بۆمان بپارێزەوە.

قەشـەی دووەم: ئێسـتاش لەبـەر دیوانــی یەزداندا

هـەمومان هـەر لـە قـەددیس و شـەهیدانی بەرلەتۆوە کۆبووینەتەوە یادمان بکەرەوە.

قەشەی سێیەم: سوپاسمان بگەیەنـە یـەزدان کە لە کانتربێری قەددیسێکی تری پێبەخشین.

کۆرس: (دەنگی سرروودی (تیدام) ی لاتینـی لەدوورەوە ئەبیسرترێ)

ئەی خواوەند بەناوی تۆ، بەشکۆمەندیت

کە لە هەموو بوونە وەرانی سەرزەمیندا

لـە بـەرفرو باراندا، لـەباو زریـاندا، لەهـەموو ئەفریەبووەکانتا، لە نێچیرو راوچیاندا بڵاوە.

لە هەموو ئەو شتانەی هەن و تـەنیا تـۆ ئـەیان بینیی و تەنیا خۆت ئاگات لێیانە

هەموو ئەو شتانەی لـەرووناکی (نـور) ی تـۆدا هەن

شکۆمەندیت تەنانەت لەلای ئەوەش ئاشکرایە نکوڵیت ئەکات.

ئـەو تاریکاییـەی کـە سـەرچاوەکەی مەزنییـە رووناکی ئاشکرا ئەکات.

ئەوانـەی نکوڵی لـە بوونت ئەکـەن، ئەگـەر بوونت نەبوایە نەیان ئەتوانی نکوڵی بکەن.

ئەوساش نکوڵی کردنەکەیان پووچ ئەبووەوە

ئەمەش ئەوەی ئەگەیاند ئەوان بوونیان نی‌یە

ئەوان لەژیاندا سوورن لەسەر بوونی تۆ

هـەموو شتێ لـەژیاندا، مـەلان لـە ئاسمـان، واشەو چۆلەکە، گیاندارانی سەرزەمین

گورگ و نێچیر، کرمـی زەوی و کرمـی سـك. پاسەوانی بوونی تۆ ئەکەن.

هەروەها مرۆڤیش کـە خولقاندووتـە پێویستە لەسەری لێت بەئاگابێت

پێویسـتە بەبیروقسـەو کـردار هوشـیارانە وەسفت بکات.

تەنانەت ئەوەشی دەستی بەگسکە، ئەوانـەی پشتیان لەئاگرکردنەوەدا چەماوەتەوە

ئـەو ئەژنۆیـەی لـەپاك کردنـەوەی مـاڵدا خواربۆتەوە

ئێمـە خـاوێن کـەرەوەو گسـك دەرانــی کانتربێرین.

پشـتمان لـەژێر بـاری گرانـا چەماوەتـەوە، ئەژنۆمان لەژێر گرانی تاواندا خوار بۆتەوە

لەترساندا دەستمان بەچاومانـەوە گرتـووە، سـەر لـە خەفـەتدا شـۆڕبوونەتەوەو تەنانـــەت لەناخماندا ئاوازی وەرزەکان

گۆرانی زستان، گۆرانی بەهار، ئاوازی هـاوین، دەنگی ئاژەڵ و باڵداران..

هەموو ستایشی تۆ ئەکەن.

ئێمە سوپاسی تۆ ئەکـەین کـە بـە خوێـن قوربانیت دا

خوێنی خۆت بەخت کرد، خوێنـی شـەهیدان و قەددیسەکانت

زەوی دەوڵەمـەند ئەکـەن و جێگـای پـیرۆز دروست ئەکەن.

قەددیس لەکوێ نیشتەجێ ئەبێ، کەی شەهید خوێنی لەپێناوی خوێنی مەسیحدا ئەبەخشێ.

خـاكێكی پـیرۆز هەیـە، پـیرۆزی لـێنابێتەوە،
گەرچی سوپا پێشێلی بکات
هێشتا (جەماوەر) بـە یـەکێتی ڕێنومایيانـەوە
دێنو چاودێری ئەکەن.
لـەو جێگايـەوە کـە دەرياکـانی ڕۆژئـاوا
ڕۆخەکانی (ئايۆنا) بەرەو مـەرگی پانتـايی بيابـان
هەڵئەدرن
لەشـوێنانی لـەيادچووەوەی نزيکـی کۆڵەکـەی
مەزنی شکاودا نوێژ ئەکرێ
ئـەو خاکـە شـتێکی لـێ هەڵـەقوڵێ بـۆ هــەتا
هەتايە زەوی نوێ ئەکاتەوە
سەرياری نکوڵی لێکردنی هەتا هەتايت.
ئۆ خودايـە ئێمـە بـەم شـێوەيە سوپاسـی تـۆ
ئەکەين.
ئــەی ئەوکەســەی پــيرۆزيت بــەکانتربێری
بەخشيووە.
بمـانبوورە، گـەورەم، ئێمـە خۆمـان بــەجۆرە
مەردوومێکی ئاسايی ئەزانين
ئـەو پيـاوو ژنانــەی دەرگايــان داخسـتووە و
لەبەر ئاگر هەڵکروشکاون
ئەوانـەی لەبەخشـندەيی يـەزدانو شـەوانی
تەنيايی ئەترسن
خۆ دبەدەستەوەدان پێويستە، بێ بەش بوون
ئاراستەکراوە.
ئەوانەی دەستی نێو دەلاقە ئەيان ترسێنێ
ئاگر لەساجی ماڵەوەدايە.
مستەکۆڵە لە (خان) دايەو پاڵنانيش لە تونێل
دا.
ساناتر لە ترساندنی ئێمەکە لـە خۆشەويستی
يەزدان ئێمە دان بە تـاوان و لاوازیو هەڵـەکانمانا
ئەنێين
ئێمە ئەزانين کە خەراپەی دنيا لەملی ئێمەيە
خوێنــی شــەهيدانو ئــازادی قەددیســان لــە
ئەستۆمانن.
سەروەر بەزەيت پێماندا بێتەوە
مەسيح بەزەيت پێماندا بێتەوە
سەروەر بەزەيت پێماندا بێتەوە
ئەی تۆماسی پيرۆز بۆمان بپاڕێرەوە.

(تەواو)

ئەم شانۆنامەيە لە کتێبی:

**Modern English Drama. Murder in the Cathedral**

By: T.S. Eliot. Ed. By: Rudy Cohn. Random House. Newyrk – 1966. P.P (176-217).

وەرگێڕراوە.

# وێستگەکانی سەردەم

■ کتێبی ڕەشی کۆمۆنیزم



■ دڵی تاریکی




■ ئاینەکان لەمێژووی میللەتانی جیهاندا



■ بەبۆنەی کۆچی دوایی تید هیوزەوە



■ لەیادی دوو سنوبەری ئازادییدا

# کتێبی ڕەشی کۆمۆنیزم*

جورج طرابیشی

و: ڕێبین هەردی

ئەم کتێبە لەسەرەتای دەرچوونیەوە لەکۆتایی ١٩٩٧دا، هەرایەکی ناوەتەوە: سەرەتا لەرۆژنامەو هەفتەنامەو رادیۆکانداو پاشانیش لەو گۆڤارانەدا کە سەنگینیان زیاترە. واتە لە گۆڤارە مانگانەو وەرزییەکاندا.

من ئەوە لەخوێنەر ناشارمەوە کە زۆر دوو دڵ بووم بەرلەوەی لەسەر ئەم کتێبە بنوسم چونکە ئەمە کتێبێکی دژەو لەبەرئەوەش حەزت ئەوروژێنێ، حەزیش هەڵبژاردنێکی پێشینەیەو کەمجار خوێندنەوەی کتێب، دەیگۆڕێت. تەنانەت ئەگەر وەك (کتێبی رەش) ئەوەندە گەورەبێت کە ٨٥٠ پەڕەی گەورە داگیردەکات. پاشان مەبەستیش حوکمێکی پێشینەیە {مسبق} و دەشێ بابەتی ئەم حوکمە پێشینەیەش هەر خودی کتێبەکە نەبێ، بەڵکو خوێنەرو رەخنەگرەکەشی بێ. چونکە خوێندنەوەی وەك نەخوێندنەوەی هەڵوێستێکە. نوسین لەسەریشی هەڵوێستێکی دووچەندانە.. جا چ بەسلبی یان ئیجابی. یەکەم شت کە لەم کتێبەدا دەتوروژێنێ ناونیشانەکەیەتی: {چونکە} جگە لەوەی دەیەوێت کتێبێکی رەش بێت لەسەر کۆمنیزم، هەروەها لەناونیشانی دوهەمیدا بابەتی کتێبەکە بەم شێوەیە دەست نیشان دەکات (تاوان، تیرۆر، سەرکوتکردن).

بەمانایەکی دی کتێبەکە دەیەوێت ـ ئەمەش لەناونیشانەکەدا دەتوروژێنێ ـ باسی کۆمونیزم بکات وەك ئەوەی وەك تاوانی نازیەکان و کولونیالیزم، تاوانبارێت، بەڵام پرسیاری گەورە ئەوەیە ئایا دەکرێت قسە لەسەر تاوانی کۆمونیزم بەهەمان ئەو قسانە بکەین کە لەسەر تاوانی نازییەکان، دەیکەین؟ ئەگەر تاوانەکانیش یەکسان بن، ئایا هەردوو ئایدۆلۆژیاکەش وەك یەکن؟

لێرەدا دووڕیانێکی {مفارقە} گەورە هەیە.. چونکە نازیزم وەك ئایدۆلۆژیایەکیش تاوانبارە، تەنانەت بەرلەوەی تاوانەکانیشی بکات.. لەکاتێکدا کومنیزم لایەنی کەم لەئاستی تیوریدا بەڵێنی ئازادیو برایەتی جیهانیە. بەمانایەکی دی تاوان لەنمونەی نازیزمدا پتر وەرگێڕانێکی یەکسەریە، بەڵام لەنمونەی کۆمنیزمدا پتر لە وەرگێڕانێکی پێچەوانە دەچێ. چونکە واقعی پراکتیکی

کۆمنیزم تا ئاستی خیانەت یان تا ئاستی هەڵگەڕانەوە بۆ دژی، لەجەمسەری دژ بەئایدیالەکەیدا بوو. هیچ تیورەیەك نیە هێندەی کۆمنیزم بەڵێنی دابێ و هیچ تیۆرەیەکیش نیە هێندەی کومنیزم بەڵێنەکانی لەپراکتیکدا بەدرۆ خستبێتەوە، کەوابوو لەحاڵەتی کومنیزم دا بەپێچەوانەی نازیزمەوە، ئەگەر باسی بێگوناهی ئایدۆلۆژیش نەکەین، لایەنی کەم دەتوانین باسی پاکێتی نیەت بکەین، ئەگەرچی راستە ئەم بێگوناهیە لەهەموو حاڵەتەکاندا راست نیەو رەنگە هەندێك رەگی خراپە لەناو تیۆری خۆیدا بێت، بەڵام دەتوانین لەئاستی تیۆریدا بەدیاریکراوی باسی پاکێتی سەرەتایی بکەین، چونکە کومنیزم مژدەی بەرهەم بوو، نەك مژدەی ئەو کرمەی کە لەناو بەرهەمەکەدایە. هەر ئەم بەڵێنەش بوو کە وایکرد ملیۆنەها مرۆڤ لەپاکترین دەرونەکانو لەو کەسانەی زیاتر لەخەڵکی دی ئامادەیی گیانفیدایین، لەدەوری کۆببنەوە، لە پێناوی وەدیهاتنی ئەم بەڵێنەشدا هەزاران کەس کوژرانو ئەشکەنجەدرانو زیندانی کران. بێگومان باسکردنی (کتێبی رەشی کومنیزم) سوکایەتی بە شەهیدانی بەڵێنەکە دەکاتو لە ئازیزترین ئازیزەکانی بیرەوەریاندا، برینداریان دەکات. جگە لەمەش کارێکی وا جەلادەکانیان خۆشحاڵ دەکاتو بە بێگوناه دەریاندێنێ. بێگومان هەموو یەکسانکردنێکی شەهیدەکانی کومنیزمو جەلادەکانی کومنیزم، یەکسانکردنێکی قبوڵنەکراون {مرفوض} وەك چۆن یەکسانکردنی کومنیزم وەك جەستەیەکی تیوری بە نازیزم، قبوڵناکرێت.

لەبەرئەوەی ئەم تێکەڵکردنەش رونەدا واباشتر بوو ناوی کتێبەکە لەبری (کتێبی رەشی کۆمنیزم)، (کتێبی رەشی نیزامەکانی کومنیزم) بێ. چونکە ناونیشانێکی وا رەنگە ئەو تێکۆشەرە کومنیزمە تیۆریانە رازی بکات کە دەستیان نەبووە لەپراکتیکە دەسەڵاتاویەکاندا (الممارسة السلطوية) پتر خۆشیان بوونە قوربانی ئەو نیزامە دەسەڵاتاویانەی تێکۆشانی خۆیان بەرهەمیهێنا، ئەم حاڵەتە لە (کتێبی رەشی کۆمنیزم) دا رەنگی داوەتەوە: چونکە زۆریەی نوسەرانی کە شەش کەسن، لەکومنیستەکانن یان لە کومینیستە کۆنەکانن. لەپێش هەموویانەوە ستیفان کۆرتوا کە سەرنوسەری گۆڤاری (کومنیزم) و نوسەری بەشدارە لە(مێژووی حیزبی کومینیستی فەرەنسی)دا، رەنگە هەر ئەمەش تۆنێکی راستگۆیانە بە (کتێبی رەش) بدات، واتە ئێمە لەبەردەم چاپێکی تازەی ئەدەبیاتی دژی کومنیزمدا نین کە کاتی بەسەرچووە، بەڵکو ئەو پێشەکیو پاشکۆیەی ستیفان کۆرتوا بۆ ئەو مەلەفە مێژوویو مەلەفی روداوەکان نوسیویێتی کە کتێبەکە پێك دەهێنن، پتر لەپیاچونەوەیەکی دیموکراتیانەی چەپ دەچێ بەتیورەی توندوتیژی مارکسدا. ئێمەش دەڵێین پیاچونەوە.. نەك هەوڵدان بۆ بێگوناهکردنی مارکس، چونکە گەر بەرێکەوت نیە کە مژدەی بەهەشتی سەر زەوی کومنیزم لەپراکتیکدا گۆڕا بۆ دۆزەخ، رەنگە کەموکوڕی وەك میکرۆبێك لەناو جەرگەی خودی تیورەداو لەناو خودی چەمکە تیورەکاندا بێ، نەك تەنها بگەڕێتەوە بۆ خیانەتکردن لەتیۆرەو دورکەوتنەوەی واقع لەئایدیالەکەی.

ئاشکراشە بۆ ئەو کەسەی دەیەوێت زانیاریەك لەبارەی (تاوان، تیرۆرو سەرکوتکردنەکانەوە) بەدەست بهێنێ، ناچارە بگەڕێتەوە بۆ مەلەفەکانی کتێبەکە لەسەر؛ کۆلاگی سۆڤیێتیو چینیو ئاسیایی (کۆریایی، ڤیتنامی،

کەمبودیای، لاوسی) و ئەورووپای خۆرهەڵاتی (بولندای، مەجەری، چیکۆسلوڤاکی، ئەڵمانی، بولگاری، رۆمانی) و ئەمریکای لاتینی (کوبای، نیکاراگوای، پیرۆی) و جیهانی سێهەمیش (حەبەشی، ئەنگۆلی، موزانبیقی، ئەفغانستانی). ئەم مەلەفانە پسپۆرە بەناوبانگەکان لەمێژووی کومنیزمدا، ئامادەیان کردووە... زۆربەشیان لەکۆمنیستەکانن یان سەر بەچەپی تازەی دیموکراتین. لەوانەش (نیکۆلای ورس) نوسەری (مێژووی یەکێتی سۆڤێت، لەئیمپراتۆری روسیاوە بۆ یەکێتی دەوڵەتە سەربەخۆکان) ١٩٢٢ و (ئەندرێ بازوفسکی) بریکاری بەڕێوەبەری پەیمانگای لێکۆڵینەوە سیاسیەکانی سەر بە ئاکادیمیای زانستەکانی پۆڵەندا، و (کارل بارتوسك) مێژوونوسی چیکی کە پسپۆرە لەمێژووی تازەی ئەورووپای خۆرهەڵاتو ناوەڕاستداو سەرنوسەری گۆڤاری (ئەڵتەرناتیڤی تازە) یە، ئامانجی ئەم کۆمەڵە مێژونوس و زانکۆیی و لێکۆڵەرەوانەش ئەنجامدانی گەورەترین (سەرژمێری) ئابروچون {فضائح} و ستەمەکانە کەلەژێر دروشمی کۆمنیزمدا کران.. لەگەڵ دەستنیشانکردنی جێگاو کاتو ناوی جەلادو قوربانیەکان، تا ئەو جێگایەی دەستیان بەو ناوانە گەیشتووە. جەلادەکان پێك دێن لەدەیان هەزار کەس و قوربانیەکانیش لەوڵاتی بچوکی وەك کۆریاو کەمبودیادا، ملیونەها کەسن و لە وڵاتی گەورەی وەك روسیاو چینیشدا، دەیان ملیۆن کەسن. بەڵام بەدەر لەم لایەنە بەڵگەییە، ئەو وانەیەی (کتێبی رەشی کۆمنیزم) هەوڵدەدات دەریبهێنێ، کورت دەکرێتەوە بۆ سێ ئاست:

١) چەندایەتی توندوتیژی (عنف) کومنیزم.

٢) چۆنایەتی توندوتیژی کومنیزم.

٣) بۆچی توندوتیژی کومنیزم.؟

## چەندایەتی توندوتیژی کۆمنیزم:

بێگومان توندوتیژی کۆمنیزم - دیارە هەمیشە باسی توندوتیژی دەسەڵاتوی (العنف السلطوي) دەکەین - دەچێتە رەوتێکی گەورەترو بەرفراوانترەوە کە رەوتی سەدەی بیستەمە.. سەدەیەك کە دەتوانین لەمێژووی مرۆڤایەتیدا بەسەدەی توندوتیژی وەسفی بکەین. مێژوو لەم سەدەیەدا وا دەرکەوت وەك ئەوەی (زانستی ئازاری مرۆڤ) بێ، سەدەی بیستەم سەرەڕای دوو جەنگی جیهانی کە نزیکەی ٦٠ ملیۆن کەسی کردە قوربانی خۆی، چەندان کارەساتی گەورەی لەتوندوتیژی دەستە جەمعیەوە بەخۆیەوە بینی کە لەهەندێك حاڵەتدا شێوەی جینۆسایدی بەخۆیەوە گرت وەك کوشتاری ئەرمەنیەکان لەسەرەتای ئەم سەدەیەداو هۆڵۆکۆست لەناوەڕاستەکانیداو دواجار کوشتارگای رەواندیەکان لەکوتاییەکانیدا.

بەڵام ئەگەر توندوتیژی کۆمنیزم دەچێتە خانەی توندوتیژیەکی بەفراوانترەوە، ئەوا لەبەرامبەردا ئەمە یەکێکە لەگەورەترین گرفتو چڕترین دەلالەتەکانی. ئەمەش هەر بەبەراوردێکی چەندایەتی، (کتێبی رەش) ژمارەی قوربانیەکانی کۆمنیزمی دەسەڵاتوی بەسەد ملیۆن کوژراو دادەنێ کە لەرووی جوگرافیی و ئەزمونیەوە بەم شێوەیە دابەش دەبن:

- ٢٠ ملیۆن کوژراو لەیەکێتی سۆڤێت.
- ٦٥ ملیۆن کوژراو لە چین
- ٢ ملیۆن کوژراو لەکەمبۆدیا
- ٢ ملیۆن کوژراو لەکۆریا
- ١و٧ ملیۆن کوژراو لەئەزمونەکانی کومنیزم لەئەفریقادا،

- ٥و١ مليۆن كوژراو لەئەورووپای خۆرهەڵاتدا

- ٥و١ مليۆن كوژراو لەئەفغانستان

- ٥و١ مليۆن كوژراو لەڤێتنام.

- ١٥٠٠٠٠ كوژراو لەكوباو ئەزمونەكانی تری كۆمنيزم لەئەمەريكای لاتيندا.

ئاشكرايە ئەم ژمارانە جياوازی گەورە لەپراكتيكی توندوتيژيدا پيشان دەدەن. بۆ نمونە ئەزمونی روسی - لينينيزم، ستاليزم پێكەوە - وەك (ستيڤان كۆرتوا) دەڵێت بەسيمای (ئەزموونی) و عەقڵانيەتی ساردیەوە (موی مرۆڤ راست دەكەنەوە). ئەزمونی مائويزم بەژمارەی بەرفراوانی قوربانيەكانیو بارستەی ئەو جەماوەرەی ئەشكەنجەيداو تا ئاستی مردن برسی كرد، دەمانحەپەسێنێ. بەڵام (لەهەمويان پێشتر) لەچڕی كوشتارەكاندا دەگەڕێتەوە بۆ (خەميرە سورەكان) كە توانيان بەسەرۆكايەتی پۆڵ پۆت لەماوەی سێ ساڵو نيودا چوار يەكی گەلی كەمبودی لەڕەگەوە دەربهێنن.

بەبەراوردكردنی ئەمەش لەگەڵ توندوتيژی نازيزمدا كە ئيدی لەسەدەی بيستدا بەپێوەری رەهای توندوتيژی ئايدۆلۆژی دادەنرێت، ئەوا {بۆمان دەردەكەوێت} توندوتيژی كۆمنيزم چوار ئەوەندەی ئەو ژەهراويە، هەرچەندە بەراوردكردنی چەندايەتی خۆی لەخۆيدا (ناشرينە) بەڵام تارادەيەكی زۆر ژمارەی ١٠٠ مليۆن لەقوربانيەكانی كۆمنيزم بە (متكراوی {مسكوتاعنه}) هێڵرايەوە. لەكاتێكدا تاوانەكانی نازيزم لەپاش جەنگی جيهانی دووهەمەوە قۆزرايەوە بۆ ناو زڕاندنێكی جيهانی. پێدەچێ پێويستی ناو زڕاندنی نازيەكان بەتايبەتی ئەوەی پەيوەندی بەهۆلۆكۆستەوە هەيە، يەكێك بێت لەو هۆيانەی كە يارمەتی شاردنەوەی توندوتيژی كۆمنيزمی دەسەڵاتاویو ونكردنی رەهەندی تاوانە دەستە جەمعيەكان، دابێ. هۆيەكی ديش پەيوەندی بەوەوە هەبوو كە يەكێتی سۆڤێتو بەهۆيەوە تيپە {كتيبە} بەرگريەكانی كۆمنيستەكان بەشداريەكی ئەگەرچی درەنگ بەڵام چالاكانەيان لەجەنگدا دژی نازيەكانو تێشكانيان، كرد. وەك ئەوەی بەم كارە يەكێتی سۆڤێت پاكانەيەكی پێشينەی وەرگرتبێو ناكرێت بخرێتە ژێر گومانەوە بە بيانووی پاراستنی كەرامەتی شەڕی جيهانی دژی كۆمنيزم.

دواجار هۆی سێيەميش كە لەهۆكانی دی زياتر چارەنوسسازە بۆ پرۆسەی شاردنەوەی تاوانەكان بريتيە لە: (ئەفسانەی شۆڕشگێڕی). چونكە ئايديای شۆڕش تا پێش راپۆرتە نهێنيەكەی خرۆشۆف لەبەردەم كۆنگرەی بيستەمی حيزبی كۆمنيستی سوڤێتيدا، ئايديايەكی پيرۆزو لەسەرو هەموو رەخنەو هەڵسەنگاندنێكەوە بوو. تەنانەت پاش بڵاوبونەوەی راپۆرتە نهێنيەكەی خرۆشۆفيش، هەر رەخنەگرتن لەبيرۆكەی شۆڕش لەرزۆكو دو دڵبوو لەوەی بگات بەڕەگی ئەفسانەكە. دەكرێت بڵێين راپۆرتەكەی خرۆشۆف لەبری ئەوەی هەستی رەخنەگرانە بوروژێنێ، بەپێچەوانەوە پتر هەوەسی شۆڕشی بزواند. لەشەستەكان و حەفتاكاندا ئەدەبی پياهەڵدان بەسەر كومنيزمدا، زياتر پەرەیسەند، تەنانەت لەناوەندی جيابوەكان {منشقين} و هەراتيقەشدا. لەوكاتەدا كە هەموو بەرپرسياريەكانی (لادان) دەخرايە ئەستۆی ستالين، لەهەمان كاتدا پاكانە بۆ دەوری لينينو ماو كرا. واتە ئەگەرچی واقعی پراكتيكی كۆمنيزم تاوانباركرا بەڵام لەهەموو كاتێك زياتر گۆرانی بەسەر

ئایدیالەکەیدا، هەڵدرا. بەمشێوەیە لەبەرامبەر ئایدیادا، تاوانەکانی پراکتیك وا دەردەکەوێت وەك ئەوەی شتێکی لاوەکی مێژوو بێت. نوسەرانی (کتێبی رەشی کۆمنیزم)یش دان بەوەدا دەنێن ـ ئەمەش خۆی ئازایەتیەکەو بۆیان دەژمێردرێت ـ کە ئەوان خۆشیان بەشداربوون لەو گەمەیەدا: تاوانبارکردنی واقع بەئامانجی پاکانەکردن بۆ ئایدیالو بەئامانجی پاراستنی بیرۆکەی (شۆڕش) وەك چارەسەرێك بۆ رزگاری مرۆڤایەتی ـ ئەگەرچی لەسەر حسابی ئازارە ترسناکەکانیش بێت بۆ مرۆڤایەتی.

## چۆنایەتی توندوتیژی:

کاتێ باسی توندوتیژی کۆمنیزم وەك توندوتیژیەکی سیاسی دەکەین، یەکسەر خەیاڵمان دەڕوا بۆ: ئەشکەنجەدانو هێرشەکانی (پاکتاوکردن) و دادگایکردنە درۆزنەکان کە لەسەرەتاوە دەرئەنجامەکانی زانراوەو زیندانەکانو پۆلیسی نهێنی کە لەسەرو یاساوە رەفتار دەکەن. بەڵام نیزامە کومونیستەکان لەهەمانکاتدا چەند شێوازێکی تایبەتیو جۆرێکی توندوتیژی سیاسی دەستەجەمعیان، پەرەپێدا کە بەشێوەیەکی تایبەتی لە ئۆردوگاکانی کارو برسیکردنی (بەرنامە بۆ داڕێژراودا) دەردەکەوێت.

(کتێبی رەشی کۆمنیزم) سەبارەت بەئۆردوگاکانی کار، دوودڵ نیە لەوەی باسی (ئیمپراتۆریەتی ئۆردوگاکان) بکات. ساڵانی سیەکان وەك چۆن سەرکەوتنی ستالینیزمی بینی، هەروەها شێوە گەلێکی توندڕەوانەو بمابێ پێشینەی بینی لە دەستدرێژیکردنو سەرکوتکرندا دژی کۆمەڵگا، لەپێش هەمووشیانەوە ئەو شێوە تازەیەی لەکاری کۆیلەیەتی کە کۆمنیزم دایهێنا: ئۆردوگاکانی کار. دادگاکانی پۆلیسی سیاسی ناسراو بە (غیبیهو) لەساڵی ١٩٢٩دا بە بەهانەی سەر لەنوێ ئاوەدانکردنەوەی (سوشیالیستی) بڕیاری کاری ناچارانەی بەسەر ٥٦٠٠٠ گیراودا دەرکردو لەساڵی ١٩٣٠دا بەسەر زیاد لە ٢٠٨٠٠٠ گیراودا. ئۆردوگاکانی کار لەساڵی ١٩٣٢دا ٣٠٠٠٠٠ دانیشتووی هەبوو. هەندێك لەو ئۆردوگایانە بەڕاستی ئۆردوگای مردن بوون، چونکە رێژەی ساڵانەی مردن تیایدا هەندێك جار دەگەیشتە ١٠٪. وەك لەئۆردوگای کاری (ناوچەی بەلتیق ـ دەریای سپی)دا. ئوردوگاکان لەساڵی ١٩٣٥داو پاش یەکێتی سیستمی کۆلاگ، کە ئەمە ناوی روسی بەڕێوەبەرایەتی سەرەکی ئۆردوگاکانەو سولوژنتسین لەرۆمانەکانیدا ناوبانگێکی جیهانی بۆ دروستکرد، ٧٢٥،٠٠٠ دانیشتووی لەخۆ دەگرت، جگە لە (هیستۆکەکانی {مستوطنات} کار) کەپتر ئەو خەڵکانەی لەخۆدەگرت کە (کەمتر لەڕوی کۆمەڵایەتیوە مەترسیدار بوون) واتە ئەو کەسانەی حوکمەکەشیان لەسێ ساڵ تێپەڕی نەدەکرد.. ژمارەی ئەمانەش لەهەمان ساڵدا گەیشتە ٢٤٠،٠٠٠ زیندانی. لەکۆتای سییەکاندا دانیشتوانی کولاگ بوو بەدوو ئەوەندەو لەسەرەتای ١٩٤١دا گەیشتە ١،٩٣٠،٠٠٠. ئەم ژمارە زۆرەی دانیشتوانی کولاگ زیانی لە (سیستمی کار)داو تا ئەو رادەیەی لەساڵی ١٩٣٧داو بەهۆی هێنانی ٧٠٠،٠٠٠ دانیشتوی تازە لەدەرئەنجامی هێرشی گەورەی پاکتاوکردندا، بەرهەمەکانی لەچاو ساڵی رابردودا (١٩٣٦) بەرێژەی ١٣٪ هاتە خوارەوە. هەر لەبەرئەمەش لاڤرنتی بیریا (نوێنەری گەل بۆ ناوخۆ {مفوض الشعب للداخلیة} بۆ دوبارە رێکخستنەوەی کۆلاگەکانو عەقڵانیکردنی سیستمی کارو بەرهەمهێنان

تیایدا، بەسیفەتی شەخسی دەستی خستە ئەم کارەوە. لەو راپۆرتە رەسمیەشدا کە لە ١٠ نیسانی ١٩٣٩دا بۆ مەکتەبی سیاسی نارد، هاتووە کە بەڕێوەبەری پێشوو (نیکۆلای ئیوف) (گەڕان بەدوای دوژمنە چینایەتیەکانی) خستۆتە پێش (بەڕێوەبردنی کاروبار بەرێکوپێکی). لێرەوە بڕی خۆراکی رۆژانەی گیراوەکان، تەنها ١٤٠٠ حەریرەیە کە ئەم بڕە دانراوە بۆ (گیراوە دانیشتووەکان)ە نەك بۆ (گیراوە کرێکارەکان) لەدەرئەنجامی ئەمەدا ٢٥٠،٠٠٠ دانیشتوو توانای کارکردنیان لەدەستداوەو رێژەی مردنیش لەریزەکانیاندا ساڵانە بەرزبۆتەوە بۆ ٨٪.

ئەگەرچی بیریا لەراپۆرتەکەیدا داوای بڕی خۆراکی زیادە دەکات بەڵام لەهەمانکاتدا پێشنیاری درێژکردنەوەی کار لەئۆردوگاکاندا دەکات بۆ ١٠ کاتژمێرو کەمکردنەوەی رۆژانی پشوو لەچوار رۆژەوە بۆ سێ رۆژ لەمانگێکدا. بەگشتیش لەساڵی ١٩٣٤و ١٩٤٠دا ژمارەی حاڵەتی مردن لەئۆردوگاکاندا گەیشتە پتر لە ٣٠٠ هەزار لەکاتێکدا ژمارەی دانیشتوان لەهەمان ماوەدا گەیشتە ٦ ملیۆن.

بەڵام شێوەی دووهەمی توندوتیژی دەستە جەمعی کۆمنیزمی دەسەڵاتاوی داهێنا، برسیکردنی رێکخراو و بەپێی بەرنامەیەکی داڕێژراو بوو. دەتوانین بڵێین چەکی برسیکردن بە رێکەوت دۆزرایەوە. مەرگەساتو قاتوقڕی ئەو شەڕی ناوخۆییەی لەساڵی ١٩١٩ - ١٩٢١دا لەنێوان (سپیەکان)و(سورەکان)دا بەتوندوتیژی رویداو تیایدا سپیەکان ئابلۆقەی سورەکانیان لەشارە سەرەکیەکاندا دابوو، لەلایەکانەوە دەستی پێنەکرد ئەو کاتە نەبێت کە قاتوقڕی {المجاعە} ٣٠ ملیۆن کەسی گرتەوەو بەتایبەتی بووە هۆی مردنی ٥ ملیۆن کەس لەریزی (دوژمنانی شۆڕشدا). لینین پێشتر سەرنجی لەمەترسی (تیوری) ئەم چەکەدا بوو.. ئەوکاتانە کە هێشتا پارێزەرێکی لاو بوو لەشاری سمارە، پایتەختی یەکێك لەهەرێمەکانی روسیا کە لەساڵی ١٨٩١دا قاتوقڕیەکی ترسناك گرتیەوە. لەوکاتەدا لینین هەڵوێستێکی رەخنەگرانەو سوکایەتی پێکرانەی لەو چینە رۆشنبیرە ناوخۆیە گرت کەخۆی سازدابوو بۆ پێشکەشکردنی یارمەتی کۆمەڵایەتی بە برسیەکان، وەك

بلیاکۆف (کە دانەری ژیاننامەی لینینی لاوە) دەڵێ ئەوەندە ئازایەتی تیابوو (بڵێتەوەی بەراشکاوی رایگەیەنێ کە قاتوقڕی دەرئەنجامی پوزەتیفی جیاجیای هەیە. لەپێش هەموویانەوە دەرکەوتنی پرولیتاریای پیشەسازی.. (گۆڕهەڵکەنی سیستمی بورجوازی). قاتوقڕی بەوێرانکردنی ئابووری جوتیاری دواکەوتوو، لەڕوی بابەتیەوە نزیکمان دەخاتەوە لەدوا ئامانجمان: سوشیالیزم. چونکە قاتوقڕی نەك هەر بەتەنها باوەڕ بەقەیسەر لەناو دەبات، بەڵکو باوەڕ بەخوداش دەکوژێ). لینین جارێکی دی ئەم تێزەی لەقاتوقڕی ١٩٢١دا کە ترسناکترین قاتوقڕی بوو کە روسیا بەخۆیەوە بینی، خستەوەگەڕ. لینین ئەم قاتوقڕیەی قۆزتەوە بۆئەوەی دەست بەهێرشێکی دەستبەسەراگرتنی بەرفراوان بکات بۆ موڵکی کەنیسە ئەرسوزوکسیەکان، (دەماغی) دوژمنی چینایەتی. لێرەوە لە ١٩ ئازاری ١٩٢٢دا نامەیەکی ئاراستەی ئەندامانی مەکتەبی سیاسی کرد کە تیایدا بەمشێوەیە هاتووە (ئێمە ئێستا ٩٩٪ بەختمان هەیە بۆئەوەی جەزرەبەیەکی کوشندە لەدەماغی دوژمن

بەسەرکەتووی بدەین، چونکە ئێستاو تەنها ئێستا بەهۆی ئەو هەموو مرۆڤە برسیەوە کە گۆشتی مرۆڤ دەخۆن و بەهۆی ئەو رێگایانەوە کە پڕن لەهەزاران لاشە، دەتوانین (و پێویستە لەسەرمان) بەهیمەتێکی پۆلاینەوە کە بەزەیی نازانێت، دەست بەسەر موڵکەکانی کەنیسەدا بگرین، ئێستاو تەنها ئێستا دەشێ زۆریەی زۆری جەماوەری جوتیاری پشتمان بگرێت یان بەدەرپرینێکی وردتر، واز لەپشتگیری کۆمەڵێ پیاوی دینی کۆنەپەرست و بورژوازی بچوک، بهێنێ.. بەمشێوەیە دەتوانین دەست بەسەر خەزێنەیەکدا بگرین کە چەند ملیۆن رۆبلی ئاڵتونی تێدایە (بیر لەخەزێنەی هەندێك کەنیسە بکەنەوە!). بێ ئەم خەزێنەیەش ناتوانین تەسەوری هیچ چالاکیەك لەدەوڵەت بەشێوەیەکی گشتی و هیچ بونیادنانێکی ئابووری بەشێوەیەکی تایبەتی و هیچ بەرگریەك لەجێگاکانمان بکەین، پێویستە لەسەرمان چەند لەسەریشمان بکەوێت، ببینە خاوەنی ئەو خەزێنەیە کە چەندان ملیۆن رۆبلە (رەنگە چەندان ملیاردیش بێ!) هەموو ئەمەش ناکرێت بەسەرکەوتووی ئەنجام بدرێت، ئێستا نەبێت، هەموو شتێکیش ئاماژە بۆ ئەوە دەکەن کە ئێمە هەرگیز لەکاتێکی تردا ناتوانین بەئامانجەکانمان بگەین. چونکە رەنگە تەنها ئەو نائومێدیەی بەهۆی قات و قڕیەوە دروست دەبێ، هەڵوێستێکی لایەنگرانە یان لایەنی کەم بێلایەنمان لەجەماوەردا بۆ دروست بکات).

ئەم توندوتیژەیە {عنف} (تیۆریە) بێوێنەیە، لەسەر دەستی ستالین بوو بەتوندوتیژیەکی کرداری. لینین لەوە زیاتری نەکرد کە ئەو (هەلەی) قۆستەوە کە قات و قڕی دروستی کردبوو، بەلام ستالین لەهەل قۆستنەوە تێدەپەڕێ و خۆی هەلەکە دروست دەکات، واتە چەکی برسێتی وەك خۆی بەکاردێنێ. بەمانایەکی دی لەو شوێنانەدا کە پێویستە دەستدەکات بەرێکخستنی برسێتی بۆئەوەی جەزرەبەیەکی کوشەندە نەك هەر لەدەماغ بەڵکو لەسەرجەم جەستەش بدات.. واتە لەخودی جەماوەری جوتیاری. بۆ نمونە ئەمە لە(قاتوقڕی گەورەدا) لە سالانی ١٩٣٢ ـ ١٩٣٣دا رویدا کە شەش ملیۆن کەسی کردە قوربانی. ئەم قاتوقڕیە وەك ئەو قاتوقڕیانە نەبوو کە روسیای قەیسەری و بەلشەفی بینیبویان، بەڵکو دەرئەنجامی راستەوخۆی سیستەمی چەوساندنەوەی چینی جوتیار بوو کە بە(سروشت) دوژمنی شۆڕشەو هەروەها دەرئەنجامی جێبەجێکردنی کۆکردنەوەی زۆرەکیە وەك دەروازەیەك بۆ بونیادنانی سوشیالیزم لە لادێکاندا. (ئامانجی قۆناغەکە کە رەوتی {سیاق} قاتوقڕی دەستنیشاندەکات، دەستبەسەراگرتنی موڵکەکانی کەنیسا نەبوو، بەڵکو دەستبەسەراگرتنی گەنمی جوتیاران بوو. بەمشێوەیە بەتاوانی (دەستدرێژیکردنە سەر موڵکیەتی سوشیالیزمی) واتە شاردنەوەی گەنم و جۆ بەکردەگی {عەمەلی}، لەماوەی ١٠ ساڵدا حوکمی زیندان لەگەڵ کارکردندا بەسەر زیاد لە ١٠٠٠٠ جوتیاردا دراو لەماوەی نێوان ئابی ١٩٣٢ و کانونی یەکەمی ١٩٣٣یشدا حوکمی لەسێدارەدان بەسەر ٥٤٠٠ جوتیاردا، جێبەجێکرا، بەلام لەبەرئەوەی هەموو ئەم کردارانە هیچ دەرئەنجامێکی نەبوو، بڕیاریدا لەتۆڵەی (برسیکردنی شارەکاندا) (لادێکان برسی) بکات. بەمشێوەیە لەکاتێکدا دەستبەسەر گەنم و مەڕو ماڵاتی جوتیاراندا گیرا، لەهەمان کاتدا رێگای چوون بۆ شاریان بەهۆی کونترۆلکردنی هاتوچۆیانەوە لەرێی وەرەقەیەکی

ڕەسمیەوە، لێگیرا. ئیدی (دژە هێرش بۆ سەر تێكدەران) نەك هەر كۆڵاگەكان بەڵكو كۆنخوازەكانیشی گرتەوەو بگرە كۆمنیستەكانی ناوچەیەكانیش. وەك لەو بەیانەدا كە سەرۆكایەتی حیزب لەهەرێمی قەفقازی باكووردا دەریكردو داوای لە (ڕێكخراوە ناوچەییەكانی حیزب كرد، پاش شكستی شەرمەزارانەی نەخشەی كۆكردنەوەی گەنم، تێكدانی ڕێكخراو لەلایەن هەندێ ئەندامی كولاكەكانەوە كە دوژمنی شۆڕشن، تێكوپێك شكێنن‌و هەروەها پاكتاوی {تصنعیة} بەرگری كومنیستە لادێییەكان‌و سەرۆكی كولخۆزەكان بكەن كە ڕابەرایەتی پرۆسەی تێكدانیان كرد).

لەماوەی مانگی تشرینی دووهەمی ١٩٣٢دا كە مانگی یەكەمە لە (خەبات دژی تێكدان) ٥٠٠٠ كۆمنیستی لادێی بەتاوانی (دەستتێكەڵكردن) لەگەڵ (دەسیسەی تێكدان)دا، ڕەوانەی زیندان كران، هەروەها ١٥٠٠٠ كۆلخۆزی گیران.. هەموو ئەمانەش تەنها لەناوچەی قەفقازی باكووردا كە خۆی گرنگیەكی ستراتیژی هەیە لەڕووی بەرهەمهێنانی خۆراكەوە. بەڵگە ڕەسمیەكانی بەڕێوەبەرایەتی كۆڵاگ ئاماژە بۆ ٧١،٢٣٦ دانیشتووی تازە لە١٩٣٢داو ٢٦٨،٠٩١ دانیشتووی‌تر لە١٩٣٣دا دەكەن كە زۆربەیان ئەو جوتیارانەن كە لەدێكانیان دورخراونەتەوە.

بەڵام پێدەچێ هەنگاوەكانی دژ بەتێكدان لەدێكانی ئۆكرانیادا كە تاوانباركرابوون بەجێبەجێنەكردنی (پێویستیەكانی دەوڵەتی پرولیتاری) بۆگەنم، گەیشتبێتە لوتكەی خۆی. ئەگەر ملیۆنەها ئۆكرانی ناچاركران نەك هەر بەرهەمەكانیان بەڵكو خەزێنەی تۆوی ئیحتیجاتیشیان تەسلیم بكەن‌و ڕێگەی چوون بۆ شاریان لێگرتن‌و تەنانەت سواربوونی شەمەنەفەریشیان لێقەدەغە كردن، ئەوا ڕێژەی مردن بەشێوەیەكی ترسناك لەناویاندا بەرزبۆوە بەتایبەتی پاش ئەوەی برسێتی‌و وەبای تیفۆئید پێكەوە لەناویاندا بڵاوبۆوە. ڕێگاكان لەزستانی ١٩٣٣ی ترسناكدا بەهەزاران لاشە داپۆشرابوو، لەهەندێ شوێنیشدا حاڵەتی خواردنی گۆشتی مرۆڤ بینرابوو. نوسەری بەناوبانگ میخائیل شولوخۆف نوسەری ڕۆمانی (دونی ئارام) ڕوداوەكانی ئەم قاتوقڕیەی لە ناوچەی (كوبان)ی قەفقازیدا كە دەكەوێتە لای سنوری ئۆكرانیەوە، بینی بوو. لەبەرئەوە نامەیەكی بۆ ستالین نوسیبوو كە تیایدا بە درێژی باسی ئەو شێوازی ئەشكەنجەدانی (سارد)و(گەرمەی) (وەك خۆی ناوی ناوە) دەكات كە بۆ دەست بەسەراگرتنی خەزێنەی ئیحتیاتی جوتیاران بەكارهاتووە (تەماشای دەقی نامەكەی شولوخوف‌و وەڵامەكەی ستالین، لەپاشكۆی ئەم وتارەدا بكەن). قاتوقڕی جگە لەسەرجەم ئۆكرانیا، بیابانەكانی ڕوباری دون‌و كوبان و قەفقازی باكوری كازاخستانیشی گرتەوەو ٤٠ ملیۆن كەس برسێتیان چەشت. قاتوقڕی لەناوچەی (خاركۆف)دا چەقی گرت كەپایتەختی ئوكرانیای كۆنە، بەشێوەیەك كە ژمارەی مردووەكان لەحوزەیرانی ١٩٣٣دا گەیشتە ١٠٠،٠٠٠ كەس لەبەرامبەر ٩٠٠٠ كەس لە ساڵی ١٩٣٢دا. هەر بەتەنها لەشاری خاركۆفداو لەماوەی ساڵێكدا ١٢٠،٠٠٠ كەس مردن. پێدەچێ جوتیارانی ئۆكرانیا لەهەموو كەسێك زیاتر زیانیان لێكەوتبێ چونكە ژمارەی قوربانیەكان لەناویاندا گەیشتە چوار ملیۆن. لەبەرئەوە هەندێ مێژوونوسی ئۆكرانی باس لە پرۆسەی جینۆسایدیكی بەمەبەست

دەکەن لە پێناوی (بەروسیکردندا)، بەڵام بەهەرحاڵ ئەوەی جێی گومان نیە ئەوەیە ستالین کە لەبنەڕەتدا جورجیاییە، رقێکی تایبەتی لەئۆکرانیەکان هەبوو. ساخارۆف باسی (فۆبیای ئۆکرانی لای ستالین دەکات)

بەڵام نابێ ئەوەمان لەیادبچێت کە کازاخستانیەکانیش کەزۆربەی دانیشتوانی لادێین، زیانی گەورەیان لێکەوت: یەك ملیۆن قوربانیانداو دوو ملیۆنیش ناچاربوون کۆچ بکەن بۆ چین‌و ئاسیای ناوەڕاست.

بەکورتی (برسیکردن) بوو بەتەکنیکێکی جێگیر لەپراکتیکی کۆمنیزمی دەسەڵاتاوی لەقۆناغی ستالینیزم‌و درێژکراوە مائویزمەکانیدا. لەچینداو ساڵانی ١٩٥٨ - ١٩٦٠و لەئەنجامی هێرشی بازدانی گەورەدا بۆ پێشەوە، بەپێی تەقدیرە نیمچە رەسمیەکان ٢٠ ملیۆن کەس لەبرسا مردن‌و بەپێی تەقدیراتی تریش ٤٣ ملیۆن کەس. ئەمەش لەهەردوو حاڵەتەکەدا گەورەترین ژمارەی قوربانی برسێتیە لەمێژووی مرۆڤایەتیدا. هەروەها لەم ئاڕاستەیەدا (خەمیرە سورەکان) بەسەرۆکایەتی پۆل پۆت، کوشندەترین قاتوقڕیان لەلاپەڕەکانی مێژودا، رێکخست، شارە کەمبودیەکان لەدانیشتوانی چۆڵکران بۆئەوەی لەرێی کارکردنەوە لەسەر زەوی، سەرلەنوێ بەشێوەیەکی (سوشیالیستی) ئاوادان بکرێنەوە، دەرئەنجامی ئەمەش ئەوەبوو رێژەی مردن لەساڵانی ٧٥ - ١٩٧٩دا لەریزی ژناندا بەرزبۆوە بۆ١٥،٧٪ و لەریزی پیاوانیشدا بۆ ٣٣،٩٪. بەپێی دانپیانانی پۆل پۆت خۆی ١،٥ ملیۆن کەس بەهۆی برسێتی‌و لەسێدارەدان‌و تیرۆرکردنەوە کوژراون‌و بەپێی تەقدیری ڤێتنامیەکانیش ٣ملیۆن کەس. لەکاتێکدا سەرچاوەکانی (CIA) باس لە زیانێکی دیمۆگرافی سەرتاسەری دەکەن کە ٣،٨ ملیۆن کەس کەمترنیە، بەمەرجی تەنها بەرزبونەوەی رێژەی کوژراوەکان لەبەرچاو نەگرین، بەڵکو رێژەی دابەزینی ترسناکی لەدایکبونەکانیش کە لە (٣٪) وە لەساڵی ١٩٧٠دا، دابەزی بۆ رێژەی (١٪) لەساڵی ١٩٧٨دا. بەگشتی لەهەموو حاڵەتەکاندا لەساڵی ١٩٧٩دا ژمارەی گەلی کەمبۆدی دابەزی بۆ ٥،٢ ملیۆن کەس لەکاتێکدا سەرژمێرەکەی بەر لەشەڕی ناوخۆ بەتەقدیر ٨ ملیۆن کەس بوو.

**بۆچی توندوتیژی کۆمنیزم:**

وەك چۆن نازیەکان چەمکی (دوژمنی رەگەز) یان داهێنا، هەرواش کۆمنیزمەکان چەمکی (دوژمنی چینایەتیان) داهێنا. دیارە دیسان بەراوردەکە (ناشرینە) بەڵام لێکچونی ئەو دەرئەنجامانەی پراکتیك کردنی ئەم دوو چەمکە لەواقیعدا خستیانەوە ناچار بەم بەراوردەمان دەکات. نازیەکان بە بەهانەی شوناسی رەگەزیەو چەندان ملیۆنیان لەناوبرد وەك چۆن کومنیزمی دەسەڵاتاویش بەبیانووی شوناسی چینایەتیەوە دەیان ملیۆن کەسیان لەناوبرد. تاکە جیاوازیەك ئەوەیە یەهودی نازیەکان بوو بەبورجوازی کۆمنیزم. ئەوەشی لەقوربانیدا لەهەردوو حاڵەتەکەدا شایەنی سزادانە کرداری مرۆڤێك نیە، بەڵکو (چۆنایەتی {کیفیت}) رەگەزی یان چینایەتیە. بەڵام ئەگەر لە پراکتیکی نازیەکاندا ئەم چۆنایەتیە جێگیرە، ئەوا لەپراکتیکی کۆمنیزمی دەسەڵاتاویدا جێگرنیە. لەئەزموونی نازیزمدا یەهودیەکان دەکوژرێن لەبەرئەوەی یەهودین، بەڵام قوربانی کۆمنیزمی دەسەڵاتاوی دەشێ سەرەتا بکوژرێ پاشان چۆنایەتیەکی چینایەتی وەك (بورژوازی) یان تەنانەت

(بورژوازی بچوك) و لەهەموو حاڵەتەكانیشدا وەك (ئەندامێكی دژی بەشۆڕش)ی بۆ دابهێنرێ. (سیرگی مولغونوف) مێژونوسی سوشیالیستی لەساڵی ١٩٢٤ لەكتێبێكدا لەبەرلین لەژێر ناوی (ئیرهابی سور لەروسیا) یەكێك لەئامۆژگاریەكان دەهێنێتەوە كە لاتزیس سەرۆكی پۆلیسی سیاسی بەلشەفیەكان كە ئەو دەمە بە (تشیكا) دەناسرا، لەتشرینی دووهەمی ١٩١٨دا بۆ دەستەو دایرەكەی ناردووە (ئێمە جەنگ دژی كۆمەڵێ كەسی دیاریكراو ناكەین.. بەڵكو بورژوازی وەك چینێك لەناودەبەین... لەبەرئەوە لەكاتی لێپرسینەوەدا بەدوای ئەو بەڵگەو شتانەدا مەگەڕێن كە تاوانبار بەقسەیان كردار چیكردووە دژی دەسەڵاتی سۆڤێتی. پرسیاری یەكەم كەپێویستە لەسەرتان ئاڕاستەی بكەن ئەوەیە: سەر بە چ چینێكە، ئەسڵی چیەو پەروەردەكردن و خوێندن و پیشەی چیە؟)

ئەوەی لەئەزموونی بەلشەفیدا زۆر تایبەتیەو دواتر ریتمی ئەزموونی كۆمنیزمی دەسەڵاتاوی پاش خۆشی دەست نیشان دەكات، گواستنەوەیە لەتوندوتیژی رەمزیەوە بۆ توندوتیژی كردەگی {عملی} و دامەزراندنی دسەڵاتێكی چەوسێنەرانەوەی رەها كە بە (دیكتاتۆری پرۆلیتاریا) ناونرا.. چەمكێك كە لەدەربڕینێكەوە وەرگیراوە كە بەرێكەوت لەیەكێك لەنامەكانی ماركسدا هاتووە. لەراستیدا لینین بەتایبەتی لە كتێبی (شۆڕشی پرولیتاریاو كاوتسكی هەڵگەڕاوە)دا كە لەساڵی ١٩١٨دا دەرچوو، تیوریزەنی گەورەی چەمكی (دیكتاتۆری پرۆلیتاریا) بوو.

لەو كتێبەدا كەناومان هێنا وتی‌و چەندان جاریش دووپاتی كردەوە كە (دەوڵەت لەدەستی چینی باڵا دەستدا ئامێرێكە بۆ تێكوپێكدانی دوژمنە چینایەتیەكانی، لەم روانگەیەوە دیكتاتۆری پرۆلیتاریا جیاوازی نیە لە دیكتاتۆری چینەكانی‌تر). چونكە دەوڵەتی پرۆلیتاریای ئامێرێكە بۆ تێكشكاندنی بورژوازیەت). ئاشكراشە دیكتاتۆری‌و توندوتیژی كردەگی، هاوڕێی هەمیشەیی یەكن. لینین دەڵێت (دیكتاتۆریەت دەسەڵاتێكە پشت بەتوندوتیژی دەبەستێ‌و هیچ یاسایەكیش كۆنترۆڵی ناكات. دیكتاتۆری شۆڕشگێرشانەی پرۆلیتاریاش دەسەڵاتێكە بەتوندوتیژی دەیگرێ‌و بەتوندوتیژیش پارێزگاری لێدەكرێ. ئەو توندوتیژیەی پرۆلیتاریا لەسەر بورژوازی پراكتیكی دەكات.. بێ‌ئەوەی هیچ یاسایەك كۆنترۆڵی بكات).

ئەم توندوتیژیە كە بەهیچ یاسایەك رێی لێ‌ناگیرێ، جگە لە لەناوبردنی دوژمنی چینایەتی، تیوریزەنی دووهەمی خۆی لەترۆتسكیدا دەدۆزرێتەوە كە سەرۆكی لەشكری سوربوو لەشەڕی ناوخۆدا.. تروتسكی لەكاتی شەڕەكەداو بۆ بەرگریكردن لەئیرهاب نوسی (دەتوانین و لەسەرمانە لەخەڵك بگەیەنین كە ئێمە لەسەردەمی شەڕی ناوخۆدا (حەرەسی سپی) لەناو دەبەین بۆئەوەی كرێكاران لەناونەبەن، یەكەم شت كە پێویستە بیكەین ئەوەیە دوژمن بخەینە حاڵەتێكەوە كە توانای ئازاردانی نەمێنێ، ئەمەش تەرجومە ناكرێت بۆ واقع بەلەناوبردنی دوژمن نەبێ. لەشۆڕشدا وەك جەنگ ئەوەی پێویستە بكرێ تێكشكانی ئیرادەی دوژمن‌و ناچاركردنی بەتەسلیم بوون‌و قبوڵكردنی مەرجەكانی سەركەوتوو. مەسەلەی ئەوەش كە ئایا دەسەڵات لەوڵاتدا بۆ كێ دەبێ.. واتە مەسەلەی زانینی ئەوەی ئایا بورژوازیەت بەزیندوی دەمێنێتەوە یان دەمرێ، شتێك نیە كە بەگەڕانەوە بۆ مادەكانی

دەستور چارەسەر بکرێ، بەڵکو تەنها بەگەڕانەوە بۆ هەموو شێوەکانی توندوتیژی چارەسەر دەکرێ).

ئەم وێنایە بۆ ئەیاری سیاسی وەك ئەوەی دوژمنەوەو دەبێ لەڕێی توندوتیژییەوە لەناوببرێ، دەبێتە هۆی ئەوەی شەڕی ناوخۆ، ببێ بەشێوەی هەمیشەیی خەباتی سیاسی. بەهەرحاڵ هەمیشە شەڕی ناوخۆ پێویستی بەداهێنانی دوژمن هەیە. لێرەوە جەنگی سور دژی سپی لە ١٩١٨ - ١٩٢١دا هەر لەسەرەتاوە لەناو خۆیدا کۆمەڵێ جەنگی تری حەشاردابوو: بەشەڕی بەلشەفیەکان دژی سوشیالیزمە شۆشگێڕەکانو مەنەشفیکە چەپەکان، جەنگی حیزب دژی جوتیارن لەسەردەمی قاتوقڕی گەورە لە ١٩٣٢ - ١٩٣٣داو دواجار جەنگی دەوڵەتی ستالینی دژی سەرجەم کۆمەڵگا.

لەو فەزا هیزائیەشدا کە بیرۆکەی جەنگی چینایەتی هەمیشەی دروستی دەکات، بەوشێوەی لەپراکتیكو تیۆرەی بەلشەفیدا چووە جێی بیرۆکەی مارکسیزم بۆ ململانێی چینایەتی، دەکرێت خودی (هاوڕێکانی) دوێنێش ببن بە(دوژمنەکان)و هەموو رقێکی چینایەتی (پیرۆزیان) بەسەردا دابارێنێو راپێچ کرێن بۆ پاکتاوکردنو لەناوبردن. بەمشێوە ستالین هەزاران لیستەی لەکاتی پاکتاوکردنی گەورە لە (١٩٣٦ - ١٩٣٨)دا بەئیمزای خۆی مۆرکرد کە ناوی ئەو هاوڕێیانەی تیابوو کە دەبوو لەسێدارە بدرێن. دەرئەنجامی ئەمەش لەناوبردنی ٦٩٠،٠٠٠ کەسو گرتنی ١،٨ ملیۆن کەسی‌تر. لەو رۆژگارە رەشەدا وەك (یۆری مارتۆفی) مەنشەفی پێشبینی کرد، ئیدی (جەلاد) بوو بە (سیمای ناوەندی ژیانی روسی). بەمشێوەیە بەپێی دەربڕینی نوسەری مارکسی (فاسیلی غروسمان) کە پۆلیسی نهێنی سۆڤێتی دەستنوسەکانی لەناوبرد، (چەقۆ) بوو بە (تیورزەنی گەورەی) ئەو کوشتارگا گەورەیەی کە (وڵاتی یەکەمی سوشیالیزم) لەسەردەمی ستالیندا بەسەری هات.

خاڵی ترسناك ئەوەیە تەنانەت (پارێزەرانی هوشیاری)ش کە ئەندامی ئەنتلجنسیای روسین، نەیانتوانی خۆیان لە وەبای ئەم جەنگە چینایەتیو ناوخۆییە هەمیشەییە، بپارێزن. بەمشێوەیە نوسەرێکی (هیومانی) گەورەی وەك گۆرکی توانی بنوسێ (سەرجەم ئەو شتانەی کاتیان بەسەرچووە، دژمان رادەوەستن، لەبەرئەوە مافی خۆمانە، خۆمان لە جەنگێکی ناوخۆی بەردەوامدا ببینین. لێرەوە ئەو دەرئەنجامەی بەشێوەیەکی سروشتی خۆیمان بەسەردا دەسەپێنێ ئەوەیە: ئەگەر دوژمن تەسلیم نەبێت، پێویستە لەرەگەوە دەریبهێنین) هەر لەبەر ئەمەش گورگی لەنامەیەکی کراوەدا وڵامی لایەنگرانی مافی مرۆڤی دایەوە کە نارەزاینامەیەکیان بەئیمزای ئەلبێرت ئەنیشتاینو توماس مانو کەسانی دی، لەسەر حوکمی لەسێدارەدانەکانی مۆسکۆ، بڵاوکردبۆوە.. لەو نامەیەدا دەڵێ (من ئەم لەسێدارەدانانە تەواو بەرەوا دەزانم چونکە بۆ دەسەڵاتی کرێکاریو جوتیاری زۆر سروشتیە کە دوژمنەکانی وەك مێرولە ئیبادە بکات). بگرە گورگی خۆی نامەیەکی بۆ (رومان رولانی) هاوڕێی کە یەکێکە لەو کەم نوسەرە گەورە فەرەنسیانەی کە هیومانی و پێشکەوتنخوازن، نوسیبوو کەتیایدا دەڵێ (هەست ئەکەم رولان بەوریاییو ویژدانانەتر بڕیارت لەسەر ئەو روداوە ناوخۆیانە دەدا کەلەیەکێتی سۆڤێت روودەدەن، ئەگەر بڕوا بەم راستیە سادەیە بهێنی:

نیزامی سوفیێتی و پێشەنگی چینی کرێکاران خۆیان لەشەڕێکی ناوخۆ واتە لەشەڕی چینایەتیدا دەبینن. ئەو دوو دوژمنەی کەجەنگی لەگەڵدا دەکەن - و دەشبێ بیکەن - ئەنتلجنسیایەیە کە هەوڵدەدا نیزامی بورژوازی بژێنێتەوە.» و جوتیاری دەوڵەمەندە کە بەبەرگریکردن لەموڵکایەتی بچوکی خۆی دەبێتە بەربەستی رەوتی کۆکردنەوە)[1]

هەر لەو ساڵەشدا ئاراگۆن قەسیدەیەکی نووسی کە لە دیرێکدا دەڵێ (چاوە شینەکانی شۆڕش لەتوندوتیژییەکی پێویستدا، دەدرۆشێتەوە)

کەوابوو توندو تیژی تەنها لەعەقڵ ودڵی ستالیندا نەبوو. بەڵکو هەروەها بەشێوەیەکی سەرەکی لەخودی عەقڵی شۆڕشدا بوو.. واتە لەتیورەکەیدا.

ئەمەش ئەو شتەیە کە لەخوێندنەوەی ئەم کتێبە رەشەی کۆمنیزمدا کە شۆڕشگێڕە کۆنەکان نوسیویان، ئازارت دەداو دەتتۆقێنێ.

لەبەرئەوە ستیفان کۆرتوا لەدەمی هەموویانەوە وانەکە بەم شێوەیە کۆتایی پێدێنێ:

هەرچییەك نامرۆڤانەیە، شێتیە

هەرچییەکیش توندوتیژی بەرهەم دێنێ، نامرۆڤانەیە کەوابوو هەموو توندو تیژیەك، شێتیە.

## لە نامەکەی شۆلۆخۆف نوسەری (دونی ئارام) بۆ ستالین لە ٤ ی نیسانی ١٩٣٣ دا

هاوڕێ ستالین:

پارێزگای فیشنسکی وەك زۆربەی پارێزگاکانی قەفقازی باکور، نەخشەی تەسلیمکردنی گەنمی جێبەجێ نەکرد، نەك لەبەر (تێکدانێکی کولاگیانە) بەڵکو بەهۆی خراپی سەرۆکایەتی ناوچەیی حیزبەوە....

لە کانونی یەکەمی رابردوودا لیژنەی هەرێمی حیزب پەیامێکی بۆ (پەلەکردن) لە هێرشی کۆکردنەوە بەنوێنەرێکدا نارد کە هەموو دەسەڵاتێکی پێ بەخشرابوو کە ئەویش هاوڕێ ئۆفتشنکۆفە، ناوبراو ئەم هەنگاوانەی خوارەوەی نا:

١) دەستبەسەرا گرتنی سەرجەم گەنمەکان تەنانەت بەو (سلفە) یەشەوە کە بەڕێوەبەرایەتی کولخۆزەکان وەك تۆو بۆ بەرهەمی ساڵێکی دی، پێشەکەش بە کۆلخۆزیەکانی کردووە.

٢) دابەشکردنی ئەو بڕە داواکراوەی کە دەبێ کۆلخۆزیەکان بیدەن بە دەوڵەت، بەسەر هەر خێزانێکی جێ مەبەستدا. دەرئەنجامی ئەم کارانە چی بوو؟ جوتیارەکان هەر کە دەسبەسەراگرتن دەستی پێکرد، هەڵسان بە شاردنەوەی گەنم و دفن کردنی. ئەمەش هەندێ ژمارە کە دەرئەنجامی ئەو هەموو دەستبەسەراگرتنەیە:

٥٩٣٠ قنتار گەنم کە (دۆزرایەوە).. ئەمەش هەندێك لەو شێوازانەیە کە بۆ کۆکردنەوەی ئەو ٥٩٣ (تەنە) کە هەندێکی دفنکرابوو، بەکار هێنرا.. لە ١٩١٨ وە!

شێوازی سارد.. کولخۆزی رەت دەکرێتەوە و (لە سەرمادا) دادەنرێ.. بە رووتی لە مەخزەندا. زۆرجاریش کولخۆزیەکان بەکۆمەڵ روت دەکرێنەوەو بە کۆمەڵیش لەسەرمادا دادەنرێن.

شێوازی گەرم... پێکانی کۆلخۆزیەکان و دامێنی تەنورەکانیان بەگاز ئاورشێن دەکرێ و ئاگری تێ بەردەدرێ، پاشان ئاگرەکە دەکوژێنەوەو

جارێکی دی لەسەرەتاوە دەست پێدەکەنەوە. لە کۆڵخۆزی (نابۆلۆفسکی) دا (بلۆتکین) کە نوێنەری لیژنەی پارێزگایە و خاوەنی هەمو دەسەڵاتەکانە کۆڵخۆزیەکان ناچار دەکات لەسەر ڕۆپایەك ڕاکشێن کە تا ئاستی سوربوونەوە گەرمە، پاشان بە زیندانیکردنیان بە رووتی لە مەخزەندا، (سپاردیان دەکەنەوە) لە کۆڵخۆزی لیبیانسکیدا کۆڵخۆزیەکان لەبەردەم دیوارێکدا ریز دەکرێن و حوکمی لەسێدارەدانی درۆزنانەیان بەسەردا جێبەجێ دەکرێ.

دەتوانم ئەم نمونانە تا بێکۆتای درێژ بکەمەوە. ئەمە ناچێتە ناو خانەی خراپ بەکارهێنانی دەسەڵاتەوە، بەڵکو ئەمە شێوازی باوە لە کۆکردنەوەی گەنمدا.

ئەگەر نامەکەمت بە شایەنی بایەخدانی لیژنەی ناوەندی زانی، ئەوا کۆمۆنیستی حەقیقی بنێرە کە ئازایەتی ئەوەی تیابێ دەمامك لەسەر سیمای ئەو کەسانە لابدات کە لەم پارێزگایەدا جەزرەبەی کوشندەیان لە بینای کۆڵخۆزیدا.

تۆ تەنها هیوامانی.

دڵسۆزت: میخائیل شۆلۆخۆف.

**وەڵامەکەی ستالین بۆ شۆلۆخۆف لە (٦ ی ئایاری ١٩٣٣) دا:**

**هاوڕێی ئازیز شۆلۆخۆف**

نامەکتم بەدەست گەیشت. رازیبووین بەو یارمەتیەی داوات کردبوو. هاوڕێ (شکر یاتۆف) م ناردووە بۆئەوەی چارەسەرێك بۆ ئەوکێشانە بدۆزێتەوە کە بۆت باس کردوم. داوات لێدەکەم یارمەتی بدەی. بەڵام هاوڕێ شۆلۆخۆف: ئەمە هەموو ئەو شتانە نیە کە دەمەوێ پێتی بڵێم. چونکە نامەکەت وێنەیەك دروست دەکات کە ناتوانم بە بابەتی (موضوعی) وەسفی بکەم. بەم بۆنەیەوە دەمەوێ چەند رستەیەکت بۆ بنووسم.

سوپاسم کردی بۆ نامەکەت کە ئاشکرای نەخۆشیەکی بچوك لە دەزگاکەماندا دەکات و دەریدەخات کە هەندێ فەرمانبەری حیزب بەهۆی ئارەزووی پێشکەشکردنی کاری باشەوە، واتە بۆ چەك کردنی دوژمنەکانمان، دەستدرێژی دەکەنە سەر هاورێکانمانو رەنگە تا ئاستی سادیەت زیادەرەوی بکەن. بەڵام ئەم سەرنجانە مانای ئەوە نیە بۆ هەموو شتەکان لەگەڵتام. تۆ تەنها لایەکی شتەکان دەبینیو بەو شێوەیە نایبینی کە پێویستە. بەڵام ئەوە تەنها لایەنێکە. بۆنەوەی هەڵەش لە سیاسەتدا نەکەیت نامەکانیشت بابەتی ئەدەبی نین، سیاسی رووتن — دەبێ روەکەی تریواقع ببینی. روەکەی تریشی ئەوەیە جوتیارە بەڕێزەکانی پارێزگاکەت — بەتەنها هەر پارێزگاکەی ئێوە نا — دەستیان بە مانگرتن و تێکدان کردو بەمەبەست سوپای سوریان بەبێ نان هێشتەوە! ئەگەر ئەم تێکدانەش لە روکەشدا بەبێدەنگی (و بێ ڕژانی خوێن) بەڕێوە چوو، ئەوا ئەمە هیچ لەجەوهەری مەسەلەکە ناگۆرێت کە ئەویش ئەوەیە جوتیارە بەڕێزەکان جەنگێکی تێکدەرانەیان دژی دەسەڵاتی سۆڤێتی بەرپاکردووە.

جەنگ تا مردن، ئەی هاورێ شۆلۆخۆفی ئازیز!

بێگومان ئەم دیاریکردنانە رەوایەتی بەو شێوازە توندوتیژانە نادات کە بەپێی تەقدیری تۆ، فەرمانبەرەکانمان ئەنجامیان داوە. لەبەرئەوە لەسەر ئەو رەفتارانە لە تاوانباران دەپێچێنەوە. بەڵام ئەوەی وەك رۆژی روون دیارە ئەوەیە کە جوتیارە بەڕێزەکانمان مەڕی مردوو نین وەك ئەوەی یەکێ نامەکەی تۆ بخوێنێتەوە، واتێ دەگات.

داوای باشترین تەندروستیت بۆدەکەم. تەوقەت لەگەڵ دەکەم.

دڵسۆزت: ج. ستالین.

گەورە دەبێ بۆ رمانی بورژوازیو نوێنەرانی: ئەو رۆشنبیرە زەرپیانەی، خزمەکاری سەرمایەدارنو بەخەیاڵی خۆیان دەماغی گەلن.. بەلام لەراستیدا ئەوانە دەماغی نین، بەلکو گووەکانین).

پەراوێز:

١) بۆنەوەی ستەم لەگورکی نەکەین دەبێ ئەوەش بڵێین کە پێش ١١ ساڵ و بەدیاریکراوی لە ٦ ی ئەیلولی ١٩١٩ دا و لەسەر گرتنی دەیان زانا لەوکاتەدا، نامەیەکی ناڕەزایی بۆ لینین نارد کە تیایدا هاتووە (بە بڕوای من سامان و هێزی هەر گەلێك بە چەندایەتیو چۆنایەتی وزەی فکری، دەپێورێ.

شۆڕشیش هیچ مانایەکی نیە ئەگەر هانی پێشکەوتن و پەرەسەندنی ئەم وزەیە نەدات. دەبێ پیاوانی زانست بە حورمەتو ڕێزێکی زۆرەوە مامەڵەیان لەگەڵ بکرێ. ئێمە لەکاتێکدا وا دەزانین خۆمان رزگاردەکەین ئەوا سەری گەل دەبڕینو دەماغی لەناو دەبەین).

لینینیش بەهەمان توندڕەوی ناسراوی خۆیەوە لەسەر رۆشنبیران، وەلامی دایەوە (هەڵەیە گەر هێزە فکریەکانی گەلو هێزە ئەنتلجنسیای بورژوازی، تێکەڵ بکەین. هێزی فکری کرێکاران و جوتیاران لە تێکۆشاندا لەدایك و

تێبینی: ئەم وتارە لە گۆڤاری (ابواب — عدد ١٨ — سالی ١٩٩٨) ەوە وەرگیراوە کە (دار الساقی) دەریدەکات.

*Stephan courtois et Autres Lelivere Noir du commnisme ,Edition Laffont, Paris – 1997, 84, Pages

# دڵی تاریکی Heart of Darkness

و: ئەنوەر حەمە صالح

(ستیپان. گ. میستروٚڤیچ، مەزاجی بەربەریانە: بەرەو تیۆرێکی رەخنەیی پۆست مۆدێرن)

لەوەدەچێت باشترین رێگە بۆ تێڕوانین لە کتێبە تازەکەی ستیپان میستروٚڤیچ کتێبی _هاتس (The Coming 1991) بێت وەکو ماوەڵێکی لە تازەیی‌دا. چونکە (مەزاجی بەربەریانە The Barbarian Temperament) وەکو ئەو بەرهەمە گرنگی دەدات بە گواستنەوە لە شارستانیەتی مۆدێرنەوە بۆ شارستانیەتی پۆست مۆدێرن. لەڕاستی‌دا، ئەو پرسیارە سەرەکیەی ئاراستەی دەکات ئەوەیە کە ئەگەر شارستانیەتی مۆدێرن نوێنەری ترۆپکی دەستەکەوتەکانی مرۆڤ بێت، یاخود بەتەنها روخسارێکی نوێی بەربەریزم بێت. بەتایبەتی کە میستروٚڤیچ دەیەوێت ئەوە بسەلمێنێت، کە لەکاتێك دا کۆمەڵگا پێشکەوتووەکان حەز دەکەن بانگەشەی پرۆسەی شارستانی خۆیان بکەن، لەسەدەی گولاگ (Gulag)(*) و هۆلۆکۆست و شەڕی کەنداودا، زۆر زەحمەتە نەگەیتە ئەو سەرەنجامەی کە بەربەریزم) لەدڵی مۆدێرنیتی‌دا ماوەتەوە).

هەرچۆنێك بێت، بەگوێرەی بۆچونی میستروٚڤیچ لەکاتی ئێستادا بەربەریزم چەند فۆرمێکی نوێی وەرگرتووە، سەرەڕای ئەوەی دەتوانرێت لە چەند بەرگێکی جۆراوجۆردا ببینرێت، جێگەی خۆی هەبێت لە روخساری ئایدزدا (AIDS) داو دەرکەوتنی بەکارهێنانە خراپەکانی دەرمانە سڕکەرەکان و، تا دەگاتە بەهەدەرچونی وزەو تێکدانی ژینگە لەسەر ئاستی هەسارەیی‌دا. بە پشت بەستن بە ژمارەیەك بیرمەندی سەدەی نۆزدەهەمینی وەکو شوپنهاوەر، نیتچە، دۆرکهایم و فرۆیدو ڤێبلین، هەروەك لە تیۆردارێژەرە تازەکانیش هۆرکهایمەر و بۆدریلارد، مەبەستی سەرەکی میستروٚڤیچ دارشتنی بناغەکانی تیۆرێکی رەخنەیی پۆست مۆدێرنە کە خۆی بەدوور دەگرێت لە ماناکانی رۆشنگەری بەهۆی ئەو جۆرە هاوڕێیەتیە رۆشنبیریەی کە هەیەتی ئەوە زۆر کەم جێگە سەرسوڕمانە درك بکرێت میستروٚڤیچ فەیلەسووفەکانی وەکو کانت و هیگڵ و مارکس و هابرماس لەگەڵ هەوڵەکانیان بۆ بنیاتنانی روانینێك بۆ رێکخستنی کۆمەڵایەتی لەسەر بناغەی عەقڵانیەت رەتدەکاتەوە.

کەواتە گرنگترین بۆچوونی میستروٚڤیچ ئەوەیە کە تاکەکان بەشێوەیەکی بنەڕەتی بونەوەری ناعەقلانین.

بەشێوەیەکی یەکلاییکەرەوە هەوڵدەدات بۆ پەرەپێدانی روانینێکی تیۆریانە کە بتوانێت راڤەی حاڵەت و رەفتاری ناعەقلانی irrational هەریەك لە تاکەکان و کۆمەڵگە بکات.

بەم جۆرە میسترۆڤیچ چەمکەکانی بەزەیی Compassion و هاوسۆزی Empathy بەکاردەبات کە لە وتارێکی شۆپنهاوەر (لەسەر بنەماکانی ئاکاری – 1844 On The Basis Of Morality و بەرێژەیەکی کەمتر لە (تێرامانەوە ناوەختەکان 1874 Untimely Meditations) ی نیتچەوە وەریگرتوون هەروەها هەوڵدەدات ئەم نوسینانە لەسەر تەڵزگەی بونگەرای ئازارەکانی ئاك لەگەڵ کارەکانی هۆرکهایمەر و بۆدریلارد لەسەر کۆمەڵگەی ژمارە زۆرو رۆحی مۆدێرنی ئەمریکا بەیەکەوە گرێبدات. لەڕاستی ئەوە لەلای کۆمەڵناسە پۆستمۆدێرنەکانی وەك زیگمونت بومان، بنەمایەکی رێگە پێشاندەرەوە بۆ پرسیارکردن.

مەبەستی میسترۆڤیچ دەستنیشانکردنی بەردەوامی هەرێنەك لە خودپەرستی تاکگەرایی egoistic و Individualism و هەماهەنگی کۆمەڵایەتی Social Confrmity ، لەسەرمایەداری پێشکەوتوودا

هەرچۆنێك بێت میسترۆڤیچ کاتێکی کەمی هەیە بۆ تاکگەرایی لیبرالی فۆکۆیاماو نوسینە تازەکانی کریستۆفەر لاش لەسەر کلتوری نارسیزم The Culture of Narcissism لەجیاتی ئەوە میسترۆڤیچ تەرکیز دەکاتە سەر سروشتی تاکگەرایی لەلێکدانەوەیەکی وردی نوسینە پشت گوێ خراوەکانی دۆرکهایمو فرۆید و ڤێبلین دا.

بێگومان ئەم نوسەرانە ناوبانگیان دەرکرد بە رووبەڕووبونەوەی ئارەزوومەندانەیان بۆ رووە تاریکەکەی مۆدێرنیتیو دەرکەوتنەکانی لە ژیانی کۆمەڵایەتی‌دا لەشێوەی خۆکوشتن دا.

زۆر شت هەیە لە سوودی مەزاجی بەربەریانە بوترێت، بەرهەمێکی نیگەرانکەرو بەشداریکردنێکی گونجاوە بۆ رەخنەیەکی تیۆری پۆست مۆدێرن و هەندێك پرسیار بەرزدەکاتەوە کە هەندێك بە باشی دەزانن هەرنەکرێن. بەڵام هێشتا هەندێك گومان دەمێننەوە. بۆ نمونە، چەند سەرەتاییە یان مشتو مڕ ورووژێنەرە ئەو گریمانەیە کە مۆدێرنیتی هێشتا بەتەواوەتی بەربەریزمی بەجێنەهێشتووە؟

پاشان، بنیامین و ژمارەیەکی بێ شوماری بیرمەندان بەدرێژی باسی مەسەلەکەیان کردووە. بۆ دواجار، سەرەڕای بانگەشەی میسترۆڤیچ کە شوێنگەی ئەو جێگەی مشتو مڕە، لەڕاستی‌دا لەناو سنورەکانی پۆست مۆدێرنیزم دا ئەوە بەکەمی جێگەی مشتو مڕە.

دوا رەخنە پەیوەندی هەیە بە پێوانەی رەهای ئاواتەکانی میسترۆڤیچەوە، بەم جۆرە



فرۆید

بانگەشەی ئەوە دەکات کە هەر بەتەنها نایەوێت پەیوەندی نێوان هۆرکایمەرو شوپنهاوەر تەواو بکات، بەڵکو دەیەوێت پشتگریەتی سۆسیۆلۆجی‌و سایکۆلۆجی قوڵی کارەکانی بۆدریلارد بکات وەکو خۆی دەڵێت، هەروەك دەیەوێت ئەو روانینە تەقلیدیە (باوە) نەهێڵێت کە بۆ هەریەك لە فرۆید و دۆرکهایم هەیە.

بەلایەنی کەمەوە، ئەمەش کارێکی ماقوڵ نیە. هێشتا گەر تیۆری رەخنەیی لەمەبەستەکانی خۆی تێنەپەڕێنێت فەلسەفەی پۆست مۆدێرن بۆچی؟

(*) گولاگ (Gulag): بەو کامپانە دەوترێت کە لە سەردەمی یەکێتی سۆڤیەتی پێشوودا وەکو زیندان دژی نەیارە سیاسییەکانی دەوڵەتو کرێکاران بەکاردەهات، کە تیایدا کاری سوغرەیان پێدەکردن.

سەرچاوە: گۆڤاری
Radical Pnilosophy
(a journal of socialist and feminist philosophy)
March\ April \ 1995. No. 70.

# ئاینەکان لە مێژووی میللەتانی جیهان دا

## سیرگی - أ - توکاریف / ١٩٩٨

**ئا: ئاسۆ جبار**




ئاین لەکوێوە سەرچاوە دەگرێ؟

هەر لەمێژەوە مرۆڤ بە دوایی شتە نادیارەکاندا دەگەڕێ و بۆچوون و تێڕاماناکانی ئاراستەی دیوە تاریکەکانی ئاسمان دەکات، زۆربەی زانا ئەنثرۆپۆلۆژیەکان سەرچاوەی ئاین دەبەنەوە بۆ ترسێکی گەورەی سەرەتایی و غەریزی مرۆڤی کۆن... ترس لەدیاردەکانی سروشت، وەک هەورە تریشقە و لافاو تۆفان و بومەلەرزە، بورکان، سوتان، مالوێرانی ... هتد. بونەتە هۆی دروستکردنی وێنەی یەزدان. وێنەو وێناندنەکانی یەزدان زانینێکی هەرە سەرەتایی جەوهەری پەیوەستبوونە بە ئەو هێزە گەورەیەی لەدیووە شاراوەکانی سروشتەوە بۆتە هۆی کارەسات و موسیبەت و نەگبەتی - هەروەک (ئێدوارد تایلۆر) ئەڵێ:

(بەبڕوای مرۆڤی کۆمەڵگە سەرەتاییەکان، هۆی سەرجەم تۆفان و کارەساتە سروشتییەکانەو - ئەفسانەکانی داگیر کردووە).

گەر لە ئەفسانەکانی کۆمەڵگە سەرەتاییەکانەوە بڕوانینە وێنەی یەزدان - ئەوا یەزدان پێکهاتەی ئەو هێزە پیرۆزەیەو هەڵگری کارەسات و دۆزەخ و بەهەشت و ژیانێکی بڕۆنزیە - دین کۆکەرەوەی شتە پیرۆزەکان و ئەفسانەی دۆزەخ و بەهەشتی ونبووە لەتەك یادەوەری و سزاکاندا - هەروەك (ماکس فیبەر) لەکتێبی (جامی ئالتون و بەهەشتی ون بوودا) دەڵێت: (بەهەشتی ونبوو شوێنگەی ئەو بەهەشتە بڕۆنزییە، لەمێژەوە مرۆڤایەتی بەدوایدا وێڵە...).

لە دووتوێی (٥٥٠) لاپەڕەدا (سیرغی -أ- توکاریف) باس لە هەموو ئاینەکان دەکات، وە بەتەنها باس لە ئاینە جیهانییەکان ناکات (International Relgion) وەک ئاینی مەسیحیەت و ئیسلام و یەهودی بوذی) بەلکە ئەم لێکۆڵینەوەیە لێکۆڵینەوەیەکی ئەنثرۆپۆلۆژی زانستی و فەرهەنگییە،

سەبارەت بە ئاینەکانی جیهان‌و کۆمەڵگە سەرەتاییەکان (وەك کۆمەڵگەی سەرەتایی ئوسترالیای غینیای تازە – ئاینی ناوچەکانی زەریای ئەتڵەسی – ئاینی هیندۆسەکانی ئەمریکاو کەنەداو بەرازیل، ئاین و ئاینزاکانی ناوچەی چین و هندستان‌و ئەفغانستان و یابان و ... هتد) لەگەڵ ئەوەش دا ئەم کتێبە هەڵگری توێژینەوەیەکی ئەنثرۆپۆلۆژی یە سەبارەت بە (ئاینی ئیسلام و مەسیحیەت و بوذی)

ئەفسانەکانی یەزدان لەنێو هەندێ مرۆڤی سەرەتاییدا جێی مشتومڕێکی گەورەیەو سەرجەم بیروڕاکان لەوێوە سەرچاوە دەگرن.

نوسەر لەم لێکۆڵینەوەیەدا هەوڵێکی زانستی مێژوویی داوە لەپێناو دۆزینەوەی ئەو پەیوەندییە رۆحیانەی کە لەنێوان وێنەی یەزدان و بۆچوونی کۆمەڵایەتی و غەریزەی ترس‌و ئەفسانەکانی یەزدان‌و بیروباوەڕە دینییەکان دا هەیە، کەواتە بیروباوەڕە ئاینییەکان تەنها وەهمێکی کۆمەڵایەتی نین، بەڵکە پەیوەستن بەسەرجەم ئەو بیروبۆچونانەی لەنەستی کۆمەڵایەتییەوە سەرچاوە دەگرن.

هەروەك نوسەری ئەم کتێبە لەپێشەکی کتێبەکەدا دەڵێت: (ئاین هێزێکی لەڕادەبەدەرە، دەچێتە نێو پێکهاتەی ژیانمانەوەو کار ئەکاتە سەر جەوهەری بونیادی هزری کۆمەڵایەتی و دەرونی، هەروەها ئاین نمونەی دیاریکردنی رێگەکانی بیرکردنەوەو بەرپەرچدانەوەیە بەرامبەر جیهان، هەروەها پێکهێنەری ئەو بەشەیە کە ناکرێت جیابکرێتەوە لە رەفتاری کۆمەڵایەتی تاك و کۆمەڵ).

کەواتە ئاین پێش هەموو شتێ کۆمەڵایەتییەو دواجاریش دەرونی و فیکرییە.

نوسەر لە دووتوێی (٢٤) بەشدا باس لە زۆربەی ئاینەکانی جیهان دەکات و باسیش لە ئاینی کۆن‌و تازە دەکات.. هەروەها باسیش لە بیروباوەڕە سەرەتاییەکانی کۆمەڵگە بەربەرییەکان دەکات.

– ئاین بەدرێژایی مێژوو کاریگەرییەکی ئەوتۆی هەبووە لەسەر هزری مرۆڤایەتی – لە بەشی یەکەمی ئەم کتێبەدا (توکاریف) بە پشتبەستن بە چەند سەرچاوەیەکی مێژووی زانستی هەوڵی داوە باس لە ئاسەوارە دینییەکانی چەرخی (بالیولیتی) بکات و بەهۆی چەند بەڵگەیەکی مێژووییەوە ئەوەمان بۆ ئاشکرا دەکات کە هەتاکو ئێستاکە گومانێکی سەرتاپاگیر هەیە سەبارەت بەوەی کە ئایا لەو زەمەنەدا بیروباوەڕە ئاینییەکان بوونی هەبووە یان بوونی نەبووە، دوابەدوای ئەم باسە نوسەر باس لە ئاسەوارە ئاینییەکانی چەرخی (نیولیتی) و چاخی بەردینی نوێ‌و چاخی زێڕین دەکات.

لە بەشی دووەمی ئەم لێکۆڵینەوەیەدا نوسەر باس لە ئاینی کۆمەڵگە سەرەتایی‌و بەربەرییەکان دەکات – بەتایبەتی باس لەئاینی (کۆمەڵگە سەرەتاییەکانی ئوسترالیاو ئاسمانییەکان دەکات، وەك: ئاینی بابواو مالیزیەکان – ئاینی دانیشتوانی بۆلۆنیز – هەروەها ئاینی میکرۆنیزمەکان.

لە بەشی چوارەمیش دا زۆر بە وردی باس لە ئاینی میللەتە دواکەوتوەکانی رۆژهەلات و باشووری ئاسیا دەکات، دوابەدوای ئەمەش لە بەشی پێنجەم دا باس لە زۆربەی ئاین‌و ئاینزاکانی میللەتانی ئەمریکا دەکات.. هتد.

بیرمەندی روسی (توکاریف)، سەرەڕای ئەوەی وەك ئەنثرۆپۆلۆژیستێك زۆربەی ناوچەکانی جیهان گەڕاوە لەپێناو دۆزینەوەی سەرەتایی بیروباوەڕە دینییەکان لەگەڵ ئەوەش دا بەتەواوەتی سودی لە هەموو سەرچاوە مێژوویی‌و کۆمەڵایەتی‌و ئەنثرۆپۆلۆژییەکان وەرگرتووە. هەورەها سودیشی لە تێبینییەکانی گەشتیارە روسی‌و خۆرئاواییەکان وەرگرتووە.

ئەم لێکۆڵینەوەی (توکاریف) پێکهاتێکە لە

توێژینەوەیەکی مێژوویی و کۆمەڵایەتی و مسیۆلۆژی و ئەنترۆپۆلۆژی.

نوسەر لە شەرحی ئاینەکاندا جگە لە بەڵگە مێژوویی و زانستییەکان هەوڵی داوە زیاتر بایەخ بدات بە بیروباوەڕە سەرەتاییەکانی ئاین و هێزی کۆمەڵایەتی و چینایەتی و چەوسانەوەو هێزی لەڕادەبەدەری کارەساتە سروشتییەکان — هەروەها شەرحی ئەفسانەسازی کۆمەڵگەکان دەکات و جارێکی تر پەیوەستی دەکاتەوە بە ئارەزووە ئینسانییەکانەوە، هەر لێرەوە ئەکرێ بوترێت ئەم لێکۆڵینەوەیە زۆر ئەکادیمییەو بەپێی میتۆدێکی زانستی باس لە سەرچاوەو گەشەسەندنی هەموو ئاینەکان دەکات، لەپۆلێنکردن و فاخ بەندکردنی ئاینەکان ریتمێکی کۆمەڵایەتی و دەروونی هاوبەش بەدی دەکەیت.

نوسەر لە دیدگایەکی ئەنترۆپۆلۆژی یەوە باس لە چەمکی (تەوتەم) دەکات. بەڕای (توکاریف)، تەوتەم بریتییەلە باوەڕپێبوون بەو پەیوەندییە بەهێزەی کە بۆ خۆی پەیوەندییەکی بەرجەستەبووە لەنێو کۆمەڵێك خەڵك و کۆمەڵێ کەرەستەی مادیدا، زۆرجار.. (تەوتەم) لەشێوەی چەند ئاژەڵێکی دیاریکراودایە، وەك بۆچوونی زۆربەی لێکۆڵەرەوەکان).

نوسەر لەم لێکۆڵینەوەیەدا هەوڵی داوە ئەو پەیوەندییە مایکرۆبییەی نێوان ئەفسانەو (تەوتەم) بدۆزێتەوە، هەروەها ئاماژەش بۆ ئەفسانە تەوتەمیە پیرۆزەکان دەکات. چونکە پەیوەندییەکی گشتگیر هەیە لەنێوان ئاین و ئەفسانەسازیدا — ناشکرێت ئەفسانەو بیروباوەڕە ئاینییەکان لە یەکتری جیابکەینەوە، هەروەها نوسەر هەوڵی داوەو لەنێو زۆربەی ئاینەکان دا شەرحی جادوو جادووگەری بکات و ئەو پەیوەندییە نادیارانەش بدۆزێتەوە کە لەنێوان (جادوو — دین) دا بوونی هەیە. چونکە بە شێکی هەرە سەرەکی ژیانی ئاینی و کۆمەڵایەتی کۆمەڵگە سەرەتاییەکان پێکهاتووە لە جادوو جادووگەری. هەربۆیە نوسەر سەبارەت بە سرووتە جادووەکانی خێڵە سەرەتاییەکانی ئوستورالیا ئەڵێت:

(... لەلایەکی دیکەوە وێناندنی جادووگەرانەی مرۆڤ و بالا دەستی بەسەر تەوتەمەکەیدا، بۆخۆی شێوە وێناندنێکە کە زیاتر پەیوەستە بەخێڵەکانی نێوەندی ئوستورالیاوە، زیاتر لە ئاهەنگەکانی زۆربوندا — Rites increase ئاشکرادەبێت، چەندین جار ئەم سروتانە تۆمارکراون، ئەم سروتانە سروتە سحریەکانن، ئەندامانی سروتەکە لەوباوەڕەدان کە ئەمە دەبێتە هۆی زۆربونی (تەوتەم).

هەر لە دوایی سالانی (١٨٥٠) وە زانایانی مرۆڤناس هەوڵیان داوە زۆرترین زانیاری کۆبکەنەوە سەبارەت بە کۆمەڵگە سەرەتاییەکان بەتایبەتی لێکۆڵینەوەو توێژینەوە لەسەر بیروبۆچوونە ئاینییەکان و سروتە ئاینییەکان و کۆمەڵایەتییەکان، جادوو، مۆراڵ، خوو نەریتە سەرەتاییەکان. وە ئەو زانایانەی کە کاریگەرییەکی ئەوتۆیان هەبووە لەم بوارەدا زیاتر (لودفیغ فیورباخ، دورکهایم، رادکالف براون، جیمس فریزەر، ئیدوارد تایلۆر، لوسی میر، غوفمان، ماکس فیبەر، ك. لیڤی شتراوس، تید. س. لیولن، کوریس غودولیە ..هتد).

هەر لەسەرەتاوە (فیورباخ) سەبارەت بە چەمکی (یەزدان) دەڵێت:

یەزدان — بریتییە لە بەرجەستەکردنی ویست و ئارەزووەکانی مرۆڤ لە جێبەجێکردن دا.. (واتە لە واقعدا) — هەر لە سەدەی نۆزدەیەمەوە مرۆڤناسەکان سەرقاڵی دۆزینەوەی روحانیەت بوون (Animizm) لەنێو بیروباوەڕە دینییەکانی کۆمەڵگە سەرەتاییەکاندا بەبۆچونی (تۆکاریف) پەیوەندییەکی بەهێز هەیە لەنێوان (رۆح) و (ئاین) و (یەزدان) دا، هەروەك چۆن رۆحە شەڕانگێز و شەڕخوازەکان لە تاریکی و شەو و تۆفان و ترس و جەنگەڵەوە سەرچاوە دەگرن، هەروەها وێنەی یەزدانیش هاوشێوە لەترس و دیوە شاراوەکانی سروشتەوە سەرچاوە دەگرێ.

# دەیویست لەگەڵ دەریادا دلۆڤان بێت.

## بەبۆنەی کۆچی دوایی (تیدهیوز)

## شاعیری بەناوبانگی ئەنگلتەرییەوە

و: مەسعود رەحیمی

(شیموس هیەنی) شاعیری بەناوبانگی ئیرلەندی، لەکاتی بەخاك سپاردنی تەرمی (تیدهیوز) دا، وتارێکی بۆ مالاوایی کردن لەکار و ژیانی سەرسوورهێنەری ئەو بلیمەتە پێشکەش کرد.

دوکتور هیەنی ئەمەی بە تازیەباران وت: (ئەو زۆر زوو جێی هێشتین. بۆ دۆزینەوەی ئەوکاتەی کە مردنی شاعیرێ وەکو رەهۆڵێ لە سروشتدا دێتە پێش چاو، ئەبێ بگەڕێینەوە بۆ دواوە. بۆ مەرگی دایلان تۆماس - یا گارسیا لۆرکا.

فریداو نیکۆلاس، منالەکانی هیوز، لە تەنیشت خەلکەوە دارەتەرمی بابیان هەڵ ئەگرت. هیوز کابرایەکی گۆشەگیر بوو. ئەو هەژدە مانگ ململانێی خۆی لەگەڵ شێرپەنجەی جەرگدا ئەشاردەوەو، لە ئاکامدا لە تەمەنی ٦٨ ساڵیدا مالاوایی لێکردین.

شیموس هیەنی، لەسەر داخوازی هاوسەری هیوز لە کاتی بە خاك سپاردنەکەدا شیعرێکی لەدایلان توماس بەناوی (ئاوهـا بـێ دەنـگ بەوشەوە خۆشەدا رۆمەچۆ) و دوو چەپکە لە باشترین شیعرەکانی هیوزی بەناوی (برۆ بۆ ماسی گرتن) و (ئەو رۆژەی کە ئەو مرد) ی خوێندەوە.

پاشان (رەد ترەنس مەك کۆفی) یەکێك لە دۆستانی کاتی خوێندنی هیوز لەزانکۆی کەمبریج سەبارەت بە هیوز وتی: وەختیخۆی ئوسلووبی ئەم شاعیرە پایە بەرزە کاری کردووەتە سەر دۆستان، هاوڕێکان، هونەرمەندان و تەنانەت هاوسێکانی خۆی. ئەو قسەی زۆری بۆ وتن هەبوو، دنیاش بە نووسینەکانی ئەو دەوڵەمەند ئەبێ ئێمە کۆبووینەتەوە تا بۆ دواجار سوپاسی ئەو بکەین.

قەشەیش وتی: ئەم خەلکە کۆبوونەتەوە کە بۆنەو هەموو گەوهەرەی کە لە شیعرەکانیدا بەجیهانی بەخشیوە رێزی لێ بگرن و لەکۆتاییدا تەرمی سووتێندرا.

ماوەیەك پێش لە مردنی هیوز، شاژن ئیلیزابێتی دووەم، بەهۆی سەرکەوتنەکانی، مەدالیای شایستەی پێدابوو، ئەو کە لەکاتی ژیانیدا بە شای شاعیرەکان ناسرابوو، لە چەند ساڵ پێشترەوە بەبۆنەی رووداوەکانی ژیانی یەوە، کە بوویە هۆی مردنی یەکەم هاوسەرەکەی بەناوی - سیلڤیا پلات شاعیری بەناوبانگی ئەمریکایی - و ئەوی خستە بەر

تیلو تانەی خەڵکێکی زۆرەوە. (بەتایبەت لەلایەن فێمێنیستەکانەوە) کەم تا کورتێ لە ژیانی نێو کۆمەڵ خۆی دەپاراست.

بەلام ڕێزو ناوبانگی ئەو کاتێ زیاتر بوو کە کۆمەڵە شیعری (نامەکانی رۆژی لەدایك بوون) ی بڵاو کرایەوەو لەم شیعرانەدا رەنگدانەوەی خەمو پەژارەی بێ برانەوەی ئەو لەمەڕ ڕووداوەی تیاچوونی هاوسەرەکەی بەرچاو ئەکەوت.

هێندێ لە رەخنەگران ئەم شاعیرە گۆشەگیرە لە ریزی شاعیرانی گەورەی سەدەی بیستەمدا وەکوو، تی. أ س. ئەلیوت و دەبلیو. أ چ. ئۆدەن دائەنێن. ناشری بەرهەمی هیوز لە (Faber & Faber) دا ئەڵێ: (لە پاش ١٨ مانگ ململانێی نەترسانەی هیوز لەگەڵ شێرپەنجەدا. دوێنێ بەجێمانی هێشت). هیوز لە دۆست و برادەری خۆی داواکردبوو کە نەخۆشی شێر پەنجەی بشارنەوە. هیوز لە ئینگلتەرە دا نووسەرێکی سەرکەوتوو و لەلای هەموان ڕێزی تایبەتی بوو هەر ئێستایش شانۆیەکی (راسین) کە ئەو تەرجومەی کردووە لە لەندەن پێشکەش ئەکرێت.

(چیرۆکەکانی ئوڤید) کە هیوز لە (میتامۆرفۆسیەکانی) (ئوڤید) ەوە وەریگێڕاوەتەوە خەڵاتی ئەو ساڵەی (ڤیت بردبوک) ی پێدرا، بەمەرجێ کە لەلایەن لێژنەی باڵاوە بە بەرهەمێکی (مەزن و بەرز) ناسرا. (نامەکانی رۆژی لەدایك بوون) کۆمەڵە شیعرێکی عاتیفی سەبارەت بە ئەوینو پێك گەیشتنی پڕ لە جەنجاڵی ئەو لەگەڵ سیلڤیا پلاتەو رەخنە و ئاژاوەی زۆری لێ هەڵگیرساو لەلایەکیشەوە بوو بە پرفرۆشترین کتێبی ساڵ.



بەلام دەنگدانەوەی پێك گەیشتنی هیوز و پلات رەنگە لە هەموو شیعرە سەرسوورهێنەرەکانی زیاتر بێت. سیلڤیا پلات کە هیوز بەجێی هێشتبوو بە غاز خۆی کوشت. ئەگەرچی پلات سێ ساڵ پێش لە ناسینی هیوزیش جارێکی دیکە ویستبووی خۆی بکوژێت بەلام سەرەرای ئەوەیش (لایەنگرەکانی رەخنەیان لێ گرت. هیوز لەماوەی ٣٥ ساڵدا بەبێ دەنگی وەلامی ئەم رەخنانەی نەدایەوە. پاشان کتوپڕ (نامەکانی رۆژی لەدایك بوون) هەروەکوو بروسکەیەك پەردەی بێدەنگی دڕی. ئاندرە و مۆشن رەخنەگری شیعر لە گۆڤاری (تایمز) ی لەندەندا نووسی ئەوانەی کەم دویی هیوزیان بەوە دائەنا کە بەزەیی کەمە، لەناکاودا هەست بەوە ئەکەن کە بەپێچەوانە، خۆیان چەندە دڵڕەق بوون. ئەم کتێبە لە رەهۆڵی رەشی پەژارەو پەژیوانی ئەچێ کە ئێمە بە هەستێکی بەهرەمەندو لەهەمانکاتدا پێچەوانەوە چاومان تێبڕیوە.

ئێستایش دەنگدانەوەی ئەم کۆمەڵە شیعرە بەردەوامە بۆیە شاعیری بەناوبانگی ئیرلەندی شیمۆس هیەنی لەم مانگەدا لەژێر تەئسیری ئەم کتێبەدا

شیعرێکی بەناوی (لەیەکەم نیگادا) لە شاری نیویۆرك لە چاپ داوە. تدهیوز لە یادداشتێکیدا، هاوکات لەگەڵ بڵاوبوونەوەی (نامەکانی ڕۆژی لەدایك بوون) ئەڵێ: نیازم نەبوو ئەم شیعرانە کە پتر لە چارەکی سەدەیەك لەمەوپێش دامنابوو بڵاوی بکەمەوە. بەڵام چارەم نەبوو و خۆم پێ نەگیراو، ئێستایش مەرگی هیوز هۆکاری ئەم ناچارییە ئاشکرانەکات.

ئەو کە پیاوێکی قۆزو جووتێ چاوی شینی درەوشاوەی پێوەبوو، لە حەڤەی ئەگۆستی (١٩٣٠) دا لە شارۆچکەی دووکەڵاوی (ماثیۆلم رۆید) لە (یورك شایر) دا لەدایك بوو. باوکی دارتاش بوو. تد، هەر لە قوتابخانەوە دەستی بە شیعر وتن کردو لە پاش دەرچوونی لە زانکۆی کەمبریج لەبەرئەوەی کە فریای نووسین بکەوێت ئیشی نیوەڕۆژی ئەکرد، یەکەم کۆمەڵە شیعری بەناوی (واشە لە باراندا) لە ١٩٥٧ دا بڵاوکرایەوە و لەمەڕ تێبینی تایبەتی ئەو لە سروشتەوە سەرنجی هەموانی راکێشا.

پاشان هیوز دەیان کۆمەڵە شیعر، پەخشان، ئۆپێراو شانۆی بڵاو کردەوە. هەروەها شیعرو چیرۆکی منداڵانیشی ئەنووسی کە یەکێ لەوانە بەناوی (دێوی ئاسنین) لە ئەمریکادا ناوبانگی دەرکرد. هیوز لە کتێبی (نامەکانی ڕۆژی لەدایك بوون) دا، سەبارەت بە ناوەڕۆك و هۆکاری رەوانی ئەم بەرهەمە ئەڵێ: (هەوڵم داوە دەرگایەکی راستەوخۆو تایبەتی و دەروونی لەسەر هاوسەرەکەم بکەمەوە و لەم هەوڵەدا بیرم لە شیعر نەکردووەتەوە بەڵکو نیازم وابووە کە بانگی بکەم و هەست بە وجوودی بکەم و پێم وابێ لێرەیەو گوێی لە من گرتووە.

(ئەیلین ئێرد) مامۆستای زانکۆی کەمبریج و رەخنەگری ئەدەبی، ئەم کتێبەی بەسەر سوورهێنەرو پاداشت و خۆشەویستی ئاین لەقەڵەم داوە. (کریستۆفێر رید)کە کاری پێداچوونەوەیە لە دەزگای Faber & Faber) دا وتی: هیوز مەزنترین حەقیقەت بێژ بوو. ئەو ئەیتوانی هەموو رووداوەیەك ئەوەندە واقیعی و لەهەمان کاتدا گاڵتە ئامێزانە بگێڕێتەوە کە خوێنەر بهێنێتە پێکەنین. لام وایە گرنگترین شتێ کە ئەو بە ئەدەبی چاخی ئێمەی بەخشیوە پێویستی دەربڕینی راستییە، هەرچەند رەش و رەزاگرانیش بێت. پێم وانیە لەم چاخەدا کەس باشتر لەو سروشت، شتەکان و بەرائەت ئاواها بدوێت ئەوانەی کە جێگەیان لەدنیای ئێمەو لەنێوماندا خاڵییە: هیوز لە ساڵی (١٩٤٨) بە پایەبەرزترین شاعیری بریتانیا هەڵبژێردرا و ئەم شانازییەی لەلایەن شاژنی ئەنگلتەرەوە پێبەخشرا. نیشانی شایستەیی سێزدە رۆژ پێش لە مردنی وەرگرت. ئەم خەڵاتە بەو کەسانە ئەدرێت کە لە بواری زانست، هونەر، ئەدەب و گەشەدان بە فەرهەنگدا رۆڵێکی دیاریان هەبووبێت.

سەرچاوە/ رۆژنامەی (ایران) ساڵی چوارەم ژمارە (١٠٩٧).

# لەیادی دوو سنۆبەری ئازادییدا

و: مەجید سالح

پایزی سالی رابردوو بۆ ئەهلی قەلەم و هزر و سیاسەت لە ئێران پایزێکی خوێناویو سوور بوو. گەلانی ئێران هێشتا لە پرسەی (داریوش فروهەر و هاوسەرەکەی و (مەجیدی شەریف) ی دا بوون کۆستی گەورەی کوژرانی هەردوو نووسەری گەورەی ئێرانی (محمد مختاری) و (محمد جعفر پەیوەندە) ی هات بەسەردا. ئەم دوو نووسەرە کە لە هەولی زیندوکردنەوەو بەگەڕخستنی یەکێتی نوسەرانی ئێران بوون لەهەمان کاتدا بە گەورەترین پشتیوانی کۆمەلی مەدەنی لە ئێران دەهاتنە ژماردن.

کوشتنی ئەم دوو کەلە نوسەرەی ئێران لەلایەن کەسانی تاریکبیرو دژ بە ئازادی هزر، لە سەرەتادا زۆر بەخێرایی لە ئێراندا بلاو بووەوەو نارەزاییەکی گەورەی لێکەوتەوە و بەهەزاران کەس دژ بەم کردەوە تیرۆرزیمیە خۆپیشاندانیان لە شارەکانی ئەو ولاتەدا ئەنجام دا.

لە هەمانکاتدا کاردانەوەیەکی گەورەی جیهانیشی لێکەوتەوە و بەسەدان روناکبیری ناوداری دونیا — هارولدپنتەر، یورگین هابرماس، ئالن تورن، ئارتۆمیلر و دەیانی تر– نامەی نارەزاییان بۆ دەولەتی ئێران ناردو داوایان کرد کە تاوانباران بەزووترین کات بناسرێن‌و بدرێنە دادگا. هەروەها داوایان کرد حکومەتی ئێران چیتر لەبەرامبەر تیرۆرکردنی نوسەرو بیرمەنداندا بێدەنگ نەبێ... دواتر بەڕێوەبەری گشتی یونسکو "فدریکو مایور" و کۆمەلێ لە هونەرمەندان‌و بیرمەندە جیهانیەکان ئەم کردەوە تیرۆریستەیان مەحکوم و ریسوا کرد.

رۆژی ٩٨/١٢/١٤ لە ناشتنی تەرمی (محمد مختاری) دا بە هەزاران کەس لە رووناکبیرو هونەرمەندو خەلکی ئازادی خوازی ئێران بەشدارییان کردو بەم بۆنەوە داواکرا خوێنی ئەم شەهیدانە بەفیڕۆ نەچێ‌و تۆلەیان بۆ بکرێتەوە. لەو رێورەسمەدا (سیاوەش) ی کوڕی مختاری وتی:

(نازانم کێ باوکمی کوشتووە، بەلام دەزانم ئەوانەی فروهەرو پەیوەندەیان کوشت هەمان ئەو کەسانەن کە باوکمیان کوشتووە.).

(مەریەم) ی هاوسەری مختاریش دەلێ:

(ئەم جەوە نائەمنیە هەڕەشە لە هونەرمەندو

نووسەرو خەڵکەکان دەکات، دەبێ بیر لە چارەسەرکردنی ئەم جەوە نادڵنیایە بکەینەوە، کێشەی هاوسەرەکەی من کێشەی گەلێکە هەست بە نەبوونی ئاسایش دەکات.)

گولشیری کە نوسەرێکی ناودارو هاورێیەکی دڵسۆزی (مختاری) یە دەڵێ:

(پێمان دەڵێن دەتانخنکێنین، ئێمەش ئامادەین، مەگەر بڕیار نییە لە پێناو کۆمەڵی مەدەنیو ئازادی قوربانی بدەین، ئێمە ئامادەین..)

لە سەرەتادا کەس نەیدەزانی تیرۆرکردنی ئەم نوسەرو سیاسەتمەدارانە لە ئەستۆی کێدایە دواتر دەستەیەک کە خۆیان بە (فیدائیانی ئیسلامی راستەقینەی محمد مستەفا) ناوبرد بەرپرسیێتی خۆی لەوکارە راگەیاند و دواتر رەدیان کردەوەو پاشان دوپاتیان کردەوە کە ئەوان ئەنجامیان داوە.. تا لە ٩٩/١/٥ رۆژنامەی (سلام) پەردەی لەسەر ئەوەلادا کە لەو کارەتیرۆریستیەدا وەزارەتی (اطلاعات) دەستی هەبووە. ئەنجامدەرانیشی لەسەر باڵی راستڕەو حساب دەکرێن.

بۆ ئاشنابوون لە ژیانو بەرهەمی ئەم دوو نووسەرە وا لە خوارەوە کورتەیەک لە ژیانو بەرهەمی هەردووکیان دەخەینە روو بەوهیوایەی لە ئایندەدا بتوانرێ بەرهەمەکانیان بۆ سەرزمانی کوردی وەرگێڕرێ.



### ژیاننامەی
### (محمد مختاری)

- ساڵی ١٩٤٣ لە خێزانێکی ناوەندو زەحمەت کێش لە شاری (مەشهەد) هاتووەتە دونیاوە. هەر لەو شارەدا خوێندنی سەرەتایی و ناوەندی تەواوکردووەو پاشان لە ساڵی ١٩٦٩ بەشی ئەدەبیاتی فارسی لە زانکۆی فەردەوسی تەواو کردووە.
- ساڵی ١٩٦٧ لە گۆڤاری (نگین) و (فەردەوسی) دا کۆمەڵێ شیعری

بڵاوکردوەتـەوە و پاشـان کتێبی (ریالیزم‌و داستانی بلند) ی جـان ئـاپدایك وەردەگێڕێتە سـەر زمانی فارسی.

- سـاڵی ١٩٧٢ لەگـەڵ هونەرمـەندی تەشـکیلی (مریـەم حسـین زادە) زەمـاوەند دەکـات‌و دوو منداڵیان دەبێ (سیاوەش) ٢٥ سـاڵ‌و (سـهراب) ١٣ ساڵ.
- سـاڵی ١٩٧٣ چالاکیـەکانی خـۆی لـە (دەزگـای شـانامە) لـەژێر چاودێری ئوستاد (مجتـەبا مینـووی) دەسـت پـێ دەکات و پـاش ماوەیـەك دەبێتە ئـەندامی دەستەی زانستی دەزگاکـەو وەك شـاعیرێکی نـوێ خـواز سوودێکی زۆر لەو دەزگایە دەبینێ.
- ١٩٧٦ کۆمەڵە شیعری (وەهـم سـندباد) بڵاودەکاتەوە.
- ١٩٧٧ کۆمەڵە شیعری (قصیدەهـای هاویە) بـڵاو دەکاتەوەو پاشان کۆمەڵـە شـیعری (برشـانە فـلات) بڵاودەبێتەوە.
- ١٩٧٩ کۆمەڵە شیعری (شـیعری ٥٧) بڵاودەکاتـەوە و پاشـان دەبێتـە مامۆسـتا لـە پـەیمانگای هونـەرە دراماتیکیەکان.
- ١٩٨٠ دەبێتـە سـکرتێری (کـانون نوسـیندگان ایـران) و تـا سـاڵی ١٩٨١ بـەردەوام دەبـێ و پاشـان دەسگیردەکرێ‌و دوو ساڵ لـە زینـدان دەبـێ‌و دوای ئـازاد کـردن لـە هـەموو کـارێکی حکومـی دور دەخرێتەوە.
- ١٩٨٤ بڵاوبوونـەوەی (داستان سیاوەش).
- ١٩٨٦ دەبێتـە ئـەندامی دەسـتەی نوسەرانی (دنیای سخن) و سێ ساڵ بەردەوام دەبێ.
- ١٩٨٩ بڵاوکربوونـەوەی (منظومەی ایرانی سرودەی سالهای ١٣٦٤ –١٣٦٦).
- ١٩٩٠ بڵاوکردنـەوەی (اسطورە زال).
- ١٩٩٢ بۆمـاوەی دوو سـاڵ دەبێتـە ئـەندامی دەسـتەی نوسـەرانی گۆڤاری (تکاپو).
- ١٩٩٣ کتێبی (انسان در شعر معاصر) رەخنـەو لێکۆڵینەوەی ئەدەبی.
- ١٩٩٥ کتێبی (هفتـاد ساڵ عاشقانە) ئانتولۆژیای شیعری هاوچەرخ لـە ١٣٠٠ بۆ ١٣٧٠. هێشتا لەلایـەن سانسـۆرەوە رێگـەی بـە چاپ گەیاندنی نەدراوە.
- ١٩٩٦ بڵاوکردنـەوەی وەرگـێڕانی کتێبـی (ئاخمـاتۆف) ژیاننامـەی شاعیری گەورەی رووس.
- ١٩٩٧ کتێبی (نیمـاو شـیعری ئـەمڕۆ) و (وەرگێڕانی) (مایکوفسکی) ژیاننامـەی شـاعیری گەورەی رووس، وەرگێڕانی (ماندلستـایم) ژیاننامـەی شاعیری گەورەی رووس..
- ١٩٩٨ بڵاوبوونـەوەی کتێبـی (تمریـن مـدارا) کۆمەڵە وتارێکی کولتوری، کۆمەڵایـەتی، سیاسـی، بڵاوبوونـەوەی کتێبـی (چشم مرکـب) و (آرایـش درونـی) و (سـهابی خاکسـتری و شـاعران معاصر ایران).

لـە پـاش نیـوەڕۆی پێنـج شـەممە ٣ ی /١٢ لـە نزیکـی خانوە کرێچیەکەی لە تـاران، کاتێك بۆ کڕینی شمەك دەچێتە دەرەوە دەیرفێنن‌و رۆژی دواتر تەرمەکـەی لـە نزیکی شـاری (رەی) دەدۆزنەوە. مختاری لە

نوسینی‌و بلاوکردنەوەی (دەقی ١٣٤ نوسەر) و بەگڕخستنەوەی (یەکێتی نوسەرانی ئێران) ڕۆڵی سەرەکی هەبوو. مانگێك پێش تیرۆرکردنەکەی لەگەڵ پێنج نوسەری تردا لەلایەن دادگاری شۆڕشەوە بانگ کراوە زیاد لە سەد وتاری لەم ٢٠ ساڵەی دواییدا نوسیوە..



**ساڵنامەی ژیانی محمد جعفر پونیده.**

- ١٩٥٤ لە شاری (یزد) لە خێزانێکی هەژار و دەسکورت هاتووەتە دنیاوە.لە شەش ساڵی دەچێتە خوێندن‌و لە ١٠ ساڵی دا شان بەشانی خوێندن بۆ بژێوی خێزان‌و کڕینی کتێبە دڵخوازەکانی دەست دەداتە کارکردن.
- ١٩٦٨ ئارەزووی خوێندنی کتێبی ئەدەبیات‌و ڕۆژنامەنووسی و وتارنوسی‌و شیعر نوسین لەناخیدا چەکەرە دەکات.
- ١٩٧٠ دوای تەواوکردنی ئامادەیی لە کولێژی یاساو رامیاری زانکۆی تاران وەردەگیرێ‌و لە ڕێکخراوی خوێندکاراندا دەست دەداتە خەباتکردن.
- ١٩٧٤ پاش تەواوکردنی کولیژی یاسا بۆ تەواوکردنی بەشی (کۆمەڵناسی) دەچێ بۆ زانکۆی (سۆربۆن) لە فەرنسا و لەساڵی ١٩٧٧ بەکالوریوس لەوبەشەدا وەردەگرێ. لەو ماوەیەی کە لە فەرەنسا دەبێ لە ریزی خوێندکارانی ئێران لە دەرەوەی ولات دژی رژێمی شاهەنشاهی تێدەکۆشێ.
- ١٩٧٨ پێش رووخانی شا بەماوەیەکی کەم دەگەڕێتەوەو دەستدەداتە چالاکیە کۆمەڵایەتیەکانی.
- ١٩٨٨ لەماوەی دە ساڵدا دەستدەداتە وەرگێڕانی کۆمەڵە بابەتێکی سیاسی کۆمەڵایەتی و سەرەتا وەرگێڕانی (قەیرەکچ) ی بالزاك بلاودەکاتەوەو ئەم رۆمانە دووجار چاپ کراوەتەوە.

- ساڵی ١٩٩٧ کتێبی (کۆمەڵگا، کولتور، ئەدەبیات) ی گلدمن وەردەگێڕێتە سەر زمانی فارسیو دواتر چەند کتێبێکی تر چاپ دەکات.
- ١٩٩٨بڵاوکردنەوەی کتێبی (ئەگەر منداڵەکەت کچە... کۆمەڵناسی و دەروونناسی دروست بوون کە سایەتی لای کچەکان) کە لە نوسینی (ئەلناجانینی بلوتی). پاشان وەرگێڕانی (قوتابخانەی بودابست) کە لە نوسینی (جورج لوکاچ) چاپ دەکات. دواتر کتێبی (راگەیاندنی مافی مرۆڤو مێژووی ئەو...) وەردەگێڕێتە سەر زمانی فارسی. هەروەها کتێبی (مێژوو ئاگایی چینایەتی) جورج لوکاچ دەکاتە فارسی.
- ١٩٩٨ ١٩٩٨/١٢/٨ کاتێك لەسەرکار دەگەڕایەوە لەلایەن چەند نەناسراوێکەوە دەڕفێنرێو پاش رۆژێك تەرمەکەی دەدۆزرێتەوە.

پویندە لە نوسین و بڵاوبوونەوەی (دەقی ١٣٤ نوسەر) و زیندوکردنەوەی یەکێتی نوسەرانی ئێران رۆڵی بەرچاوی هەبوو. مانگێك پێش تیرۆرکردنەکەی لەگەڵ پێنج نوسەری ترکە سەرقاڵی کۆبونەوەی گشتی نوسەرانی ئێران بوون لەلایەن دادگای شۆڕش بانگ کراوەو لێکۆڵینەوەی لەگەڵدا کراوە.

زیاتر لە ١٥٠ وتاری نوسیوەو ٢٧ کتێبی نوسیوە یان وەرگێڕاوە. و ئێستا زیاد لە نۆ کتێبی تری ئامادەی چاپن.

لەکۆتاییدا سڵاو لە مختاری و پویندە کە بە خوێنی گەشیان رێگای کۆمەڵی مەدەنیو ئازادیان لە ئێران روناك کردەوە فەروغ دەڵێ (تەنیا دەنگ دەمێنێتەوە) ئەمانەش ئەو دەنگانەن کە هەتا هەتایە هەردەمێننەوە.

## ئاگادارییەك بۆ نووسەرانی گۆڤاری سەردەم

- لەگەڵ دەقە وەرگێڕراوەکەدا دەقە ئەسڵیەکەش بنێرن.
- ڕەچاوی ڕێزمان و خاڵبەندی بکەن.
- دەبێ بابەتەکە بەخەتێکی جوان و لەسەر دیوێکی کاغەزەکە بنوسرێ، دەنا فەرامۆش دەکرێ.
- بەپێی پێویست وێنە لەگەڵ بابەتەکەدا هەبێ.
- هەر بابەتێك بڵاوبکرێتەوەو نەکرێتەوە نادرێتەوە بەخاوەنەکەی.
- ئەو بابەتانەی بڵاودەکرێنەوە مەرج نىیە دەربڕی ڕاو بۆچوونی گۆڤارەکە بن.
- (سەردەم) پاش بەراوردو پایچوونەوە بەبابەتەکاندا، لەدەسکاریو داڕشتنەوەیاندا ئازادە.

## ئاگادارییەك بۆ وەرگێڕەکان

دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم بەنیازە لەزنجیرە کتێبە چاپکراوەکانیدا گرنگییەکی تایبەت بەوەرگێڕانی کتێبی هەڵبژاردە بدات لە زمانیە زیندووەکانی جیهانەوە، هەر بۆ ئەم مەبەستە:

یەکەم: بایەخی تایبەت بەلێکۆڵینەوە دەدرێ لەبوارەکانی: فیکر، فەلسەفە، توێژینەوەی ئەدەبی، دەقی جیهانی وەرگێڕراو، ڕەخنە، زانستیە مرۆییەکان، مێژوو، لێکۆڵینەوە خۆرهەڵاتناسیەکان، تۆژینەوەی هونەری، ئەدەبی منداڵ، فەرهەنگسازی...دا.

دووەم: دەبێ دانەیەك لەکتێبە ئەسڵیەکە لەگەڵ وەرگێڕانەکەدا هەبێ.

سێیەم: دوای ئەوەی بڕیاری چاپکردنی دەدرێ؛ نۆرەی خۆی بۆ چاپ دەگرێت و پاش چاپکردن، بەپێی قەوارەو کتێبەکە (جگە لە ڕێژەیەك لەکتێبەکە) خەڵات بۆ وەرگێڕەکەی تەرخان دەکرێ.

